# سەحرا




نووسەر:
**لۆکلێزیۆ**
وەرگێڕ لە فەرەنسەوە:
**کافیە جەوانڕوودی**

# سەحرا

نووسەر: ژ.م.گ. لۆکلێزیو

وەرگێر: کافیە جەوانروودی

لوکلز یو، ژان ـ ماری گوستاو، ۱۹۴۰ ـ
Le clezio, Jean-Marie Gustave
سەحرا/ نووسە رژ.م. گ. لوکلیزیو؛ وە رگێر کافیە جە وانروودی. ـ تهران: احسان، ۱۳۸۰.
۳٦۷ ص.
ISBN 964-356-054-6
فهرستنویسی براساس اطلاعات فیپا.
عنوان اصلی: Le clezio, ou, la quete de desert.
کردی.
۱. داستانهای فرانسه ـ ـ قرن ۲۰. الف. جوانرودی، کافیه، ۱۳۵۲ ـ ، مترجم. ب.عنوان.
۹س۸۲۴و/PQ۲٦۳۸ ۸۴۳/۹۱۴
۱۳۸۰
کتابخانه ملی ایران ۱۸۹۵۲-۸۰م
محل نگهداری:

*Desert*
*J.M.G.Le clezio*
*Introduit par:*
*Kafieh Djavanroudi*

**چاپ و بلاو کردنەوەی احسان**

---

ناوی کتێب : **سەحرا**
نووسەر : ژ.م. گ. لۆکلێزیۆ
وەرگێڕ : کافیە جەوانروودی
چاپی یەکەم : ۱۳۸۱ (۲۰۰۲ ز)
ژمارە : ۱۰۰۰ دانە
ڕووبەرگ : سەلاح علمیزادە
پیتچین و سەفحەئارایی: ڕەزا پێنجوێنی و عەتا شەکیبایی
چاپ: چاپخانەی مهارت
ژمارەی نێو نەتەوایەتی ٦-۰۵۴-۳۵٦-۹٦۴
**قیمەت ۲۰۰۰ تمەن**

بۆیادی "باوکم"
که به ئازادی ژیا
و به ئازایی مرد
و
بۆ هەموو خۆشەویستیەکانی
"دایکم"

# پیشەکی

"ژان‌ماری گوستاو لۆکلێزیۆ" لە ١٣ی ئاوریلی ١٩٤٠ لە "نیس" لە دایک بووە، رەگەزی ئەگەڕێتەوە بۆ خێزانێکی "برۆتانی" کە لە سەدەی هەژدەهەمدا کۆچیان کردووە بۆ دوورگەی "موریس". سەفەری زۆری بۆ ئوروپا و باکووری ئافریقا و مکزیک کردووە، لە تەمەنی حەوت هەشت ساڵییەوە دەستی کردووە بە نووسینی؛ شێعر، چیرۆک، نوول، رۆمان و... .

یەکەمین کتێبی لەچاپ‌دراوی "ریزی حسێب" لە ساڵی ١٩٦٣ خەڵاتی "رۆنۆدۆت"ی وەرگرتووە. "لۆکلێزیۆ" تا ئێستا دەیان کتێبی بە چاپ گەیاندووە، رۆمانی "سەحرا" لە ساڵی ١٩٨٠ خەڵاتی گەورەی "پۆل مۆراند"ی ئاکادمی فەرەنسەی وەرگرتووە.

نووسەر هەر لە یەکەمین رۆمانیدا هۆگری روانینێکی تاوانبارانەیە لە سەر خشونەت و زبری دونیای ئەمرۆ، کەسایەتیەکان هەمیشە لە هەڵهاتن‌دان، سەرگەردان لە دونیایەکدا کە هەرکات لە ناو شێتی و شڵەژاویدا هەڕەشەی تەفروتوونا کردنیان لێ ئەکا.

لە "ریزی حسێب"دا خوێنەر ئەباتە دونیای شێتی و ئاوارەیی و خشوونەت. "ئادەم پۆلۆ" کەسایەتی ناوەندی چیرۆکەکە بوونەوەرێکی سەیرە: لە خانوویەکی چۆڵی دوور لە شار ئەژی، بەڵام جارجار بۆ پیاسە کردنی ماوەدار ئەڕواتە ناو شار یان وەک پەیام‌هێنەرێک خەڵک لە دەور خۆی کۆ ئەکاتەوە و قسەیان بۆ ئەکات، "ئادەم پۆلۆ"

بوونەوەرێکی زبرە: بێدەلیل بە تۆپی بیلیارد مشکێکی سپی ئەکوژێ، هێرش ئەکاتەسەر هاورێکەی، "میشل" و... هاوشاریەکانی ئەیگرن و ئەیبەن بۆ شێتخانە.
لە "کتێبی هەڵهاتنەکان"دا "ژۆنۆم ئۆژان" کەسایەتی چیرۆکەکە لە ماوەی گەشتە ماوەدارەکانیدا خشونەتێکی زیانهێنەر کە بە سەر شارە گەورەکاندا زاڵە ئەگێرێتەوە. نووسەر ئەیەوێ بیسەلمێنێ کە دونیای نوێ "پاک" نیە، کە مرۆڤەکان ئەبێ هەر رۆژ لەگەڵ بێدەنگی و رق و خراپە و ترس و بێلایەنی بە شەڕ بێن. "ژۆنۆم ئۆژان" جگە لە هەڵهاتن چارە سەرێکی تر نادۆزێتەوە.
سەفەر و ئاوارەیی، مەودای هەڵهاتنی لە شارەکان کە زیندانیان کردووە و ئەو ئاوێنانەی کە نابوودی ئەکەن، پێ ئەدا، چونکە کەسایەتیەکەی "لۆکلێزیۆ" هەر وەها ئەیەوێ لە خۆیشی وەدەر بێت، هەویەتی خۆی بگۆڕێ، هەڵ بێت و گوم بێت.
لە حەفتاکاندا بەرهەمی "لۆکلێزیۆ" ئەگۆڕیەت و پشتیوانی لێ ئەکرێت، ئیتر کەسایەتیەکانی لە دونیای نوێ راناکەن، بە دوای بەختەوەریدان، بەدوای هێمنیەکدان کە لە "شوێنێکی تر" ئەیدۆزنەوە کە زۆربەی کات "ئەو شوێنە" دوورە لە شارستانیەتی ماتریالیستی.
لە ١٩٦٩ بە دواوە، "لۆکلێزیۆ" بە زۆری هات و چۆی سوور پێستەکانی "ئامبێرا"ی پاناما ئەکات. بە رای ئەو، ئەوان دوایین مرۆڤە ئازادە بەختەوەرەکانی سەر زەوین. "هایی" لە ١٩٧١ وتارێ کە سەبارەت بە کولتوور و دابونەریتی سوور پێستەکانی "ئامبیرا"، نووسەر لە بەرانبەر رەگەز پەرەستی تەنکی رۆژئاوا رائەوەستێ، بە رای ئەو دۆزینەوەی ئەم شارستانیەتە، مەودایەکە بۆ دونیای ئەمرۆکە لەو بن بەستەی تیایدان، دەربازبن. لە ساڵەکانی ٨٠-١٩٧٥ بەرهەمەکان، ئاکامی گۆڕانکاری دەروونی نووسەرن، کەسایەتیەکانی لەگەڵ ئەوەدا کە هەڵدێن بە دوای بەختەوەری و ئازادیشدان.
"مۆندۆ و چیرۆکەکانی تر" لە ساڵی ١٩٧٨ کۆمەڵە چیرۆکێکە تایبەت بە دونیای منداڵیەوە، کەسایەتیەکان "مۆندۆ"، "لوولابی"، "دانیەل" لە پەراوێزی دونیای

گەورەکانداو برێ جار لە پەراوێزی کۆمەڵگادا ئەژین. ئەوان بە هیوان ئازادی و بەختەوری و هۆویەتی منداڵیان بپارێزن.

بە نووسینی "سەحرا" لە ساڵی ١٩٨٠، دونیای منالآن دیسان سەرنجی "لۆکلێزیۆ" بۆ لای خۆی رائەکێشێ، بۆ لای ئەو کەسانەی کە «دونیا بەو جۆرەی کە هەیە ئەبینن و هەموو جوانیەکی دونیا ئەناسن».

"نوور" و "لالا" سیماگەلی سەرەکی "سەحرا"، بوونەوەری ساکار و پاکن، سامانی دونیای رۆژئاوا لای ئەوان پووچ و درۆینە و بە پێچەوانەوە، ژیان لە سەحرادا، هارمۆنی هێمنی و ئازادیە.

"سەحرا" لە دوو بە سەر هاتی سەربەخۆ پێکهاتووە:

- بە سەر هاتی بە کۆمەڵ: سەحرانشینان کە لە کاتی ئیستعماری مەراکش لە ساڵەکانی ١٩٠٩ و ١٩١٢ لە لایەن هێزی فەرەنسە بە کۆ کوژران. "نوور" کورێکی لاو شایەتی ئەم تراژیدیەیە.

- بە سەرهاتێکی تاکی: "لالا" کچێکی لاو کە لە بیابان لە دایک بووەو لەگەڵ شارستانیەتی ئوروپا روبەروو ئەبێت.

منداڵی و بەختەوەری، شەڕ و هەڵهاتن، تاوانبار کردنی رۆژئاوا، بە دوای ژیانێکی نوێ بوون، بیابان و کەرەسەکانی سرووشت، بابەتە سەرەکیەکانی "سەحرا"ن.

"سەحرا" لە سێ تەوەرەی سەرەکی پێک هاتووە:

- باری مێژوویی: بە سەر هاتی "نوور" و سەحرانشینانی بیابان قۆناغێکی گرینگی ئیستعماری سەحرای رۆژئاوایە و ڕووداوەکان و کەسایەتیەکان لەگەڵ راستی مێژوویی‌دا یەک ئەگرنەوە.

- باری بڕوایی: "لۆکلێزیۆ" دوو شارستانیەت و دوو چەمکە ژیانی هێناوە کە لە بنەڕەتەوە پێکەوە جیاوازن. باوەڕی سەحرانشینان و باوەڕی رۆژئاویەکان. رۆمانەکە بایەخ بۆ ژیانی ساکاری مرۆڤەکانی سەحرا دائەنێت.

- باری هێمایی: لای "لۆکلێزیۆ" بیابان جگە لە شوێنێکی جوغرافیایی، هێمای ساکاری

و بێوەری بوونە.

"ژ.م.گ. لۆکلێزیۆ" یەکێ لە لووتکەکانی ئەدەبیاتی ئەمرۆی فەرەنسەیە، بەڵام بەداخەوە لای چینی خوێنەواری ئێمە هێشتا نامۆیە، جگە لە دوو یان سێ کورتە چیرۆک لە گۆڤاری (سخن)و(جوان)ی ساڵانی ۴۰و ۵۰ ، هیچکام لە بەرهەمەکانی "لۆکلێزیۆ" تەنانەت وەرنەگێردراونەتەوە سەر زمانی فارسی.

هەوڵم داوە وەرگێرانێکی پوختە پێشکەشی خوێنەر و کتێبخانەی کوردی بکەم. «ئەمە ئەوە نیە کە ئەمەوێ، ئەوەیە کە توانیومە». بێ گومان بۆ زمانی پاراوو و رستە شاعیرانەکانی "لۆکلێزیۆ" ئەمانەتدارێکی بێهەڵە نەبووم.

لە کۆتاییدا لە هەموو ئەوانەی یارمەتیان داوم سوپاس و دەست خۆشبوونیان لێ ئەکەم بە تایبەت کاک "ئەنوەر هوژەبری" بۆ پیاچوونەوەکەی کاک "سەلاحی علمیزادە" بۆ هەموو یارمەتیەکانی و بۆ ئامادە کردنی رووبەرگی کتێبەکە و کاک "بێهزادی کوردستانی" کە بە وردی و دڵسۆزیەوە پیایدا چووەتەوە.

«چاوەروانی رەخنە و پێشنیاری هەموو خوێنەرانی خۆشەویست و دڵسۆزم، بۆ بەهرە وەرگرتن لە بەرهەمەکانی تردا.»

ناونیشان: مەریوان س.پ ١٦٧ - ٦٦٧١٥

مەریوان - گەلاوێژی ٨٠

ک. ج

# «ساگیت ئەلحەمرا» زستانی ۱۹۱۰ـ۱۹۰۹

وەکوو خەونێک لە سەر تەپۆڵکەکەوە دەرکەوتن، نیوە نادیار لە نـاو تـەپ و تۆزی لمدا کە بە هەنگاو هەڵنان هەڵیان ئەدایەوە بە سەر جێ پێ نادیارەکاندا، بـەرە بەرە لە دۆڵەکەوە دائەگەڕان.

پیاوان لە پێش کاروانەکەوە پاڵتاوی خوری‌یان لەبەر کردبوو دەمامکی شـینیان هەڵبەستبوو، دوو یان سێ وشتری یەک کۆپاریان پێ‌بوو و مەڕ و بزنەکانیش کـە لە دواوە بوون، منداڵان تەنگیان پێ هەڵچنیبوون. ژنانیش لە دوای کاروانەکەوە بوون.

ئەمانە تارماییە قورسەکان بوون کە لە نێوان پاڵتۆ قورسەکانیاندا، داپۆشرابوون و پێستی باڵ و ڕوومەتیان لە پشت پەڕۆ شینەکانەوە ڕەش‌تری ئەنواند.

بێ ئەوە دەنگی پێیان لەسەر لمەکە ببیسرێ ڕێگەیان گرتبوەبەر، بێ ئەوە بزانن بۆ کۆی ئەڕۆن، "با" بێ‌وچان هەڵی ئەکرد، "با"ی بیابان، لە ڕۆژدا گـەرم و لە شـەودا سارد.

لم لە دەور و بەریاندا، لە بەین پەنجەی پـێی وشـترەکـانەوە هـەڵدەبەزیەوە و روخساری ئەو ژنانەی ئەدایە بەر قەمچی کە ڕووبەندی شینی سەرو چاویان لائەدا.

منداڵەکان رایان ئەکرد، ساواکانیش کە دایکیان بە چارۆکەی شین بەستبوونیان بە کۆڵیانەوە، ئەگریان. وشترەکانیش نەڕە و پڕمەیان ئەهات. کەس نەیدەزانی بۆ کوێ ئەڕوا.

هەتاو هێشتا بە تاقی ئاسمانی چۆڵەوە بوو، "با" دەنگ و بۆی لەگەڵ خۆی ئەهێنا، عارەق لە رووومەتی مسافرەکان بەخوڕ ئەتکایە سەرگۆنا و قۆڵ و قاچیان.

پێستی لەشیان شینی ئەنواند، خاڵی شینی سەر تەوێڵی ژنەکان وەک پشقەڵ خۆی ئەنواند چاوە رەشە قەترانیەکانیان بە سەختی ئەوپەڕی لمەکەیان ئەدی، لە نێو شەپۆلی تەپۆڵکەکەدا بە دوای جێ‌پێدا ئەگەڕان.

پانتایی زەوی کەسی لێ نەبوو، هیچی لێ نەبوو، ئەوان لە بیاباندا لە دایک ببون.

هیچ جادەیەکی تر ئەوانی نەئەگەیاند، هیچیان نەئەوت، هیچیان نەئەویست، "با" بەسەریانداو لە نێوانیاندا ئەگەڕا، ئەتوت کەس لەسەر تەپۆڵکەکە نیە.

لەگەڵ یەکەمین گزنگی ئاسۆ، بەڕێ ئەکەوتن، بێ‌راوەستان، ماندوویەتی و تینویەتی وەک خۆڵ زێڕی داپۆشیبێ، ئەوانی داشاردبوو.

لێویان وشک هەڵاتبوو، برسیەتی دایرزاندبوون.

نەیاندەویست بدوێن، لەو ماوە درێژەدا لاڵ ببون. کاتێ هەتاو بە تاقی ئاسمانەوە ئەدرەوشایەوە، پڕ ئەبوون لە رووناکی، لە شەوە پڕ لە ئەستێرە بەستەڵۆکەکاندا رەق هەڵدەهاتن... هەر وەک بیابان. بەرەو قووڵایی دۆڵەکە ئەچوون. کاتێ لمەکە لە ژێر پێیان داڕۆ ئەچوو، خوار و خێچ دائەگەڕان، بێ ئەوە بۆ بەرپێیان بڕوانن ئەیانزانی پێ لەکوێ بنێن.

ئەتوت پێ لە سەر ئەو جێ پێ نادیارانە ئەنێن کە بەرەو کۆتایی و تەنیایی و شەوی ئەبردن. تەنیا یەکێکیان چەکێکی پێبوو، "کارابین"ێکی بەردین، دەستەیەکی درێژی برنجەیی رەشی هەبوو لە سەر سینگی بە دووقۆڵی گووشیبوی بە خوێەوە، لوولەکەی وەک دەسکەی ئاڵا بەرەو ئاسمان بوو. براکانی لە تەنیشتیەوە تێدەپەڕین، خۆیان لە پاڵتاوەکانیانەوە پێچا بوو، لەبەر قورسایی بارەکانیان چەما بوونەوە. جلە شڕەکانیان لە ژێر پاڵتۆکانیانەوە ئەبینرا. دڕک و لم شڕی کردبوون، لە دوای ئاژەڵە بەستەزمانەکانیش، کوڕی کابرای چەکدار کەوتبوەپێش دایک و خوشکەکانی رووومەتی مات بوی، لەبەر هەتاودا رەش هەڵ گەڕابوو، بەڵام چاوەکانی

ئەدرەوشایەوە بروسکەی نیگای ئاسایی نەبوو.

ئەوان ژنان و پیاوانی ئەو لمستان و "با" و رۆشنایی و شەوە بوون، کە وەکوو خەونێک لەسەر تەپۆلکەکەوە دەرکەوتن، وەک بڵێی لە ئاسمانێکی ساماڵی بێهەوردالە دایک بووبن.

چەرمەسەری و سەختی رێگا بە جەستەیانەوە دیار بوو. برسیەتی و تینویەتی لێویانی شەقار کردبوو، بێ دەنگیەکی قورس لەوێ داکە رۆژ ئەدرەوشایەوە، شەوە ساردەکان و رووناکی کاکێشانی رێگای شیری و مانگ، هەڤاڵی هەموو کاتێکیان بوون.

لەگەڵ داچوونی رۆژدا، سێبەرە گەورەکانیان، قامکە بڵاوەکانیان کە بە لمەکەوە ئەنووسا و ئاسۆوە بێبڕوانەوەکە، لەگەڵیان رێ ئەکەوتن.

بە تایبەت پرشنگی نیگاکانیان لە سپێنەی چاویاندا ئەدرەوشایەوە. رانی بزنە سپی و مەڕەکان لە پێش منداڵەکانەوە بوو، ئاژەڵەکانیش بێ ئەوە بزانن بۆ کوێ ئەڕۆن، سمیان ئەنایەوە جێ سمە کۆنەکان، لم ئەچوو بەدرزی سمیانداو بە موویانەوە دەئالا. کابرای وشترەوان هەر وەک ئەوان کەوتبوە پڕمەپڕم.

دەنگی کلپەی هەناسەکان لەگەڵ "با" تێکەڵاو ئەبوو و خێرا نوقمی دۆڵەکانی رووەو باشوور ئەبوو. بەڵام ئیتر "با" و وشکی و برسیەتی گرینگ نەبوو.

چەندین حەوتوو، چەندین مانگ بوو، رێ کەوتبوون، لەم چاڵ بۆ ئەو چاڵ، لە سێلاوگە وشکەکان کە لەناو لمەکەدا ون ئەبوون، لە فەلاتەکان تێ ئەپەڕین. ئاژەڵ و مرۆڤ گەڵای داری "جوزالقی" یان پێکەوە ئەخوارد.

ئێوارە، کاتێ هەتاو ئەخزایە نزیک ئاسۆ و سێبەری دەوەنەکان درێژ ئەبوونەوە، ئاژەڵ و مرۆڤەکانیش ئەوەستان، پیاوەکان باری وشترەکانیان دائەگرت، رەشماڵێکی گەورەی خوری بۆریان هەڵدەداکە تەنیا کۆڵەکەیەکی دارسدر رای ئەگرت، ژنەکان ئاگریان ئەکردەوە و شۆربای هەرزەن و شیری دەڵەمە وکەرە و خورمایان ساز ئەکرد، شەو خێرا دائەهات.

ئاسمانی بەرین بە سەر زەوی بێ دەنگدا ئەکرایەوە. ئەمجا ئەستێرەکان لە دایک ئەبوون هەزاران ئەستێرە، بێجوولە لە بۆشایی ئاسماندا.

پیاوە چەکدارەکە، کە بەڵەدی جەماوەر بوو، "نوور"ی بانگ کرد، سەری کاروان کوژەی پێ نیشاندا. ئەستێرەیەکی تەنیا، کە "گابری"یان پێ ئەوت، ئەمجا لەوبەر بورجی گەردوون «کەوکەبی» شینی پێ نیشاندا. بەرەو رۆژهەڵات پردێکی بە "نوور" نیشاندا کە پێنج ئەستێرە ئەدرەوشایەوە. «ئەلکاید»، «میزرا» «ئەلیوت»، «میگرێز»، «فێکدا» رێک لە رۆژ هەڵات لە سەر ئاسۆی رەنگ خۆڵەمێشی «ئوریۆن» بە ئەستەم دەر ئەکەوت، لەگەڵ «ئالینلام» کە وەک دەکەڵی کەشتیەک کەوتبوو بەلایەکدا، ئەو هەموو ئەستێرەکانی ئەناسی، برێ جار ناوی سەیر سەیری لێ ئەنان، رێگایەک کە لە رۆژدا ئەیان بری پێی نیشان ئەدا، ئەتوت رووناکیەکانی ئاسمان نیشان دەری رێگایەک بوون کەئەبوایە بیان بریبا.

گەلێ ئەستێرە لە ئاسماندا بوو، شەوانی بیابان پڕ لە رووناکی بوو، کە بە هەناسەی "با" چاویان ئەتروکاند.

وڵاتێکی بێ کات و سات بوو، دوور لە چیرۆکی مرۆڤەکان، وڵاتێ کە توانای دەرکەوتن و مردنی بۆ نەمابوو، وەک بڵێی لە مێژەوە لە وڵاتانی دیکە برا بێت، ئەتوت لە لووتکەی ژیانی سەرزەوی دابوو. زۆربەی کات بۆ ئەستێرەکانی ئاسمانیان ئەروانی، رێگایەکی سپی گەورە چەشنی پردێ لە لم بەسەر زەویدا کێشرا بوو.

بە دەگمەن ئەدوان. گەلاپێچراوەکانی «کیفیان» دائەگیرساند، چیرۆکی سەفەرەکانیان ئەگێرایەوە و شەرەکانیان لەگەل سەربازە مەسیحیەکان و تۆڵە لێ سەندنەوەکانیان.

ئەمجا گوێیان بۆدەنگی شەو رائەگرت، شۆڵەی گری چیلکەی ژێر قۆریە مسینەکان سەمایان ئەکرد، دەنگی توانەوەی ئاوەکە ئەهات ژنانیش سەرقاڵی قسەکردن بوون، ژنێکیان بۆ منداڵەکەی کە لە سەر سینگیا نوستبوو، لایەلایەی ئەکرد. لوورەلووری سەگە وەحشیەکان ئەهات، دەنگدانەوەکەیان لە نشێوی دۆڵەکاندا لە

وەڵام دانەوەی کۆمەڵە سەگێکی تر ئەچوو.

بۆنی ئاژەڵەکان و بۆنی نمی لم و بۆنی ناحەزی دووکەڵی ئاگردانەکان تێکەڵ ئەبوون. ژن و منداڵەکان ئەچوونە رەشماڵەکەو ئەخەوتن، پیاوەکانیش بە پاڵتاوی بەریانەوە ئەنوستن لەگەڵ ئەوەداکە ئاسمانی رەش زیاتر ئەدرەوشایەوە، لە نێوان لم و بەرددا نوقم ئەبوون. بەم چەشنە، لەوانەیە مانگان و ساڵان رێگەیان بری بێت، لە نێوان شەپۆلی دۆڵەکاندا کەوتبوونە شوێن رێگا ئاسمانیەکان، ئەو جادانەی لە «درا»وە ئەهاتن، لە «تانگروت»، «ئیرگ ئیگدی»، یان لە باکوورەوە، جادەی «ئایت ئاتا»، لە «گێری»، «تافلیت»، یان جادەیەکی بێ پایان کەتا سینگی ئاسمان ئەچوو، لەوبەر «هانک»ەوە، بەرەو شاری گەورەی «تومبوکتو»، برێکیان لە سەر جادەکە مردبوون، برێکیشیان لە دایک بووبوون، شوویان کردبوو، ژنیان هێنا بوو، برێ لە ئاژەڵەکانیش تۆپیبوون، گەروویان کراوە، ئەبوون بە هۆی بە پێز کردنی خاک یان ئەبوون بە هۆی تاعوونی زیاتر، بە سەر زەویە رەقەکەوە بۆگەن ئەمانەوە.

ئەتوت لێرەدا نەناو بوو نە وتە، بیابان هەمووی بە "با" ئەشۆردەوە و هەمووی پاک ئەکردەوە. بۆشاییەکی بەرین لە بینایی مرۆڤەکاندا بوو، پێستیان وەک کانزا بوو، پرشنگی هەتاو لە هەموو جێگایەکدا ئەدرەوشایەوە، لمی رەنگ سوورو زەرد و خۆڵەمێشی و سپی، لمە سووکەکان کە بە عەرزدا ئەخشان نیشانەی بوونی "با" بوو، "با"یەک کە جێ پێ ئێسقانەکانی پر ئەکردەوە و رووناکی ئەتاراند، ئاوی راو ئەکرد، ژیانی لێ ئەگرتن، لە جێگایەکدا کە کەس توانای ناسینەوەی نەبوو، لایان روون بوو کە نایبەون، بەڵام بێوچان رێگایان ئەبری. لەسەر ئەو رێگاگەلەداکە کەسانێکی تر بە دوای شتانێکی دیکەدا لێیدا تێپەری بوون.

ئاو لە ناو «عیونە»کاندا بوو یان لە شوێن تەرایی رابردووی چەمێک، هەر لە رەنگی ئاسمان بوو، بەڵام بەکەڵک نەئەهات و لە ئاسەواری دڵۆپی عارەق ئەچوو لە پانتایی بیاباندا.

دووایین جوڵەی ژیان بوو، بەخششی بەرچاوتەنگانەی خوای وشکی بوو،

ئاوێکی قورس کە لە نێوان لمەکەوە دەرئەهات، ئاوی مردوی شەقارەکان، ئاوێکی قورس، کە ئەبوو بە هۆی سکچوون و رشانەوە. چە مابوونەوە، ئەبوایە هەر برۆشتنایە، بەرەو ئەوێ کە ئەستێرەکان لە دایک ئەبوون رەنگە ئەوەتاکە وڵاتێکی ئازاد بوو کە ئیتر مافە ئینسانیەکان گرینگ نەبوون.

وڵاتی بەرد و "با" و دووپشک و مشک بوو، ئەوانەی کە ئەیانزانی کاتێ هەتاو بە هەموو هێزیەوە ئەسوتێ و کاتێ کە شەو ئەیبەست، خۆیان حەشاربدەن.

لە سەر دۆڵی "ساگیت" دەرکەوتن، بە هێمنی لە پانتایی لمەکە ئەچوونە خوارەوە، لە قووڵایی دۆڵەکە شوێنەواری مرۆڤ دەستی پێ‌ئەکرد، کێڵگەکان کە بەوشکە کەڵەک دەوریان گیرابوو، پەچەی وشترەکان، کۆڵیتەکان کە لە گەڵا نەمامی خورما درووست کرابوون. رەشماڵە خوریەکان کە لە بەلەمی نخوون و هەڵگەڕاوە ئەچوون.

بە ئەسپایی دائەگەڕان، تا ئەژنۆ لە لمی ژێر پێیاندا رۆئەچوون و ئەچەقین.

ژنانیش لە سەرخۆ و بە هێمنی لە ئاژەڵەکان کە بۆنی چاڵەکان شێتی کردبوون، خۆیان لائەدا. ئەمجا دۆڵێکی بەرین لە ژێر فەلاتە بەردینەکەوە دەرکەوت، ""نوور"" بە دوای درەختە بەرزە سەوزە تێرەکاندا ئەگەڕا، کە لە عەرزەوە روابن و لە دەور رووبارێکی زوڵالدا رێچکەیان بەستبێ، بۆ کۆشکە سپیەکان ئەگەڕا، منارەکان و هەموو ئەو شتانەی کە کاتی منداڵی سەبارەت بە شاری «سمارا» پێیان وتبوو.

ماوەیەکی زۆر بوو درەختی نەدیبوو، هەر دوو قۆڵی شل داخستبوو، لە بەر بریقەی لمەکان چاوی تۆزێ قوونجاندبوو و بەرەو خواری دۆڵەکە ئەرۆیشت.

بەرەبەرە کە بەرەو قووڵایی دۆڵەکە ئەرۆیشتن، ئەو شارەی کە هەر بۆ ساتێ بینیبوویان نوقم ئەبوو بیجگە لە عەرزێکی وشک و خاڵی چی‌تریان پەیدا نەکردبوو، هەوا گەرم بوو، ئارەق بە روومەتی ""نوور""دا ئەچۆڕایە خوارێ، جلە شینەکانی ئەلکان بە شان و ناو قەدیدا.

ئەمجا ژنان و پیاوانێکی دیکە دەرکەوتن، وەک بڵێی لە دۆڵەکە لە دایک بووبن.

ژنەکان ئاگردانەکانیان بۆ چێشتی شەو داگیرساندبوو، پیاو و منداڵەکـان، بـێ جووڵە لە بەردەم ڕەشماڵە خۆڵاویەکـان مـابوونەوە، لە هـەموو شـوێنێکی بـیابانەوە هاتبوون لەوبەر ئامادای بەردینەوە لە کێوەکانی «شوعیبا» و «ئوراکـزیز» و «سـیروا». کێوەکانی «ئوم شاکور» تـەنانەت لەوبـەر مـەڵبەندە گـەورەکـانی بـاشوورەوە و لە تەنگەڵانی «مایدر» کێوەکانیان تێ پەڕاندبوو، بەرەو «تارامانت» یان خوارتر لەویا کە لە «رۆگبات»ەوە «دراو» و «تانگوت» یەکیان ئەگرتەوە.

هەموو خەڵکی باشوور هاتبوون، قەرەجەکان، بـازەرگانەکـان، شـوانـەکـان، چەتەکان و سواڵکەرەکان، لەوانەیە بڕێکیان لەوڵاتی پاشایەتی «بیرۆ»وە هاتبێتن یان لە مەڵبەندە گەورەکانی «ئوالاتا». ئاسەواری داخی هـەتاو، سـەرمای مـەرگ هـێنەری شەوانی سنوورەکانی بیابان بە روخساریانەوە دیار بوو، بڕێکیان پێست ڕەشی مەیلە و سوور و کەڵەگەت بوون و بەزاراوەیەکی نەناسراو ئـەدوان. «تـووبووس»ەکـان کـە لەوبەری بیابانەوە هاتبوون، لە «بۆرکو» و «تیبیستی» هەرچی نزیکتر ئەکـەوتنەوە، ئەوەندەش تارمایی مرۆڤەکـان درێـژتر ئـەبوەوە، لە پشت ئـەقاقیا چـەماوەکـانەوە، کۆڵیتەکان کە لە پەل و پۆی قوڕ دروست کـرابـوون و لە شـارەمێروولە ئـەچوون، دەرکەوتن. ماڵە چینەییەکان، کەپرەکان، بە تایبەت وشکە کەڵکەکان کـە تـا ئـەژنۆ ئەگەیشت، زەویەکە دابەش کرابوو بە ماڵی بچووک بچووک.

لە کێڵگەکەدا کە هەر ئەونەی سەلوێنکێک بـوو، کـوێلەکـان بـیبار و بـاقلە و هەرزەنیان کێڵابوو. ئێستا ئەوانیش گـەیشتبوونە شـاری "سـمارا"، مـرۆڤ و ئـاژەڵ هەموویان لەم زەویە وشک هەڵاتوە لە قووڵایی ئەم برینە گەورەی «سـاگـیت»ەوە بەرەو پێش ئەچوون.

بە درێژای ئەو ڕۆژ و ساتانەی کە وەکوو بەردی چەخماخ تیژ و ڕەق بـوون، تامەزرۆی چاو پێ کەوتنی ببون. جەستەیان، لێوە برینداره‌کانیان و نیگا سووتاوەکانیان سیخناخ بوو لە ئێش و ئازار، بـێ ئـەوەی قـارە و بـارەی ئـاژەڵەکـان یـا زەنـەزەنی مرۆڤەکانی دیکەیان گوێ لێ بێ، بە پرتاو بەرەو چـاڵەکـان ڕۆشـتبوون، پـیاوەکـان

دەستیان کردبوو بە نوێژ خوێندن، منداڵەکان بەردیان لە ئاژەڵەکان ئەهاوێشت و بڵاوەیان پێ ئەکردن، ئەمجا چووبوونە سەر ئاوەکە و بینیان پێوە نابوو. وەک چاوەکانی ئاو بوون لە ناوەڕاسی بیاباندا، ئاوە شیرتینەکەیش وزەو پتەویی "با" و "لم" و ئاسمانە گەورە سەهۆڵ بەسراوەکەی شەوی تیا بوو. کاتێ "نوور" ئاوی خواردبوەوە، هەستی بە بۆشاییەک کردبوو کە چاڵ بۆ چاڵ لە خۆی دووری کردبوەوە، ئاوە بێتام و قوراویەکە دڵی تێک ئەشێواند و تینویەتی نەئەشکاند، ئەتوت بە خواردنی ئەو ئاوە، بێ دەنگی و تەنیایی تەپۆڵکەکان و فەلاتە بەردینەکان ئەچوونە ناخی جەستەیەوە.

ئاوی ناو چاڵەکە لە جوولەکەوتبوو وەکووکانزا لووس و ساف بوو، وردە گەڵا و مووی بزن کەوتبونە سەر ئاوەکە، لە چاڵێکیتر ژنەکان جلیان ئەشۆرد و قژیان دائەهێنا.

بزن و وشترەکانیش وەک بڵێی کۆڵەکەیەک لە نێو گڵی چاڵەکە راگیری کردبن جووڵەیان لە خۆیان بڕیبوو. ئەوانی دیکەیش لە نێوان رەشماڵەکاندا لە هاتووچوودا بوون، ئەوانە جەنگاوەرانی بیابان بوون، دەمامکیان هەڵبەستبوو خەنجەر و چەکی درێژیان پێ بوو و بۆ کەسیان نەئەروانی و هەنگاوی بەرز و گەورەیان هەڵدەهێنا، کۆیلە سودانیەکانیش بە جلە شرەکانیانەوە خورما و خیگەی رۆنیان لە کۆڵ نابوو. کورانی رەشماڵە گەورەکە جل و بەرگی سپی و شینیان لەبەر بوو، «شلۆ» پێست رەشەکان منداڵانی قژ سوور و پێستبەڵەکی قەراخ دەریا، سواڵکەرە پیس و پۆخڵەکان کە لە ئاوەکە نزیک نەئەبوونەوە، کۆمەڵە مرۆڤێکی بێ رەگەز و ناو نیشان بوون.

هەموو لە سەر زەویە بەردەڵان و تەپ و تۆزاویە سوورەکە بەرەو دیوارەکانی شاری پیرۆزی «سمارا» ئەرۆیشتن، رۆژان و مانگان بیابانیان تێپەڕ کردبوو، رەشماڵە قورسەکەیان دامەزراندبوو بە پاڵتۆ پەشمینەکانیان خۆیان داپێچابوو و بەتەمای داهاتنی شەو مابوون.

ئێستا شێویان ئەکردەوە، شۆربای هەرزەن، شیری دەڵەمە و نان و خورمای وشک کە تامی هەنگوێن و بیباری ئەدا، مێش و مێشوولە بە دەور قژی منداڵەکانەوە سەمایان ئەکرد و زەردەواڵە ئەیدا بەدەست و گۆنای چلکنیانەوە، پیاوەکان بە دەنگی بەرز قسەیان ئەکرد، ژنان لە تاریکی تاساوی ژێر رەشماڵەکاندا پێ ئەکەنین و جار جار بەردیان لە منداڵەکان ئەهاوێشت کە هەرایان ئەکرد. وشەکان وەها لە زاری پیاوەکان ئەپەڕینە دەرەوە، وەک بڵێی مەست بن، وشەکان گۆرانیان ئەوت، ئەیان قیراند، دەنگیان ئەدایەوە، لە پشت رەشماڵەکان، نزیک دیوارەکانی «سمارا» "با" لە بەین ئەقاقیاکان و لە نێوان دار خورما نزمەکان گفەی ئەهات.

بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانە دابێ دەنگی لەوێ زاڵ بوو، ئارەق روومەت و لاشەی ژنان و پیاوانی شین کردبووەوە، بەڵام ئەوان بیابانیان بەجێ نەهێشتبوو.

فەرامۆشیان نەکردبوو، لە قووڵایی جەستەیاندابوو، لەناو دەمارەکانیاندا، ئەم بێدەنگیە، کە بێوچان بە سەر تەپۆڵکەکاندا ئەگەڕا،نهێنیەکی راستەقینە بوو.

پیاوە چەکدارەکە بۆ ساتێ بێدەنگ بوو، ئاوڕی دایەوە بەرەو لووتکەی دۆڵەکە لەویا کە "با" هەڵی ئەکرد. برێ جار پیاوی هۆزێکی دیکە لە رەشماڵەکە نزیک ئەبووەوە سڵاوی ئەکرد بە ئاستەم لێوی لێک ئەبری، چەن وشە، چەن ناو لە زاریان دەرئەهات، بەڵام ئەو وشە و ناوانە بە زوویی نوقم ئەبوون.لەمەبا شوێنەواری جێ پێکانی پڕ ئەکردەوە.

شەو کە دائەهات، سەر لە نوێ دەسەڵاتی ئاسمانی پڕ ئەستێرە لە سەر ئاوی سەرچاوەی ئاوەکە دەستی پێ ئەکرد. لە دۆڵی «ساگیت» و «ئامارا» شەوەکان نەرمتر ئەبوون و مانگی نوێ بە ئاسمانی تاریکدا سەر ئەکەوت، سەمای شەمشەمە کوێرەکان لە دەور رەشماڵەکان دەستی پێ ئەکرد، رۆشنایی ئاگردانەکان لە ئاوی چاڵەکاندا ئەلەرایەوە، بۆنی رۆنی داخ و دووکەڵ بڵاو ئەبووەوە، دوو سێ منداڵ لە بەین رەشماڵەکان رایان ئەکرد و لاسایی دەنگی سەگیان ئەکردەوە، ئاژەڵەکان نوستبوون، پێی وشترەکان بەسرابوونەوە، مەڕوبزنەکانیش لە نێوان چینە بەردێکدا بوون، پیاوەکان

ئیتر چاوەڕوان نەبوون، کابرای بەڵەد چەکەکەی لەبەر ڕەشماڵەکە دانابوو و جگەرەی ئەکێشا ڕاستەوخۆ بۆ بەردەم خۆی ئەڕوانی.

دەنگی نزم و پێکەنینی ژنانی لای ئاگردانەکەی بە ئاستەم ئەبیست، ڕەنگە خەیاڵی شەوانێکی دیکە و ڕێگاگەلێکی دیکە بردبوویەوە، وەک بڵێی سووتانی پێستیان لە بەر هەتاودا، ئازاری تینویەتی لە قورگیاندا، سەرەتای حەزو ئاواتێکی تر بوو.

خەو بە هێوری بە سەر ئاستی «سمارا»دا ئەکشا، لە جێگایەکی دیکە، لە باشوور، لە سەر «ئامادا»ی بەردینەوە شەوانە، خەونە بوو. لە سەرمادا سڕوگێژ ئەبوون، "با"کە لە سەر لمەکان هەڵی ئەکرد و داوێنی کێوەکانی ئەڕووتاندەوە، لە بیابان نەیاندەتوانی بنوون.

ئەژیان و ئەمردن، لە کاتێکدا ماندوویەتی و تینی هەتاو چاویانی ئەسووتاندەوەو لە جمەی ئەخستن. بڕێ جار پیاوە شینەکان تووشی ڕێبوارێک ئەبوون، کە لە ناو لمەکە دانیشتبوو هەر دوو پێی ڕاکێشابوو. جەستە بێجووڵەکەی لە ناو جلە شڕەکانیدا دیاربوو، چاوە ڕەشەکانی ماقی ئاسۆ بزۆکەکەی تەپۆڵکەکان ببوو، بەم چەشنە بوو کە مەرگ بێخەبەر ئەهات.

خەو وەک ئاو بوو، بەڕاستیش کەس نەیدەتوانی دوور لە سەر چاوەی ئاوەکان بنوێ. "با" هەڵی ئەکرد و زەوی فێنک ئەکردەوە، بەڵام لێرە، مسافرەکان لە دۆڵەکەدا ئەنووستن.

کابرای بەڵەد پێش هەموو لە خەو هەڵسا، بێ جووڵە لە بەر ڕەشماڵەکە ماقی تەم و مژێک بوو کە لە درێژای دۆڵەکەوە بەرەو ئامادا سەرئەکەوت.

لەگەڵ بزاڤی تەم و مژدا، شەو نوقم ئەبوو، دەستی لە سەر سینگی، هەناسەی سوار بووبوو جووڵە لە پێڵوەکانی بڕابوو چاوەڕوانی یەکەم گزنگی ئاسۆ مایەوە.

کازیوە، خاڵێکی سپی لە ڕۆژهەڵات، لە خوار تەپۆڵکەکانەوە دەرکەوت، کاتێ هەوا ڕۆشنی کردەوە، بەرەو ""نوور"" نوشتایەوەو لە خەو هەڵیستاند. دەسی لە سەر

شانی دانا، بێسرتە لە سەر جێ پێکان کە بەرەو چاڵەکانی ئەبردن دوور کەوتنەوە، دوورتر، لە پرشنگی خۆڵەمێشی دەمەوبەیان، سەگەکان ئەوەڕان. پیاوەکە و "نوور" وەک ئەوەی یاسا بوو دەست نوێژیان گرت، ئەندام لە دوای ئەندام، هەریەک سێ جار، ئاوەکە فێنک و خاوێن بوو. ئاوی لم و شەو بوو، لە دوای دەست نوێژ بەرەو رۆژهەڵات، بۆ خوێندنی نوێژی بەیانی وەستان، ئاسمان لە ئاسۆوە بەرە بەرە روون ئەبوەوە.

لە ئوردووگاکە، ئاگردانەکان لە دەمەوبەیانی لێڵدا سووریان ئەنواند، ژنان ئاویان لە چاڵەکە هەڵدەگۆزی. کیژۆڵەکان بە قیژە قیژ لە ناو ئاوەکەدا هەڵدەبەزینەوە، لە کاتێکدا گۆزەکانیان بە سەریانەوە گرتبوو.

دەنگی ژینی ئادەمیزاد، دەنگی تەنەکە و بەرد و ئاو لە ئوردووگا و ماڵە گلێنەکان بەرز ببوەوە، سەگە زەردەکان لە دەوری یەک کۆببونەوە و هەڵدەبەزینەوە. وشترەکان و ئاژەڵەکانی دیکە سمکۆڵانیان ئەکرد و تۆز و خۆڵ بەرز ئەبوەوە. لەو کاتەدا پرشنگێکی دڵرفێن سەر «ساگیت ئەلحەمرا»ی گرت. لە ئاسمان و زەوی رووناکی ئەباری. رووناکییەکی زێڕین و مسین بێسووتان و گێژکردن لە ئاسمانە چۆڵەکەدا ئەلەرزی. کچەکان لە پەنای رەشماڵەکان قژەپرەکانیان دائەهێنا لە پشتە سەریانەوە، لە جێی گرێی سەرپۆشەکانیانەوە، ئەیان بەست. رووومەت و باڵە رەشەکانیان ئەدرەوشایەوە.

"نوور" لە سەر لمەکە هەڵتروشکابوو، ماقی رۆژ بو کە بەرەبەرە ئاسمانی سەر ئوردووگاکەی ئەگرت، کەوەکان لە ئاسماندا ئەفڕین و ئەمجا بە ئارامی لە دۆڵەکە سەرئەکەوتن.

بۆ کوێ ئەڕۆیشتن؟ رەنگە تا لووتکەی "ساگیت"، بەرەو هەورازە سەختەکانی ئەرزە سوورەکە، نێوان کێوەکانی «ئاگمار» و لە داچوونی هەتاودا ئەگەڕانەوە بەرەو دۆڵە ئاواڵەکانی خوار کێڵگەکان، لەوێدا کە ماڵەکان لە شارە مێرولە ئەچوون؟

لەوانەیە «عیونیان» ئەناسی، شاری قورودار کەبڕێکیان سەربانەکانیان تەنەکەی

سوور بوو. یان ئەیانزانی دەریای رەنگ زمرووت و برونزیەکە، دەریـای ئـازاد، لە کوێیە؟

کاتێ مسافرەکان گەیشتنە ساگیت، لە نێوان تەپ و تۆزێکی خەسدا بە دۆڵەکەدا داگەڕان. بێ ئەوەی ئاور بدەنەوە، لە بەر ئوردووگاکەوە تێپەڕین. ئەتوت کەسی لێ نیە، بەرەو سەر چاوەی ئاوەکە ملیان ئەنا، "با" لە سەرەوەی «ئامادا» هەڵیکرد. لە ناو دۆڵەکە، لە ئاستی سەر دار خورماکورتەکان لە نێوان رەگی درکەکان و بەردە وشک هەڵاتوەکاندا ئەمرکایەوە.

بەڵام لەوپەڕی "ساگیت"ەوە دونیای گاشە بەردەکان، شەقارەکان و پانتایی لم و رووناکی لە چاوی مسافرەکاندا ئەدرەوشایەوە.

ئاسمان بەرین و بێبنەتا بوو، شینێکی تۆخی ئاگرین، دوورتر لە لووتکەی ریزە تەپۆڵکەکانەوە مرۆڤەکان رێیان ئەبڕی.

بەڵام ئەمە دونیای راستەقینەیان بوو، ئەم لمە، ئەم بەردانە، ئـەم ئـاسمانە، ئـەم بێدەنگی و ئازارە، نە شارە ئاسنین و سیمانیەکـان کـە قـوڵپەی کـانی و زەنـازەنای مرۆڤەکان ئەیبیسرا، لێرەدا بارودۆخی چۆڵی بیابان بوو، لێرەدا هەر رووداوێک بواری رووداني هەبوو لە بیابانی بێسێبەردا لە ژێر دەسەڵاتی مەرگدا تێ ئەپەڕین.

پیاوە شینەکان بە سەر جێ پێ نادیارەکاندا، بەرەو «سمارا» ئـەچوون. تـا چـاو ئەیدی لووتکە شەپۆلاویەکانی دۆڵەکان بوو و پانتاییەکی نادیار.

ژن و منداڵە پێخاوسەکان جێ پێیەکی ناسکیان لە سەر لمەکە لێ بە جێ ئەماکە "با" خێرا ئەیسریەوە، دوورتر، شارە سپیەکان، بازارەکان، کاروانی وشتر و کەرەکان کە پێداویستیان لێ بارکردبوون و سەراوەکان،لە نێوان زەوی و ئاسماندا ئەشەکانەوە.

مرۆڤەکانیش وەک سەراب بوون، وەک برسیەتی و تینوویەتی و ماندوویەتی هەموو لە بیابان لە دایک بیوون.

جادەکان، بازنەگەلێ بوون کە هەردەم مسافرەکـانیان بـۆ ئـەو جـێگایە ئـەبرد کەلێیەوە رێکەوتبوون، جادەیەکی بێبڕانەوە بـوو، چـونکا لە تـەمەنی مـرۆڤەکـان

ماوەدارتر بوو.

ئەوان لە رۆژهەلاتەوە ئەهاتن، لەولای كێوەكانی «ئەعدم ریە»، لەوبەر «یەتی» و تا «بلبالا»وە ئەهاتن. برێكیان لە باشوورەوە، لە ناوچەكانی «ئاریكا»، لە چالی «عەبدولمەلیك»وە ئەهاتن، بەرەو رۆژئاوا و باكوور ئەچوون، تا رۆخی دەریا یان لە ناو كانگا گەورەكانی خوێی «تێغازا»، بە خواردەمەنی و پێداویستیەكانیانەوە، تا ناوچە بەرینە پیرۆزەكەی «ساگیت ئەلحەمرا» رۆیشتبوون، بێ ئەوە بزانن دیسان ملی كام رێگا ئەگرنەوە بەر.

هاوتەریبی ئەستێرەكان رێكەوتبوون، كاتێ ئاسمان سوور ئەبوو و تەپۆلكەكان ئەبزووتن، "با"ی لم هەلّی ئەكرد.

ژن و پیاوەكان بەم چەشنە ئەژیان، بێوچان رێیان ئەپێوا، ئەوان رۆژێ ئەمردن تۆپ و تەیارەی دوژمن لێی ئەدان، «یاو» ئەیپووكاندنەوە.

ژنەكان زۆر بە ئاسایی منداڵیان ئەبوو، لە سێبەری چادرەكە بە جیچكانەوە دائەنیشتن، دوو ژن هەردوو باڵیان ئەگرت، پشتوێنێكی گەورەیشیان لە سكی ئەچەراند.

لە یەكەمین شەوی ژیانیاندا هی ئەو پانتایە بێبرانەوە بوون. تایبەت بەو لم و دڕك و مارو مشكە، تایبەت بە "با" بوون، چونكە هەر ئەمانە خێزانی راستەقینەیان بوون.

كیژۆڵەكان كە قژە مسینەكانیان هەر درێژ ئەبوەوە، داب و نەریتی بێ برانەوەی ژیان فێر ئەبوون جگە لە پانایی ئەفسووناوی دەشتە گەچینەكەو ئاسمانێكی یەك دەس، ئاوێنەیەكی دیكەیان نەبوو. كورەكان رێگەرۆیشتن فێر ئەبوون، قسە كردن، راو و شەڕ فێر ئەبوون. فێر ئەبوون چۆن لە سەر لمەكە بمرن.

لە بەر رەشماڵەكە، كابرای بەڵەد ماوەیەكی زۆر بوو چاوی بریبوە كاروانەكە، كە بەرەو تەپۆلكەی لمەكان و سەرچاوەی ئاوەكان ئەچوون.

هەتاو دەم و چاوە بۆرەكەی قژە لوولە مسینەكەی و لووتە قەڵانگەكەی

ئەدرەوشاندەوە، "نوور" شتێکی پێوتبوو، بەڵام ئەو نەیبیستبوو، ئەمجا کاتێ ئوردووگاکە هێمن بووەوە، ئاماژەی بە "نوور" کردبوو. لەگەڵ ڕێبوارێ کە بەرەو «سمارا» ئەچوو بە یەک گەیشتن.

- تۆ کێی؟

- «بوسبا»، ئەی تۆ؟

- «ئومایا»

- لە کوێوە دێی؟

- «عەین راگ»

- من لە باشوورەوە، لە «ئیگویت»ەوە دێم.

ئەمجا بێ خواحافیزی لێک جیابوونەوە، دوورتر جێ پێ نادیارەکان لە نێوان ریخەڵان و ئەقاقیا کورتەکانەوە تێدەپەڕی. لە سەر ریخە تیژەکەوە بە دژواری ڕێیان ئەبڕی. "نوور" بە سەختی شوێن باوکی کەوتبوو. هەتاو بە هەموو هێزیەوە تیشکی ئەهاوێشت. "با"ی بیابان لە ژێر قاچ و قولیاندا تەپ و تۆزی هەڵدە بەزاندەوە. لێرەدا دۆڵەکان پان و ئاوەڵا نەبوون. جۆرە شەقارێکی رەنگ خۆڵەمێشی و سوور بوون کە لە برێ جێگادا وەک کانزا ئەدرەوشانەوە.

بەردە وردەکان، بەردە ئاگر پژێنەکان کە هەتاو بە سەریانەوە ئەبریسکایەوە، ڕێگای سێڵاوگە وشکەکانیان ئەبەست. کابرای بەڵەد، پشتەو خۆر و چەماوە، ڕێی ئەبڕی.

"نوور" سەری بە پاڵتۆ خوریەکەی داپۆشیبوو. دڕک جلەکانی شڕو دڕ کردبوو، قاچە رووتەکانی داڕوشاندبوو بەڵام گرینگ نەبوو. چاوی بڕیبوە بەردەمی، کەوتبووە دوای تارماییەکەی باوکی کە هەڵدە هات، لە پڕدا هەردووکیان وەستان، قەبرە سپیەکەی نێوان کۆگا بەردەکان دەرکەوت، لە رووناکی رۆژدا ئەدرەوشایەوە.

پیاوەکە ئەتوت لە قەبرەکە سڵاوی ئەکرد، هەروا چەماوە، بێ جووڵە مابووەوە.

ئەمجا بێ ئەوە بینایی لە سەر قەبرەکە بگوێزنەوە، بە سەر وردە بەردەکاندا کە

ئەرووخان هەڵگەڕان.

تا لە قەبرەکە نزیک ئەبوونەوە پێیان وابوو بەردی سەربانە خڕەکە بەرەو ئاسمان بەرزتر ئەبێتەوە. رووناکیەکی گەش و خاوێن قەبرەکەی روون کردبوەوە. سێبەری لێ نەبوو، هەر بەردە تیژەکانی تەپۆڵکەکە و لە خوارترەوە سێڵاوگە وشکەکەبوو. گەیشتنە بەر قەبرەکە، چوار دیواری گڵینی بە ئاهەک سواق دراوو کوڵەکەیەکی سووری گەورەی بەردین، تەنیا دەرگایەکی وەک تەنووری هەبوو کە بە بەردێکی سوور بەریان گرتبوو. گۆمەزێکی سپی نووک تیژ وەک توێکڵی هێلکە بە سەر دیوارەکانەوە چەق وەستابوو. "نوور" چاوی بڕیبوە دەرگای قەبرەکە کە پێی وابوو وەک دەرگای کۆشکێ، تا دێت گەورە ئەبێتەوە گۆمەزەکەیش لە کێوێکی زەبەلاح ئەچوو.

لە وێدا، نە "با" بوو نە گەرمای بیابان و نە تەنیایی رۆژ. هیچ جێ پێیەک نەبوو، تەنانەت جێ پێی ئاوارە و شێت و دۆڕاوەکان دیار نەبوو. ئەویا ناوەڕاستی بیابان بوو. ڕەنگە ناوەندێ بوو، کە کاتێ بۆ یەکەمین جار مرۆڤەکان هاتبوون هەموو شت لەوێوە دەستی پێکردبوو. قەبرەکە لە لێژایی تەپۆڵکە سوورەکەوە ئەدرەوشایەوە، زەویەکە رووناکی هەتاوی هەڵدەگەڕانەوە. هەتاو گۆمەزەکەی ئەسووتاند. جارجار جۆگەلەیەکی بچووکی گەردی سوور لە شەقاری دیوارەکانەوە ئەڕژایە خوارەوە. "نوور" و باوکی لای قەبرەکە تەنیا بوون، بێ دەنگیەکی قورس دۆڵی «ساگیت ئەلحەمرا»ی داگرتبوو. کاتێ بەردە گەورەکەی خزاندە ئەولاوە، لە دەرگاکەوە سێبەرێکی قورس و سارد وەک شنەیەک تێپەڕی. زیارەتکەرەکان ئاقاری قەبرەکەیان پێشێل کردبوو. نوێژیان لەوێ خوێند لە سەر تەپۆڵکەکە لای قەبری پیاوە پیرۆزەکە و دۆڵی «ساگیت ئەلحەمرا» کەتا چاو ئەیدی درێژەی هەبوو و ئاسۆیەکی بەرفراوان کە تەپۆڵکەکان و گاشەبەردەکان بەرانبەر ئاسمان لەوێوە دەرئەکەوت، بێ دەنگیەکی دڵتەزێن بوو، ئەتوت دونیا لە جووڵە کەوتوەو وەک بەردێ، بێدەنگ، تووردراوە. بەڵام جارجار "نوور" خڕەخڕی دیوارە گڵینەکان و ویزەویزی دەعبا و

ویژەی "با"ی ئەبیست. پیاوەکە لە سەر چۆک دانیشت.

ـ من هاتوم، یارمەتیم بەیت، من لە ئێسک و خوێنی تۆم ... من هاتوم.

"نوور" بێ ئەوەی لێی تێبگات، گوێی لە باوکی گرتبوو. باوکی دەنگی بەرز ئەکردەوەو یان لە ژێر لچەوە ورتەی ئەهات، سەری رائەوەشاند و ئەم وشە ساکارانەی ئەوتەوە.

ـ من هاتوم، من هاتوم،

بە مشت خۆڵی بەسەریا ئەکرد. ئەمجا هەڵسایەوە سەرپێ، لە بەر دەرگاکە چۆکی داداو تەوێڵی لە سەر بەردی دەرگاکە دانا و دۆعای ئەکرد.

تاریکی بەرە بەرە وەک تەم و مژێکی شەوانە ئەخزایە ناو قەبرەکەوە، دیوارەکان وەک دەرەوە سپی بوون، سەرمیچە کورتەکەیشی تێکەڵێک بوو لە رەنگی سپی و گڵ.

"نوور"یش بە گاگۆڵکێ رۆیشتە ناوقەبرەکە، هەستی بە بەردەرێژە سفت و ساردەکە کرد کە لەگەڵ خوێنی بزن تێکەڵ ببوو.

لە سەر زەویە پێشل کراوەکە، پیاوەکە بەدەما راکشا و هەر دوو قۆڵی بە سەر خۆڵەکەدا درێژ کردەوە، نە دۆعای ئەخوێند، نە گۆرانی، بە ئارامی هەناسەی ئەکێشا، لێوی لە سەر زەوی، گوێی لە لێدانی گەڕانی خوێنی ناو دەمارەکانی لاملی گرتبوو.

هەستی ئەکرد شتێکی سەیر لە زارو تەوێڵ و ناو لەپی دەستی و سکیەوە ئەڕواتە ناخیەوە، بێ ئەوە هەستی پێبکات، لە ناخیەوە شتێ ئەیگۆڕاند.

رەنگە بێدەنگی بیابان بوو کە لە دەریای تەپۆڵکەکانەوە، لە کێوە بەردینەکان و رووناکی مانگ یان لە پانتایی بەرینی لمە سوورەکەوە هاتبوو، لە رووناکی هەتاو کە سەمای ئەکرد و وەک پەردەیەک لە باران دائەخزایە خوارەوە. بێدەنگی سەر چاوەی ئاوەکە کە وەک چاو گەلێ ماقی ئاسمان ببوو، بێ دەنگی ئاسمانی بێ هەور و باڵندەیەک کە لە "با"دا، ئازاد ئەسووڕایەوە، هەستی ئەکرد هەموو گیانی تەزیوە، پیاوەکە لە سەر زەویەکە راکشا بوو، هەموو گیانی خاو ببوەوە. چاوی پڕ ببوو لە خەو،

بەڵام لەسکڵ و دەستەکانیەوە جۆرە وزەیەکی نوێ ماسولکەکانی سیخناخ ئەکردەوە، گۆڕانکاری تێدا بەدی ئەهێنا. هەستی بە ئازارو و حەز و تۆڵە نەئەکرد، هەمووی لە بیرچووبووەوە. ئەتوت دۆعا و نوێژ رۆحی شۆردبووەوە، ئیتر وشەکان بوونیان نەبوو، سێبەری ساردی قەبرەکە هەمووی بێ ماناکردبوو.

شاڵاوێکی سەیر بوو کە لە زەویە خوێناویەکەوە ئەلەرایەوە. لە هیچ شتێکی دیکەی سەرزەوی نەئەچوو وزەیەکی راستەوخۆ و بێ بیرو هزر کە لە قووڵایی زەویەوە هەڵدەهات و بەرەو قووڵایی ئاسمان ئەکشا، وەک بەنێکی نادیار جەستەی پیاوە راکشاوەکەی بە دونیایەکی دیکەوە ئەبەستەوە.

"نوور" هەناسەی سوارببوو، بۆ باوکی ئەروانی کە لە سێبەری قەبرەکەدا دانیشتبوو. قامکەکانی بە سەر زەویە ساردەکەدا بڵاوکردبووەوە.

بۆ ماوەیەکی زۆر، هەروەها، کابرای بەڵەد بە سەر زەویەکەدا راکشابوو و "نوور" چاوی زەق، بە جیچکانەوە دانیشتبوو.

ئەمجا ئەوانە هەمووی دوایی هات، پیاوەکە بە ئارامی هەڵسایەوە و کورەکەی بردە دەرەوە.

کورەکە لە بەرانبەر قەبرەکە دانیشت، ئەویش بەردەکەی لە بەر دەرگاکە دانایەوە.

زۆر شەکەت و ماندوو بوو، وەک بڵێی ماوەیەکی زۆر بێخواردن و خواردنەوە، رێی بڕیبێ. بەڵام لە ناخیدا هەستی بە وزەیەکی نوێ و بەختەوەریەک ئەکرد کە بینایی رووناک ئەکردەوە. وادیار بوو ئێستا ئەزانێ چیبکات، شارەزای ئەو رێگایە بوو کە ئەبوایە تێپەڕی بکات.

لاخواری پاڵتۆ خوریەکەی بە سەر دەم و چاویدا هێنا. بێ ئەوە زاری بجوڵێنێ، هەر بە جووڵاندنەوەی سەری و ورەورێکی ئاهەنگین لە گەروویەوە، سوپاسی لە پیاوە پیرۆزەکە ئەکرد. دەستە درێژەکانی تەپ و تۆزی زەویە پێشێل کراوەکەی هەڵدەبەزاندەوە. هەتاو لە پێشیانەوە، لە بازنەیەکدا بەرەبەر لە «ساگیت ئەلحەمرا»وە، دائەگەڕایە خوارەوە، لە قووڵایی دۆڵەکانەوە، سێبەری تەپۆڵکە و گاشەبەردەکان درێژ

ئەبوونەوە، کابرای بەڵەد ئاگای لە هیچ نەبوو، بێ جووڵە پاڵی دابوەوە بە دیواری قەبرەکەوە و هەستی بە داچوونی خۆر و برسیەتی و تینوویەتی نەئەکرد. لێواولێو لە وزەیەک، لە زەمانەیەک ببو کە لە یاسای ئینسانی نامۆی ئەکرد.

رەنگە ئیتر چاوەڕوانی هیچ شتێ نەبوو، ئیتر هیچی نەئەزانی، وەک بیابانی لێ هاتبوو، بێ دەنگ و بێ جووڵە و شاردراوە.

شەوکە داهات، "نوور" هەستی بە ترسێ کرد، شانی باوکی گرت، ئەویش بێ ئەوە هیچ بڵێ بۆی روانی و بزەیەک هاتە لێویەوە.

لە تەپۆڵکەکەوە بەرە و سێڵاوگە وشکەکە داگەڕانەخوار. "با"یەکی گەرم دەم و چاو و دەستی ئەسووتاندەوە، پیاوەکە لۆژە لۆژ سەری لە سەر شانی "نوور" دانابوو لە جادەکە بەرەوخوار داگەڕان.

لە خوارەوە لە قووڵایی دۆڵەکەوە، ئاوی سەر چاوەی ئاوەکە رەشی ئەنواند. مێشوولەکان سەمایان ئەکرد و ئەسووڕانەوە و بە پێڵووی چاوی منداڵەکانیانەوە ئەدا.

لەوبەرتر، لای دیوارە سوورەکانی "سمارا" شەمشەمەکوێرەکان بەسەر رەشماڵەکانەوە باڵیان ئەگرتەوەو لە ئاقاری ئاگردانەکاندا ئەسووڕانەوە. "نوور" و باوکی لە بەر یەکەمین سەرچاوەی ئاوەکەدا وەستان و بە سەرنجەوە دەس نوێژیان گرت، ئەمجا بەرەو ئەو جێگەیەی کە شەو دائەهات نوێژیان خوێند.

***

تا ئەهات خەڵکێکی زۆرتر لە باشوورەوە بەرەو "ساگیت ئەلحەمرا" ئەچوون. بڕێکیان بە سواری وشتر و بڕێ بە سواری ئەسپ، بەڵام زۆربەیان بە پێ ئەهاتن، چونکە حەیوانەکانیان لەبەر برسیەتی و نەخۆشی لە سەر جادەکە تۆپیبوون.

کورەکە هەر رۆژ لە ناو بازنگەی خاکە هەڵکندراوەکەدا، ئوردووگایەکی نوێی ئەدی، تا ئەهات رەشماڵە خوریە بۆرەکان لە دەورووبەری دیوارەکانی شار زۆرتر ئەبوونەوە، هەر شەو لەگەڵ داچوونی شەودا "نوور" سەیری مسافرەکانی ئەکرد کە لە

نێو گەردەلوولێ لە تەپ و تۆزەوە خۆیان ئەگەیاند.

هەرگیز تا ئەوڕادەیە حەشیمەتی مرۆڤی نەدیبوو، زەنا زەنا قاڵە قاڵی بێ پسانەوەی ژنان و پیاوان، قیرەی ئالۆزو نادیار و گریانی منداڵان لەگەڵ قرەقری مەڕو بزنەکان و دەنگی بەستنەوەی ئەسپەکان بە گاریەکانەوە و نەڕە نەڕی وشترەکان، تێکەڵاو ببوون.

بۆنێکی سەیر لە لم و شنەی "با"کەوە ئەهات کە "نوور" نەیدەزانی بۆنی چیە؛ بۆنێکی بەتێکرا توندونەرم، بۆنی پێستی ئادمیزاد، بۆنی هەناسەکێشان و عارەق.

زوخاڵ و چیلکە و سەنێر لە تاریک و لێڵی شەودا داگیرسابوون. دووکەڵی ئاگردانەکان لە ڕەشماڵەکان بەرز ببوەوە. "نوور" گوێی لە دەنگی لایە لایەی ژنانە وەبوو، زۆربەی ئەو کەسانەی ئەهاتن پیرو ژن و منداڵ بوون.

ڕێپێوانی زۆری بیابان شەکەت و مانووی کردبوون. جلەکانیان شڕ و دڕ ببوو بە پەڕۆی کۆن پێیان هەڵبەستبوو. هەتاو دەم و چاویانی سووتاندبوەوە، چاوەکانیان لەتە زوخاڵ ئەچوو.

منداڵەکان رووت و قووت و سەر ئەژنۆیان پڕ زام و برین بوو. سکیان لە تینویەتی و برسێتی ئاوسابوو. "نوور" لە ئوردووگاکە، لە نێوان ڕەشماڵەکان تێپەڕی. لە دیتنی هەموو ئەو خەڵکە سەری سوڕما بوو. بەڵام پەشۆکاوو دڵ نیگەرانیش بوو، چونکە ئەیزانی، کە هەموو ئەو ژن و منداڵانە بە زوویی ئەمرن، بێ ئەوە بزانێ لە بەرچی؟

خێرا خێرا تووشی ئەو ڕێبوارانە ئەبووکە بە هێمنی لە ئاستی جادەکان و نێوان چادرەکان تێئەپەڕین. زۆربەیان لە باشوورەوە ئەهاتن. وەک سوودانیەکان ڕەش پێست بوون و زاراوەیەکی نەناسراویان بوو. زۆربەیان بە پاڵتۆی خوری و پەڕۆی شین خۆیان داپێچابوو. پاپووچی چەرمی مەڕیان لە پێ بوو. چەکی درێژی لوولە برنجەیی و خەنجەریان پێ بوو. "نوور" سەیری ئەکردن کە بەرەو "سمارا" دوور ئەکەوتنەوە.

ئەوان ئەرۆیشتن سڵاو و ڕێزیان پێشکەشی «شێخ مەولا ئەحمەد بن موحەمەد ئەلفازل» بکەن کەسێکە پێیان ئەوت «مائەلعەینەین» یانێ ئاوی چاوەکان.

لە سەر سەکۆ گڵێنەکانی حەوشەکەی شێخ دانیشتن، ئەمجا بانگی شێوان، لە ڕۆژ هەڵاتی چاڵەکانەوە لە سەر لمەکە چۆکیان دا و بەرەو بیابان نوێژیان خوێند.

شەو کە داهات "نوور" گەڕایەوە بەرەو ڕەشماڵەکە، کە باوک و براگەورەکەی لێی دانیشتبوون. لە لای ڕاستی ڕەشماڵەکەوە، دایک و خوشکەکانی لەسەر جاجمەکە و لە نێوان ئازووخەکان و کۆپانی وشترەکە، قسەیان ئەکرد.

بەرەبەرە، بێ دەنگی "سمارا" و دۆڵەکەی دائەگرت. دەنگە دەنگی مرۆڤ و قرمە قرمی ئاژەڵەکان یەک لە دوای یەک ئەکوژانەوە.

مانگی چواردە بازنگەیەکی ئەفسووناوی سپی لە ئاسمانە ڕەشەکەدا بوو.

بەوەیشەوە کە گەرمای ڕۆژ لە لمەکەدا مابووەوە، شەو سارد بوو، شەمشەمەکوێرەکان لە بەر تریفەی مانگدا ئەفڕین و بە خێرایی بەرەو زەوی دائەگەڕان.

"نوور" بەلاتەمویدا ڕاکشابوو و سەری بەسەر باسکیەوە، سەیری شەمشەمەکوێرەکانی ئەکرد و چاوەڕوانی نوستن بوو، بێ ئەوە ئاگای لە خۆی بێ، بە چاوی کراوەوە خەوی لێ کەوتبوو.

کاتێ لە خەو هەستا، هەستی کرد کات تێپەڕیوە، چاوی بە بازنگەی مانگدا گەڕاند، کە خەریک بوو بەرەو ڕۆژئاوا دائەگەڕا، ئەوکاتە بوو زانی کە ماوەیەکی زۆرە نووستوە. بێدەنگی مرۆڤی وەڕەس ئەکرد، تەنیا لە دوورەوە حەپەحەپی سەگەکان ئەبیسرا.

"نوور" هەستایەوە، باوک و براکەی لە ڕەشماڵەکەدا نەبوون، تەنیا لە لای چەپی ڕەشماڵەکەوە تارمایی ژن و منداڵەکان بوو کە لە ناو بەتانیەکەدا خۆیان داپێچابوو.

"نوور" لە جادە ڕیخەڵانەکەی نێوان ئوردووگاکەوە بەرەو خاکرێژەکانی "سمارا" ڕێ کەوت.

تریفەی مانگی زێوین، لمەکەو سێبەرە شینەکانی بەردەڵان و دەوەنەکانی ڕووناک کردبووەوە. هیچ دەنگێ نەئەهات، ئەتوت هەموو نووستوون. بەڵام "نوور"

ئەیزانی پیاوەکان لە رەشماڵەکاندا نەماون. تەنیا منداڵەکان نووستبوون و ژنەکانیش بێ جووڵە بە تانیەکانیان لە خۆیان ئاڵاندبوو بۆ دەرەوەیان ئەڕوانی.

لە بەر ساردیی هەوا هەڵدەلەرزی، لمەکەی ژێرپێی سارد و رەق بوو.

کاتێ لە دیوارەکانی شار نزیک بوەوە، زەنازەنای پیاوەکانی بیست. دوورتر تارمایی بێجووڵەی ئیشکچیەکە لەبەر دەرگای شاردا هەڵتروشکابوو. «کارابین»ێکی درێژی بە ئەژنۆکانیەوە نووساندبوو. بەڵام "نوور" ئەیزانی سووچێ ئەولاتر، خاکرێژەکە داتەپیوەو ئەتوانێ بە دزی ئێشکچیەکەوە بڕواتە ناوشار.

پیاوەکان لە دەستگەلی پێنج، شەش کەسی دا، لە دەور ئاگردانەکانی حەوشەی ماڵی شێخ، لە سەر ئەرزەکە دانیشتبوون. ئاوی کوڵاتووی کتریەمسینەکان ئامادەی دەم کردنی چایی سەوز بوو.

"نوور" بە ئاسپایی خۆی خزاندە ناویان، کەس بۆی نەئەڕوانی. جەنگاوەرەکان لەبەر دەرگای ماڵەکە چاودێری خەڵکەکەیان ئەکرد. چەند سەربازی شین پۆشی بیابان، بێ جووڵە چاویان بڕیبوە پیاوە بە ساڵاچووەکە کە پاڵتۆیەکی خوری تا سەری داپۆشیبوو، دوو لاوی چەکداریش لەملاو ئەولای پیاوەکە، بە نۆرە، بە سۆزو تاسەوە، قسەیان ئەکرد.

لە بەر زەنا زەنا و قاڵە قاڵی پیاوەکان کە قسە پێشوەکانیان دووپات ئەکردەوەو لێی ئەکۆڵینەوە، "نوور" وتەکانی دوو لاوەکەی نەئەبیست.

کاتێ چاوی بە تاریکی و شۆڵەی سووری ئاگردانەکان راهات، تارمایی پیاوە پیرەکەی ناسیەوە. «مائەلعەینەین»ی گەورە، کە بەر لە هاتنیان بۆ چاڵاییەکانی "سمارا"، باوک و براکەی سڵاویان لێ کردبوو. "نوور" لە پیاوەکە لای دەستیەوە، ناوی دوو لاوەکەی پرسی.

ـ "سەعدبوو" و "لارداف"، براکانی "ئەحمەد دیبا"، کە پێی ئەڵێن، پارچە زێڕ، کە بە زوویی ئەبێ بە پادشای راستەقینەمان.

"نوور" جوان گوێی شل کردبوو بۆ ئەوەی وتەکانیان ببیسێ، چاوی بڕیبوە

روومەتە ناسکەکەی پیاوە پیرەکە کە لە مابەینی دوو لاوەکەدا بێ جووڵە دانیشتبوو، شەوقی مانگ وەک خاڵێکی سپی پاڵتۆکەی ئەدرەوشاندەوە. پیاوەکانی تریش بۆ ئەویان ئەڕوانی، ئەتوت لە راستیدا ئەو بوو قسەی ئەکرد. وادیار بوو بە تەنیا هێمایەکی ئەو هەموو شتێک ئەگۆڕدرا، ئەو تەنانەت بە سەر بیابانیشدا دەسەڵاتی بوو. "مائەلعەینەین" جووڵەی نەئەکرد، ئەتوت زەنازەنای بێوچانی پیاوەکانی حەوشەی نەئەبیست.

جار جار بۆ جێگایەکی دیکەی ئەڕوانی، پشت سەری پیاوەکان و ئەودیوی دیوارە گڵینەکان و شار، بەرەو ئاسمانی تاریکی ئاستی تەپۆڵکە بەردینەکان.

"نوور" وایدەزانی کە ئەو ئەیەوێ خەڵکەکە بگەڕێنەوە بەرەو بیابان، بەرەو ئەو شوێنەی کە لەوێوە هاتبوون و بەم بیرانە دڵی ئەگوشرا. بەڵام تێ نەئەگەیشت پیاوەکان چی ئەڵێن.

ئاسمانە بەستەڵۆکەکەی خوار "سمارا"، قووڵ نەبوو و ئەستێرەکان لە رووناکیە سپیە ئەستوورەکەی مانگدا نووقم ببوون. لە نیشانەی مەرگیان رۆیشتن ئەچوو، نهێنیەکی سامناک کە رەشماڵ و دیوارەکانی کون ئەکرد، بە تایبەت کاتێ "نوور" بۆ تارماییە لاوازەکەی شێخی ئەڕوانی، هەستی پێ ئەکرد.

ئەتوت ئەچێتە دڵی شێخەوە، ئەچێتە بێ دەنگی شێخەوە.

شێخەکانی دیکەی سەرۆکی رەشماڵە گەورەکان، جەنگاوەرە شینەکان، یەک لە دوای یەک بە دەنگێکی کپ و ماندوو ئەو وتەیان دووپات ئەکردەوە سەبارەت بە سەربازە مەسیحیەکان کە شالاویان بردبووە ناوچەکانی باشوور و لەگەڵ سەحرانشینەکان بە شەڕ هاتبوون، سەبارەت بەو شارە تۆکمانەی کە مەسیحیەکان لە بیابان درووستیان ئەکردن، سەبارەت بەو شەڕانەی کە بە زیبوون و ژمارەی مردووەکان هێندە زۆر بوون تەنانەت ناوەکانیان لە بیر چووبووەوە، ژن و منداڵەکانیش لە بیابانەوە بەرەو باشوور هەڵهاتبوون. ئێسک و پرووسکی ئاژەڵە تۆپیوەکان بە هەموو جێگایەکدا پژابوو.

سەبارەت بە کاروان گەلێ دوابوون کە ڕێیان پێ گرتبوون، کاتێ سەربازە مەسیحیەکان کۆیلەکانیان ئازاد کردبوو و بەرەو باشوور رەوانەیان کردبوون، کاتێ مەسیحیەکان، جەنگاوەرەکانیان بە پارە ئەخلەتاند کە لە کاروانە کە کۆیلەیان بۆ بدزن.

ڕێگر و چەتەکانیش هەر لەو کاتەدا کە مەسیحیەکان هاتبوون، کەل و پەل و ئاژەڵەکانیان لێ داگیر کردبوون. سەبارەت بە دەستەی سەربازە مەسیحیەکان دوابوون کە رەش پێستەکانی باشوور هێنا بوونیان و ئەوەندە زۆر بوون کە لەم سەرتا ئەو سەرتەپۆڵکەکان، تا ئاسۆیان داپۆشیبوو.

ئەمجا ئەسپ سوارەکان ئوردووگایان گەمارۆ دابوو و هەموو ئەوانەی کە بەر هەڵستیان ببوونەوە کوشتبوونیان و منداڵەکانیان بردبوە مەدرەسەی مەسیحیەکان لە قەڵاکانی رۆخی دەریا. کاتێ ئەمانەیان ئەوت، ئەوانی دیکە ئەیان وت: راستە، بە خودا هەموو ئەمانە هەروایە و زەنازەناکەیان ئەماسی و وەک "با" ئەشەکایەوە.

"نوور" قاڵە قاڵەکەی ئەبیست، کە تا ئەهات زۆرتر ئەبوەوە، ئەمجا وەک "با"ی بیابانی سەرتەپۆڵکەکان ئەنیشتەوە سەر زەوی و خەم بەربینی "نوور"ی ئەگرت، ئاخر هەستی بە مەترسیەکی سامناک بۆ مرۆڤ و شار ئەکرد، مەترسیەک کە لێی تێ نەئەگەیشت.

بێ ئەوە پێڵوەکانی لێک بنێ چاوی بریبوە تارمایە سپیەکەی پیاوە پیرەکە، کە لە سەرما و ماندوویەتی شەودا بێ جووڵە مابوەوە.

"نوور" وای ئەزانی تەنیا «مائەلعەینەین» ئەتوانێ توورەیی کۆمەڵ هێمن کاتەوە، تەنیا بە راوەشاندنی دەستی، یان بە پێچەوانەوە ئەیتوانی خەڵکە کە زۆرتر هەڵ بنێ، هەر تەنیا بەچەن وشە، کە دەم بە دەم ئەگەڕاو شەپۆلێکی خەشم و توورەیی هەڵی ئەکرد.

ئەوانی تریش، وەک "نوور"، سەیری شێخیان ئەکرد. شەکەتی و تاو چاویانی سوور هەڵگەڕاندبوو زام و تاڵی ژیان رۆحیانی سەخت و رەق کردبوو.

"با"ی بیابان لێویانی رەق هەڵگەڕاندبوو. هەموو بێ جووڵە چاوەڕوان بوون،

ئەبڵەق، چاوەڕوانی ئیشارەیەک.

بەڵام وادیار بوو «مائەلعەینەین» لە سەر دونیا نەبوو. چاوەکانی بە سەر پیاوەکاندا تێپەڕیبوو، ماقی ئەو بەر دیوارە گڵینەکانی "سمارا" ببوو.

ڕەنگە لە قووڵایی ئاسمانی شەوانەدا، لە نێوان تەم و مژە سەیرەکەی دەووروبەری بازنگەی مانگدا بە دوای وەڵامی دڵ نیگەرانی و دڵەڕاوکێی پیاوەکانەوە بوو.

"نوور" سەیری ئاسمانی کرد، لەو شوێنەدا کە زۆربەی کات ئەستێرەی «پتیت شارێوت» دەرئەکەوت، بەڵام هیچ نەئەبینرا، تەنیا ئەستێرەی سەهۆڵ بەستووی «ژوپیتر» لە ئاسمانە سەهۆڵ بەسراوەکە بوو. تەم و مژ تریفەی مانگی داپۆشیبوو.

"نوور" ئەستێرەکانی زۆر خۆش ئەویست، کاتێ منال بوو باوکی ناوی ئەستێرەکانی فێر کردبوو، بەڵام ئەو شەوە ئەتوت توانای ناسینەوەی ئاسمان و ئەستێرەکانی نەبوو.

هەموو شتێک گەورە و سارد بوو، لە تریفەی زێوینی مانگدا نوقم ببوون.

ئاگرەکان وەک چاڵ گەلێکی سوور بە شێوەیەکی سەیر، روخساری پیاوەکانیان ئەگەشاندەوە، وەک بڵێی ترس هەموو شتێکی گۆڕاندبوو، روخسار و دەستیانی لاواز کردبوو دەور چاویانی ڕەش هەڵگەڕاندبوو، شەو پرشنگی بینایانی ئەکردە سەهۆڵ و قووڵایی ئاسمانی کون ئەکرد.

کاتێ وتەی پیاوەکان دوایی پێ هات، یەک لە دوای یەک، لای شێخ وەستان، "نوور" پێشتر ناوی هەموویانی لە باوکی بیستبوو، سەرکەردەی هۆزی جەنگاوەرەکان، پیاوە ئەفسانەییەکان، «ماکیلەکان»، «ئاریب»، «ئۆلاد یەحیا»، «ئۆلاد دێلیم»، «ئاروسیوین»، «ئشێرگیگن»، «روگیبات»ەکان بە دەمامکی ڕەشەوە و ئەوانەی بە زاراوەی «شلۆ» ئەدوان، «ئیداو بلال»ەکان، «ئیدائو مێریبات»، «ئایت با عەمران»، کەسانێکە ناویانی نەئەزانی و لە سنوورەکانی «موریتان»ەوە لە «تومبوکتۆ»وە هاتبوون و نەیان ویستبوو لای ئاگردانەکان دابنیشن، خۆیان لە پاڵتۆکانیان داپێچابوو و لە بەر

گۆڕەپانەکە وێستابوون، لە سیمایاندا ترس و سوکایەتی تێکڕا ئەبینرا، ورتەیان لێوە نەئەهات.

"نوور" یەک لە دوای یەک سەیری ئەکردن، بۆشاییەکی بە روخساریانەوە هەست پێ ئەکرد، وەک بڵێی بە زوویی ئەمرن، «مائەلعەینەین» کەسی نەئەدی، تەنیا جارێ، کاتێ بینایی بە سەر روومەتی "نوور"دا گێڕا بوو کاتێ "نوور" چاوەڕوانی ئیشارەدیەکی شێخ بۆ کۆمەڵەکە بوو، وەک ئەوە بوو کە دیتنی "نوور"ی لە نێوان ئەو هەموو پیاوانەدا پێ‌سەیر بووبێ.

تەنیا بۆ ماوەی ساتێ بوو، وەک لێکدانەوەیەکی خێرا، بەڵام دڵی توندتر و بە هێزتر کەوتبوە لێدان.

شێخ جووڵەی نەئەکرد، ئەتوت بیر لە شتێکی‌تر ئەکاتەوە، بەڵام دوو کوڕەکەی دانەویبوونەوەو قسەیان لەگەڵ ئەکرد.

پاشان تەزبێحە ئابنووسەکەی لە عاباکەی دەرهێنا، بە هێمنی لە ناو خۆڵەکە بە جیچکانەوە دانیشت سەری داخست، ئەمجا دەستی کرد بە دۆعاکردن، ئەو دۆعایانەی کە خۆی نووسیبوونی، کوڕەکانیش لەم‌لاوئەولایەوە دانیشتبوون، هەموو بە بیستنی دۆعاکەی بێدەنگ ببوون، بێدەنگیەکی رەق و بەستەڵۆک، کە لەگەڵ تریفەی زێوینی مانگدا وڵاتی داگرتبوو.

لە دوورەوە، زەنازەنای گومی پیاوەکان کە لە بیابانەوە، لە "با" و بەردە وشکەکانی دەشتەکە و لەوەڕینی پچڕپچڕی سەگە وەحشیەکانەوە ئەهات هەوای سیخناخ کردبوو.

بێماڵ‌ئاوایی کردن، بێ ئەوە ورتەیان لێوە بێت یەک لە دوای یەک هەڵسانەوە و لە سەر جادە خۆڵاویەکەوە بەریز رێکەوتن، نیازیان بە وتنی هیچ شتێ نەبوو.

کاتێ باوکی "نوور" دەستی لە سەر شانی دانا، هەڵسایەوە، بەر لەوە رێکەوێ، ئاوڕی دایەوە بۆ دیتنی تارماییە ناسکە سەیرەکەی پیاوە پیرەکە، لە ژێر تریفەی مانگدا، خێرا خێرا دوعاکەی ئەوتەوە، وەک ئەوە بەسەر ئەسپەوەبێ خۆی

ئەجوولاندەوە.

رۆژانی دوایی دڵە خورپێ و نیگەرانی تا ئەهات لە ئۆردووگای سمارا زۆرتر ئەبوو، رووداوێکی گوم و شاریاوە کە هەموویان هەستیان پێ ئەکرد، وەک ژانی دڵ بوو، وەک هەڕەشەیەک. رۆژان هەتاو بە هەموو هێزیەوە ئەسووتا و پرشنگەکانی لە سووچی وردە بەردەکانی سێلاوگە وشکە کەلێکتەدایەوە.

کۆڵەکە بەردینەکانی «ئامادا» ئەلەرزین، سەراوەکانی لاژووری دۆڵی «ساگیت» لە چاو ون نەئەبوون. هەر ماوەیەکی رۆژ دەستەیەکی تری سەحرانشینەکان پاش رێپێوانێکی زۆر لە باشوورەوە ئەگەیشتن، تینویەتی و ماندوویەتی لە پێی خستبوون. تارماییەکانیان لە ئاسۆوە لەگەڵ سەراوەکان تێکەڵ ئەبوون. قاچیان بە قایشی پێستی بزن داپێچابوو، کۆڵی سووکیان پێ بوو، بڕێ جار لە دوای وشترە برسیەکان و ئەسپە شەلەکان و مەڕ و بزنەکانەوە بە ئەسپایی رێیان ئەبڕی.

خێرا رەشماڵەکانیان لە قەراخ ئۆردووگاکە دائەمەزراند. کەس لای لێ نەئەکردنەوەو لێی نەئەپرسین لە کوێوە هاتوون. زام و برینی شەڕ لەگەڵ سەربازە مەسیحیەکان یان تاڵانکەرەکانیان پێوە دیار بوو. زۆربەیان «تاو» و نەخۆشینی سک هێزی لێ بڕیبوون.

بڕێ جار پاشماوەی هێزێکی بەزیو ئەهاتنەوە، بێ فەرماندە، بێ ژن، پیاوی پێست رەشی تۆخ بە جلە شڕەکانیەوە رووت و قووت بوون.

لە بەردەرگای «سمارا» تینوویەتیان لە کانیەکان ئەشکاند، ئەمجا لە سێبەری دیوارەکانی شاردا لە سەرزەوی بە چاوی کراوەوە ئەنووستن.

لە شەوی کۆبوونەوەی هۆزەکان بە دواوە ئیتر "نوور" «مائەلعەینەین» و کورەکانی نەدیبوو. بەڵام هەستی بەوە ئەکرد غەڵبە غەڵبێک کە کاتی دوعا خوێندنی شێخ دەستی پێ کردبوو، هێشتا دوایی نەهاتبوو.

هەراکە لە ناو قسەکانیاندا بوو. باوکی و دایکی و براگەورەکەی هیچیان نەئەدرکاند. سەریان هەڵئەگەراندەوە. نیشانیان ئەداکە نایانەوێ پرسیاریان لێ بکرێ.

بەڵام نیگەرانی و دڵەخورپێ تا دهات زۆرتر ئەبوەوە، لە هەراوهوریای ئوردووگاکە، پرمە پرمی ئاژەڵە وەرەزبوەکان، لە زرمەزرمی هەنگاوی مسافرە تازەکان کە لە باشوورەوە ئەهاتن، لە مشتومڕی پیاوەکان لەگەڵ یەکتر و لەگەڵ منداڵەکاندا. دڵەخورپێ و نیگەرانی لە بۆنە توندەکانەوەیش ئەهات، لە ئارەق، لە پێشاوو برسیەتی کە هەمووی لەزەویەوە یان لە سووچ و قوژبنی شاریاوەی ئوردووگاکەوە ئەهات.

بۆنەکە لە کەمی خواردەمەنیەکاندا بوو، چەن دەنک خورمای بیبار دراو، شیری دەڵەمەو جۆی کوڵاو کە کاتێ هێشتا هەتاو لە پشت دۆڵەکانەوە بوو، لە یەکەمین سەعاتەکانی رۆژدا بە پەلە ئەیانخوارد.

نیگەرانی و دڵە خورپێ لە ئاوی پیسی چاڵەکانیشدا بوو کە هاتووچۆی مرۆڤەکان و ئاژەڵەکان لێڵیان کردبوون کە تەنانەت چایی سەوزیش لێڵیەکەی لانەئەبرد.

ماوەیەکی زۆر بوو نە قەندیان بوو نە هەنگوێن. خورماکانیش وەک بەرد رەق بوون. گۆشتەکەیش رەق و بۆگەن ببوو، ماندوویەتی وشترەکانیشی تۆپاندبوو.

نیگەرانی لە زارە وشک هەڵاتوەکانیان، قامکە خوێناویەکانیان، لە قورساییەکدا کە بە سەر شان و سەریانەوە هەستیان پێ‌ئەکرد، تا ئەهات زۆرتر ئەبووەوە.

نیگەرانی لە گەرمای رۆژانە و لە سەرمای شەوانەدا بوو کە منداڵەکانی لە نێوان بەتانیەکانەوە ئەلەرزاند. هەموو ئەو رۆژانەی کە "نوور" لە بەر ئوردووگاکە ئێئەپەری، شین و شەپۆری ژنانی ئەبیست کە بۆ کەسێکە شەوی پێش مردبوو، ئەگریان.

هەموو رۆژێ تا ئەهات لە نا ئومێدی و تووڕەیی نزیک ئەبوونەوەو دڵی "نوور" زۆرتر ئەگوشرا.

بیری لە نیگای شێخ ئەکردەوە کە لە سەر تەپۆڵکە نادیارەکانی شەو ئەشەکایەوە، ئەمجا بۆ ساتێ بەسەر ئەما ئەنیشتەوە و ناخی رووناک ئەکردەوە.

هەموویان لە جێگاگەلی زۆر دوورەوە بەرەو "سمارا" هاتبوون، ئەتوت ئەبوایە دوایین قۆناغی سەفەریان هەر ئێرە بێت، ئەتوت چی‌تر ئەوانی بە ئامانجی خۆیان

نەئەگەیاند.

هاتبوون چونکە زەویەکەی ژێر پێیان هیچی تێدا نەبوو بۆیان، ئەتوت لە دوای ئەمانەوە ئەرووخاو لەبەین ئەچوو و ئیتر نەیانئەتوانی بگەڕێنەوە.

ئێستا لەوێ بوون، سەدان کەس، هەزاران کەس، لە سەر زەویەک کە قبوڵی نە ئەکردن، زەویەکی بێ ئاو بێ دار و بێ خۆراک.

بینایان سوچی بازنەی ئاسۆیان ئەپشکنی، کێوە لەت لەتەکانی باشوور بەرەو بیابانی ڕۆژهەڵات بەرەو سێڵاوگە وشکەکان، بەرەو بەرزایی فەلاتەکان.

نیگاکانیان لە ئاسمانی بەریندا ون ئەبوو، ئاسمانێکی بێ هەور و هەتاوێکی ئاگرین کە ئینسانی کوێر ئەکرد. ئەمجا ترس جێی نیگەرانی ئەگرت و تووڕەیی جێگای ترس، "نوور" هەستی ئەکرد شەپۆلێکی سەیر لە سەر ئوردووگاکە تێئەپەڕی. بۆنێ کە لەوانە بوو لە ڕەشماڵەکان بەرزترەوە بێت، لە سەر شاری "سمارا" ئەسووڕایەوە.

هەروەها وەک مەستییەک بوو، بێهۆشی نەبوون و برسیەتی کە ڕواڵەت و ڕەنگی زەوی ئەگۆڕی، شینایی ئاسمانی ئەگۆڕی و لە چەمە گەورە خاوێنەکان، لە سەر شەپۆلە ئاگرینەکانی خوێ لە دایک ئەبوو. "نوور" لە سێبەری دیوارە گڵینەکە دانیشت، کاتی داچوونی هەتاو بۆ ئەوشوێنەی ئەڕوانی کە ئەو شەوە «مائەلعەینەین» بۆ دۆعا خوێندن هەڵتروشکابوو.

برێ جار وەک ئەو، کەسانێکی تر ئەهاتن، بێ جووڵە ماقی پەنجەرە تەنگەکانی دیوارە سوورەکە ئەبوون، ورتەیان لێوە نەئەهات، هەر سەیریان ئەکرد. پاشان ئەڕۆیشتنەوە بۆ ئوردووگاکە.

پاش ئەو ڕۆژانەی تووڕەیی و ترسە لە زەوی و ئاسماندا، دوای هەموو شەوە سەهۆڵاویەکان کە هەر نەختێ ئەنووستن، لە پڕ دائەچڵەکان، بە چاوی تاودارو جەستەی ئاوەڵاو شەلاڵی ئارەقەوە، دوای هەموو ئەو ماوە کە هێدی هێدی پیرەکان و منداڵەکان ئەمردن، لە پڕ بێئەوە بزانن چۆن، زانیبوویان کاتی ڕۆشتنە.

"نوور" ئەوەی بیستبوو، پێش ئەوەی تەنانەت دایکی قسەی لێ بکات، پێش ئەوەی براکەی بە بزەوە پێی بڵێ،... ئەتوت گۆڕانکاری بە سەر هەموو شتدا هاتبوو.

«سبەی یان دووسبەی ئەڕۆین، جوان گوێ گرە، بەرەو باشوور ئەڕۆین، شێخ "مائەلعەینەین" وتویە، ئەڕۆین بۆ جێگایەکی زۆر دوور.»

ئەبێ ئەم هەواڵە لە هەواوە هاتبێ یان لە تەپ و تۆزەوە، یان بە سەیر کردنی زەویە پێشل کراوەکەی گۆڕەپانەکەی "سمارا" بیستبێتی.

خێرا وەک ئاهەنگێ لوولی خواردبوو و هەموو ئوردووگاکەی داگرتبوو. زەنازەنای پیاوەکان، قیژەی منداڵەکان تەقەتەقی مسینەکان، نەڕەی وشترەکان و قرمەقرمی ئەسپەکان، لە دەنگی باران ئەچوو کاتێ لە دۆڵەکە ئەرژایە خوار و ئاوی سووری سێڵاوگەکەی لەگەڵ خۆی ئەسووراندەوە.

ژن و پیاوەکان لە درێژایی ڕێگاکاندا هەڵئەهاتن، ئەسپەکان سمیان لە زەوی ئەکوتا، وشترە بەسراوە وەڕەز بووەکان گوریسەکانیان ئەجوی.

لە ژێر شاڵاوی تینی هەتاودا، ژنەکان لە بەر ڕەشماڵەکان وەستابوون، قسەیان ئەکرد، ئەیان قیژاند، کەس نەیدەزانی هەواڵەکە چۆن یەکەم جار هاتبوو. هەموو ئەم ڕستەیان دووپات ئەکردەوە کە سەرخۆشی کردبوون:

"ئەڕۆین، بەرەو باکوور ئەڕۆین." چاوەکانی باوکی "نوور" بە جۆرە شادمانیەکی تاودارەو، ئەدرەوشایەوە.

"ئێمە بەزوویی ئەڕۆین، شێخ فەرموویەتی، بەزوویی ئەڕۆین."

ـ بۆ کوێ؟ "نوور" پرسیاری کردبوو.

ـ بەرەو باکوور، ئەوبەر کێوەکانی «درا»، بەرەو «سوس»، بەرەو «تیزنیت». ئاو و خاک بۆ هەموومان هەیە، مەولای هیبا کوڕی "مائەلعەینەین" و «ئەحمەدویشم» وتویانە.

پیاوەکان لە بوارە تەنگەکان بەرەو شاری "سمارا" ملیان نابوو، "نوور"یش لە نێوان تەپ و تۆزەکەیانەوە، ڕێی ئەبڕی. تەپ و تۆزێکی ڕەنگ سوور لە هەنگاوی

مرۆڤ و سم کرانی ئاژەڵەکان بەرزببوەوەو بە سەر ئوردووگاکەوە گەردەلوولێک ئەسووڕایەوە، یەکەمین تەقەی تفەنگەکان، بۆنی توندی بارووت دەسەڵاتی ترسەکەی سەر ئوردووگاکەی تێک شکاند.

"نوور" بێ ئەوە بۆ دەوروبەری خۆی بڕوانێ، ملی نابوو. پیاوەکان شانیان تێ ئەکوتی، ئەکەوتە پاڵ رەشماڵەکان، تەپ و تۆز گەرووی وشک کردبوەوە و چاوەکانی ئەسووتاندەوە. تینی هەتاو تیژ بوو. تیشکە سپیەکانی ئەهاوێشتە ناو تەپ و تۆزە خەسەکەوە. "نوور" هەر دوو دەستی بەرز کردبوەوە و ماوەیەک هەروا، ڕێی ئەبڕی. ئەمجا هەڵکەوت. خۆی خزاندە پەنای رەشماڵێ، لە تاریکی و لێڵی ئەوشوێنەدا سەر لە نوێ هەستەکانی دۆزیەوە.

پیرێژنێ پاڵی بە رەشماڵەکەوە دابوو. پاڵتۆکەی لە خۆیەوە پێچابوو. کاتێ "نوور"ی بینی، پەلاماریدا، وایئەزانی دزی گرتوە، بە دەنگی بەرز جوێنی ئەداو بەردی بۆ ئەهاوێشت.

پاشان لێی نزیک بوەوەو گۆنا تۆزاویەکەی بینی کە هێڵێ فرمێسکی لە سەر کێشرابوو.

ژنەکە بە ئارامی وتی: تۆ کێی؟ نەخۆشی؟

"نوور" سەری لەقاند، ئەویش بە چوار دەست و پێ لێی نزیک بوەوە.

- پێم وایە نەخۆشی، من چاییت ئەدەمێ.

چاییەکی لە پیاڵەیکی مسینەدا تێکرد.

- بیخۆ.

چاییە گەرمە تاڵەکە زیندووی کردەوە.

بە گومانەوە وتی: ئێمە بەزوویی لێرە ئەڕۆین.

پیرێژنەکە بۆی ڕوانی و شانی هەڵتەکاند: ئەرێ، وائەڵێن.

- ڕۆژێکی پیرۆزو گەورەیە.

بەڵام لەوە نەئەچوو لای پیرێژنەکە گرینگ بێت. لەوانەیە بە هۆی پیریەوە

بووبێت.

ـ تۆ لەوانەیە تا ئەوێ بڕبکەیت، ئەو شوێنەی کە ئەڵێن، تا باکوور، بەڵام من تا ئەوکاتە مردووم.

دیسان وتیەوە: بەرلەوە بگەمە باکوور، من ئەمرم.

"نوور" خێرا لە رەشماڵەکە دەرپەڕیە دەرەوە، گوزەرگاکانی ئۆردووگاکە دیسان چۆڵ ببوو، ئەتوت هەموو گیان لەبەرێ ئەوێی بەجێ هێشتبوو.

بەڵام لە سێبەری رەشماڵەکاندا رواڵەتی مروڤەکانی ئەبینی، پیرەمێردەکان و نەخۆشەکان لە تەنیشت کوورەی ئاگرەکەوە، هێشتا هەر لەرزیان کردبوو.

ژنە لاوەکان منداڵەکانیان لە باوەش گرتبوو و بە چاوە خاڵی و خەمینەکەیانەوە ماقی بەردەم خۆیان ببوون، "نوور" دیسان هەستی کرد دڵی ئەگوشرێ، ئەوەش لەبەر سێبەری مەرگی ژێر رەشماڵەکان بوو. کاتێ لە دیواری شار نزیک ئەبوەوە، تا ئەهات ئاهەنگی ریتمیکی مۆسیقا زۆرتر ئەبوەوە.

ژن و پیاو، لە بەر دەرگای "سمارا" ئاپوورەیان دابوو. لە دەور مۆسیقا ژەنەکە لە نیوە بازنەیەکدا وەستابوون. "نوور" گوێی لە دەنگی فلوتەکان بوو کە بەرزونزم ئەبوو و دیسان بەرز ئەبوەوەو بێدەنگ ئەبوو. بەڵام تەپڵ و روبابەکان بێ وچان هەر یەک رستەیان دووپات ئەکردەوە. دەنگێکی پیاوانە لەسەرخۆ گۆرانیەکی "ئاندلس"ی ئەوتەوە. بەڵام "نوور" لێی تێنەئەگەیشت، لە سەر شارە سوورەکە ئاسمان ساماڵ بوو شینێکی تۆخ و سەخت.

جەژنی مسافرەکان دەستی پێ کردبوو، تا رۆژی دوایی، تاکازیوەی بەیان درێژەی بوو و رەنگە تا دوو رۆژ، "با" ئاڵاکانی ئەشەکاندەوە. ئەسپ سوارەکان لە دەور خاکرێژەکە غاریان ئەکرد و بە چەکە درێژەکانیان گوللەیان دەرئەکرد. ژنە لاوەکان ئەیان قیژاند. دەنگیان وەک زەنگۆڵە ئەلەرزی، مۆسیقا و سەماکە "نوور"ی سەرمەست کردبوو و سێبەری مەرگی ناو رەشماڵەکانی لە بیر چوو بوەوە.

ئەتوت بەرەو بەرزایی گاشەبەردەکانی باکوور ملی ناوە، لەوێدا کە فەلاتەکان

دەستیان پێ ئەکرد، سێلاوگەی ئاوە ڕۆشنەکان دەستیان پێ ئەکرد، ئاوێ کە هەرگیز کەس بۆی نەڕوانیبوو، بەڵام دڵە خورپێ و نیگەرانیەکەی کاتی هاتنی سەحرانشینەکان، لە ناخیدا سەقامگیر ببوو.

ئەیویست "مائەلعەینەین" چاوکات، بەدەور خەڵکەکەدا کە بۆ دیتنی گۆرانی بێژەکە ئاپورەیان دابوو دەوری دایەوە.

بەڵام شێخ لە ناو خەڵکەکەدا نەبوو، بەرەو دەرگای شار ملی نا، خۆی بە کونەکەدا کرد کە شەوی کۆبوونەوەکە ڕۆیشتبوە ناو شار، زەویە پێشێل کراوەکە کەسی لێ نەبوو، دیوارەکانی ماڵی شێخ لە بەر ڕووناکی هەتاودا ئەدرەوشایەوە. بە سەر دیوارەکانی دەرگای ماڵی شێخەوە، بە خۆڵی سوور وێنەی سەیر سەیر کێشرابوو، "نوور" ماوەیەکی زۆر سەیری وێنەکان و دیوارە رزیوەکانی کرد. پاشان بەرەو ناوەندی گۆڕەپانەکە ملی نا، زەویەکەی ژێر پێی وەک بەردەڕێژی بیابان داخ و پتەو بوو. ئاهەنگی فلووتەکە لێرەدا نەئەبیسرا. ئەتوت ئەم کونجی بیابانە، ئەوپەڕی دونیایە. کاتێ کورە لاوەکە بەرەو ناوەندی گۆڕەپانەکە ئەڕۆیشت هەستی ئەکرد تا ئەهات هەموو شتێک گەورە ئەبێتەوە. بە باشی هەستی بە لێدانی خوێنی دەمارەکانی ملی و لاجانگی ئەکرد. هەستی ئەکرد ئاهەنگی دڵی لە خاکەکەی ژێر پێیدا ئەزرنگێتەوە.

"نوور" کاتێ گەیشتە نزیک دیوارە گڵینە سوورەکە، لەوێدا کە پیرەمێردەکە کاتی نوێژ خوێندن دانەویبووەوە، خۆی خستە سەر زەویەکە، ڕوومەتی پێوە نووساند، بێ ئەوە بیر لە چیتر بکاتەوە. بێ جووڵە مایەوە. دەستی لە زەویەکە گیرداببوو، وەک بڵێی بە دیوارێکی زۆر بەرزی ڕۆخی دەریا شۆڕ بوبێتەوە، بۆنی توندی تۆز و خۆڵ دەم و لووتی پڕ کردبوەوە. دوای ماوەیەکی زۆر بەزاتەوە سەری بەرز کردەوە پاڵتۆ سپیەکەی شێخی دی.

ـ لەویا چی ئەکەی؟ "مائەلعەینەین" لێی پرسی.

دەنگی دوور و ئارام بوو، ئەتوت لە جێگایەکی دیکەوە دێت: "نوور" دوو دڵ بوو، لە سەر ئەژنۆ دانیشت بەڵام هێشتا نەیوێرابوو بۆ شێخ بڕوانێ.

پیرەمێردەکە دیسان وتیەوە: لەوێدا چی ئەکەی؟

ـ من ... من نوێژم ئەخوێند، درێژەی پێدا... من ئەم ویست نوێژ بخوێنم.

شێخ پێکەنی: وە هێشتا نەت توانیوە نوێژ بخوێنی؟

"نوور" ساکارانە وتی: نە

دەستی پیرەمێردەکەی گرت: تکات لێ ئەکەم دوعای خێرم بۆ بکە.

"مائەلعەینەین" دەستی بە سەر و ملیا هێنا، ئەمجا کوڕە لاوەکەی بەرز کردەوەو لە ئامێزی گرت.

ـ ناوت چیە؟ هەر ئەوە نیت لە شەوی کۆبوونەوەکەدا چاوم پێت کەوت؟

"نوور" ناوی خۆی و باوکی و دایکـی وت. لە کـاتی وتـنی دواهـەمین نـاودا روخساری "مائەلعەینەین"گەشایەوە.

ـ دایکت لە رەگەزی "سەید موحەممەد"ە، کە پێی ئەڵێن، «ئەلئەزرەق»، پیاوی شین؟

"نوور" وتی: خاڵی دایە گەورەی منە.

ـ خۆ بە راستی تۆ کوڕی سەیدێکی پێغەمبەری.

ئەمجا بینایـە شادەکەی بە سەر روخساری "نوور"دا گـێرساندەوە، ئـەتوت بـە دوای بیرەوەریەکدا ئەگەڕێ. پاشان سەبارەت بە پیاوی شین بـۆی دوا بـوو. کـە لە ناوچەکانی باشوور لەوبەر گاشەبەردەکانی "ئامادا" دیتبوی، کاتێ کە ئەم شتانەی ئێستا، تەنانەت شاری "سمارا"یش هێشتا نەبوون، پیاوی شین لە کۆڵێتێکدا کە لە بەرد و لقی درەخت، لە قەراخ بیابان دروست کرابوو ئەژیا. بێ ئەوەی لە کـەس یـان تـەنانەت لە حەیوانە وەحشیەکان بترسێ. دەمەوبەیانی هەموو رۆژێ، لەبەر دەرگـای کـۆڵێتەکـە خورما و جامێ شیری دەڵەمەو گۆزەیەک ئـاوی تـازەی ئـەدیەوە، ئـەوە خـوابـوو چاودێری ئەکرد و ئەیژیاند.

کاتێ "مائەلعەینەین" هاتبوو بۆلای پەروەردەی بکات، پیاوی شین نەیویستبوو ببینێ. ماوەی مانگێ لەبەر دەرگاکەدا مابووەوە. بێ ئەوە زاری لەگەڵ بجووڵێنێ، یان

تەنانەت بۆی بڕوانێ، تەنیا نیوەی ئاوو خورما و شیرەکەی بۆ دائەنا.

"مائەلعەینەین" هەرگیز شتی هێندە خۆشی نەخواردبوو. ئاوی گۆزەکەیش، خێرا تینوویەتی ئەشکاند، ئاوەکە دەستی کەسی لێ نەکەوتبوو، لە خاوێنترین شەونمەکان گیرابوو.

دوای مانگێ شێخ خەمبار و نائومێد، بڕیاری دابوو بگەڕێتەوە ناو ماڵ و منداڵەکەی. وای زانیبوو کە پیاوی شین ئەوی شیاوی خزمەتکردن بە خوا نەزانیوە، بە نائومێدی لە سەر جادەکە بەرەو گوندەکە ملی نابوو، بەڵام کەسێ چاوەڕوان بوو "ئەلئەزرەق"،... لێی پرسیبوو کە بۆ لەوێ ئەڕوا.

پاشان داوای لێ کردبوو بمێنێتەوە، بەم شێوەیە بوو کە لەوێ مابووەوە.

"مائەلعەینەین" بۆ ماوەی چەن مانگ لەوێ مابووەوە، ڕۆژێ پیاوی شین پێی وتبوو کە ئیتر بۆ فێرکردنی ئەو چی تری پێ نەماوە، "مائەلعەینەین" وتبووی: بەڵام تۆ هێشتا وانەکەت نەوتوە.

"ئەلئەزرەق" دەوری خورماکەو جامی شیر و گۆزەی ئاوەکەی پێ نیشان دابوو.

ـ مەگەر من لەو ڕۆژەوە کە هاتوی لەگەڵ تۆ بەشم نەکردوون؟

پاشان ئاسۆی پێ نیشان دابوو، بەرەو باشوور، بەرەو ساگیت ئەلحەمرا، پێی وتبوو شارێکی پیرۆز بکاتەوە بۆ کوڕەکانی. تەنانەت لە پێشەوە وتبوی یەکێکیان ئەبێ بە پادشا.

"مائەلعەینەین" و خێزانەکەی گوندەکەیان بە جێ هێشتبوو و شاری "سمارا"یان درووست کردبوو.

کاتێ چیرۆکەکەی دوایی هات، جارێکی دیکە "نوور"ی لە ئامێز گرت و گەڕایەوە سێبەری ماڵەکەی. ڕۆژی دوایی کاتی داچوونی هەتاو "مائەلعەینەین" بۆ خوێندنی نوێژ لە ماڵ ڕۆیشتە دەر، ژن و پیاوانی ئوردووگا نەنوستبوون هێشتا گۆرانی و سەما دوایی نەهاتبوو، ئەمە گەورەترین سەفەریان بۆ ئەو بەری بیابان بوو. مەستی ڕێپێوانی درێژی جادە شینەکە ناخیانی گرتبوو. لە هەناسەی ئاگرین سیخناخی ئەکردن

و سەراوەکانی بەردەمیانی ئەبریسکانەوە.

کەسیان زام و ئێش، تینویەتی و هاڵاوی داخی هەتاوی سەربەردەکان و لمە بێپایانەکە و ئاسۆ، کە هەر رۆژ پاشەکشێی ئەکرد، لە بیرنەچووبوەوە.

کەس ئەو برسیەتیەی کە دایرزاندبوو، لە بیری نەچووبوەوە. نەک ئەو برسیەتیەی لە نە خواردنەوە بەدی ئەهات بەڵکو برسیەتی بە ئومێد و ئازادی و هەموو ئەو شتانەی کە نەیان بوو.

برسیەتیەک، کە لە نێوان گەردەلوولی تەپ و تۆز لە نێوان مێگەلی ئاژەڵەکانەوە تێدەپەری.

برسیەتیەک، کە تا ئەهات لە پانتایی تەپۆڵکەکانەوە تا ئەو شوێنەی کە لەگەڵ دەیان و سەدان تەپۆڵکەی دیکەی وەک یەک بەرەوخوار رائەشکان، زۆرتر ئەبوەوە.

"مائەلعەینەین" دیسان لە سەر زەویە پێشێل کراوەکەی گۆرەپانی بەر ماڵان، کە بە ئاهەک سواق درابوون، هەڵترووشکابوو. بەڵام ئەم جارە سەرکردەی هۆزەکان لەملاوئەلایدا دانیشتبوون، "نوور" و باوکی لە نزیکیەوە دانیشتبوون، بەڵام دایکی و براگەورەکەی لە ناو خەڵکەکە بوون ژن و پیاوەکان لە نیوە بازنەیەکدا ئاپوورەیان دابوو. برێکیان هەڵترووشکا بوون و لەبەر سەرمای شەو، پاڵتۆکانیان لە خۆیان پێچابوو. برێکیان وەستابوون یان لە درێژای دیوارەکە هاتوو چۆیان ئەکرد. مۆسیقاژەنەکان ئاهەنگێکی خەمینیان لێ ئەدا، قامکەکانیان لە تەلی گیتارەکان ئەگێراند و لە تەپڵە بچووکەکانیان ئەکوتا.

"با" پەیتا پەیتا هەڵی ئەکرد و دەنکە لمەکانی بۆ دەم و چاویان ئەهاوێشت، لە ئاستی سەر گۆرەپانەکە ئاسمان شینێکی تۆخی مەیلەوە رەش بوو.

بێدەنگیەکی بێپایان "سمارا"ی داگرتبوو، بێدەنگی تەپۆڵکەی بەردە سوورەکان، بێدەنگی شینایی قووڵایی شەو، ئەتوت بێجگە لەمان هەرگیز مرۆڤێکی دیکە نەبوە.

زیندانیەکانی لێواری بورکانە بچووکە گڵینەکان، چنگیان لە زەویە سوورەکەی ئاقاری چاڵە ئاوە خۆڵەمێشیەکە گیردابوو. ئەولاتر، بەرد و "با" و کۆگا لمە شەپۆلاویەکان و خۆی بوو، ئەمجا دەریا یان بیابان. کاتێ زیکرەکەی دەست پێ کرد! لە بێدەنگی گۆڕەپانەکە ئەزرینگایەوە، جەستەی ئەشکاندەوە بەڵام سەر چاوەی بێدەنگی شارەکە و سەر هەموو دۆڵی ساگیت ئەلحەمرا، لە بۆشایی "با"ی بیاباندا بوو دەنگی پیاوە پیرەکە روون و دڵنیا، وەک دەنگی گیانلەبەرێکی زیندوو بوو "نوور" بەدەم لەرزەوە گوێی راگرتبوو.

ژن و پیاوەکان لە گۆڕەپانەکە جووڵەیان لە خۆیان بڕیبوو. ئەتوت بینابیان بە دەروونیانەوە گرساوەتەوە. لە رۆژئاوا، لە سەر گاشەبەردە شەقار شەقارەکانی "ئامادا" هەتاو خاڵێکی سووری گەورە بوو، سێبەرەکان بەسەر زەویدا کشابوون، ئەمجا وەک ئاو کە هەڵئەچێ، تێکەڵاوی یەک ئەبوون.

«ستایش بۆ خوایە، خوای زیندوو، خوای نەمر، ستایش بۆ خوایە کە نە باوکی هەیە نە منداڵ نە پشتیوان، تەنیا ستایش بۆ خوایە کە رێنوێنیمان ئەکات، ناردراوەکانی، حەق و راستیان هێناوە.»

لە دوای هەر دۆعایەک دەنگی "مائەلعەینەین" ئەلەرزی و هەناسەی سوار ئەبوو. وەک شۆڵەیەکی ناسک لەگەڵ هەر بڕگەیەکی درێژ و جیا لەیەک لەبێ دەنگیدا ئەدرەوشایەوە.

«ستایش بۆ خوایەک کە تەنیا ئەو دڵاوایە، خاوەنی هەموو شتێکە، زانا و بینایە، تێ ئەگات و فەرمان ئەدات، ستایش بۆ ئەو کە چاکە و خراپە هی ئەوە، چونکە وتەو پەیمانی ئەو تەنیا دادڵدەیە.

تەنیا ئیرادە ئەوە، بەرانبەر خراپەکاری مرۆڤەکان، بەرانبەر بە مەرگ، نەخۆشی و بەڵاو چەرمەسەری ئەوانەی کە بە دروستبوونی دونیا هاتنەکایەوە.»

شەو بە هێمنی ئەخزایە زەوی و چاڵایی لمەکان، بێخ دیوارە گڵینەکان، بەردەم پیاوەکان کە بێجووڵە دانیشتبوون، ئەخزایە ژێر رەشماڵەکان، نێوان کونەکان کە

سەگەکان تیایدا نووستبوون، ئەخزایە قووڵایی ئاوە رەنگ پیرۆزەیەکەی چاڵەکانەوە.

«ئەمە ناوی ئەوکە سەیەکە لایەنگرە، بەرەو من دێت و ورەو توانایم پێ ئەبەخشێ، چونکە ناوەکەی گەلێ گەورەیە، ناوی ناهێڵێ لە دوژمنانم بترسم، کاتێ بەرەو شەڕ ئەڕۆم، لە ناخمەوە هاواری بۆ ئەبەم، چونکە ناوەکەی بە سەر زەوی و ئاسماندا دەسەڵاتی هەیە.»

لە ئاسمان، لەوێوە کە پرشنگی هەتاو بەرەو رۆژهەڵات دائەگەرا، سەرمای قووڵایی زەوی دەرئەهات لە نێوان لمە رەقەکاندا هەڵئەبەزیوە، بە قاچیانەوە ئەنووسا.

«سپاس بۆ خوای مەزن، هێز و هانا هەر ئەوە، خوای بەرز و مەزن، ئەوکەسەی نە لە ئاسماندایە نە لە زەوی، کەسێکە لە بینایی مندایە، لە زانیاری و زانستی مندایە، کەسێکە من ئەناسێ، بەڵام من ناتوانم بیناسمەوە، خوای مەزن، خوای بەرز و مەزن.»

دەنگی، دوورتر، لە بیابانەوە ئەزرینگایەوە، ئەتوت دەنگی تا سنوورەکانی خەم و پەرۆشی تاکۆگا لمەکان و شەقارەکان، تا ئەو پەڕ فەلاتە رووتەکان و دۆڵە وشکهەڵاتوەکان و پێشتر، تا زەویە نوێکان ،ئەوبەرکێوەکانیدرا، کێڵگەکانی گەنم و هەرزەن، ئەو جێگەیەکە دەستیان بەوەی خواردەمەنی بوایە ئەگەیشت، ئەڕوا.

«خوای توانا و بێ کەمایەسی، چونکە بێجگە لەو خوایەکی دی نیە، زانای بە دەسەڵاتە، پایە بەرزی دلۆڤانە، نزیک وخاوەن زانستە ،میهرەبانی بێ پەرە، تەنیا مێهرەبانە. بە هێزگەلی زەوی و ئاسمان فەرمان ئەدات، دلۆڤان و بێ عەیبە»

دەنگە کزو دوورەکە یەک یەک ئەنووسا بە ژن وپیاوەکانەو،ئەتوت لە دەروونیانەوە، ئەتوت لە گەروویانەوە دەردێت، لەگەڵ بیرەکانیاندا تێکەل ئەبوو، لەگەڵ وتەکانیان و موسیقایەکی پێک ئەهێنا.

«شکۆمەندی و سوپاسی بێ پەڕ، شکۆمەندی و سپاس بۆکە سێکە نامرێ، کەسێکە بوونی بەرزو باڵایە کەسێکە ئەبیسێ و ئەزانێ ....»

سینگی سیخناخ ببوولە هەوا، ئەمجار، بە هێزەوە، هەناسەی ئەکێشا، بێ ئەوە

لێوی بجووڵێنێتەوە، چاوی قوونجاندبوو لاژوروی جەستەی وەک لاسکی درەخت ئەشەکایەوە.

«خوای ئێمە، خاوەن و خوای ئێمە ، چاکترینە، رووناکی رووناکیە، ئەستێرەی ئاسمانە، خوای ئێمە، تەنیا ئەو حەقە، وتە هەر ئەوە، شکۆمەندی و سپاس بۆ کەسێکە ناوی دوژمنانمان سەرنگون ئەکا»

ژن وپیاوەکان بێ ئەوە تێبگەن، زیکرەکانیان دووپات ئەکردەوە، هەر جارکە دەنگی پیاوە پیرەکە بەدەم لەرزەوە ئەبڕایەوە دەنگی ئەوان بەرز ئەبوەوە.

«گەورەو بەهێزە، بێ‌عەیبە، خاوەن و خوای ئێمەیە، کەسێکە بە گۆشت و پێستمانەوە ناوی نوسراوە، بەرزو پیرۆزو دیارە، کەسێکە وتوویەتی: من گەنجێکی شاریاوە بووم، ویستم بناسرێم، ئینسانم خەلق کرد...»

«ئەو گەورەیە، هاوتاو بەر هەڵستی نیە، کەسێکە بوونی بەرلە هەمو وجودێکە، کەسێکە وجودی خەلق کرد. کەسێکە ئەمێنێتەوە، دەسەڵاتدارە، کەسێکە ئەبینێ، کەسێکە ئەبیسێ وئەزانێ، کەسێکە بێ‌عەیبە، کەسێکە هاوتای نیە...»

«گەورەیە و لە دڵی رێبوان و یارانیدا جوانە، لە دڵی کەسانێکدا کە ئەیناسن پاک و خاوێنە. لە رۆحی کەسێکە پیێ ئەگا، بێ‌هاوتایە، باشترین خاوەنە...»

«هاوتا و هەڵوێستی نیە، کەسێکە لە ترۆپکی بەرزترین کێوەکاندایە، لە لمی بیابان و لە نێوان دەریا و ئاسمان و ئاو دایە کەسێکە کە ڕێگایە، شەوی ئەستێرەکانە...»

مۆسیقا ژەنەکان بێ ئەوە ئاگایان بێت، مۆسیقایان لێ ئەدا و لەگەڵ دەنگی "مائەلعەینەین" تیکەڵ ببو.

بە سرتەسرت لەگەڵ نوتە تیژوکپەکانی "ماندۆلین"، لەگەڵ زرمەزرمی تەپڵە بچووکەکان، پاشان لە پڕ وەک قیژەی باڵندەکان مێلۆدی یەک دەستی نەیەکان، تێک ئەشکان.

دەنگی پیرەپیاوەکە و مۆسیقاکە ئێستا وەڵامی یەکیان ئەدایەوە، ئەتوت هەر یەک شت ئەڵێنەوە، لەگەڵ دەنگی مرۆڤەکان و زرمەی کپی هەنگاوەکان لە سەر

زەویە رەقەکە.

«هاوتاو هەڵوێستی نیە، چونکا بە هێزە، کەسێکە خەلق نەکراوە، رووناکیەک کە بە شەمعەکان ژیانی داوە ئاگرێ کە ئاگرەکانی دیکەی داگرساندوە، یەکەمین هەتاو، یەکەمین ئەستێرەی شەو، کەسێکە بەر لە هەموو بووە، ژین و مەرگی هەموو لە دەستیدایە، دروست ئەکات و تێک ئەشیوێنی...»

کۆمەڵ سەمایان ئەکرد و قیژە و زیرەیان بەرز ببوەوە.

"هووا، هوو"، بەراوەشاندنی سەر و بەرز کردنەوەی لەپی دەستیان بەرەو ئاسمانی رەش.

«کەسێکە راستی و حەقی بۆمان ناردوە، سەرۆک موحەممەدی پیرۆز کرد، هێزو وتاری پێ بەخشی، ناردراوی خوا بۆ سەر زەوی.»

«هووا، هوو»

سپاس بۆ خوایە، شکۆمەندی هی خوای مەزنە، کاملە، خوای راز و رەمزە.»

«هووا، هوو»

سپاس بۆ خوا، چونکە ئێمەی خەڵق کردوە، ئێمە بێدەسەڵات و دەست کورتین، نەزان و کوێر و کەرین، ئێمە ناتەواوین...»

«هووا، هوو»

«ئەی کەسێکە ئەزانی، حەق و راستیمان پێ ببەخشە، ئەی دلۆڤان، بە تاقەت، بەخشەندە، تۆ کە بێنیازیت!»

«هووا،هوو»

«سپاس بۆ خودا کە پادشایە، پیرۆزە، بە هێزە، سەرکەوتوە، شکۆدارە، کەسێکە بەر لە هەموو بووە، بەرزە، بەرینە، تەنیایە، بە سەر هەموو دوژمناندا سەرکەوتووە، زانا و بینایە، بیسەرە، بەرز و زانایە، ئاگادار و شایەتە، داهێنەرە، تەنیایە، بێکەرانە، بینەرە، قەشەنگە، بەخشەندەیە، بە هێزە، تەواوە، بەرزە، بەرینە...»

دەنگی "مائەلعەینەین" ئێستا ئەیقیراند، لەپڕ وەک ئاوازی کوللەیەک لەشەودا،

راوێسا، ئاهەنگی تەپڵ و دەنگەکانیش، لەپڕ پچڕا، مۆسیقای گیتار و فلووتەکە وەستا، دیسان بێدەنگیە سامناك و ماوەدارەکە لاجانگی ئەکوتان و دڵیان تەپەی ئەهات. چاوەکان پڕلە فرمێسك بوون، "نوور" پیاوە پیرەکەی ئەبینی کە چەمابووەوە و بە دوودەستی روخساری داپۆشیبوو، لە ناخیدا وەك شەپۆلێکی خێرا، سیخناخ لە نیگەرانیەکی بێبڕانەوەی نەناسراو، پاشان "لارداف" سێیەمین کوڕی "مائەلعەینەین" دەستی پێکرد. دەنگە پتەوەکەی لە گۆڕەپانەکە تەقایەوە، بەڵام بە روونی دەنگی "مائەلعەینەین" نەبوو، زایەڵەیەکی تووڕەی هەبوو، لە ناکاو مۆسیقا ژەنەکان دەستیان پێکردەوە.

(یا ئەڵڵا، خوای ئێمە، ئیمان و راستیمان وەرگرە، هەڤاڵەکانی مەولای «بوئازا»، «بیکایبا»، هەڤاڵەکانی «گودفیا».)

هەمهەمەی کۆمەڵ ئێستا ببوو بە قیرەو هاوار:

«شکۆ بۆ شێخمان "مائەلعەینەین"، سپاس بۆ نێردراوی خوا»

«شکۆ بۆ "مائەلعەینەین"، سپاس بۆ هەڤاڵەکانی "گودفیا"»

«ئۆ خوایە، گوێگرە لە بیرەوەری کوڕەکەی، شیخ ئەحمەد، کەسێك پێی ئەڵێن "ئەششەمس" "هەتاو" گوێگرە لە بیرەوەری کوڕەکەی "ئەحمەد دیبا"، کەسێکە پێی ئەڵێن "پارچە زێڕ" مەولای هیبا، شای راستەقینەمان!»

«شکۆ بۆ هەموویان، شکۆ بۆ مەولای هیبا، پادشامان!»

ئێستا خەڵکەکە مەست ببوون و دەنگی گڕی پیاوە لاوەکە تووڕەیی خەڵکەکەی هەڵدەناو ماندوویەتی ئەڕەواندەوە.

«یائەڵڵا، خوای ئێمە، لە هەڤاڵەکانت رازیبە، مرۆڤەکانی شکۆ و گەورەیی، خوایە رازیبەلێیان، مرۆڤەکانی ئەوین و راستی، خوایە لێیان رازی بە، ژنان و پیاوانی وەفاداری و پاکی، خوایە لێیان رازیبە، گەورەکان، جەنگاوەرەکان، نەجیبزادەکان، کە خوا لێیان رازی بێت، پیرۆزەکان، تەبەرك کراوەکان، خزمەتکارەکانی ئیمان، خوا لێیان رازی بێت.

«ئاوارەکان، بێچارەکان، کە خوایان لێیان رازی بێت، کە خوا تەبەرکمان بکات!»

زەنازەنای کۆمەڵ ماسیبوو، دیواری ماڵەکان ئەلەرایەوە، لەکاتێکدا دەنگەکان ناوەکانیان بە قیرە ئەوتەوە، بە سەر بیرەوەریانەوە بۆ هەمیشە هەڵیان ئەکەند، لەسەر زەویە ساردەکە و لە ئاسمانی سیخناخ لە ئەستێرەدا.

«دۆعاو تەبەرکی نێردراوی خوا بۆ ئێمە، هەروەها هی "الیاس"، خوایە شەفاعەتی "اویس قرنی" شەفاعەتی "عبدالقادر گیلانی"، پیرۆزی "بەغدا"، نێردراوی خوا، یائەڵڵا..»

ناوەکان لە بێدەنگی شەودا ئەتەقانەوە، بەرزتر لە مۆسیقاکە کە زەنازەنای ئەهات و ئەبزوا.

«هەموو خەڵکی سەرزەوی و دەریا، یائەڵڵا، خەڵکی باکوور و باشوور، یائەڵڵا، خەڵکی رۆژهەڵات و رۆژئاوا، یائەڵڵا، خەڵکی زەوی و ئاسمان، یائەڵڵا...»

بیرەوەریەکان گەڵی جوان بون، ئەویاد و بیرەوەریانەی کە لە دوورەوە لە بیابانەوە ئەهات و دڵی هەمویانی، ژن و پیاو یەک‌بەیەک ئەگرتەوە، وەک خەوێکی کۆن کە سەرلە نوێ دەستی پێ ئەکردەوە.

«خوایە، دۆعا و شەفاعەتی پیاو چاکەکانمان پێببخشە، "ابو یازا"، "یالانور"، "ابو مادیان"، "معروف"، "الجنید"، "الحلاج"، "الشبلی"، پیاو چاکە پیرۆزەکانی شاری بەغداد...»

تریفەی مانگ بە ئارامی لەسەر تەپۆڵکە بەردینەکانەوە دەرئەکەوت، "نوور" بەدەم شەکاندنەوەی جەستەیەوە بۆی ئەروانی، چاوەکانی ماقی قووڵایی ئاسمانە رەشەکە ببو، لە ناوەندی گۆرەپانەکەدا، "مائەلعەینەین" هێشتا سەری لە ناو جەستەیدا چەماندبووەوە، گەلێک سپی بوو، وەک رواڵەتێکی خەیاڵی، تەنیا قامکە ناسکەکانی ئەبزواندو بە تەزبێحە ئابنووسەکەی، تەزبێحاتی ئەکرد.

«خوایە، دۆعاو شەفاعەتی گەورەکانمان پێببەخشە، "الحلوی"، کەسێکە بۆ منالان سەمای ئەکرد، "ابن حواری"، "تسائوری"، "یوسف بن عبید"، "بصری"، "ابو

یازرد"، "محمد الصغیر السهیلی"، کە قورئانی فێر ئەکرد. "عبدالسلام"، "غزالی"، "ابوشهیب"، "ابو مهدی"، "مالک"، "ابو محمد عبدالعزیز الطوبی "، پیرۆزی شاری مەراکیش، یاهوو.»

ناوەکان مەستی هێنەر بوون، وەک بڵێی چاوی بورجی گەردوونن، کە لە نیگا ونبوەکانیانەوە هێز و وزە بۆ گۆرەپانە سەهۆڵ بەسراوەکە ئەبەن، ئەو شوێنەی کە پیاوەکان کۆببونەوە.

«یائەڵڵا یائەڵڵا، شەفاعەت و دۆعای خێری هەموو گەورە و چاکەکانمان پێبەخشە، هەڤاڵەکان، داهاتووەکان لەشکرە سەرکەوتوەکەت "ابو ابراهیم تونسی"، "سیدی عباس سبتی"، "سیدی احمد الهارستی"، "سیدی جاکیر"، "ابو ذاکر یحیی نوعانی"، "سیدی محمد بن عیسی "، "سیدی احمد الرفاعی"، "محمد بن سلیمان الجازولی"، هەڵبژاردەی خوا لە شاری مەراکش، یائەڵڵا!»

ناوەکان لە سەر لێوی هەموو ئەهات و ئەچوون، ناوی پیاوەکان، ناوی ئەستێرەکان، ناوی دەنکە لمەکان لەبای بیاباندا، ناوی رۆژ و شەوە بێبڕانەوەکان، کە نەمر بوون.

«ئەڵڵا، ئەڵڵا، دۆعا و شەفاعەتی هەموو پیاو چاکانی زەویمان پێببەخشە، ئەوانەی نهێنیەکان ئەزانن ئەوانەی ژیان و بەخششیان ناسیوە، پیاو چاکانی راستەقینەی سەرزەوی، دەریا و ئاسمان، "سیدی عبدالرحمان"، کە پێی ئەڵێن "صحابی"، هەواڵی پێغەمبەر، "سیدی عبدالقادر"، "سیدی مبارک"، "سیدی بولخیر، "کەسێکە شیری لە بزنەنێر ئەدۆشی، "لالامنصورا"، "لالافاطیما"، "سیدی احمد الحاروسی"، کە گۆزەی شکاوی دروست ئەکردەوە، "سیدی محمد"، کە پێی ئەڵێن "ئەلئەرزەق" پیاوی شین، کە ڕێگای فێری شێخی گەورە "مائەلعەینەین "کرد، "سیدی محمد الشیخ الکامل"، «تەواو»، کەسێکە گەورەی هەموو زەوی و دەریا و ئاسمانە...»

بێ دەنگی دیسان دێتەوە، پڕ لە مەستی و تیشک. مۆسیقای فلووتەکان، دیسان شاڵاویان ئەهێنایەوە و ئەخزان و ئەمجا کوژانەوە، پیاوەکان هەستانەوەو بەرەو

دەرگاکانی شار ڕێکەوتن. تەنیا "مائەلعەینەین" نەبزوابوو، دانەوابووەوە، بۆ جێگایەکی نادیاری ئەروانی کە تریفەی زێوینی مانگ ڕۆشنی کردبوەوە. کاتێ سەما دەستی پێ کرد، "نوور" هەستایەوەو تێکەڵی خەڵکەکە بوو، پیاوەکان پێیان بەسەر زەویە ڕەقەکەدا ئەکوتی. بێ ئەوە بۆ بەرۆ یان دواوە بڕۆن، تەنگییەک لەکەمانەیەکدا کە گۆرەپانەکەی ئەبەستەوە.

ناوی خوا بە هێزەوە بڵاو ئەبوەوە، ئەتوت هەموویان لەیەک ساتدا ئازار ئەکێشن، زەوی وەک تەپڵێک هەر هاوارێکی نیشان ئەکرد. «هوها، هو...»

ژنەکان بە هەموو هێزەوە ئەیانقیژاند، مۆسیقایەک بوو کە ئەچووە ناو زەویە ساردەکە، کە تا قووڵایی ئاسمانی ڕەش ئەچوو، لەگەڵ خەرمانەی مانگدا تێکەڵ ئەبوو، ئێستا ئیتر کات نەبوو، ئیتر بەدبەختی نەبوو، ژن و پیاو نووکی پێیان یان ئەژنۆیان ئەکوتا بەسەر زەویدا، بەدووپات کردنەوەی هاوارە نەبەزەکە:

«هوها، هو، هایی!... حەی ...»

سەریان ئەچەرخاند بۆ ڕاست، بۆ چەپ، بۆ ڕاست، بۆ چەپو مۆسیقاکە لە ناخیاندا بوو لەگەروویانەوە دەرئەپەڕی و تا دوور، تا ئاسۆ ئەچوو، هەناسەگڕ و برگە برگە کە وەک فڕین ئەیانی برد. تا ئاستی سەر بیابانە بەرینەکە بەرزی ئەکردنەوە، لە درێژای شەودا، بەرەو خاڵە بێڕەنگەکانی کازیوە بۆ ئەوبەر کێوەکان، سەروڵاتی "سوس"، "تیزنیت"، بەرەو دەشتی "فێ".

«هووا، هوو، ... ئەڵڵا!...»

دەنگی گڕی پیاوەکان، کە تەپڵی کپی زەوی و چریکەی فلووتەکان مەستی کردبوون، لە حاڵێکدا ژنە هەڵتروشکاوەکان لاژوروی جەستەیان ئەشەکاندەوەو بە لەپی دەستیان لەملوێنکە زێوین و برۆنزیەکانیان ئەدا.

جارجار دەنگیان وەک فلوتەکان ئەلەرزی، لە دوایین نیهایەتی هەستی ئینسانیدا، ئەمجا لەپڕ ئەوەستان. پیاوەکان دەنگە مەوزوونەکەیان لە سەر ئەگرتەوە و دەنگی سامناکی هەناسەکانیان لە گۆڕەپانەکەدا دەنگی ئەدایەوە.

«هووا، هووا!... هەی، حەی!.. هووا، هەی‌ی، هوواهەی!»

چاویان نیوە بەسراو، سەریان بۆدواوە هەڵگەراندبوەوە. دەنگێ بوو کە بەرەو هێزە ئاساییەکان ئەچوو. دەنگێ کە راستەقینەی ئەدراند. دەنگێ کە لە هەمان کاتدا هاتووچوونی مشارێکی زەبەلاحی بەسەر کۆتەی درەختێکەوە هێمن ئەکردەوە. هەڵاتنی هەر هەناسەیەکی قووڵ و بەژان برینی ئاسمانی گەورەتر ئەکردەوە.

برینێ کە مرۆڤەکانی بە فەزاوە پێوەند ئەدا، خوێن و لەنفی تێکەڵاو ئەکردن. هەر گۆرانی بێژێ ناوی خوای هاوار ئەکرد، تا ئەیتوانی توونـد و توونـدتر، سەریان وەک مانگایەک کە ئەنەرێنێ بەرزکردبوەوە. دەمارەکانی ملیان وەک تەناف کێشرابوون. رووناکی ئاگردانەکان و تیشکی سپی مانگ جەستە لەرزۆکەکانی رۆشن ئەکردنەوە. ئەتوت برووسکەکان بێوچان لە نێوان تەپ و تۆزەوە دەرئەپەرینە دەرەوە. تادهات توونـدتر هەناسەیان ئەکێشا، وتە بێسەداکانیان دەرئەپەراندە دەرەوە، لێویان نەئەبزوا، گەروویان بەسرابوو، لەگۆرەپانەکە، لە بۆشایی شەوی بیاباندا، جگە لە دەنگی کوورەی ئاسنگەریەک کە هەناسەی ئەکێشا دەنگێکی تر نەبوو.

«هوو، ! هە!، هە!، هە!،»

ئێستا ئیتر وتە نەبوو، وەک بڵێی بای هەڵکردووی هەناسەی توندی پیاوەکان ناوەندی زەوی و ئاسمانی بەیەکەوە بەستبوەوە. ئەتوت بە توند کردنەوەی ریتمی هەناسەکان، شەو و رۆژەکان، مانگەکان و وەرزەکان پووچەڵ ئەبوونەوەو تەنانەت مەودا بێئومێدەکانیش، کۆتایی هەموو سەفەرەکان، کۆتایی هەموو کاتەکانی نزیک ئەکردەوە، ئازارەکە گەلێ بەرفراوان بوو، مەستی هەناسەکە ئەندامەکانی ئەلەرزاندەوە، گەرووی کراوەتر ئەکردەوە.

لە ناوەندی نیوەبازنەی پیاوەکاندا، ژنەکان سەمایان ئەکرد، جەستەیان بێجووڵە، باڵیان نەختێ بڵاوکردبوەو وبە ئاستەم ئەلەرزین. ریتمی کپی پاژنەکانیان تەشەنەی ئەکردە سەر زەوی و نەرەیەکی بێوچانی پێک ئەهێنا وەک تێپەڕینی لەشکرێ. نزیک مۆسیقا ژنەکان، جەنگاوەرانی باشوور، دەمامکی رەشیان هەڵبەستبوو.

لەگۆڕەپانەکە هەڵدەبەزینەوە بەبەرزکردنەوەی ئەژنۆیان، وەک باڵندەگەلی گەورە کاتێ ئەیانەوێ بفڕن. پاشان، کەم‌کەم، شەو، دامرکانەوە. یەک لەدوای یەک، ژن و پیاو لەسەرزەوی هەڵترووشکان باڵیان ڕاست بۆ بەردەمیان درێژکردبووەوە، لەپێ دەستیان بەرەو ئاسمان و تەنیا هەناسەکپەکانیان بێ‌وچان بڵاو ئەبووەوە، هەر هەمان برگەیان ئەهاوێشتە ناو بێ‌دەنگی:

«هە! هە! هووا.... هە! هە!»

دەنگی پچڕانی هەناسەکان گەلێ گەورە و بە هێز بوو، ئەتوت هەموو لە پێشەوە گەلێ لە "سمارا" دوور کەوتبوونەوە لە نێوان ئاسمانەوە، لە "با"دا، تێکەڵ لەگەڵ تریفەی مانگ و تەپ و تۆزی بیاباندا. بێ‌دەنگی و تەنیایی نەئەلوا. دەنگی هەناسەکان تەواوی شەوی سیخناخ کردبوو، هەموو ئاسمانی داپۆشیبوو.

لە ناوەندی گۆڕەپانەکە، لە ناو تەپ و تۆزەکەدا،"مائەلعەینەین" بۆ کەسی نەئەڕوانی. دەستی دەنکە تەسبیحەکانی ئەگوشی و لە هەر جار هەناسەکێشانی خەڵکەکە دەنکێکی دائەخست. ئەو ناوەندی هەناسەکە بوو، کەسێک کە ڕێگای بیابانی پێ نیشان دابوون، کەسێکە ریتمەکانی فێر کردبوون. ئێستا ئیتر بە تەمای هیچ شتێ نەبوو. سەرنجی کەسی نەئەدا، ئەویش هەناسەی ئەکێشا، وەک هەناسەی نوێژ، ئەتوت ئەو و ئەوانی دیکە، هەر گەرووپەکیان بوو، هەر سینگێکیان هەبوو و هەناسەیان جادەکەی بەرەو باکوور بەرەو زەویە نوێکانی کردبووەوە. پیاوە پیرەکە ئیتر هەستی بە پیری و ماندوویەتی و نیگەرانی نەئەکرد، هەناسەکە، کە لە هەموو زارەکانەوە دەرهاتبوو، لەودارەوا ببوون، هەناسەیەکی تێکرا نەرم و توند کە وجوودیانی زۆر ئەکردەوە. خەڵکەکە ئیتر بۆ "مائەلعەین"یان نەئەڕوانی، چاویان بەستبوو، باڵیان کردبووەوە، ڕوخساریان بەرەو شەو وەرچەرخاندبوو، لە هەوادا هەڵواسرابوون، بەرەو ڕێگای باکوور ئەخزان.

کاتێ لە ڕۆژ هەڵات لە سەر تەپۆڵکەکان، هەتاو دەرکەوت، ژن و پیاوەکان بەرەو ڕەشماڵەکان ملیان نا. سەرەڕای هەموو ئەو ڕۆژ و شەوانەی مەستی، کەس

هەستی بە ماندوویەتی نەئەکرد. ئەسپەکانیان زین کردبوو و رەشماڵەکانیان پێچابوەوە و وشترەکانیان بار کردبوو. کاتێ "نوور" و براکەی، لەسەر جادە خۆڵاویەکە بەرەو باکوور رێ کەوتن، هێشتا هەتاو بەرەو تاقی ئاسمان سەر نەکەوتبوو.

کۆڵی جل و ئازوخە بە سەرشانیەوە بوو، لەبەر دەمیانا، لەسەر جادەکە، پیاوەکان و منداڵەکانی تریش رێیان ئەبڕی. هەورێک لە تەپ و تۆزی خۆڵەمێشی و سوور، بەرەو ئاسمانی شین رێ کەوتبوو.

لە جێگایەکدا، لە دەروازەی "سمارا"، مائەلعەینەین، کە جەنگاوەرە شینەکانی و کوڕەکانی دەوریان دابوو، بۆ درێژای کاروانەکەی ئەڕوانی کە لە دەشتە بیابانیەکەدا کشرابوو. پاشان پاڵتۆ سپیەکەی هەڵبەست و لاقی گیراندە مل وشترەکەی و بە ئارامی، بێ ئەوە ئاوڕ بداتەوە، لە "سمارا" دوور کەوتەوەو بەرەو سەر ئەنجامەکەی ملی نا.

# بەختەوەری

هەتاو هەڵدەکشێ، سێبەری سەر لمە ڕەنگ خۆڵەمێشیەکە و تەپ و تۆزی سەر جادەکە تابێ هەر درێژ ئەبنەوە و گردۆڵکەکان لە بەرانبەر دەریادا قوت وەستاون، "با" گژ و گیاکە ئەشەکێنێتەوە، لە ئاسمانی شینی سارددا، نە باڵندە هەیە، نە هەور، تەنیا هەتاو ئەدرەوشێتەوە.

بەڵام گزنگی دەمەوبەیان ئەڵێی هێشتا دانەمەزراوە، هەر جمەی دێت. لە درێژای جادەکە، لە پەنای ریزە گردۆڵکە ڕەنگ خۆڵەمێشیەکان "لالا"ش بە ئەسپایی ئەڕواتە پێش.

جارجار ئەوەستێ و بینایی بە سەر زەویەکەدا ئەگێرسێنێتەوە، یان گەڵا وردەکان کۆئەکاتەوە و لە بەین قامکەکانیا ئەیپروێنێ، بۆنی توندی شیرەکەی هەڵەمژێ، گەڵاکان سەوزێکی تۆخی بریقەدارن.

بڕێ جاریش بە دوای هەنگێکی قەڵەوی ئاڵتونی بە سەر تەوقەی

"شوکران"ەکانەوە هەڵدێ، بەڵام زات ناکات زۆر لێیان نزیک بێتەوە. هەنگەکە باڵ ئەگرێتەوە و ئەفڕێ، ئەم ئەکەوێتە شوێنی و هەر دوو دەستی بڵاو ئەکاتەوە، ئەڵێی بەراستی ئەیەوێ بیگرێ، بەڵام "لالا" هەر بۆ گاڵتە دوایان ئەکەوێ.

لێرەدا هەر رووشنایی دووری ئاسمان ئەبینرێ. شەپۆلەکانی دەریا دیار نین، بەڵام زرمەزرمیان گردۆڵکەکان ئەلەرێنێتەوە. خویێ سەر گژوگیاکان وەک ئارەق بریقەیان دێت. دەعباکان لە هەموو لایە هەن. گوێرەکە سوورە کەمرەنگەکان، زەردەواڵەکان کلکیان هێندە باریکە ئەڵێی دوو لەت بوون. خشخشۆکەیەک لە سەر تۆز و خۆڵەکە هێڵێکی باریک لە دوای خۆی بە جێ دێڵێ، مێشە پانە رەنگ کانزاییەکان روومەت و لاقی سوێری کیژۆڵەکە ئەلێسنەوە. "لالا" بە هەموو جادە و چاڵایی گردۆڵکەکان شارەزایە.

بە چاوی بەسراوە بۆ هەر کوێ بیەوێ ئەتوانێ بڕوا. "با" لە سەر گردۆڵکەکان هەڵئەکاو وەک دڕک بە مناڵەکەوە ئەدا و قژە رەشەکەی ئەشێوێنێ.

کراسەکەی لکاوە بە پێستە تەڕەکەیدا، دەستی پیادێنێ و لێی جیا ئەکاتەوە. "لالا" هەموو جادەکان ئەناسێ، ئەو جادانەی تا چاو بڕ ئەکات لە درێژای گردۆڵکە رەنگ خۆڵەمێشیەکاندا، لە بەین دڕکەجارەکەدا نوقم ئەبن و لە کەوانەیەکدا ئەگەڕێنەوە، جادەگەلێ کە هەرگیز رێیان بۆ هیچ کوێ نەئەبری.

بەڵام هەرجار کە دێتە ئێرە، شتێکی نوێ ئەبینێ، ئیمڕۆ هەنگێکی ئاڵتوونی تا ئەوپەڕ ماڵی ماسیگرەکان، تا تەنکاوی دەریا، بە دوای خۆیدا رایکێشاوە. لەولاتر لە نێوان دڕکەجارەکە ئێسکە پەیکەرێکی کانزایی ژەنگاوی چنگ و شاخەکانی بە هەرەشەوە بەرز کردۆتەوە. لە نێو لمی جادەکەیش قوتوویەکی بەتاڵی سپی بێ ناونیشان و دووکون لەم لاولایدا، داکەوتووە.

بە ئەسپایی مل ئەنێتەوە، هێندە بە سەرنجەوە چاو ئەبڕێتە لمە خۆڵەمێشیەکە، چاوی دێتە ئێش، بێ ئەوە بیر لە هیچ بکاتەوە، یا بۆ ئاسمان بڕوانێ، لە سەر زەویدا، بە دوای شتێکدا ئەگەڕێ، ئەمجا لە ژێر دارکاجێکدا ئەوەستێ و چاوی ئەقوونجێنێ.

هەر دوو دەستی بە دەور ئەژنۆیدا گرێ ئەداو خۆی رائەوەشێنێ و گۆرانیەکی فەرەنسی ئەلێتەوە، کە تەنیا ئەلێ: «مێدیترانێ ـ ێ ـ ێ»

"لالا" لێی تێناگات، رۆژێ لە رادیۆ بیستبووی و تەنیا هەر ئەو وشەیە لە بیرماوە، بەڵام زۆری حەز لێ ئەکا، برێ جار کە سەرخۆشە و بێکارە وەیان ئەو کاتانە بێ ئەوە بزانێ لەبەر چی دڵی ئەگیرێ، ئەم گۆرانیە ئەڵێ، جاری واهەیە هێندە نزم ئەیلێ خوێشیبە باشی نایبیسێ، یا بە پێچەوانەوە، بە هەموو هێزیەوە دەنگ بەرز ئەکاتەوە بۆ ئەوەی بەسەر ترسەکەیدا زاڵ بێت.

بەڵام ئێستا بە دەنگێکی نزم ئەیلێتەوە، چونکە هەست بە بەختەوەری ئەکات، مێلووره سووره سەر رەشەکان لە سەر سووزنی گەڵای کاجەکەدا رێچکەیان بەستووە،ساتێ رائەوێسن و لقە ناسکەکان ئەگرنە بەر.

"لالا" بە چڵە دارێکی وشک دەیان ئالۆزێنێ، بۆنی درەختەکان و بۆنی توندی دەریاکە "با" لەگەڵ خۆی ئەیهێنێ، تێکەڵ بوون. لمەکان وەک کۆڵەکەیەک تا ئاستی گردۆلکەکان، بەرەو ئاسمان هەڵدەبەزنەوە، ئەمجا لە پڕ تێک ئەشکێن و وەک هەزاران دەرزی بە لاق و رووومەتی منداڵەکەوە ئەدەن.

تا خۆر ئەڕواتە سینگی ئاسمانەوە، "لالا" لە سێبەری کاجەگەورەکە ئەمێنێتەوە. پاشان بەکاوە خۆ بەرەو شار مل ئەنێ. جێ پێکانی خۆی ئەناسێتەوە. باریکتر و بچووکترن لە پێی. بەڵام کاتی گەڕانەوە، گەورە ئەبنەوە، شانەکانی هەڵئەتەکێنێ و رائەکات.

درک بە قامکی قاچیەوە ئەدا، ئەمیش دوای چەن هەنگاو بەشەلەشەل، ئەوەستێ درکەکان دەربێنێ هەر جارکە ئەوەستێ، دەوروبەری پڕە لە مێروولە، لە زیندانیگەلێ ئەچن کە لە پشت بەردەکانەوە دەر ئەپەڕنە دەرەوە و بەرەو لمە بریقەدارە رەنگ خۆڵەمێشیەکە مل ئەنێن، بەڵام "لالا" خۆشیانی ئەوێ. خشخشۆکەکانیشی خۆش ئەوێ کە خنەخن مل ئەنێن.

سیسرکە ئاڵتوونیەکان کە سوور ئەنوێنن، کرمەپانەکان، خزیلکەکان،

گوێرە کەسوورە کان، کوللە کان کەلەنووکی داری سووتاو ئەچن، هەموویانی خۆش ئەوێ.

"لالا" ئەوەستێ کە تێیەڕن، دەعباکانیش بە دەور خۆیاندا ئەسووڕێنەوە و چزە کانی پێ نیشان ئەدەن. مارمیلکە ڕەنگ سەوز و خۆڵەمێشیەکانیش توند کلکیان ڕائەوەشێنن بۆ ئەوە توندتر لە گردۆڵکە کان سەرکەون. برێ جار یەکێکیان ئەگرێ و ئەونە بە کلکی ڕای ئەگرێ تا ئەقرتێ. ئەمجا لەتەکەی دیکە لە ناو خۆڵەکە لوول ئەخوات.

ڕۆژێ کوڕێ پێی وتبوو ئەگەر چاوەڕوان بمێنێ لە کلکی مارمیلکەکە سەرو پێ ئەڕوێتەوە، بەڵام "لالا" باوەڕی نەکردبوو.

ئێرە بە تایبەت پڕە لە مێش، گەرچی هەر ئەویزێنن و پێوەی ئەدەن بەڵام خۆشی ئەوێن، نازانێ بۆ؟ ڕەنگە بە بۆنەی دەس و پێ هەرە باریکەکەیانەوە بێت، یان پێی وایە بە جوانی ئەفڕن، بەم لاوئەولادا، بۆ دواوە بۆ پێشەوە.

بە پشتا لە سەر لمەکە ڕائەکشێ، مێشە پانەکان یەک لەدوای یەک لە سەر ڕوومەت و دەست و قاچە ڕووتەکانیدا ئەنیشنەوە، خێرا لێی نزیک نابنەوە، چونکە لێی ئەترسن. حەز لە ئارەقە سوێرەکەی پێستی ئەکەن، کە ئەیخۆن، ترسەکەیان ئەشکێ، کاتێ قاچە بچووکەکانیانەوە ئەچن بە ڕێگادا، "لالا" دێتە پێکەنین. بەڵام نزم پێدەکەنێ بۆ ئەوە نەترسن. برێ جاریش مێشێکی پان بە گۆنایەوە ئەداو ئەویش بە تووڕەییەوە ئەقیژێنێ. ماوەیەکی زۆر کایەیان لەگەڵ ئەکات. مێشی گیا ئاویەکانی ڕۆخی دەریا، هەروەها مێشە ڕەشەکان کە لە خانووەکانی "سیتە" ئەژین. لە سەر مشەما و کارتۆن و شووشە و ماڵەکانی "گلاسیەرا"، مێشە قەڵەوە شینەکان بە سەر تەنەکەی زبڵدانەکانەوە بە دەنگی تەقینەوەیەک ئەفڕن.

"لالا" لە پڕ ڕائەچڵەکێتە سەرپێ و بەفڕکان بەرەو گردۆڵکەکان ئەڕوا، لمەکە لە ژێر قاچە ڕووتەکانیدا ئەڕوخێ، درک بە پێیەوە ئەدا، بەڵام گوێ نادات. ئەیەوێ بە زووترین کات خۆی بگەیەنێتە سەر بەرزترین لووتکەی گردۆڵکەکان، کاتێ ئەگاتە

سەر تەپۆڵکەکە "با" بە هەموو هێزەوە ڕوومەتی ئەداتە بەر قەمچی، ناتوانێ بە پشتا ڕاکشێ، "با"ی ساردی دەریاکونەلووتەکانی و چاوی ئەکزێنێتەوە. دەریا پان و بەرین و شینە و خۆڵەمێشی و خاڵی کەف بە سەریەوەیە، بێدەنگ ئەنەڕێنێ، لەکاتێکدا شەپۆلە کورتەکان خۆیان بەگوڕ بە سەر لمەکەدا ئەکوتن، ڕەنگە تۆخە شینەکەی ئاسمان لە دەریادا ڕەنگ ئەداتەوە.

"لالا" پشت لە "با" هەڵ ئەکات. دائەنەوێتەوە، کراسەکەی (کە لە ڕاستیدا کراسێکی متقاڵی کوڕانەیەکەپووری قۆڵەکانی بۆ بڕیوە) نوساوە بە ڕان و سکیا، ئەڵێی مەلەی کردووە.

دەنگی "با" و دەریا لەگەڵ دەنگی کوتانی قژی بە لاجانگیا، تێکەڵاو بوون، تاوێ لەم گوێیدا تاوێ لەویاندا ئەزرنگێتەوە، جارجار "با" مشتێ لمی بۆ ئەهاوێ، خێرا چاوی ئەنووقێنێ نە وەک کوێربێ. بەڵام "با" بە لاساری ئاو لە چاوی دێنێ و دەنکە لمەکان لە ناو دەم و بەین دیانەکانیدا تەقەیان دێ. کاتێ جوان لە "با" و دەریا سەر مەست ئەبێ لە خاکرێژی گردۆڵکەکە دائەگەڕێ، لە داوێنی گردۆڵکەکەدا هەڵئەترووشکێ و هەناسەی تازە ئەکاتەوە. "با" لەوبەر تەپۆڵکەکانەوە هەڵ ناکات، بەڵکو لە سەردا دێت، بەرەو زەوی و تا گردۆڵکە شینە تەماویەکان هەڵدێ.

"با" هەرچی بیەوێ ئەیکا، کە "با" هەڵئەکا "لالا" هەست بە بەختەوەری ئەکات، ئەگەر چی چاو و گوێی ئەکزێنێتەوە و لمی بۆ ئەهاوێ. کاتێ لە ماڵە تاریکەکەیان لە "سیتە"یە و هەوا قورس و سەنگینە، بیر لە "با" ئەکاتەوە کەگەورە و ڕوونە و بێ وچان بە سەر دەریادا هەڵدەکات، لە بیابان تێئەپەڕێ، لە دارستانی سدرەکان، لە نێوان باڵندە و گوڵەکاندا، لە داوێنی کێوەکاندا سەما ئەکات.

"با" ناوەستێ، لە کێوەکان ئەگوزەرێ، گسک لە خۆڵ و لم و خۆڵەکەوە ئەدا، کارتۆنەکان سەرەونخون ئەکاتەوە. بڕێ جار تا شاری تەختە و کارتۆنە قیرتاویەکان ئەڕوا و بە، بەرز کردنەوەی چەن سەربان و دیوار کایە ئەکات.

بەڵام ئەوانە گرینگ نین، بەڕای ئەو "با" وەک ئاو جوان و ڕوونە و وەک

هەورەتریشقە توندە. ئەونە بە هێزە ئەگەر بیەوێ ئەتوانێ هەموو شارەکانی دونیا، تەنانەت ماڵە بەرزە سپیە شووشەییەکانیش برووخێنێ. کاتێ بچووک بوو خۆی ناوی لێ نابوو، لە ماڵە دارینەکان ناوی "ئووووو..." بوو. لەولاتر لە ناو درکە جارەکە پەیدای ئەکاتەوە، کە وەک دەستی ئادەمیزادگەلا زەردەکان لەیەک جیا ئەکاتەوە. واشەیەک لە ناو دەشتەکە جووڵەی لە خۆی بریوە، باڵە رەنگ مسینەکانی لە "با"دا بڵاو کردوەتەوە.

"لالا" سەیری ئەکا و لە دڵەوە ئافەرینی پێ ئەڵێت کە لە "با" دائەفرێ. واشەکە بە ئاستەم نووکی باڵەکانی ئەبزوێنێ و کلکی رائەوەشێنێ. بێ ئەوە هەوڵ بدات خۆی بەدەست "با"وەداوە. سێبەرەکەی لە خاچێک ئەچێ لەسەر گیا زەردەکاندا ئەلەرێتەوە. جارجار ئەناڵێنێ و هەر تەنیا ئەڵێ "کاییک"*، "لالا"یش وەڵامی ئەداتەوە. پاشان بە خێرایی ئەنیشێتەوە سەر زەوی، باڵەکانی لە یەک نزیک ئەکاتەوە و ماوەیەکی زۆر وەک ماسیەک بە سەر گیاکاندا خۆی ئەخشێنێ و لە ناو گژوگیا شێواوەکاندا نوقم ئەبێ. "لالا" بێهوودە ئەناڵێنێ. "کاییک"، باڵندەکە ناگەرێتەوە. بەڵام ماوەیەکی زۆر لە گلێنەی چاویدا ئەمێنێتەوە.

ئێستا "لالا" سەری بەرز کردۆتەوە و بێجووڵە ماقی ئاسمانە سپیەکەیە، بازنەگەلێ لە ناوەراسیدا تێک ئەشکێن و لەتلەت ئەبن، ئەڵێی چاڵی ئاوە و بەردیان بۆهاوێشتوە، کە دەعبا وباڵندە و هیچ شتێک لەو شێوە نین، بەڵام هەزاران نیشانەن لە ئاسماندا ئەجووڵێنەوە. وەک بڵێی ئاسمان لە مێش و مێرووله و ئەسپێ پر بووبێ. کە لە ئاسمانە سپیەکە دانافرن، بەڵکو دێن و ئەرۆن، ئەڵێی گێژ بوون نازانن بۆ کوێ برۆن. رەنگە سیمایەک لە هەموو ئەو مرۆڤانەن کە لە شاردا ئەژین. ئەو شارانە کە هێندە گەورەن هەرگیز رێگای دەرباز بوونیان لێنیە. جێگایەکی پر لە ماشین و مرۆڤ، جێگایەک کە هەرگیز بۆ دووجار کەسێ نابینرێتەوە.

---

*- Kaiiik

"نوعمان"ی پیر ئەم شتانە ئەگێڕێتەوە، ناوە هەندەرانیەکەشی پێ فێر کردوە "ئەلجەزیرە"، "مادرید" (کە ئەو پێی ئەڵێ "مادری")، "مارسێ"، "لیۆن"، "پاریس"، "ژنێ".

ئەمانە هەموو رۆژێ نابینێ، چەن رۆژ جارێ، کاتێ "با" هەڵ ئەکات و هەورەکان بەرەو کێوەکان راکێشێ کاتێ هەوا سپیە و رۆشنایی هەتاو ئەبزوێ ئەمجا دەعباکان دەرئەکەون، ئەبزوێن، راکەن و سەما ئەکەن. هێندە بەرز ئەبنەوە وەک مێشێ بە ئاستەم ئەبینرێن.

دیسان دەریا بانگی ئەکاتەوە. ئەویش لە نێوان درکە جارەکەوە بەرەو گردۆڵکە رەنگ خۆڵەمێشیەکە هەڵدێ، گردۆڵکەکان لە مانگای خەوتوو ئەچن کە سەریان دانەواندبێتەوە، پێی خۆشە بە سەر پشتیدا سەرکەوێ دەست و پێی مانگاکە رێگایەکیان دروست کردووە، ئەمجا بەرەو لمی کەنار دەریا گرمۆڵە بوونەتەوە.

ئوقیانوس زرمەزرم لە سەر قەراخە پتەوەکە ئەشکێتەوە، دواتر پاشەکشێ ئەکا و هەتاو، کەفەکەی ئەتاوێنێتەوە. ئێرە، لێواولێو لە رووناکی و دەنگە دەنگە، "لالا" دەم و چاوی ئەقوونجێنێ، لێوو پێڵووەکانی سووتاونەتەوە، "با" و بۆران هەناسەی سوار کردوە. بەڵام پێی خۆشە ماوەیەکی زۆرتر بمێنێتەوە، ئەرواتە ناو ئاوەکە، شەپۆلەکان خۆیان بە سینگ و لاقیدا ئەکوتن. کراسەشینەکەی ئەنوسێنن بە جەستەیەوە.

هەست ئەکا لاقەکانی وەک دووچڵدار چەقیونەتە ناو لمەکە. بەڵام خۆی زۆر ناخاتە مەترسیەوە چونکە برێ جار دەریا منداڵەکان لەگەڵ خۆی ئەبات و دوای دوو رۆژ ئەیانهێنێتەوە سەر لمی قەراخ دەریا، بەڵام دەم و چاویان پڕە لە ئاو و قرژانگیش لووت و لێوەکان و نووکی قامکی خواردوون.

"لالا" لە سەر کەفی سەر لمەکە رێ ئەکەوێ، "با" تا ناوقەدی کراسە تەڕەکەی وشک کردوەتەوە، رواڵەتی لەبەر خورەتاودا مسینە رەنگ ئەنوێنێ. "با" قژە رەشەکەی بەلایەکدا لوول ئەدات.

بووکە دەریاییەکان یەک یەک و دوور لە یەک رژاونەتە سەر لمەکە، قژۆکە

شێواوەکانیان وەک قژ پرژوبڵاو بوون. "لالا" بینایی بە سەر چاڵەکانەوە ئەگیرسێنێتەوە، کە لە هەر جاری پاشەکشێ ئاوەکەدا دروست ئەبن. ئەکەوێتە دوای قرژانگە بچووکەکان کە بە شێوەی مارپێچ هەڵدێن و هەردوو چنگیان وەک جاڵجاڵووکە بەرز ئەکەنەوە، "لالا" پێیان پێئەکەنێ.

بەڵام "لالا" وەک مناڵانی‌تر ناکەوێتە دوایان بۆ ئەوە بیانگرێ، بەڵکوو وێڵیان ئەکات بگەڕێنەوە ناو دەریا لە نێوان کەفە پیسەکەدا نوقم ببن.

"لالا" بەدەم گۆرانی خوێندنەوە درێژایی قەراخ دەریا ئەگرێتەبەر. گۆرانی‌یە یەک وشەیەکە ئەڵێتەوە.

ـ مێدیتێرا ـ نێ ـ ێ ـ ێ...

ئەمجا لە داوێنی گردۆڵکەکەی بەرانبەر رۆخی دەریا چوارمشق ئەدا، دوو دەستی بە دەور ئەژنۆیدا گرێ ئەدا و سەری لە لۆچی کراسەکەیدا ئەشارێتەوە، لەبەر ئەو لمانەی کە "با" فڕێیان ئەدات نەکەوێتە ناو دەمیەوە. هەمیشە هەر لەوێدا دائەنیشێ، کۆڵەکەیەکی داری رزیو لە چاڵایی جێی شەپۆلەکاندا چەقیوەتە ناو ئاوەکە و دار هەنجیرێکی گەورە لە نێوان بەردەکانی گردۆڵکەکە رواوە. لەوێ چاوەڕوانی "نوعمان"ی ماسی‌گر ئەبێ. "نوعمان"ی ماسی‌گر وەک کەسی‌تر نیە، پیاوێکی بالابەرزی لەڕی چوارشانە و روخسارێکی لاواز و پێستی گەنمی سووتاوی هەیە و هەمیشە پێخاوسە، پانتۆڵێکی شین و کراسێکی سپی لەبەر ئەکات‌کە ئەوەندە لە بەری گەورەیە وەک ئاڵایەک لەبەر "با" دائەشەکێتەوە. بەڵام بەرای "لالا" ئەو زۆر جوان و خۆش جل و بەرگە، هەر کات کە ئەزانێ کاتی گەڕانەوەی "نوعمان"ە دڵی توندتر لێ ئەدا.

چرچ و لۆچی روومەتی بە باشی دیارە، "با" و دەریا رەقیان کردوە، پێستی گۆنا و تەوێڵی ساف و لووسن. بەڵام خۆرەتاو سووتاندویە و رەش هەڵگەڕاوە. قژیشی لە رەنگی پێستیەتی. بەڵام بە تایبەت رەنگی چاوی زۆر سەیرە، پیرۆزەیەکی مەیلە و خۆڵەمێشی، زۆر روون و رۆشن لە نێوان روخسارە بۆرەکەیدا ئەدرەوشێتەوە، ئەڵێی

ئێشکچی رووناکی و روونی دەریان.

لە قەراخ دەریا، لای دار هەنجیرەکە چاوەڕوانی دیتنی چاوەکانی ماسیگرەکە و پێکەنینەکەیەتی لە کاتێکدا ئەم ئەبینێ. ماوەیەکی زۆر لە ژێر دار هەنجیرەکە لە ناو لمی قەراخ دەریا چاوەڕوانیەتی و لە ژێر لێوەوە ورتەی دێت. سەری ناوەتە نێوان قۆڵەکانی بۆ ئەوە لم نەکەوێتە ناو دەمی و ناوە خۆشە جوان و درێژەکە ئەڵێتەوە:

«مێدیتێرانێیێ ....»

چاوەڕوان، ماقی دەریاکەیە، کە خەریکە تووشی تۆفان ئەبێت. رەنگی خۆڵەمێشی و شینی پۆلایی دەریا وەک هەورێکی بێڕەنگ، هێڵی ئاسۆ دائەپۆشێ. برێ جار پێی وایە خاڵێکی رەش لەپۆپەی شەپۆلەکاندا ئەبینێ کە سەما ئەکات. رائەچەنێ، وائەزانێ بەلەمەکەی "نوعمان"ە کە نزیک ئەبێتەوە، بەڵام خاڵە رەشەکە ون ئەبێ، رەنگە سەراوێکی دەریاییە یان پشتی "دولفینێک".

"نوعمان" بۆی گێڕابوەوە کە دەستەی دولفینە پشت رەشەکان لە نێوان شەپۆلەکاندا، لەبەردەم بەلەمەکاندا هەڵئەبەزینەوە، ئەڵێی لە ماسیگرەکان سڵاو ئەکەن. ئەمجا لە پڕ مل ئەنێن و بەرەو ئاسۆ ون ئەبن.

"نوعمان" هەمیشە زۆری پێخۆشە بەسەر هاتی دولفینەکانی بۆ بگێڕێتەوە، کاتێ قسە ئەکات تروسکەی دەریا لە چاوانیدا ئەبریسکێتەوە، وەک بڵێی "لالا" ئەتوانێ لە گلێنەیەوە حەیوانە رەشەکان ببینێت.

بەڵام بێهوودە ماقی دەریاکەیە، دولفینەکان نابینێت، دیارە نایانەوێ لەسەر ئاوەکان نزیک کەونەوە. "نوعمان" بەسەر هاتی دولفینێکی بۆ گێڕابوەوە کە پیاوێکی ون بووی بردبوەوە بۆ قەراخ دەریا. هەورەکان بەرەو دەریا داکشابوونە خوارو وەک پەردەیەک دایان پۆشیبوو، "با"یەکی سامناک دەکەڵی بەلەمەکەی تێک شکاندبوو دوو رۆژ لە نێوان شەپۆلەکان کە هەرسات هەرەشەی هەڵگەڕانەوەیان لێ کردبوو، وەیلان مابووەوە.

لە راستیدا ماسیگرەکە ون ببوو. کاتێ دولفینێکی کلک درێژ لە نێوان

شەپۆلەکاندا دەرکەوتبوو، ئەو دۆعای ئەخوێند، بەدەور بەلەمەکەدا ئەسووڕایەوە و هەڵئەبەزیەوە وەک عادەتی دولفینەکان کایەی ئەکرد.

بەڵام ئەمەیان گەلێ تەنیا بوو. ئەمجا لە پڕ دەستی کردبوو بە پاڵ پێوەنانی بەلەمەکە، بڕوای پێ ناکرێ. بەڵام ئەو کارەی کردبوو، لە دواوە پاڵی پێوەئەنا، بڕێ جار دولفینەکە ملی ئەنا و لە نێوان شەپۆلەکاندانوقم ئەبوو و ماسیگرەکە وایئەزانی بەجێی هێشتوە، بەڵام ئەگەڕایەوەو بە تەوێڵی پاڵی بە بەلەمەکەوە ئەنا و کلکە بە هێزەکەی لە ناو ئاوەکەدا رائەوەشاند. بەم شێوە ماوەی ئەو رۆژە رێیان بڕیبوو.

ئێوارە، ماسی گرەکە لە نێوان تەم و مژدا رووناکی قەراخی دیبوو و بە شادیەوە قیڕاندبووی و گریا بوو.

کاتێ گەیشتبوونە قەراخ، دولفینەکە نیوە دەورێکی دابوەوە و بەرەو ناوەڕاسی دەریا گەڕابوەوە. ماسیگرەکەیش چاوی بڕیبوە رۆیشتنەکەی، پشتە قەڵەوە رەشەکەی لەژێر پڕشنگی دەمەو مەغریبدا ئەدرەوشایەوە.

"لالا" زۆر حەز لەو چیرۆکە ئەکات. زۆربەی کات بۆ دیتنی دولفینێکی گەورەی رەش بینایی بەسەر دەریادا ئەگەڕاند. بەڵام "نوعمان" پێی وتبوو ماوەیەکی زۆر رابوردوەوە و دولفینەکە ئێستا زۆر پیر بوە.

"لالا" وەک هەموو رۆژێ لە سێبەری دار هەنجیرەکە چاوەڕوانەو سەیری دەریا رەنگ شین و خۆڵەمێشەکە ئەکات، ئەو شوێنەی کە ئاڤرینەکان ئەچنە پێش، شەپۆلەکان لە هێڵێکی لاردا ئەکەونە رۆخی دەریا، لە پێشدا لە رۆژهەڵاتەوە بەرەو لووتکەی تاشە بەردەکان، پاشان بەرەو رۆژئاوا، لەکەنار رووبارێکدا تێک ئەشکێن. لە دواییدا لە ناوە راستدا ئەشکێنەوە.

"با" کەفەکە بەرەو گردۆڵکەکان دوور ئەخاتەوە، کەف و لم و خۆڵ تێکەڵ بوون، هێشتا هەتاو لە دڵی ئاسمانە بێ هەورەکە دایە، "لالا" بەکاوە خۆ بەرەو سیتە مل ئەنێ، چوونکا ئەزانێ کاتێ ئەگاتەوە ماڵ ئەبێ کار بکات، بە تەنەکەیەکی ژەنگاوی لەکانی ئاو بێنێ. ئەمجا لە چەمەکە جل بشۆرێ، ئەمەیان باشترە چونکە ئەتوانێ لەگەڵ

کەسانێکی دیکەدا بدوێ و هەموو جۆرە چیرۆکی سەیر و سەمەرە ببیسێ. بەڵام رقی لە دووشتە، کۆکردنەوەی چیلکەو هاڕینی گەنم. "لالا" لاقەکانی بە دوای خۆیدا رائەکێشێ و لۆژەلۆژ بە کوێرەرێگاکەدا هەڵئەگەڕێ. ئیتر گۆرانی ناڵێتەوە، چونکە لەسەر تەپۆلکەکانەوە، کورەکان داو بۆ باڵندەکان دائەنێن. پیاوەکانیش ئەچن بۆ سەر کار. برێ جار کورەکان گاڵتەی پێ ئەکەن چونکە نازانێ بە پێخاوس باش رێ بکات، کاتێ ئەزانێ لێی نزیک ئەبنەوە خۆی لە پشت دەوەنێکەوە دائەشارێ.

هەندێ بەیانیان، لە ئاسماندا شتێکی نوێ ئەبینێ کە زۆر حەزی لێ ئەکات، گەواڵە هەورێکی سپی و گەورە و درێژەدار لە ئاسماندا، لەو شوێنەی کە شینترە تێدەپەڕێ، لە دوای تاڵە سپیەکاندا خاچێکی بچووکی زێوینە کە ئەوەندە بەرز بوەتەوە بە ئاستەم ئەبینرێ.

"لالا" ماوەیەکی زۆر بینایی بە سەر خاچە بچووکەکەدا کە لە ئاسماندا تێئەپەڕێ، ئەگەڕێنێ. ئەیەوێ بزانێ چۆن لە ئاسمانی بەرینی شیندا، بێدەنگ، پێش ئەچێ و بە دوایەوە، هەورێکی درێژی سپی، وەک تۆپ گەلی بچووکی تووکن پێک دێن، ئەمجا "با" دێت و هەمووی ئەشواتەوە.

"لالا" پێی خۆشە لەو سەرەوە بێت، لە نێو خاچە زۆر بچووکە زێوینەکەدا، هەروەها پێی خۆشە تا قووڵایی دەریا، ژێر دوورگەکان تا ناخی زەوی بڕوا.

ماوەیەکی زۆر دوای ئەوەکە فڕۆکەکە نوقم ئەبێ، بینایی بە سەر ئاسماندا ئەگێرسێنێتەوە.

لە پێچی جادەکە، "سیتە" دەرئەکەوێ، لە دەریاوە بەرەو رووبارەکە نیو سەعات تا "سیتە" رێگەیە، "لالا" نازانێ بۆ پێی ئەڵێن "سیتە" چونکە هەر لە پێشەوە دە دوانزە کۆڵیتی دارینی قیرتاوکراو، لەوبەر چۆمەکەوە زەویە بایرەکان لە شارە ئەسڵیەکەیان جیا ئەکردەوە، لەوانەیە بەو هۆیەوە ئەو ناوەیان لێ نابێت، کە ئەو مرۆڤانە لە گەڵ سەگ و مشکدا لە نێوان تۆزو خۆڵدا ئەژیان.

لەو کاتەوە دایکی مردبوو، لێرە مابوەوە. ماوەیەکی زۆر بوو هاتنەکەی لە یاد

چوو بووەوە. هاوینێکی گەرم بوو، "با"گەردەلوولی تۆز و خۆڵی بە سەر کۆڵیتە دارینەکاندا هەڵ ئەکرد.

کەوتبووە دوای تارمایی پووری تا کوڵیتە بێ پەنجەرەکە، کە پووری و کورەکانی تێیدا ئەژین. ئەیویست لەسەر جادەی بەرەو کێوە بەرزەکان راکات و هەرگیز نەگەڕێتەوە. هەر جار کە لە تەپۆڵکەی لمەکان ئەگەڕێتەوە، سەرمیچە تەنەکەو قیرتاوەکانی ئەبینێ، دڵی ئەگوشرێ و یەکەمین رۆژی هاتنی دێتەوە یادی.

بەڵام ماوەیەکی زۆری لێ رابوردوە. ئەڵێی ئەوانە هیچکام لە دونیای راستەقینەدا نەبوون، ئەڵێی چیرۆکە و بیستویەتی. هەر وەک بەسەر هاتی لە دایک بوونەکەی لە نێوان کێوەکانی باشوور، ئەو جێگایەی بیابان دەستی پێ ئەکرد.

هەندێ جار زستانان کە بێکار بوو و لەماڵەوە بوو "با" لە سەر پانتایی تۆز و خۆڵەکە هەڵی ئەکرد و لە نێوان تەختەدارەکانی ماڵی "عەمە"کە باش پێکەوە نەلکابوون، ویژەویژی ئەهات. "لالا" دائەنیشت و گوێی ئەگرت بۆ چیرۆکی لە دایک بوونەکەی. بەسەر هاتێکی درێژ و سەیرە، "عەمە"یش هەر جار بە شێوەیەک بە دەنگە ئاهەنگینەکەیەوە ئەیگێڕێتەوە و سەریشی بۆ ئەلەقێنێ، وەک بڵێی خەریکە خەوی لێبکەوەی.

«رۆژی لەدایک بوونەکەت، هێندەی بۆ هاوین و بۆ وشکە ساڵی نەمابوو، "حەوا" هەستی بە کاتی هاتنت کردبوو، هێشتا هەموو لە خەودا بوون، ئەویش بێ‌دەنگ و بەئاستەم لە رەشماڵەکە رۆیشتەدەر، بە پارچەیەک سکی پێچابوو، رۆشتبوو بۆ شوێنێ کە درەختێک و کانیەکی لێ بوو، ئەیزانی کاتێ رۆژ بێتەوە نیازی بە سێبەرو ئاو هەیە، یاسای ئەوێ بوو کە ئەبوایە لای کانی منداڵیان بێت، لای درەختەکە راکشاو چاوەڕوانی هەڵاتنی خۆرمایەوە. کەس نەیدەزانی دایکت لە دەرەوەیە، ئەو بە شێوەیەکی وا نهێنی و بێ‌دەنگ هەنگاوی هەڵئەگرت تەنانەت سەگەکانیش هەستیان پێ نەئەکرد.من خۆم لای ئەو خەوتبووم بەڵام ئاگام لە ناڵە ناڵ و رۆیشتنە دەری لە رەشماڵەکە نەبوو.»

ـ دەی ئیتر چی رویدا "عەمە"؟

«کە رۆژ بوەوە و ژنان لە خەو هەستان، زانیمان دایکت نیە، تێگەیشتین هۆی رۆیشتنەکەی چبووە، من بەرەوکانیەکە رۆیشتم، کاتێ گەیشتم، لە ژێر درەختەکە، بە هەر دوو دەستی خۆی هەڵواسیبوو بە چڵی درەختەکەوە و بۆ ئەوە پیاوو منداڵەکان خەبەر نەکاتەوە بە ئارامی ئەینالاند.

ـ دەی ئیتر چی بوو "عەمە"؟

ـ ئیدی تۆ لە دایک بوی، لەسەر زەوی لە نێوان ریشەی درەختەکەدا. تۆمان لە ئاوی کانیەکە داشۆردەوە لە بەر سەرما پاڵتاوێکمان تێوە پێچایت. دایکت گەڕایەوە ژێر رەشماڵەکە بنوێ، باش لە بیرمە تۆمان لە نێوان پاڵتۆکەی دایکتدا خەواند، چوونکە هیچمان دەست نەکەوت.

دایکت رازی و خۆشحاڵ بوو، چونکە خێرا لە دایک ببوی، بەڵام بە بۆنەی مەرگی باوکتەوە خەمبار بوو، وایئەزانی توانای بەخێو کردنی تۆی نیە، لەوە ئەترسا ناچاربێت، بە کەسێکی دیکەت بسپێرێت.»

جاری وابوو رووداوەکەی جۆرێکی دیکە ئەگێرایەوە، وەکوو بڵێی بە باشی لە بیری نەمابێ.

بۆ وێنە ئەیوت کە "حەوا" چنگی لە لقی درەختەکە گیرنەدابوو، بەڵکوو پەتی بیرێکی راگرتبوو و بە هەموو هێزەوە ئەیکێشا بۆ ئەوە بەرگەی ئێشەکە بگرێت.

یان ئەیگێرایەوە کە شوانێکی رێبوار مناڵەکەی بە دونیا هێنابوو و پێچابووی لە پاڵتاوەکەی خۆیەوە.

ئەمانە هەموو لە نێوان شاڵاوی تەم و مژدا نوقم ئەبوون، ئەتوت لە دونیایەکی دیکەدا روویان داوە لەو پەڕ بیابان و لە ئاسمانێکی دیکە و هەتاوێکی دیکەدا بووە.

«پاش چەند رۆژ دایکت ئەیتوانی تا سەر چاوەی ئاوەکە بڕوات. بۆ ئەوە خۆی بشواو سەری دابێنێ، تۆیش بە مەلۆتکەیی لە ناو پاڵتاوەکەیدا بە کۆڵیەوە بووی، بە ئەسپایی ئەچوو، چونکە هێشتا وەک جاران تینی تێ نەهاتبوەوە، بەڵام بە لە دایک

بوونی تۆ بەختەوەر بوو و کاتێ ناوی تۆمان لێ ئەپرسی، ئەیوت، کە تۆیش هاوناوی ئەوی، "لالاحەوا" ئاخر تۆ کچی "شەخسێک" بووی.

ـ دەی تو خوا، سەبارەت بە "ئەلئەرزەق" بلێ، پیاوی شین.

بەڵام "عەمە" سەری ئەلەقێنێ. ـ ئێستا نە، بۆ رۆژێکی دیکە.

ـ توخوا "عەمە"، بیگێرەوە.

بەڵام "عەمە" بێ ئەوە وەڵامی بداتەوە، سەری رائەوەشێنێ ونانی سەر ساجەکە بەرز ئەکاتەوە.

"عەمە" هەرگیز بۆ ماوەیەکی زۆر سەبارەت بە پیاوی شین یان "مولای ئەحمەد بن موحەممەد بن ئەالفازل" کە پێیان ئەوت "مائەلعەینەین"، ئاوی چاوەکان قسە ناکات. شتێکی سەیر لە "سیتە" ئەوەیە کە هەموان دەس کورت و فەقیرن و کەس هەرگیز گلەیی ناکات، لە "سیتە" کۆڵیتەکان لەدارو تەنەکە چێ کراون و سەربانەکانیان قیرتاو کردوە و بە بەرد رایان گرتوە. کە "با" لە دۆڵەکانەوە شاڵاو دێنی، زرم و هۆری تەختەکان و تەقەتەقی تەنەکەکان بەرز ئەبێتەوە و سەمفۆنیایەکی پێکەنینی پێکدێنن کە تەق و هۆر، دێلانی ئەکات، ئەڵێی لە ناو ئوتووبووسێکی گەورەی شەق و شڕ دایە، یان ئەڵێی مێگەلی ئاژەڵ ورەوە مشک لە سەر بان و ناو کۆڵانەکان غار ئەکەن. هەندێ جار شاڵاوی تۆفان گەلێ توند و بە هێز گسک ئەدا لە هەمووشت، ئەبێ رۆژی دوایی سەر لەنوێ هەموو شت دروست بکرێتەوە، بەڵام ئەوان هێندە فەقیرو دەست کورتن ترسی لە دستدانی هیچ شتێکیان نیە، رەنگە پێ خۆشحاڵیش بن، چونکە پاش تۆفان ئاسمانی ژوور سەریان پان و بەرین و شینتر ئەنوێنێ، پرشنگی رۆژ دڵرفێنترە، لە هەر حاڵدا لە ئاقاری "سیتە" هەر زەویەکی زۆر لوس و گەردەلوولی تەپ و تۆز ئەبینرێ و دەریایەک کە هێندە پان و بەرینە هەمووی نابینرێ، "لالا" پێی خۆشە هەمیشە سەیری ئاسمان بکات. زۆربەی کات تا ئەو پەڕ تەپۆڵکەکان کە جادەی لمەکە لە دەستی راستێ ئەڕوات، خۆی ئەخات بە پشتاو لە ناوەڕاسی لم و درکدا دەستی راست و چەپ لە سەر یەک دائەنێ، پاشان ئاسمان بە سەر روخسارە

سافەکەیدا ئاوەڵا ئەبێتەوە و وەک ئاوێنەیەک ئەدرەوشێتەوە، ئارام و هێمن، بێ‌هەور و بێ‌باڵندە و بێ‌فڕۆکە، "لالا" چاوەکانی جوان ئەکاتەوە بۆ ئەوە ئاسمانی تیا جێ بکاتەوە. وەک بەسەر جۆلانە یان بەلەمێک بیت، یان بڵێی لە نێوان دووکەڵێکی خەس و خۆڵداگیری کردبێ و سەر گێژەی گرتبێ. رەنگە بە هۆی تینی خۆرەتاو بێ کە لەگەڵ "با"ی ساردی دەریا، ناخی جەستەی کیژۆڵەکە ئەسوتێنێ، تینەکە ئەچێتە ناو سک و سی و قوڵ و قاچەکانی و ئەبێ بە هۆی ژانی سەر.

بەڵام ئەو هەروا بێ‌جووڵە ئەمێنێتەوە، چونکە هەتاو و ئاسمانی خۆش ئەوێ. کاتێ لەویایە، لە سەر لمەکە رائەکشێ، دوور لە منداڵەکانی دیکە، دوور لە "سیتە"ی سیخناخ لە دەنگ و بۆن. کاتێ ئاسمان وەک ئیمرۆ گەلێ شینە، "لالا" ئەتوانێ بیر لەو شتەی کە ئەیەوێ، بکاتەوە. بیر لە کەسێکە پێی ئەڵێ "ئێس سێر" کە روانینی وەک هەتاوە و ئەم ئابڵۆقە ئەداو چاودێری لێ ئەکات.

لێرە، لە "سیتە"، کەس نایناسێ. بەڵام کاتێ ئاسمان گەلێ جوان و دڵرفێنە و رووناکی سەر دەریا و دۆڵەکان ئەدرەوشێتەوە، ئەڵێی کە ناوی "ئێس سێر" لە هەموو جێگایەکدا ئەبینرێ، لە هەموو جێگایەکدا ئەزرنگێتەوە و تا ناخی ئەم ئەگرێت. "لالا" وائەزانێ دەنگی ئەبیسێ، دەنگی سووکی هەنگاوەکانی، برووسکەی نیگای لە سەر پێستی روخساری هەست پێ‌ئەکات کە تەشەنە ئەکاتە هەموو گیانیەوە.

بینایی لەوبەر کێوەکانەوە، لەوبەر "درا"وە دێ، لەو پەڕی بیابان، وەک شۆڵەیەک ئەدرەوشێتەوە و ون بوونی بۆنیە. کەس نایناسێ. کاتێ "لالا" بۆ "نوعمان"ی ئەگێڕێتەوە، ماسی‌گرەکە سەری رائەوەشێنێ چونکە هەرگیز ناوی نەبیستوە و لە چیرۆکەکانیدا ناوی نەهێناوە.

بەڵام "لالا" دڵنیایە کە ئەوە ناوی راستەقینەیەتی. چونکە ئەو وای بیستوە. رەنگە ئەوە هەر خەوێکە و بەس، تەنانەت "عەمە"یش سەبارەت بەو هیچ نازانێ. بەرای "لالا" ناوەکەی ئەو لە هی خۆی جوانتر و خۆشترە.

ناوێ کە کاتێ ئەیبیسێ، سەر خۆشی ئەکات، بۆ بیستنی ناوەکەی، بۆ دیتنی

پرشنگی نیگای هەمیشە دوور ئەکەوێتەوە، لە نێوان گردۆڵکەکان لەو شوێنەدا کە تەنیا دەریایە و لم و ئاسمان.

کاتێ "لالا" لە شاری تەختە و قیرتاو کراوی "سیتە"یە، "ئێس سێر" ناتوانێ نە تینی پێببەخشێ، نە ناوەکەی خۆی پێ بڵێ. ئینسانێکە خۆشی لە دەنگە دەنگ و بۆن و خۆشی نایەت. ئەبێ تەنیا لە "با"دابێت، تەنیا، وەک باڵندەیەک لە ئاسماندا، خەڵک نازانن "لالا" بۆ ئەڕوا؟ رەنگە وائەزانن ئەڕوا تا ماڵی شوانەکان، تا ئەوپەڕ تاشە بەردەکان و هیچ ناڵێن.

خەڵک لێرە چاوەڕوانن، لە راستیدا لە "سیتە" هیچ کارێک نیە بۆ ئەوان، نەختێ دوور لە قەراخی دەریا لە نێوان کۆڵێتی تەختە و تەنەکەیەکانیاندا، بێ جووڵە، لە تاریکیەکی خەس و خۆڵدا ئەمێننەوە.

کاتێ رۆژ لە ئاستی سەر بەردەڵان و تۆز و خۆڵەکەوە هەڵئەکات، ساتێ دێنەدەر، ئەڵێی ئەیانەوێ کارێ بکەن. کچەکان بەرەو کانی مل ئەنێن و کوڕەکان لە کێڵگەکان کار ئەکەن. یان لەو بەر چۆمەکەوە لە شەقامەکانی شار پیاسە ئەکەن. یان لە قەراخ شەقامەکە دائەنیشن بۆ سەیر کردنی هاتوچووی کامیۆنەکان. هەموو بەیانیەک "لالا" رێ ئەکەوێ. لە کۆڵانەکان تێئەپەڕێ، گوێ شل ئەکات بۆ دەنگی مۆسیقا کەماڵ بۆ ماڵ لە رادیۆکانیانەوە بەرز ئەبێتەوە، هەمیشە هەر هەمان گۆرانیە بێبڕانەوە میسریەکەیە، کە کۆڵان بە کۆڵان درێژەی هەیە. زۆری پێخۆشە، کاتێ ئاهەنگێکی مەوزون ئەناڵێنێ و لەگەڵ تەپەی هەنگاوی کچان و شۆڕەی ئاوی کانیەکە تێکەڵ ئەبێ. کاتێ ئەگاتە سەر کانی، تەنەکە بە دەست، بە تەمای نۆبەی ئەمێنێتەوە و سەیری کچەکانی دیکە ئەکات، هەندێکیان وەک "ئیکیکر"، رەشن، ئەوانیشیان سپی پێس و چاو سەوزن وەک "مریەم". ژنە پیرەکان دەمامکیان هەیە و بە کاتیلەی رەشەوە دێن بۆ ئاو و خێرا و بێ ئەوە ورتەیان لێوە بێت ئەگەڕێنەوە.

کانیەکە بۆرییەکی درێژی قور قوشمی پێوەیەکە شێرێکی برنجەیی لێ بەستراوە، هەر جار کە ئەیکەنەوەو ئەیبەسنەوە، ئەلەرێتەوە. کچەکان دەم و چاو و

قاچیان لەبەر ئاوە ساردەکەدا ئەشۆرن، هەندێ جار بە تریكوهۆڕ ئاو پرژێنی یەكدی ئەكەن، زەردەواڵەكان بە دەوریاندا ئەسوڕێنەوەو خۆیان لە قژە شێواوەكانیانەوە دەئاڵێنن.

"لالا" تەنەكەكە ئەنێتە سەر سەری و قوت ڕێ ئەڕوا بۆ ئەوە تنۆكی ئاوی لێ نەڕژێ. بەیانان ئاسمان گەش و جوانە، ئەڵێی تازە لە دایك بوە، بەڵام كاتێ هەتاو ئەگاتە تاقی ئاسمان، تەم و مژ وەك تەپ و تۆز لە ئاسۆ نزیك ئەبێتەوە و ئاسمان قورس و سەنگین بە سەر زەویدا خۆی ڕائەخات.

***

جێگایەك هەیە "لالا" زۆری پێخۆشە بڕواتە ئەوێ. لەكوێرە ڕێگاكان، كە لە دەریا دوور ئەبنەوە، بەرەو ڕۆژهەڵات هەڵئەگەڕێ، ئەمجا لە سێلاگە وشكەكان سەرئەكەوێ. لە سەر بەردە سوورەكانی تەپۆلكەبەردینەكان لە سەر جێ سمی بزنەكان هەنگاو هەڵئەگەڕێ، هەتاو لە ئاسماندا ئەگەشێتەوە، بەڵام "با"یەكی ساردیش هەڵی كردوە، چونكە لە وڵات گەلێكی بێدارو دەوەن و ئاوەوە دێت. بایەك كە لە بێخی ئاسمانەوە دێت، لێرەدایە كە "ئیس سێر" یان "ڕاز" ئەژی.

ئەمجا ئەگاتە بەر فەلاتێكی سپی بەردین كە تاكو ئەو پەڕی ئاسۆ، تا ئاسمان كێشراوە، لەو هەموو ڕووناكیە بە شەوارە ئەكەوێ، "با"ی سارد لێوی ئەقڵیشێنێ و ئاو لە چاوی دێنێ.

"لالا" هێندە بینایی بە سەر ئاسماندا ڕائەگرێ كە دڵی بە توندی و نهێنی لە لاجانگ و سینەیدا ئەكەوێتە ترپە ترپ و پەردەیەكی سوور ئاسمان دائەپۆشێ، لە گوێیدا دەنگە دەنگێكی نەناسراو كە قاڵە قاڵ و زەنازەنایان پێكەوە ئەزرنگێتەوە.

پاشان لە نێوان فەلاتە بەردینەكانەوە تێئەپەڕێ، جێگایەك كە هەر مار و دوپشك هەن، لە سەر ئەو فەلاتەی كە ڕێگایەكی دیاری كراوی لێ نیە، بەڵكوو هەر تاشەبەردی تیژ و وردو گەورەن كە ئەبرووسكێنەوە. نە دارو درەخت و نە سەوزە بەدی ناكرێ، تەنیا "با" لە بۆشاییەوە هەڵ ئەكات. ئەوێ ژوانگەی جار بە جاری

پیاوەکەیە. نازانێ کێیە و لە کوێوە دێت، برێ جار سامناک و زۆر جاریش هێمن و ئارامە.

پڕاوپڕ لە جوانیەکی ئاسمانی، بەڵام لەبەر دەمامکە شینەکەی وەک جەنگاوەرانی بیابان، تەنیا چاوەکانی دیارە، پاڵتاوێکی سپی لەبەردایە کە وەک خوێ لەبەر خۆرەتاودا ئەدرەوشێتەوە.

لە سێبەری مێزەرە شینەکەیدا ئاگرێکی مات و سەیر لە چاوانیدا ئەگرێ. وەک کاتێ لە بڵێسەی ئاگر نزیک ئەبێتەوە، "لالا" هەست بە گوزەری تینی نیگای بە سەر روخسار و جەستەیدا ئەکات.

بەڵام "ئێس سێر" هەموو کات نایەت، تەنیا ئەو کاتانەی "لالا" زۆری نیاز پێیە.

کاتێ کە بەڕاستی ئەبێ ببینێ. وەک نیاز بە دواندن و گریان، بەڵام تەنانەت کاتێکیش نایەت، شتێک لەوبەر فەلاتە بەردینەکەوە هەیە، رەنگە نیگاهێکی ئاگرین کە دیمەنەکە ئەبریسکێنێتەوە، لەم سەر تا ئەو سەر ئاسۆ تێپەڕ ئەکات.

لە نێوان بەردەڵانەکەوە، بێ ئەوەی بۆی گرینگ بێت بۆ کوێ ئەڕوا، مل ئەنێ، لە سەر هەندێ لە بەردەکاندا کە نیشانەگەلی سەیر و سەمەریان پێوەیە. نیشانی خاچ، خاڵ، شێوەی هەتاو و مانگ. فلش گەلێ کە بە سەر بەردەکانەوە هەڵکنراون.

کورانی "سیتە" ئەڵێن، ئەبێ نیشانەی سیحر و جادوو بن. هەر لەبەر ئەوە تا فەلاتە سپیەکە ناڕۆن، بەڵام "لالا" لەو نیشانانە ناترسێ، ئەو لێی روونە پیاوی شین بە نیگای ئەی پارێزێ، ئەویش ئیتر لە بێدەنگی و بۆشایی و "با" ناترسێ. جێگایەک، کە کەسی لێ نیە، تەنیا پیاوی شین کە بێوچان، بێ ئەوە لەگەڵی بدوێ سەیری ئەکات. ئەو نیازی پێیەتی. بێسرتە دێت. بینایی لێواولێوە لە هێزو وزە، کاتێ ئەو لە پرشنگی نیگایدایە و لە سەر فەلاتەکەیە، بەختەوەرە، ئەشزانێ کە نابێ سەبارەت بەو لەگەڵ هیچ کەس بدوێ، تەنانەت لەگەڵ "عەمە"یش، چونکە ئەوە نهێنەکە، گرینگتر لە هەر شتێ، نهێنیە، چونکا هەر ئەو بێترس لە فەلاتە بەردینەکە سەر ئەکەوێ، لە بێدەنگی و بۆشایی "با"دا.

ڕەنگە شوانە "شلۆ"کەیش، کە ناوی "ئارتانی"ە، تا سەر فەلاتەکە بێت، کاتێ یەکێ لە بزنەکانی لە درێژای کەناوەکە مل ئەنێ. ئەویش لە نیشانەی سەر بەردەکان ناترسێ. بەڵام "لالا" هەرگیز ناوێرێ نهێنیەکەی لای ئەویش بدرکێنێ.

"لالا" پێی ئەڵێ "ئێس سێر"، «نهێنی»، چونکە نابێ کەس ناوی بزانێ. "ئارتانی" ناتوانێ قسە بکات. ئەڵبەت زمانی مرۆڤەکان نازانێ، بەڵام "لالا" دەنگی لە ناخیەوە ئەبیسێ. بە زمانە تایبەتەکەی شتانێک ئەڵێ کە ناخی ئەم ئەهەژێنێ.

ڕەنگە ئەو لەگەڵ هاژەی ئارامی "با"دا کە لە قووڵایی بۆشاییەوە دێت، بدوێ. یان لەگەڵ بێدەنگی نێوان هەناسەکانی "با"، لەوانەیە لەگەڵ وشەکانی ڕووناکیدا بدوێ.

ئەو وشانەی ئەتەقێنەوە و ئەپرژێنە سەر تەختە بەردەکان، وشەگەلی لم و بەردەوردکان کەوەک خۆڵ وردئەبن. هەروەها وشەگەلی مارو دوپشکەکان کە لە سەر تۆز و خۆڵەکە جێ پێیەکی سوکیان لێ بەجێ ئەمێنێ. ئەو بە هەموو ئەو وشانە ئەتوانێ بدوێ. نیگای لەم بەر بۆ ئەوبەر ئەپەڕێ، گیاندارێکی سووک و زیرەکە کە بە هەڵبازێنێک تا ئاسۆ ئەپەڕێ.

ڕێک بەرەو ئاسمان هەڵئەچێ. لە باڵندەکان بەر زتر ئەبێتەوە. "لالا" زۆری پێخۆشە بێتە ئێرە، تا سەر فەلاتە بەردینە سپیەکان، بۆ بیستنی ڕازە نهێنیەکان هەڵگەڕێ.

"لالا" "ئێس سێر" ناناسێ، نازانێ لەکوێوە دێ، بەڵام لە دیتنی لێرەدا، زۆر خۆشحاڵ ئەبێ، چونکە لە بیناییدا، لە زوبانیدا تین و گەرمای وڵاتی تەپۆڵکە و لمەکانی باشوور و زەویە بێدار و ئاوەکان هەیە.

تەنانەت کاتێ "ئێس سێر" نایەت، ئەڵێی ئەو هەر ئەتوانێ ببینێ. تێگەیشتنی ئاسان نیە، چونکە ئەڵێی لە خەودایە، ئەڵێی "لالا" بە تەواوەتی لەم دونیایە براوە، ئەڵێی لە دونیای ئەوبەر نیگای پیاوە شینەکەدایە. ئەمجا شتانی سەیر و جوان دەرئەکەون، ئەو شتانەی کە هەرگیز لە هیچ جێگایەکدا نەیدیوە و نایبینێ بەڵام

ئەیشێوێنێ و نیگەرانی ئەکات. پانتایی لمەکەی بە رەنگی زێڕ و گۆگرد ئەبینێ، بەرین و بێپایانە وەک دەریا. وەک شەپۆل گەلی بێجووڵەی گەورە، لەسەر پانتایی لمەکە کەس نیە، نە دارو نە سەوزە، هیچ، تەنیا سێبەری تەپۆڵکەکان کە درێژ ئەبنەوە و لەگەڵ یەک تێکەڵ ئەبن. لێرەدا هەموو شتێک یەک شێوەی هەیە، ئەڵێی لە ساتێکدا لێرەدایە، لە پڕ لەوێدایە کە نیگای بە هەڵکەوت ئەگرسێتەوە. ئەمجا جێگایەکی تر، جێگایەک لە نێوان زەوی و ئاسماندا.

لە نیگای ئەمدا تەپۆڵکەکان بە دەم جیاکردنەوەی لمی قامکەکانیان، کەوتوونەتە جووڵە، جۆگەی زێڕەکان لە قووڵایی دۆڵە ئاگرینەکان ڕێ کەوتوون.

ڕووناکیەکی بروسکەدار لە هەموو لایەک ڕێ کەوتوە. ڕووناکیەکان لە هەموو لایەک پێکەوە بە دونیا دێن، ڕووناکی زەوی و ئاسمان و هەتاو.

ئاسمان بێبنەتایە. تەنیا تەم و مژێکی وشک لە نزیک ئاسۆوە شەپۆل ئەدا، تیشک دانەوەکان تێک ئەدات. وەکوو سەوزەڵانی ڕووناکی ئەدەنەوە، تەپ و تۆزی ڕەنگ سوور و نارنجی لە "با"ی سارددا ئەبزوێن و بەرەو دڵی ئاسمان سەر ئەکەون.

ئەمانە هەموو نامۆ و دوورن، لەگەڵ ئەوەدا یار و هەڤاڵن، "لالا" ئەڵێی لە چاوی یەکێکی ترەوە بەردەم خۆی ئەبینێ. بیابانی پان و بەرین ئەبریسکێتەوە. هەناسەی "با"ی باشوور بەسەر پێستیەوە هەست ئەکات، کاتێ گەردەلوولێکی خەسی لمەکە هەڵئەکات، هەست بە لمە داخەکەی ژێر پێی ئەکات.

بە تایبەت هەست بە هەراوی ئاسمانی ژوور سەری، ئاسمانێکی بێلەکەو هەتاوێکی بێوێنە کە ئەدرەوشێتەوە، بۆماوەیەکی زۆر، ئەو ئیتر خۆی نیە، یەکێکی ترە، دوور و لە بیر چوو، شێوەگەلی تر ئەبینێ.

تارمایی منداڵەکان، پیاوەکان، ژنەکان و ئەسپ و وشترو مێگەلی بزنەکان، شێوەی شارێ ئەبینێ، شێوەیەک لە بەردو خاکی سوور، خاکرێژەگڵینەکان کە لەوێوە دەستەی جەنگاوەرەکان دێن، خەو نیە، بەڵام بیرەوەریەکی دیکەیە، لە ناخیدا، زەنازەناو غەڵبە غەڵبی پیاوەکان ئەبیسێ، گۆرانی و ئاهەنگی ژنەکان، ئەڵێی خۆیشی

سەما ئەكات و بە دەور خۆيدا ئەسوورێتەوە، قامكى قاچە رووتەكانى ئەكوتێ بە زەويدا، زرينگە زرينگى خرخاڵە مسينەكان و ملوانكە قورسەكان، پاشان لە پڕا وەك هەناسەيەكى "با" هەموو شت نوقم ئەبێ. تەنيا نيگاى "ئيس سێر" ئەمێنێتەوە، لە ئاقارى فەلاتە بەردينە سپيەكاندا ئەگيرسێتەوە.

ئەمجا "لالا" نيگاكەى خۆى ئەدۆزێتەوە. هەست بە ترپەى سيەكان و پێستى ئەكات. هەست بە بچووكترين شتەكان ئەكات. هەر بەردێ، هەر شەقارێ، هەر نيگارێكى بچووكى نێوان تەپ و تۆزەكە. بەرەو سێلاوگە وشكەكان دائەگەڕێ. خۆى لە بەردە تيژەكان و دڕك و دەوەنەكان ئەپارێزێ.

كاتێ ئەگاتە خوارەوە، ئەو هەموو رووناكى و "با"ى بێوچانە هێزى لێبڕيوە. بە كاوە خۆ لە سەر جادەكە، بەرەو "سيتە" مل ئەنێ، لەوێدا كە هێشتا سێبەرى ژن و پياوەكان ئەبزوێن. لە سەر كانيەكە، بە سەر چۆكەوە، دەست و رووى ئەشوا، ئەڵێى لە ڕێگايەكى زۆر دوورەوە هاتوەتەوە.

***

زەردەواڵەكانيشى خۆش ئەوێ، لە هەموو جێگايەكى شاردا ئەبينرێن، لاشەيان درێژ و زەرد و خەتخەتى رەش و باڵيان روون و ناسكە، سەر بە هەموو كونێكدا ئەكەن، بە قورسى باڵ ئەگرنەوە، بێئەوە بە كەسەوە بدەن بە دواى خواردن و مژيندا ئەگەڕێن. "لالا" زۆرى خۆش ئەوێن، زۆربەى كات چاويان تێئەبڕێ، كە لە بەر خۆرەتاودا ئەڵێى بە سەر كۆگاى زبڵەكانەوە يان دەوروبەرى گۆشتى قەسابيەكاندا، هەڵواسراون. برێ جار كە "لالا" پرتەقاڵ ئەخوات لێى نزيك ئەبنەوەو ئەيانەوێ بە سەر روومەت و دەستيەوە بنيشنەوە. جار جاريش بە لامل و قۆڵەكانيەوە ئەدەن كە بۆ چەن سەعات هەر ئەكزێتەوە. بەڵام گرينگ نيە، ئەو هەر خۆشى ئەوێن. مێشەكان وەك ئەوان باش نين. لاشەى درێژى زەردو رەشيان نيە، كلكيشيان وەك ئەوان درێژ نيە.

مێشەكان توند ئەفڕن و بەيەك بزاوت ئەنيشنەوە، پانن و دوو چاوى زلى سوور

و خۆڵەمیشی بە سەریانەوە زاق ئەروانێ.

"سیتە" هەمیشە سیخناخ لە دووکەڵە، کە لەسەر کۆڵیتە دارینەکان و لە درێژایی کۆڵانەکان کە زەویەکەیان پێشێل کراوە، رێ کەوتون. ژنەکان بە سەر ئاگردانەکانەوە چێشت لێ ئەنێن، بۆ سوتاندنی زبڵ و کوڵاندنی قیر بۆ سەربانەکان ئاگر دائەگیرسێنن. کاتێ بێکارە، بە تامەزرۆییەوە چاو ئەبڕێتە ئاگرەکان.

بۆ کۆ کردنەوەی چیلکەی ئەقاقیا تا سێڵاوگە وشکەکان ئەڕوا، چیلکەکان بە پەتێک بە کۆڵیەوە ئەبەسێت و بۆ "عەمە"ی ئەهێنێتەوە.

شۆڵەی ئاگر بە شادیەوە لە نێوان چڵە دارەکاندا هەڵئەبەزنەوە، دڕک و ساقەکان ئەگەشێنەوەو شیلەی گیاکان ئەسوتێن. شۆڵەکان لە هەوای ساردی بەیانان سەما ئەکەن و ئاهەنگێکی خۆش لێ ئەدەن.

"عەمە" ئەڵی ئەگەر سەرنجی نێوان شۆڵەکان بدەی، فریشتەی تێدا ئەبینی، تەنانەت ئەتوانی دیمەنیشی تێدا بەدی‌کەی. شار و رووبارو زۆر شتانی دیکە وەک هەور دەر ئەکەون و لە پڕ نوقم ئەبن.

ئەمجا زەردەواڵەکان خۆیان ئەگەیەنن. چونکا بۆنی گۆشتی مەڕ لە ناو تیانەکاندا بەرز بوونەتەوە. منداڵەکان لە زەردەواڵە ئەترسن، بەردیان بۆ ئەخەن، ئەیانەوێ دووریان کەنەوە، بەڵام "لالا" ئاسودە ئەهێڵێ بەدەور قژیدا بسوورێنەوە. ئەو ئەیەوێ لێیان تێ‌بگات، لە ویزە ویزەکەیان کاتێ باڵیان لێک ئەدەن.

کاتی نانی نیوەڕۆ، هەتاو بە تاقی ئاسمانەوە، بە هەموو هێزیەوە ئەگەشێتەوە. دونیا سپی سپیە، کەس بەردەمی خۆی نابینێ، سێبەرەکانیش وەک چاڵێکی هەڵکنراو رەش رەشن. پێش هەمووان کوڕەکانی "عەمە" دێنەوە. دوانن، یەکێکیان چواردە ساڵانە، ناوی "عەلی"ە، ئەویشیان هەڤدە ساڵە ناوی "بارکی"ە چونکە لە رۆژی لە دایک بوونیدا تەبەڕکیان کردبوو. "عەمە" پێش لە هەموو چیشت بۆ ئەوان دائەکات، ئەوانیش بێ‌ئەوەی ورتەیان لێوە بێت، بە پەلە ئەیخۆن، زۆر ئەخۆن و کاتێ ئەخۆن بە پشتە دەستیان زەردەواڵەکانیش ئەکوژن. پاشان مێردەکەی "عەمە" دێتەوە. لە سەر

کێڵگەن تەماتە لە باشوور کار ئەکات. ناوی "سەلیم"ە، بەڵام پێی ئەڵێن ""سووسی" ". چونکە لە ناوچەی چۆمی سووسیەوە هاتوە. زۆر بـچووک و لاوازە و دوو چـاوی سەوزی هەیە کە "لالا" زۆری پێ‌جوانە. گەرچی زۆربەی خەڵک ئـەڵێن پـیاوێکی تەوەزەلە، بەڵام خۆ ئەو زەردەواڵەکان ناکوژێ. برێ جاریش لە بەین قـامکەکـانیدا ئەیان گرێ و بە گاڵتەوە چزەکانیان دەردێنێ ئەمجا بە ئەسپایی ئەیخاتە سەر عەرزەکە بۆ ئەوەی باڵ بگرنەوە و برۆن. برێ جار کە میوانیان بۆ دێ، "عەمە" لەتێ گۆشتی بۆ دێنێ. "نوعمان"ی ماسی‌گر جارجار دێت بۆ ماڵیان. "لالا" هەمیشە لە هاتنی خۆشحاڵ و شاد ئەبێت. "نوعمان"یش ئەوی خۆش ئەوێ و چیرۆکی بۆ ئەگێڕێتەوە. "نوعمان" بە ئارامی نان ئەخوا و جارجار شتێکی پێکەنینی بۆ ئەگێڕێتەوە، "نوعمان" پێی ئەڵێ «لالا بچکۆلە»، چونکە لە رەگەزێکی پیرۆزە.

لە چاویدا هەست بە دیتنی رەنگی دەریـا ئـەکـات، ئـوقیانوس رەد ئـەبێت لە چاوانیدا لە ئاسۆ تێ‌ئەپەڕێ و تا شارە گەورەکان و ماڵە سپیەکان ئەڕوا، تا باخەکان و کانیەکان، "لالا" تامەزرۆی دیتنی شارەکانە، زۆربەی کات داوا لە "نوعمان" ئەکات بۆی بلێتەوە، تەنیا ناوەکان و بە کاوە خۆ، بۆ ئەوەی دەرفەتی دیتنی شتە نهێنیەکـانی بێت. "ئەلجەزیرە"، "گرانادا"، "سیڤیلا"، "مادرید".

کوڕەکانی "عەمە" ئەیانەوێ زۆرتر بزانن، چاوەڕوان ئەمێنن "نوعمان" دەست لە نان خواردن بگرێتەوە. هەموو جۆرە پرسیارێکی لێ ئەکەن سـەبارەت بـە ژیـانی ئەوێ، ئەو پەڕی دەریا.

ئەوان بە دوای خەو و خەیاڵەوە نین. بەڵکوو لە شتە واقیعەکان ئەپرسن. لە پارە و کار و قیمەتی جل و بەرگ و خواردنی و ماشین، لەوێ سینەمای لێیە یان نە؟

"نوعمان" زۆر پیرە، ئەمانە نازانێ، یانێ لە بیری چوەتەوە، یان رەنگە لەو ماوەیە کە ئەو لەوێ دوور بووە، دونیای ئەوێ گۆڕاوە. ئەمجا کوڕەکان شان هەڵئەتەکێنن. بەڵام هیچ نادرکێنن. چونکە "نوعمان" لە "مارسێ" برایەکی هەیە، رەنگە رۆژێ بـە کەڵکیان بێت.

برێ رۆژ "نوعمان" خۆی حەز ئەکا قسە بکات، لەو شتانەی دیتبوی بدوێ، هەمیشە پێی خۆشە بۆ "لالا"ی بگێڕێتەوە، چونکا پرسیاری لێ ناکات.

تەنانەت ئەگەریش ئەوانەی ئەیگێڕێتەوە راست نەبن، "لالا" هەر پێی خۆشە گوێی لێ بگرێت. شارە سپیە گەورەکانی رۆخی دەریا و هەموو رێ گوزەرەکانی دار خورماکان، باخەکان کە تا سەر تەپۆلکەکان درێژەیان هەیە، پڕ لە گوڵ و دار پرتەقاڵ و هەنار، بورجەکان کە تا ئاستی کێوەکان بەرز ئەبنەوە، شەقامەکان کە ئاخرەکەیان نابینرێ.

بە تایبەت لە ماشینە رەشەکان بۆی بلێ، کە بە ئەسپایی، بە تایبەت لە شەودا، بە چرا رۆشنەکانیانەوە دەئاژوون، هەر وەها روونـاکـی رەنگـا و رەنگـی نـوانگـەی دووکانەکان.

هەر وەها کەشتیەکی گەورەکە شەو ئەگاتە "ئەلجەزیرە"، بە ئەسپایی لە درێژای لەنگەرگە تەرەکەدا ئەخزێتە پێشەوە. خەڵکەکەیش بە قیرە قیر سەرو دەستیان بۆ راوەشێنن و بەخێر هاتنیان ئەکەن. جادە ئاسنینەکانیش بەرەو باشوور مل ئەنێن، شارە و شار، لە نێوان کێوە تەم و مژاویەکان تێئەپەڕن، لە چەم و کێوەکان و لە تونیلە درێژە تاریکەکانیش بە هەموو مسافرەکانیانەوە، تا ئەگاتە شاری گەورەی "پاریس". "لالا" بەدەم دڵە خورپێ و نیگەرانیەوە جوان گوێی بۆ شل ئەکات.

بیر لەوە ئەکاتەوە کە چەنێ حەز ئەکات لە سەر جادە ئاسنینەکە بێت، شارە و شار، تا جێگا نەناسراوەکان بۆ وڵاتێ کە ئیتر نە تەپ و تۆز ئەناسن نە سەگی برسی، نە کۆڵیتی دارین کە سیخناخ لە "با"ی بیابان ئەبێ.

ـ کاتێ ئەڕۆی منێش لەگەل خۆت ئەبەی؟

"نوعمان" سەر راوەشێنێ ـ من زۆر پیر بـووم، "لالا بـچکۆلە"، ئـیتر نـاچم رەنگە لە سەر جادەکە بمرم.

ئەمجا بۆ دڵنەوایی ئەڵێ: ـ بەڵام تۆ خۆت ئەڕۆی، هەموو شارەکان ئەگەڕێیت و ئەمجا ئەگەڕێتەوە، هەر وەک من.

ئیتر ئەویش بە دیتنی هەموو ئەو شتانەی ئەیەوێ لە چاوەكانی "نوعمان"دا، رازی ئەبێ. وەك كاتێ چاو بە قوولایی دەریادا ئەگێڕێ.

ماوەیەكی زۆر بیر لە ناوی جوانی شارەكان ئەكاتەوە و لە ژێر لێوەوە دیسان ئەیلێتەوە، ئەلێی گۆرانی ئەلێ، برێ جاریش "عەمە" پێی ئەلێت كە قسەی ولاتە سەیرەكانی بۆ بكات.

ئەمجا ئەو جارێكی‌تر سەفەرەكەی لە "ئیسپانیا"، لە سنوور و جادەكەی رۆخی دەریا ئەگێڕێتەوە و شاری گەورەی "مارسێ"، یەكبەیەكی ماڵەكان، و شەقامەكان، پلیكانەكان، لەنگەرگە بێ‌پایانەكان، جەرسەقیلەكان و كەشتیەكان كە بە ئەندازەی ماڵەكان گەورەن، یان رەنگە ئەونەی شارێ ئەبن، ئەمجا لە لەنگەرگە كە كامیۆن و واگون و بەرد و سیمانەكان دائەگرن و بە دەم فیكە كردنەوە ئەگەرێتەوە سەر ئاوە رەشەكەی بەندەر.

دوو كورەكەی "عەمە" گوێ لە هەموو ئەمانە ناگرن، چونكە باوەڕیان بە "نوعمان"ی پیر نیە. كاتێ "نوعمان" ئەڕواتەوە ئەلێن كە هەموو ئەزانن لە "مارسێ" چێشت لێنەر بووە، ئەمجا گەمەی پێ ئەكەن و پێی ئەلێن «تەبیب»، یانێ چێشت لێنەر.

بەلام بۆ "عەمە" گرینگ نیە "نوعمان" لەوێ چێشت لێنەر بوەو لێرە ماسی‌گر، هەر گوێی بۆ ئەگرێ و هەر جار پرسیارێكی دیكەی لێ ئەكات، بۆ ئەوە سەر لە نوێ بە سەر هاتی مسافرەتەكەی لە سنوورەكان و ژیانی لە "مارسێ"دا بگێڕێتەوە.

"نوعمان" شەڕ و هەرای جادە و شەقامەكانی شار ئەگێڕێتەوە، كە عەرەب و یەهوودیەكانیان ئەكوشت و ئەبوایە بۆ پاراستنی خۆیان لە شەقامەتاریكەكاندا هەمیشە چەقۆیان پێبوایەت. یان بەرد توور بدەن و كاتێ ماشێنی پۆلیس ئەهات ئەبوایە خێرا هەلێن و خۆیان بشارنەوە و خۆیان لە رۆشتنە زیندان رزگار كەن.یان بەسەر هاتی كەسانێ ئەگێڕێتەوە كە شەوانە بە قاچاخ كێوەكانیان ئەپێواو بە رۆژدا لە ئەشكەوت و نێوان دارو دەوەندا خۆیان دائەشاری، بەلام پولیسەكان برێ جار دوایان ئەكەوتن و كاتێ ئەهاتنە خوارەوە، ئەوبەر سنوور، هێرشیان ئەكردە سەریان.

"نوعمان" هەموو ئەمانە بە جۆرە خەم و پەژارەیەکەوە ئەگێڕێتەوە. "لالا" هەست بە سەهۆڵی ساردی نێوان چاوەکانی ئەکات. هەستێکی نامۆ و نەناسراوە بەڵام ئەیترسێنێ و هەڕەشەی لێ ئەکات، وەک گوزەری مەرگ و بەدبەختی، ڕەنگە "نوعمان"ی پیر ئەم هەستەی لەو شارانەی ئەوبەر دەریا، لەگەڵ خۆی هێنا بێ. "نوعمان"ی پیر بڕێ جاریش بەسەر هات گەلێ ئەگێڕێتەوە کە بیستوویەتی. زۆرتریش بۆ ئەو منداڵانەی ئەگێڕێتەوە کە پرسیاری لێ ناکەن.

هەندێ ڕۆژ لە ڕۆخی دەریا، لە سێبەری دار هەنجیرەکە بەدەم دروست کردنەوەی تۆڕەکانیەوە، جوانترین چیرۆکەکانی ئەگێڕێتەوە. بە سەر هاتی سەر ئوقیانوس، لە تۆفان و زریاندا لەناو کەشتیەکاندا، چیرۆکی نوقم بوونی کەشتیەکان لە دوڕگە نەناسراوەکان.

"نوعمان" هەموو جۆرە چیرۆک و بە سەر هاتێ ئەزانێ. بۆ وێنە لە سێبەری دار هەنجیرەکە "لالا" چاو ئەبڕێتە دەستە گەورە بۆرەکانی و نینۆکە شکاوەکانی کە خەریک دروست کردنەوەی تۆڕەکانیەتی و چالاکانە ئەبزوێن. لە پڕ چاوی بە کونێکی گەورەی تۆڕەکە ئەکەوێ بە ئاسایی ئەڵێ ـ ماسیەکی گەورە وای لێ کردوە؟

"نوعمان" بە جێی وەڵام دانەوە تۆزێ ڕائەمێنێ و ئەڵێ ـ بۆم نەگێڕایتەوە ئەو ڕۆژە کە کۆسە ماسیەکەمان گرت، نە؟

"لالا" سەری ڕائەوەشێنێ و "نوعمان" چیرۆکێکی دیکە دەست پێ ئەکات. وەک لە زۆربەی چیرۆکەکاندا تۆفان و زریان و هەورە تریشقە ئاسمان دائەگرن، شەپۆلەکان سنگ لە ئاسمان ئەکوتن، لێزمەی بارانە و تۆڕەکە قورسە، هێندە قورسە بە دەم هەڵکشانیەوە، کەشتیەکە لارەوسەنگ ئەبێ، ترسی خنکان، ئەیان تۆقێنێ. کاتێ تۆڕەکە هەڵئەکێشن، کۆسەماسیەکی شینی زەبەلاح زارە پڕ لە دانە سامناکەکانی پیشانیان ئەدات.

زۆرانبازی کۆسەماسیەکە، کە ئەیەوێ تۆڕەکە ببا و بڕوا، لەگەڵ ماسیگرەکان دەس پێ ئەکات.

بە تەورو دار بە سەرو ملیدا ئەکوتن. بەڵام کۆسەماسیەکە گاز لە قەراخ کەشتیەکە ئەگرێ و تێکی ئەشکێنێ، هەر وەک پارچە سەندووقێک. بەڵام لە ئاکامدا کاپیتانەکە بە چڵەدارێ بێ گیانی ئەکات و هەڵیئەکێشنە سەر کەشتیەکە. سکی هەڵئەدرن، ئەنگوستیلەیەکی زێڕین کە بەردێکی بە نرخی سووری بە سەرەوەیە، دەری دێنن، بریسکەی دێ. هێندە جوانە، ناتوانن بینایی لێ بگوێزنەوە. شتێکی ئاسایە، هەر کامیان ئەنگوستیلەکەی بۆ خۆی ئەویست، ناکۆکیەکەیان پەرەی سەند. خەریک بوو لە سەر ئەنگوستیلە نەفرەتیەکە یەکتر بکوژن. پاشان بە پێشنیاری من تاسەکانمان هەڵئەخست. کاپیتان جوتێ تاسی لە ئێسک بوو.

لە عەرشەی کەشتیەکەدا بەو تۆف و زریانە، شەش کەس بووین، شەش جار هەڵمان خست، دوای دەوری یەکەم هەر من و کاپیتانماینەوە. چونکە هەر کاممان یازدە جار هەڵمان خستبوو. شەش و پێنج، ئەوانی دی ئاپوورەیان دابووین. من هەڵم خست، جووت شەش بوو. ئەنگوستیلەکەم بردبوەوە. بۆ چەن سات بەختەوەر بووم. هەرگیز لە ژیانمدا بەو ئەندازە تامی بەختەوەریم نەچەشتبوو.

ماوەیەکی زۆر چاوم تێبڕی. بەردە سوورەکە وەک ئاگری جەهەننەم ئەگەشایەوە و وەک خوێن سوور بوو. ئەمبینی چاوی هەڤاڵەکانم هەر بە هەمان برووسکەی ناحەزەوە ئەدرەوشێنەوە. تێگەیشتم کە ئەنگوستیلەیەکی نەفرەت لێ کراوە. ئاخر هی کەسێکی تر بوە و کۆسە ماسیەکە هەڵی لووشیبوو، زانیم کە لای هەر کەسیش بێت، ئەویش هەر نەفرەت لێکراوە.

جوان سەرنجیم داو فڕێم دایە ناو دەریا. کاپیتان و هەڤاڵەکانم هێندە تووڕە و قەڵس بوون ئەیان ویست منیش بخەنە دەریاکەوە.

ئەمجا من وتم: بۆ لێم تووڕەن؟ ئەو شتەی لە دەریاوە دێت ئەگەڕێتەوە بۆ دەریا، ئێستا وەک ئەوەی هیچ رووی نەدابێ.

لەوکاتەدا تۆف و زریانەکە هێمن ببوەوە و هەتاو ئەدرەوشایەوە. دەریاوانەکان ئارام ببوونەوە و کاپیتانیش کە ئەونە هەستی ئەکرد نیازی بە ئەنگوستیلەکەیە، خێرا لە

بیری چووبووەوە، بە منی وت: کارێکی باشت کرد فرێت دایە دەریاکەوە. پاشان لاشەی کۆسە ماسیەکەشمان فڕێ دایەوە دەریا و بۆ دروست کردنی تۆڕە دڕاوەکە گەڕاینەوە بۆ قەراخ دەریا.

"لالا" پرسیاری کرد: بە ڕاستی پێت وایە ئەنگوستیلەکە نەفرەت لێ کراو بوە؟

ـ نازانم، بەڵام لێم ڕوونە ئەگەر نەم خستایەتە دەریاوە هەرئە و ڕۆژە یەکێکیان بۆ وەدەست هێنانی، منی ئەکوشت و هەر بەو جۆرە یەکەیەکە هەموو ئەکوژراین.

"لالا" زۆر حەز لەو چیرۆکانە ئەکات، لە سێبەری دار هەنجیرەکە، ڕووە و دەریا، لای ماسیگرەکە دائەنیشێ، "با" گەڵای دارەکە ئەشەکێنێتەوە، ئەڵێی چاوەڕوانی دەنگی دەریایە.

بەقسەکانی "نوعمان" ئارام پێڵوەکانی قورس ئەبێ، خەو بە سەر جەستەیدا زاڵ ئەبێت. لە سەر لمەکە خۆی ئەگلێنێتەوە، سەری ئەنێتە سەر ڕەگی دار هەنجیرەکە، ماسی گرەکە تۆڕەکە بە تەنافی سوور ئەدوورێتەوە، زەردەواڵەکان لە سەر خوێکاندا ویزەیان دێت.

***

ـ هۆ... "ئارتانی"!

لالا لە "با" دا بەرز ئەقیژێنێ. بە دەم نزیک بوونەوە لە تەپۆڵکەی بەردە وردەکان و دڕکە جارەکەدا.

جارجار مارمیلکەکان دەر ئەپەڕنە دەرەوە. تەنانەت برێ جاریش مارەکانیش ئەبینێ کە ئەخشێن.

گیا بەرزەکان و زۆربەی دار خورما کورتەکانیش کە حەسیرو سەوە تەیان لێ دروست ئەکەن، وەک چەقۆ تیژن.

ویزە و خشەی دەعباکان لە هەموو جێگایەکدا هەیە. بەردەکان لەملاولا پڕن لە کانی و چاڵی گەورەی شارباوە و ئاوی سارد، چاوە ڕوانی ڕێبوارەکانە. "لالا" بەدەم تێپە ڕینەوە بەرد ئەخاتە شەقارەکان و گوێ ئەگرێت بۆ دەنگ دانەوەی لە تاریکی

نێوان بەردەکاندا.

- ئارتا، ئا - ئانی!

زۆربەی کات بەگەمەوە لە بنە دەوەنێکدا خۆی دائەشارێ. هەمیشە کراسێکی درێژی بۆری لە بەردایە کە قۆڵ و ئەنیشکی ریشاڵ ریشاڵ بووە. بە پەروویەکی درێژ سەر و ملی داپێچاوە.

وەک گیای "لیان"(جۆرە گیایەکی "ئەمریکی") لەرو درێژ هەڵکشاوە و دوودەستی جوانی بۆر و نینۆکی بە رەنگی عاجن، لاقەکانیشی ئەڵێی هەر بۆ کێبەرکێ و راکردن دروست کراون.

بەڵام بە تایبەت ئەو سەرنجی "لالا" رائەکێشێ. چونکە لە کەسی دیکە ناچێ، روخسارێکی لاواز و ساف تەوێڵی بەرز و برۆی رێک و دوو چاوی گەورەی رەشی قەترانی، قژی کورت و لوولە و سمێڵ و ردێنی نیە. کاتێ چاوەکانی راست ئەبڕێتە شتێ ئەڵێی لە خۆی دڵنیایە و باوەڕی هەیە، بێ‌ترس سەرنج ئەدات. ئەزانێ پێبکەنێ. بە پێکەنینە دەنگ دارکەیەوە بەختەوەری و خۆشحاڵی پێشکەش ئەکات. ئیمرۆ خێرا ئەیبینێتەوە، چونکە خۆی دانەشاردوە، لەسەر بەردێکی گەورە دانیشتوە و راستەوخۆ چاوی بڕیوەتە بەردەمی، بەرەو مێگەلی بزنەکان، جووڵەی لە خۆی بڕیوە، "با"کراسە بۆرەکەی ئەشەکێنێتەوە، نووکی سەر پێچەکەی ئەبزوێنێ.

"لالا" بێ‌ئەوە بانگی لێ بکات سەر ئەکەوێ، ئەزانێ کە "ئارتانی"گوێی تیژە، تەنانەت بزووتنی کەروێشکێک لەوبەر تەپۆڵکەکانەوە ئەبیسێ، هەمیشە بەر لەوە دەنگی فڕۆکەکان لە ئاسماندا بەرزبێتەوە، بە "لالا"ی نیشان ئەدات.

کاتێ "لالا" جوان لێی نزیک ئەبێتەوە، "ئارتانی" ئاوڕ ئەداتەوە، هەتاو روخسارە رەشەکەی ئەسوتێنێ، پێ‌ئەکەنێ و ددانەکانی ئەبریسکێنەوە.

ئەگەر چی لە "لالا" منداڵترە، بەڵام کەڵەگەت و باڵا بەرزە، چەقۆیەک لە دەستیدایە.

- ئەو چەقۆیەت بۆ چیە؟

ڕێبوانەکە شەکەت و ماندووی کردوە، لە سەر بەردێک دائەنیشێ، ئەویش بەسەر قاچێکەوە لە بەردەمیا ئەوێسێ. لەپڕ بە پشتا هەڵئەبەزێتەوە و لە نێوان تەپۆڵکەی بەردەڵانەکەوە دەست ئەکا بە ڕاکردن. دوای چەن سات دێتەوە. زەلێکی بەدەستەوەیە کە لە زەلکاوەکە بڕیویەتی.

بە پێکەنینەوە بە "لالا"ی نیشان ئەدا. وەک سەگێ کە توند هەڵاتبێ هەناسە بڕکێی پێ کەوتوە.

"لالا" ئەڵێ: جوانە، ئەتەوێ ئاهەنگی پێ لێ بدەی؟

لە ڕاستیدا ئەوەی نەپرسیبوو، لە ژێر لێوەوە وتبووی و دەستی بزواندبوو. کاتێ ئەدوێ "ئارتانی" بێ جووڵە، چاوی تێ ئەبڕێ و بە سەرنجەوە هەوڵ ئەدا لێی تێ بگات.

ڕەنگە هەر تەنیا "لالا" لێی تێبگات. کاتێ وتی ئاهەنگ، "ئارتانی" هەڵی خستەوە.

دوو قاچی بڵاو کردەوە ئەڵێی سەما ئەکات. بە قامکی فیکە لێ ئەدات، هێندە بەرز کە مەڕو بزنەکان لە پانتایی تەپۆڵکەکەدا ئەلەرزن.

چەند زەل لە دەستیدا پێکەوە ئەلکێنێ و فووی تێ ئەکات. مۆسیقایەکی پێکەنینی گڕو خەمین وەک گۆرانی شوانەکانی "شلۆ" بڵاو ئەبێتەوە. بێ هەناسەکێشان، بێ وچان لێی ئەدات. ئەمجا ئەیدا بە "لالا" ئەویش لێی ئەدا. "ئارتانی" بێجووڵە، لە نیگایدا حەز و ئارەزوویەک ئەبینێ، بە نۆرە لە زەلە بچووک و درێژەکان ئەدەن.

مۆسیقایەکی پڕ خەم و پەژارەکە ئەڵێی لە دیمەنی سپی ڕووناکیەکە دەر ئەپەڕێتە دەرەوەو لە چاڵایی ئەشکەوتەکانی ژێر زەویەوە، تەنانەت لە ئاسمانەوە ئەهات کە "با" کەوتبوە هاتوو چوو.

بەیناوبەین، لە پڕ دەست لە لێدان هەڵئەگرن، هەناسە بڕکێیان پێ کەوتوە، کوڕە

لاوەکە ئەتریقێتەوە، "لالا"یش بێ ئەوە هۆکەی بزانێ دەست ئەکا بە پێکەنین.

لە سەر بەردەڵانەکە رێ ئەکەون، "ئارتانی" دەستی "لالا" ئەگرێ چونکە تەپ و تۆزە خەسەکە پڕە لە بەردی نووکی تیژ.

بە سەر دیوارە بەردینە وشکەکاندا ئەپەڕنەوە، بە درکە جارەکەدا، بە خێرایی تێئەپەڕن. "ئارتانی" هەموو شتی بەردەڵانەکە و پانتایی تەپۆڵکەکانی پێی نیشان ئەدات. ئەو باشتر لە هەر کەس شارەزای جێگا شاراوەکانە، جێگای دەعبا زێڕینەکان، کوللە و دەعبای گژ و گیا و شێخەکەکان، هەموو چەشنە گیایەک ئەناسێ، گیاگەڵی کە کاتێ لە ناو دەستیدا ئەیپروێنێ هەست بە بۆنێکی خۆش ئەکەن، رەگەکانیان پڕ لە ئاون و تامی بیبار و نەعنا و هەنگوێن ئەدەن.

دانەگەلێ کە لە ژێر ددانیاندا تەقەیان دێت. مێوە گۆشتیە هەرە بچووکەکان لێو و دەستیان شین ئەکات. ئەو تەنانەت جێگای نهێنی شەیتانۆکەکان و وردە لمەکان کە بە شێوەی ئەستێرەن، ئەزانێ.

"لالا" لە گەڵ خۆی ئەبات تا ئەو بەر دیوارە بەردینە وشکەکان، تا درێژای کوێرە رێگاکان کە "لالا" شارەزای نیە تا لووتکەی تەپۆڵکەکان ئەیبات، لە شوێنێکەوە کە بیابان دەست پێ ئەکات.

چاوەکانی ئەبریسکێتەوە، پێستی روخساری رەش و گەشە، کاتێ ئەگەنە سەر تەپۆڵکەکە، باشووری پێ نیشان ئەدات، جێگای لە دایک بوونی.

"ئارتانی" لە هیچکام لە کوڕانی "سیتە" ناچێ، کەس نازانێ بە راستی لە کوێوە هاتوە، تەنیا ئەڵێن، رۆژێ لە رۆژان، زۆر لە مەو پێش، کابرایەک بە سەر وشترێکەوە هاتوە. جل و بەرگی جەنگاوەرانی بیابانی لەبەر بووە. پاڵتۆیەکی شینی ئاسمانی و دەمامکی شینی هەڵبەستوە، لای چاوانەی ئاوەکە بۆ حەسانەوەو ئاو خواردن گیرسابووەوە. "یاسەمینا"ی ژنی شوانەکەیش لەوێ بوو. کاتێ کابرای نەناسراو رۆشتبوو. لە قەراخ چاڵەکە، ساوایەکی پێچراوە لە پەڕوویەکی شیندا دیتبوو. کەس منداڵەکەی نەویستبوو، "یاسەمینا"یش منداڵەکەی بە لای خۆیەوە بەخێو کردبوو هەر

وەک ئەندامی خێزانەکەی، وەک کوڕی خۆی گەورەی کردبوو. منداڵەکە هەر ئەم "ئارتانی"ە بوو.

ئەوە ناز ناوەکەیەتی، چونکە وەک کوێلەکانی باشوور پێستی رەش رەشە، "ئارتانی" لەوێداکە جەنگاوەرە بیابانیەکە جێی هێشتبوو، گەورە ببو. لە بەردەڵانی لای تەپۆڵکەکان، لەو جێگەیەی کە بیابان دەست پێ ئەکا، وەک هەموو کوڕەکانی دیکە شوانە، شوانی بزنەکانی "یاسەمینا".

ئەو ئەزانێ چۆن خەریکیان بێت و چۆن هەڵس و کەوتیان لەگەڵ بکات. بێ ئەوە لێیان بدات، بۆ هەر جێگایەک بیەوێ ئەیانبات، تەنیا بە فیکە لێدان بە قامکەکانی. حەیوانەکان لێی ناترسن. هەر بەو چەشنە لەگەڵ زەردەواڵەکانیش ئەدوێ بە دەستی فیکە لێ ئەدات و رێیان پێ‌نیشان ئەدات.

خەڵک نەختێک سڵی لێ ئەکەنەوە. ئەڵێن کە "مەجنوونە"، دەستی لەگەڵ شەیتان تێکەڵە و هێزەکانی لەو ئەگرێ. ئەڵێن ئەتوانێ بە مار و دووپشک فەرمان بدات و بیان نێری بۆ کوشتنی ئاژەڵی شوانەکانی‌تر. بەڵام "لالا" باوەری بەم ورینانە نیە. لێی ناترسێ و رەنگە تەنیاکەسێکە، باش ئەیناسێ، چونکە لەگەڵیدا قسە ئەکات. بەڵام نەک بە رستە و وشە، ئەو بۆی ئەروانێ و لە بروسکەی چاوە قەترانیەکانیدا تێ ئەگات. لە قووڵایی چاوە هەنگوینیەکانیەوە چاوی تێئەبڕێ.

"لالا" تەنیا سەیری روخساری ناکات. بەڵکو لە راستیدا بینایی بە سەر ناخی چاوەکانیدا رائەگرێ و لێی تێ ئەگات. "عەمە" پێی خۆش نیە "لالا" هێندە خێرا خێرا بۆ دیتنی "ئارتانی" تا بەردەڵانی تەنیشت تەپۆڵکەکان ئەروا. بە "لالا" ئەڵێ کە ئەو منداڵێکی دۆزراوە و نامۆیە و وەک کوڕانی دیکە نیە.

بەڵام "لالا" دوای کارەکانی لە ماڵ "عەمە"، لە سەر جادەکە بەرەو تەپۆڵکەکان مل ئەنێ‌و رائەکات و وەک "ئارتانی" بە قامکی فیکە ئەکێشێ و دەست ئەکات بە قیژەقیژ.

«ئو هۆ.... "ئارتانی"!» برێ جار تا داچوونی هەتاو لای ئەمێنێتەوە، ئەمجاکوڕە

لاوەکە ئاژەڵەکان کۆئەکاتەوە بەرەو ئاخورەکەی لای ماڵ "یاسەمینا" دائەگەڕێن.

زۆربەی کات چونکە قسە ناکەن، لە سەر تاشە بەردەکانی بەرانبەر تەپۆڵکەکان جووڵە لە خۆیان ئەبڕن. کەس نازانێ لەو کاتەدا خەریک چین، ڕەنگە ماقی بەردەم خۆیان ئەبن، ئەڵێی لە نێوان تەپۆڵکەکانەوە تا ئەوپەڕ ئاسۆ ئەبینن.

"لالا" خۆیشی نازانی چی ڕووئەدا، چونکە کاتێ لای "ئارتانی"ە، کات مانای نیە، وتەکان بە ئازادی دێن و ئەڕۆن، بەرەو "ئارتانی" ئەڕۆن و ئەگەڕێنەوە، ئەمجا مانایەکی دیکە ئەگرن، ئەڵێی هەر دوو پێکەوە خەو ئەبینن.

"ئارتانی" فێری کردوە، ئاوا، جووڵە لە خۆی بڕێ و ماقی ئاسمان و بەردو دەوەن بێت. سەیری فڕینی زەردەواڵە و مێشەکان بکات و گوێ لە گۆرانی دەعبا نادیارەکان بگرێت.

هەست بە سێبەری باڵندە راوچیەکان و لەرزینی کەروێشکە سەحراییەکانی درکە جارەکە بکات. لە راستیدا "ئارتانی" کەس‌وکار و خێزانی نیە، ئەویش وەک "لالا" خوێندن و نووسین نازانێ، تەنانەت نازانێ نوێژ بکات، قسە بکات.

"لالا" زۆر حەز لە روخسارە ساف و لووسەکەی ئەکات و دەستە درێژەکانی و چاوە قەترانیەکەی و پێکەنینەکەی، خۆشی لە رێگە رۆشتنەکەی دێت کە وەک سەگێکی راوچی سووک هەڵدە بەزێتەوە. لەم بەرد بۆ ئەو بەرد ئەپەڕێتەوەو لە ماوەی چاو تروکانێکدا خۆی ئەشارێتەوە، هەرگیز نایەتە ناو شار. ڕەنگە لە کورەکانی دیکە بترسێ. چونکە لەوان ناچێ، ئەو هەر بەرەو باشوور ئەڕوا، لەویا کەجێ پێی سەحرانشین و وشتر سوارەکان ئەبینرێ، بێ ئەوە کەس بزانێ لە کوێیە چەن رۆژ گوم ئەبێ و و لە پڕ دێتەوە و لەگەڵ مەڕو بزنەکان ئەڕواتەوە بۆ بەردەڵانەکە ... ئەڵێی هەر ساتێ لەوێ دوور بوەتەوە.

کاتێ پێکەوە لە سەر بەردێک دائەنیشن چاو ئەبڕنە پانتایی بەردەڵانەکەی بەر هەتاو و جار بە جارێ "با"یەک هەڵ ئەکات و زەردەواڵەکان بە سەر رێگا ڕەنگ خۆڵەمێشیە بچووکەکانەوە ویزە ویزیان دێت و دەنگی پێی مەڕو بزنەکان بە سەر

بەردەڵانەکاندا کە لە ژێر پێیاندا ڕۆ ئەچێ، بە ڕاستی نیازیان بە چی‌تر نیە. "لالا" هەست بە شاڵاوی گەرما لە ناخیدا ئەکات. ئەڵێی بە تێکرا ڕووناکی ئاسمان و بەردەکان تا ناخی ئەگرێت و لوول ئەخوا و گەورە ئەبێتەوە.

"ئارتانی" بە دەستە گەورە بۆرەکەو قامکە درێژەکانیەوە دەستی "لالا" ئەگرێ و هێندە توند ئەیگووشێ کە ئێشی پێ ئەگات. "لالا" لە ناو لەپی دەستیدا هەست بە خولانەوەی گەرما ئەکات، وەک لەرزشێکی گەرمی ناسک، نیازی بە دواندن و بیرکردنەوە نیە، بەم چەشنە ئەتوانێ تەواوی ڕۆژ بمێنێتەوە، بێ جووڵە تا کاتێ کەناوەکان سیخناخ ئەبن لە شەو، بۆ بەردەمی ئەڕوانێ و وردترین دیمەنی هەر بەردو گژ و گیایەک ئەبینێ و هەر جۆرە تەقە و خشپەیەکی دەعباکان ئەبیسێ.

مشەمشی ئارامی هەناسەکانی هەست پێ ئەکات، ئەوەندە لێی نزیکبووەتەوە کە بە چاوەکانی ئەو ئەبینێ و بە پێستی ئەو، هەست بە دەوروبەری ئەکات، هەر ساتێکە، بەڵام ئەو هەست ئەکا ماوەیەکی زۆرە لەو حاڵەتەدایە.

لە پڕ وەک بڵێی لە شتێ بسڵەمێتەوە، دەست "لالا" بەر ئەدات و وەک سەگێکی ترساو بێ‌ئەوە ئاوڕ بداتەوە ڕائەکات، بە سەر بەردەکان و کەناوە وشکەکاندا ئەپەڕێتەوە، لە دیوارە بەردینە وشک هەڵاتووەکان تێئەپەڕێ، "لالا" سێبەرە ڕووناکەکەی ئەبینێ کە لە نێوان درکە جارەکەدا ون ئەبێ. «"ئارتانی"! "ئارتانی"، بگەڕێوە» "لالا" بەسەر بەردێکەوە ئەوێسێ و ئەقیژێنێ. دەنگی ئەلەرزێ چونکە ئەزانێ بێ سەمەرە. لەپڕ "ئارتانی" نوقم ئەبێ. یەکێ لە چاڵە تاریکەکانی ناو بەردە تاهەکیەکان هەڵی ئەلووشێ. ئەمڕۆ ئیتر خۆی دەرناخات. ڕەنگە بەیانی یان دێرتر. ئەمجا "لالا"یش لای تەپۆڵکەکەوە دائەگەڕێتە خوارەوە، لە بەردێ بۆ بەردێکی‌تر نەزانانە ئەپەڕێتەوە، جار جاریش ئاوڕ ئەداتەوە، بەڵکوو شوانەکە ببینێ، لە بەردەڵانەکە و وشکە دیوارەکان تێئەپەڕێ، بەرەو قووڵایی دۆڵەکە دائەگەڕێ لەو جێگەیەدا کە دەریا زۆر دوور نیە و مرۆڤەکان لەو ماڵانەی کە بە دارو تەنەکە و قیر دروست کراون، ئەژین.

***

لێرە، لە "سیتە"! هەموو رۆژەکان وەک یەکن و برێ جار لەو رۆژەی تێیدا ئەژین دڵنیا نین،زەمانێکی کۆنە و هیچ بەڵگە و تاپۆیەک بۆ دڵنیایی نیە. تازە، خۆکەس بیریشی لێ ناکاتەوە، کەس لە خۆی ناپرسێ کە بە راستی کێیە؟ بەڵام "لالا" هەمیشە لەو کاتانەدا لە فەلاتە بەردینەکە سەر ئەکەوێ، بۆ جێژوانی پیاوە شینەکە، کە پێی ئەڵێ «ئێس سێر» ئەو پرسیارە لە خۆی ئەکات.

لەوانەیە بە هۆی زەردەواڵەکانیشەوە بێت. لە "سیتە" هێندە زەردەواڵە زۆرن، تەنانەت لە ژمارەی ژن و پیاوەکانیش زۆرترن. لە گزنگی بەیانەوە، تا تەنگی شێوان بە دوای خواردندا ویزە ویزیان دێت، لە رووناکی هەتاودا سەما ئەکەن.

بەڵام ساتەکان هەرگیز یەک نین، وەک وشەکان کە لە زاری "عەمە" دێنەدەر، وەک روخساری کچانی سەر کانی. سات گەلێکی داخ و ئاگرین کە هەتاو بەسەر جلەکانەوە پێستی ئەسوتێنێ و چاوی دەرزیئاژن ئەکات و لێوی شەقارشەقار.

ئەوکاتە "لالا" بە تەواوەتی خۆی لە پەڕۆ شینەکەدا دائەپێچێ، بە سەرپۆشێکی گەورە پشت سەرو چاوی ئەپێچێتەوە و بە پەڕۆیەکی دیکە سەر و سینگی ئەبەسێ.

هالاوێکی ئاگرین لە بیابانەوە دێت، فوو لە دەنکە خۆڵەکان ئەکات. لە دەرەوە لە کۆڵانەکانی "سیتە" کەس نیە. تەنانەت سەگەکان لە چاڵایی زەویدا، لە تەنیشت ماڵەکان و بەرمیلە خاڵیەکاندا خۆیان حەشارداوە.

بەڵام "لالا" حەز ئەکا لەم رۆژانەدا لە ماڵ بێتەدەر، رەنگە هەر بە خاتر ئەوەکە کەس لە دەرەوە نیە، ئەڵێی لە سەر زەوی هیچ شتێک کە مافی مرۆڤەکانی پێوەبێت نەماوە.

ئەوکاتە هەست ئەکا لە خۆی دوور ئەبێتەوە، ئەڵێی هیچ لەو کارانەی کردویەتی گرینگ نین، ئەڵێی هیچ بیرەوەری و یادێ بوونیان نیە. ئەمجار بەرەو دەریا مل ئەنێ لەو جێگەیەدا کە تەپۆلکەکان دەست پێ ئەکەن جەستەی ئەنیشێنێتە سەر زەوی،

پێچراوە لە نێو پەرۆیەکی شیندا، روو ئەکاتە تەپ و تۆزە بەرزۆ بووەکە. سینگی ئاسمان شینێکی تۆخی مەیلەو رەشە. کاتێ بەرەو ئاسۆ هەڵئەروانێ، لە ئاستی تەپۆڵکەکان کە تەنیا لە کاتی کازیوەدا ئەم رەنگە ئاڵ و خۆڵەمێشیە بینیوە.

ئەو رۆژانە مێش و زەردەواڵەکانیش ئازادن، چونکە "با" بەرەو چاڵایی بەردەکان رایان ئەکێشێ بۆ نێوان هێلانە گڵینە وشکەکانیان، یان کونجی تاریکی ماڵەکان.

نە پیاوی لێیە، نە ژن و نە منداڵ، نە سەگ و نە پەلەوەر. تەنیا "با" لە نێوان چڵ و پۆپی دەوەنەکاندا لە نێوان گەڵای ئەقاقیاکان و هەنجیرە وەحشیەکاندا گفەی دێت.

هەزاران بەرد روخساری ئەدەنە بەر قامچی و لە نەوارێکی درێژدا، بە شێوەی مار و دووکەڵ لێک جیا ئەبنەوە. هاژە هاژی "با"، لرفە لرفی دەریا و خرەخرِی ریخ، "لالا" دائەنەوێ هەناسە بکێشێ، پەرۆ شینەکە لکاوە بە پەرەی لووت و لێویەوە.

ئەڵێی وەک "نوعمان"ی ماسیگر و هەڤاڵەکانی، لە کەشتیەک دایە و لە سەر دەریا و لە تۆف و زریاندا وون بوە. ئاسمان چۆڵ و سەر سوور هێنەرە. زەوی دیار نیە، یان بە بۆنەی دابرانی هیلالی لمەکە بە سەختی ئەبینرێ.

"لالا" نازانێ لەم رۆژانەدا بۆ لە دەرەوەیە، ناتوانێ لە زیندانی ماڵی "عەمە" بمێنێتەوە، تەنانەت ناتوانێ لە کۆڵانەکانی "سیتە" هەنگاو هەڵگرێ، "با"یەکی ئاگرین لێوەکانی و پەرەی لووتی وشک هەڵئەگەرێنێ و بە ناخیدا دائەگەرِێ، وەک بڵێی پرشنگەکانی ئاسمانە، ئاگرێکە لە رۆژهەڵاتەوە دێت و "با" جەستەی لە ئاگر سیخناخ ئەکات. بەڵام رووناکی هەر ئەیسووتێنێ، "لالا" ئازادە و هەست ئەکا سووک و چالاک بووە. هەر دوو دەستی لە لمی تەپۆڵکەکە گیر ئەدات، چەناکەی ئەنێتە سەر ئەژنۆی، هەناسە برکێی پێ کەوتوە، نایەوێ لەوە زۆرتر سووک بێت، هەوڵ ئەدا لە شتێ باش بیرکاتەوە. بەڵکو "با" لەگەڵ خۆی نەیبات. بیر لە "عەمە" ئەکاتەوە و لە "ئارتانی" و بە تایبەت لە "نوعمان". بەڵام لەو رۆژانەدا لە راستیدا شتێکی گرینگ و سەیر رووی نەدابوو. بیری هەڵدێ، ئەڵێی "با" بەرزی ئەکاتەوە و ئەیبا بۆ ئاستی

تەپۆلکەکان. ئەمجا لەپڕ نیگای پیاوە شینەکە هەست پێ ئەکات. نیگاکەی سەر فەلاتە بەردینەکەی سنووری بیابانە، نیگایەکی خاڵی و باڵا دەستانە بە سەر شانیەوە، لەگەڵ قورسایی "با" و رووناکی قورس ئەبێت.

نیگایەکی زەندەقبەرکە ئازاری ئەدات، نیگایەکی رەق وەک خرەی بەردەکان کە روخسارو جلەکانی ئەداتە بەر قامچی. نازانێ چی لێ ئەوێ؟ لەوانەیە هیچی لەم نەوێت، هەر بەسەر دیمەنی دەریا و چەمەکانەوە تێئەپەرێ و دوورتر بۆ سووتاندنی شار و ماڵە سپیەکان و باخ وکانی و شەقامە گەورەکانی وڵاتەکانی ئەوبەر دەریائەڕوا ؟

"لالا" ترسی لە سەر ئەنیشێ، ئەیەوێ نیگاکە رابگرێ، بە سەر خۆیەوە رای بگرێ کە بەرەو ئەوبەر ئاسۆ نەروا، ئەیەوێ تۆڵەکەی، ئاگر و توورەییەکەی هێمن کاتەوە. تێناگات، بۆ شاڵاوی تۆفانی پیاوی بیابان ئەیەوێ شارەکان خاپوور بکات؟ چاوی ئەقوونجێنێ، نایەوێ لمەکان ببینێ کە لە دووکەڵی تۆقینەرن‌و وەک مار تێی ئاڵاون.

دەنگی جەنگاوەری بیابان، "ئێس سێر" ئەزرنگێتەوە. هەرگیز بەو روونیە گوێی لە دەنگی نەبووە. تەنانەت کاتێ لە سەر فەلاتەکە دیبووی پاڵتۆیەکی سپی و دەمامکی شینی لەبەر بوو.

زایەڵەی دەنگێکی سەیرە کە لە مێشکدا ئەیبیسێ، لەگەڵ ویژەی "با" و خرەی ریخەکان، تێکەڵ ئەبێ. زایەڵەیەکی دوور کە ئەم باش لە وشەکانی تێناگات و بێ وچان هەر ئەو وشانە دووپات ئەکاتەوە.

ـ «"با" راوێستێنە» "لالا" ئەقیرێنێ، بێ ئەوە چاوی بکاتەوە: «شارەکان وێران مەکە، "با" راوێستێنە، کارێ بکە "با" ئیتر هەڵ نەکات، هەتاو نەسووتێ، هەموو شت هێمن کەوە.» ئەمجا دیسان ئەڵێ: «چیت لە من ئەوێ؟ بۆ هاتوی بۆ ئێرە؟ من لە ئاستی تۆدا هیچم، بۆ لەگەڵم قسە ئەکەی، تەنیا لەگەڵ من؟» بەڵام دەنگەکە بوو بە ژاوەژاو و دەستی کرد بە لەرینەوە لە جەستەی "لالا"دا.

ئەوە هەر ویژەی "با"یە، لرفەی دەریا و لمە، رەنگی رووناکیەکە خواست و

ئیرادەی مرۆڤەکان سەرمەست و سەرسام ئەکات.

ئەویش هەر لەو کاتەدا ئەهات کە نیگا سەیرەکە ئەهات، هەر شتێ لە سەر زەوی کە لەبەرانبەیدا بەرخۆدانی ئەکرد، تێکی ئەشکاند و لە جێ هەڵی ئەکەند. ئەمجا دوورتر، بەرەو ئاسۆ، لە سەر دەریا لە نێوان شەپۆلە بەهێزەکاندا نوقم ئەبێ، هەورەکان و لمەکە بەرەو تاشەبەردەکانی رۆخی دەریا ئەکێشێنێ، بەرەو ئەوبەر دەریا. بەرەو دڵتا گەورەکانی ئەبات لەو جێگەیەدا کە دووکەڵ لە لوولەی پاڵاوگەکانەوە دەردێ.

***

"لالا" ئەلێ: «بەسەر هاتی پیاوی شینم بۆ بگێڕەوە.»

بەڵام "عەمە" خەریکی هەویر شێلانە، سەری ئەلەقێنێ: «ئێستا، نە»

"لالا" بە لاساری ئەلێ: «بۆ؟ هەر ئێستا، "عەمە"، تو خوا»

ـ «هەموو ئەو شتانەی ئەزانم بۆتم گێڕاوەتەوە.»

ـ «قەیناکات، من ئەمەوێ دیسان بزانم، یان لە "مائەلعەینەین، ئاوی چاوەکان.»

"عەمە" دەست لە هەویر شێلان هەڵئەگرێ و جەستەی ئەنیشێنێتە سەر زەوی و دەست ئەکات بە گێڕانەوە. لە راستیدا زۆری پێخۆشە چیرۆک بگێڕێتەوە.

ـ «زووتریش بۆتم گێڕاوەتەوە، بە سەر هاتی ماوەیەکی زۆر لەمەو بەرە، زەمانێ کە نە دایکی تۆ و نەمن هێشتا نەبوین. کاتێ منداڵی دایەگەورەی دایکی تۆ، کاتێ کە "ئەلئەرزەق" کە پێی ئەڵێن "پیاوی شین" فەوتی کرد. "مائەلعەینەین" هێشتا لەو زەمانەدا لاو بوو.»

"لالا" بە باشی شارەزای ئەو ناوانەیە، چونکە هەر لە منداڵیەوە سەبارەت بەوان زۆری بیستوە، بەڵام هەر جار کە ئەیبیسێ، ئەلەرزێ، ئەڵێی لە ناخیدا شتێ ئەبزوێ.

ـ « "ئەلئەرزەق" لە هۆزی دایەگەورەی دایکت بوو، لە باشوور، لەوبەر "درا" و "ساگیت ئەلحەمرا" ئەژیا، لەو زەمانەدا هێشتا بێگانەکان وڵاتیان داگیر نەکردبوو. خاچ پەرەستەکان مافی هاتنیان نەبوو، هێشتا جەنگاوەرانی بیابان لەشەڕدا نەبەزیبوون.

هەموو ناوچەی باشووری "درا"، دوورتر تا چەقی بیابان تا شاری پیرۆزی "شینگێت" هی ئەوان بوو.»

هەر جار کە "عەمە" چیرۆک ئەگێڕێتەوە، شتێکی پێ زیاد ئەکات. رستەیەکی نوێ، یان شتێکی تیا ئەگۆڕێ. ئەڵێی هەرگیز نایەوێ تەواوی بکات. دەنگێکی بەهێز و ئاهەنگین، دەنگی بە شێوەیەکی سەیر لە ماڵە تاریکەکەدادەنگ ئەداتەوە و لەگەڵ تەقەتەقی لۆحەکان و ویزەویزی زەردەواڵەکان تێکەڵ ئەبێ.

ـ «خوا بانگی ئەکات و ئەویش پیرۆز ئەبێت. جلە شینەکانی بیابان دەدڕێنێ و کراسێکی درێژی خوری وەک فەقیر لەبەر ئەکات، ئەمجا دەست ئەکات بە گەڕانی شارەوشار، بە پێی پەتی و گۆچانێکەوە، وەک ئەوەی سواڵکەر بێت. بەڵام خوا پێی خۆش نەبوو لەگەڵ سواڵکەرەکان بگۆڕدرێ. بە شێوەیەک کە پێستی دەستی و رووومەتی هەر شین مابوو، خۆیشی بشوایەت هەرگیز لانەئەچوو، خەڵک کە بە کراسە کۆنە خوریەکەیەوە ئەیاندی ئەیانزانی سواڵکەر نیە، بەڵکو جەنگاوەرێکی راستەقینەی بیابانە، پیاوێک کە خوا پیرۆزی کردوە.»

بەدەم قسەکردنەوە خۆی بەملاولادا ئەلەقێنێتەوە، ئەڵێی بەدەم ئاهەنگەوە سەما ئەکات. ماوەیەکی زۆر نقەی لێوە نایەت. هەویرەکە پان ئەکاتەوە و دیسان هەڵیئەگلۆفێنێتەوە و بە مشت پانی ئەکاتەوە.

ئەڵێ: «لەو زەمانەوە کەس زیندوو نەماوە، ئەمانە دەم بە دەم گێڕدراونەتەوە، وەک ئەفسانە و بیرەوەریەکان، بەڵام کەسی وا هەن باوەڕیان پێی نیە، ئەڵێن ئەمانە هەموو درۆن.»

"عەمە" بێدەنگ ئەبێ، ئەیەوێ هەر چی ئەگێڕێتەوە بە سەرنجەوە هەڵی بژێری.

«"ئەلئەرزەق" پیاوێکی گەلێ پیرۆز بوو، نەخۆشی چاک ئەکردەوە، تەنانەت ئەوانەی نەخۆشینی دەروونیان بوو، ئەوانەی شێت بوون. ئەو لە هەموو جێگایەکدا ئەژیا، لە کۆڵێتی شوانەکان، لە کەپرەکاندا، تەنانەت لە ئەشکەوتەکان، لە دڵی

كێوەكاندا. خەڵك لە هەموو جێگایەكەوە بۆ دیتنێ ئەهاتن. بۆ ئەوە یارمەتیان بدات. رۆژێ پیاوێكی پیر كوڕە كوێرەكەی هێنابوو. وتی : تۆ كە خوا تەبەڕك و پیرۆزی كردووی كوڕەكەم رزگار بكە، چاكی كەرەوە، هەر چیم هەیە بە تۆی ئەدەم، ئەمجا هەگبەیەكی پڕ لە زێڕی پێنیشان دابوو. "ئەلئەرزەق" وتبووی: زێـڕەكـەت لێـرەدا كەڵكی چیە؟ بیابانی پێ نیشان دابوو، بێ سەمەرو بێ تنۆكێ ئاو... هـەگـبەكـەی لە پیاوەكەی گرتبوو فڕەی دابووە سەرزەوی. زێڕەكان ببون بە مار و دووپشك و دوور كەوتبوونەوە. پیاوە پیرەكە لە ترسا لەرزی بوو.

ئەمجا "ئەلئەرزەق" پێی وتبوو: رازی ئەبی بە جێی كوڕەكەت كوێر ببی؟

پیاوە پیرەكە وڵامی دابوەوە: من زۆر پیرم، چاوی كوڕەكەم چاك كەرەوە، من رازیم.

لەپڕ كوڕەكەی بینایی خۆی بە دەست هێنا بووەوە. بەڵام كاتێ باوكی بینی كوێر بووە، بەختەوەریەكەی تەواو ببوو.

ـ بینایی بەرەوە بە باوكم، چونكە من خوا مەحكوومی كردووم كوێر بم.

ئەمجا هەر دووكیانی بینا كردبوەوە، چونكە ئەیزانی كە پیاو چاكن و ئـەویش رێگای جادەكەی دیسان گرتبوەوە بەر بۆ جێگایەكی دیكە، لای تەپۆڵكەكانی رۆخی دەریا.»

"عەمە" دیسان بێدەنگ ئەبێ. "لالا" بیر لە تەپۆڵكەكان ئەكاتەوە، لەویـا كـە "ئەلئەرزەق" ئەژیا، گوێی لە دەنگی "با" و دەریایە.

«ماسیگرەكان هەر رۆژ خواردنیان بۆ ئەبرد، ئەیانویست دۆعـای خـێریان بـۆ بكات، بڕێكیان لە زۆر دوورەوە ئەهاتن لە شارە تۆكمەكانی باشوورەوە ئەهاتن گوێ لە قسەكانی بگرن.

بەڵام ئەو سوونەت و یاسای بە "وتە" فێر نەئەكردن، كـاتێ كـەسێ ئـەهات، ئەیوت: تەریقەتم فێركە. بۆ ماوەیەكی زۆر تەزبێحاتی ئەكرد، بێئەوەی نقەی لێـوە بێت.

پاشان پێی ئەوت برۆ دار و چیلکە بۆ ئاگرەکە بێنە، ئاو بێنە، باوەشێنم کە، وەک ئەوەی نۆکەری بێت، تەنانەت زۆر بە توندی بەسەریا دای ئەخوری.»

"عەمە" بە هێمنی ئەدوێ، "لالا" وائەزانێ لە ماڵە تاریکەکەدا دەنگی پیاوی شین ئەبیسێ.

«ئاوا فێری ئەکردن، نەک بە وشە و قسە، بە هەڵسووکەوت و دۆعا و نوێژ، بۆ ئەوەی خۆیان بە کەم بزانن بەڵام کاتێ خەڵکی ئاسایی یا منداڵان ئەهاتن، "ئەلئەرزەق" لەگەڵیان نەرم بوو و قسەی خۆش و ئەفسانە و چیرۆکی بۆ ئەگێرانەوە، چونکە ئەیزانی دڵیان رەق و سەر سەخت نیە و بەراستی لە خوا نزیکن.»

"عەمە" بە گومانەوە ئەڵێ:

«پەرجۆی کانیەکەم بۆ گێراویتەوە کە لە ژێر بەردی هەڵقوڵابوو.»

"لالا" ئەڵێ: «ئەری بەڵام جارێکی تر بیگێرەوە».

بەسەر هاتێکە کە لە هەموو دونیادا پێی خۆشترە، هەرجار کە ئەیبیسێ، هەست بە شتێکی سەیر لە ناخیدا ئەکات، شتێکی سەیر کە ئەبزوێ، ئەڵێی ئەگریەت، ئەڵێی لە "یاو"دا لەرزی کردووە.

بیر لەوە ئەکاتەوە کە ئەو رووداوانە چۆنیان رووداوە، ماوەیەکی زۆر لەمەوبەر، لە ئاقاری بیابان لە گوندێکی گڵینە بە لق‌وپۆی درەختەوە، گۆرەپانێکی چۆڵی گەورە کە زەردەواڵەکان ویزەویزیان دێت و ئاوی کانیەکە لە بەر هەتاودا ئەدرەوشێتەوە و وەک ئاوێنەیەکی ساف و لووسە کە هەورەکانی ئاسمان لێک ئەداتەوە.

گۆرەپانی گوند کەسی لێ نیە، چونکە هەتاو بە هەموو هێزیەوە ئەدرەوشێتەوە و هەموو لە فێنکی ماڵەکانیاندا پەنایان گرتووە.

لەسەر ئاوی کانیە بێجووڵەکە، کە وەک چاو سەیری ئاسمان ئەکات، جارنەجارێ لەرینەوەیەکی ئارامی ئاگرینی هەوا تێئەپەرێ کە گەردێکی سپی ئەهاوێتە سەرەکەی وەک پەرۆیەکی نەبینراو کە بە زوویی ئەتاوێتەوە. ئاوەکە جوان و قووڵە، پیرۆزەیی، بێدەنگ، بێجووڵە لە ناو چاڵایی زەویە سوورەکەدا کە لاقی

رووتی ژنەکان جێ پێیەکی گەشینی لێ بە جێ ئەمێنێ.

هەر زەردەواڵەکان بە سەر ئاوەکەدا دێن و ئەڕۆن، ئەنوسێن بە سەرەکەیدا و بەرەو خانوەکان مل ئەنێن، شوێنێ کە دووکەڵی ئاگردانەکان بەرز بوەتەوە.

«ژنێ کە بە گۆزەیەکەوە بۆ سەر کانی رۆیشتبوو، ئێستا کەس ناوی لە بیر نەماوە، چوونکە ماوەیەکی زۆر لەمەوبەر رووی‌داوە، بەڵام پیرێژنێکی پەککەوتە بوو، کاتێ گەیشتبووە سەر کانی، دەستی کردبوو بە گریان و ئەیناڵاند، چوونکە رێگایەکی زۆری لەبەر بوو تا گۆزەکەی بۆ ماڵ بېردایەتەوە.

لەوێ مابووەوەو لە سەر زەوی هەڵتروشکابوو و ئەگریا و ئەیناڵاند، ئەمجا لە پڕ بێ ئەوە ئاگای لە هاتنەکەی بووبێت، "ئەلئەزرەق" لە بەردەمیدا وەستابوو...»

"لالا" ئێستا بە روونی ئەیبینێ، بەرزولەرە و خۆی لە ناو پاڵتۆ رەنگ ریخیەکەی داپێچاوە. دەمامکی هەڵبەستووە، بەڵام چاوەکانی بەرووناکیەکی سەیرەوە ئەدرەوشێتەوە کە وەک شۆڵەی گڵۆپێ، ئارام و بە هێزی ئەکاتەوە.

"لالا" ئێستا ناسیەوە، ئەوە کە لە سەر فەلاتە بەردینەکە دەرئەکەوێ، شوێنێ کە بیابان دەست پێ ئەکات، بە روانینەکەی "لالا" ئابلۆقە ئەدات بە وەها لاساری و هێزێکەوە کە "لالا" تووشی سەرگێژە ئەکات.

ئەو ئاوەها دێت، بێ‌دەنگ، وەک سێبەرێک، هەرکات کە پێویستە دێت.

«ژنە پیرەکە هەر ئەگریا، "ئەلئەزرەق" بە ئارامی لێی پرسیبوو بۆ ئەگری»

بەڵام کاتێ ئەو بە ئارامی ئەگات، وەک ئەوە لە پڕ لە بیابان دەرکەوتبێ، ئیتر ناترسێ. روانینەکەی لێواولێوە لە جوانی، دەنگی ئارام و هێمنە، تەنانەت روخساری لەبەر رووناکیدا ئەدرەوشێتەوە.

«ژنە پیرەکە خەم و تەنیاییەکەی پێ‌وتبوو، چوونکە ماڵەکەی گەلێ لە کانیەکە دوور بوو و ئەو هێزی هەڵگرتنی گۆزەکەی نەبوو...»

دەنگ و روانینەکەی هەر یەکێکن. ئەڵێی لە پێشەوە ئەیزانی چی‌رووئەدات و نهێنی چارەنووسی مرۆڤەکانی ئەزانی.

«بۆ ئەوە مەگری، "ئەلئەرزەق" وتبووی، من یارمەتیت ئەدەم بگەرێتەوە ماڵ خۆت. باڵی گرتبوو و یارمەتی دابوو تا ماڵەکەی و کاتێ گەیشتبوونە بەر ماڵەکەیان، پێی وتبوو بەردی قەراخ جادەکە بەرز بکاتەوە، ئیتر هەرگیز بێئاو نابێت.

ژنە پیرەکە ئەو کارەی کردبوو و لە ژێر بەردەکەدا، جۆرە ئاوێکی زۆر روون و رۆشن هەڵقوڵیبوو و بڵاو ببوەوە، کانیەکی روشن و تازە بوو کە وێنەی لە وڵاتدا پەیدا نەئەبوو.

ژنە پیرەکە سوپاسی لە "ئەلئەزرەق"کردبوو و خەڵک لە هەموو لایەکەوە بۆ دیتنی کانیەکە و خواردنەوەی ئاوەکەی هاتبوون. هەموو ستایشی "ئەلئەزرەق"یان ئەکرد کە خوا ئاوەها هێزێکی پێدابوو.»

"لالا" بیر لە کانیەکە ئەکاتەوە، لە کاتێکدا کە "عەمە" هەویرەکە ئەشێلێ. سێبەری پیاوە شینەکە ئەخزێت و دوور ئەکەوێتەوە، بێدەنگ، هەروا کە هاتبوو. بەڵام نیگا لێواولێو لە هێزەکەی بە سەریەوە، ئاوێزان ئەمێنێتەوە و وەک هەناسەیەک ئابلۆقەی ئەدات.

"عەمە" ئێستا بێدەنگە، ئیتر هیچ نالێ و بێوچان هەویرەکە ئەشێلێ. لەوانەیە ئەویش لە کانیە جوانە قووڵەکە بیر ئەکاتەوە کە لە ژێر بەردی جادەکە هەڵقوڵیبوو، وەک وتارە راستەکەی "ئەلئەزرەق"، وەک رێگا دروستەکەی.

***

رووناکی "سیتە" هەموو رۆژێ هەر جوانە، "لالا" جاران هێندە رووناکی سەرنجی رانەئەکێشا، "ئارتانی" فێری کرد بۆی بروانێ. بە تایبەت رووناکی بەیانان، دوای هەڵاتنی هەتاو، بەردەکان و زەویە سوورەکە ئەبریسکێنێتەوە، ژیانیان پێ ئەبەخشێ. جێگاگەلێ بۆ سەیر کردنی رووناکی هەن.

"ئارتانی" رۆژێ "لالا" لەگەڵ خۆی ئەبا. کەندالێک بە قووڵایی کەندالێکی بەردین ئاوەڵایە، "ئارتانی" تەنیا کەسێکە شارەزای ئەو حەشارگەیە، دەستی "لالا" ئەگرێ لە درێژای کوێرە رێگاکەوە بەرەو ژێر زەوی ئەیبا. لەپڕ هەست بە سێبەرێکی

فێنکی شێدار ئەکا.

دەنگەکان نامێنن، وەک کاتێ سەر بە ژێر ئاودا ئەکەن. کوێرە ڕێگاکە دوورتر، ئەچێتە ژێر زەوی. "لالا" ئەترسێ، چونکە جاری یەکەمە ئەچێتە ژێر زەوی. بەڵام شوانەکە دەستی ئەگوشێ و دڵنەوایی ئەکات.

لەپڕ ئەوەستن، درێژای کوێرە ڕێگاکە لێواولێوە لە ڕووناکی، چونکە بە تەواوەتی بەرەو ئاسمان ئاوەڵایە. "لالا" تێ ناگات، هەر چی ئەکات بۆی ڕاست نابێتەوە، چونکە ئەوان بەرەو خوارەوە ئەچن. بەڵام خۆ ڕاستە، ئاسمان لەوێ لەبەر دەمیدایە، پان و سووک.

جووڵەی لێ براوە، هەناسە ناکێشێ، چاوەکانی ماق ماون، لێرەدا جگە لە ئاسمان چی‌تر نیە، ئاسمانێکی هێندە ڕۆشن کە پێی‌وایە باڵندەیەکە و ئەیەوێ بفرێ.

"ئارتانی" بە ئیشارە پێی ئەڵێ لە کونەکە نزیک بێتەوە. بە ئاسپایی بۆ ئەوە نەڕوخین لە سەر بەردەکان دائەنیشێت. "لالا" لە دواترەوە دائەنیشێت. لە تاو سەرگێژە لەرزی کردووە.

لە خوارەوە، لە خوارەوەی تاشە بەردەکانی قەراخ، لە نێوان تەم و مژی پانتایی بیابان‌دا، سێڵاوگە وشکەکان ئەکەوێتە بەر چاوی. لە ئاسۆ هەڵمێکی ڕەنگ نارنجی دائەکشێتە خوارەوە. لەوێوە بیابان دەست پێ ئەکات، لەو شوێنەدایە برێ جار "ئارتانی" بە تەنیا مل ئەنێ، تەنیا پارووەیەک نان لە نێو دەستەسرێکدا لەگەڵ خۆی ئەبا و مل ئەنێ. ئەویا ڕۆژهەڵاتە، ڕووناکی هەتاو لە هەموو کات جوانترە، هێندە جوان کە ئەیەوێ وەک "ئارتانی" بە پێی پەتی لە نێوان ریخەڵانەکەدا رابکات.

بە سەر بەردەکان و کەناوەکاندا بپەڕێتەوە و دوور و دوورتر کەوێتەوە.

«"ئارتانی"، زۆر جوانە»

"لالا" برێ جار لە بیری ئەچێتەوە کە "ئارتانی" تێ‌ناگات. کاتێ قسەی بۆ ئەکات، "ئارتانی" ڕووی وەرئەگەڕێنێ و چاوەکانی ئەبریسکێنەوە، لێوەکانی ئەبزوێنێ. ئەیەوێ وەک "لالا" قسە بکات، ئەمجا دەمەلاسکێ ئەکاتەوە و "لالا"

ئەتریقێتەوە.

«ئۆە» بە قامکی خاڵێکی رەشی بێ جووڵەی لە هەوادا پێ نیشان ئەدات. ئارتانی ساتێ بۆ خاڵەکە ئەروانێ و بە ئاماژەی دەستی، تیێ ئەگەیەنێ کە باڵندەیە، قامکە گەورەکەی ئەنووشتێنێتەوە وسێ قامکی تری لێک جیائەکاتەوە، وەک شاپەرەکانی باڵندەیەک.

خاڵەکە بەکاوەخۆ ئەخزێتە دڵی ئاسمان، بە دەور خۆیدا خولێ ئەداتەوە، دێتە خوار، لێیان نزیک ئەبێتەوە، "لالا" جوان ئەیبینێ، سەری و شاپەرە بڵاوەکانی واشەیەکە بە دوای نێچیردا ئەگەڕێ.

بێ دەنگ وەک سێبە رێک خۆی بە دەست "با"وە داوە.

"لالا" ماوەیەکی زۆر بینایی لە سەر راگیر ئەکات، دڵی ئەکەوێتە خورپە. هەرگیز شتی هێندە جوانی نەدیوە، لە ئاسماندا بە ئەسپایی لە ئەڵقە گەلێکدا ئە سووڕێتەوە، بەرز بەرز، تەنیاو بێدەنگ، لە "با" و پرشنگی هەتاودا، جار جاریش بەرەو بیابان بە توندی دائەگەڕێ، ئەڵێی ئەکەوێتە سەرزەوی.

دڵێ توندتر لێئەدا چونکە بێ دەنگی باڵندە رەنگ خەنەیەکە دێتە ناخی ئەمیشەوە و ترس‌دای ئەگریت.

بینای لە سەر واشەکە ئەگیرسێنێتەوە، ناتوانی چاوی لێ هەڵگرێ، بێ دەنگی سامناکی دڵی ئاسمان، سەرماو بە تایبەت بروسکەی رووناکی ئاسمان گێژ و مەنگی کردوون. پاڵ ئەداتەوە بە "ئارتانی"ەوە بۆ ئەوە نەکەوێ بەزەویدا، ئەویش ماقی واشەکەبووە، بەڵام ئەڵێی هەر یەکێکن و هیچ شتێ توانای جیاکردنەوەیانی نیە، هەر دوو یەک نیگا و یەک ئازایەتیان هەیە، هەر دوو لە بێدەنگی بێبرانەوەی ئاسمان و "با" و بیاباندا شەریکن.

کاتێ "لالا" ئەزانێ کە "ئارتانی" و واشەکە وەک یەکن، دڵی خورپەیەک ئەکا، بەڵام سەرەگێژەکەی لانەماوە، ئاسمانی بەردەمی پان و واڵایە، زەوی تەم و مژێکی رەنگ خۆڵەمێشیە کە لە ئاسۆدا ئەبزوێ.

ئێستا کە "ئارتانی" شارەزای هەموو ئەمانەیە، بێ‌دەنگیەکە "لالا" ناترسێنێ. چاوی ئەقوونجێنێ، خۆی ئەخزێنێتە ناو بۆشایی ئاسمان، باسکی شوانە لاوەکەی گرتوە و بە ئەسپایی پێکەوە لە بازنەگەلێکدا ئەسوڕێنەوە. هێندە بەرز ئەبنەوە کە ئیتر گوێیان لە هیچ نیە، جگە لە شەقەی شاپەڕەکان، هێندە بەرز کە تاشەبەرد و درکەجارەکە و ماڵە دارین و لۆحە قیرتاویەکان نابینن.

دوای ماوەیەکی زۆر کە لە بروسکە و شینایی ئاسمان سەر مەست ئەبن بەرەو ئەشکەوتەکە ئەگەڕێنەوە، بە ئەسپایی لەسەر تاشەبەردە سوورەکە ئەنیشنەوە، بی‌ئەوە بەردێ تل بێتەوە، بێ‌ئەوە تەنانەت دەنکە لمێ بزوێ، ئەمەش لەو کارانە بوو کە "ئارتانی" بێ‌ورتە و بێ‌بیر کردنەوە، ئەیکرد، تەنیا هەر بە نیگایەک. ئەو بە هەموو جۆرە جێگایەک، بۆ دیتنی رووناکیەکان شارەزایە، ئاخر خۆ هەر یەک جۆرە رۆشنایی نیە، بەڵکوو رۆشنایی جۆراوجۆر هەیە، جاران کە لە نێوان بەردەکان و چاڵەکان تێ‌ئەپەڕین بەرەو شەقارە کۆنەکان و سەرگاشەبەردە سوورەکان ئەچوون، وای ئەزانی "ئارتانی" ئەیەوێ مارمیلک بگرێ یان وەک کورەکانی دیکە بۆ تاڵان کردنی هێلانەی باڵندەکان هاتوە، بەڵام "ئارتانی" بە مێهرەبانیەوە دەستی ئەگرت و بە چاوەگەشە پڕلە شادمانیەکەیەوە ئاسمانی پان و بەرینی پێ‌نیشان ئەدا، ئاسمانێکی سپی بریسکەدار و سەمای شۆڵەکانی هەتاو لە ئاستی شەقاری بەردەکاندا.

مێشە بچووکەکانیشی پێ‌نیشان ئەدات کە وەک بلّقگەلێ لە نێوان دوو تەوق گیادا وەک رایەڵی درێژی جاڵجاڵۆکە دەرئەکەون.

کاتێ بینایی بە سەریاندا ئەگێڕن، جوانتر و نوێتر ئەنوێنن، ئەڵێی کەس جگە لەمان بۆی نەڕوانیوە، ئەڵێی ئەوەڵی دونیایە.

"لالا" پێی خۆشە دوای "ئارتانی" کەوێ. بە دویدا لە کوێرە رێگاکەدا هەنگاو هەڵدەگرێ، هیچ جێ پێیەکی لێ‌نیە، بەڵام کاتێ "ئارتانی" هەنگاو هەڵئەگرێ، "لالا" دڵنیایە کە هەر ئەم رێگا دروستە، نە رێگایەکی‌تر.

ڕەنگە کوێرەرێگای بزن و رێویەکانە، نە هی مرۆڤەکان، بەڵام ئارتانی وەک

ئەوانە، ئەوشتانەی مرۆڤەكان تواناى دیتن و زانینیان نیەنەك تەنیا بەچاوەكانیەوە بەڵكو بە هەمو وجودیەوە زەفەری پێ ئەبا، وەك هەست كردن بە بۆنەكان، برێ جار لەسەر پانتایی بەردەڵانەكە بەرە و رۆژ هەڵات مل ئەنێ، هەتاو شانە و رخساری لالا ئەسووتێنێ وناتوانێ دوای ئارتانی بكەوێ، ئەویش گوێ پێ نادات، ئەڵێ بەدوای شتێكدا ئەگەرێ، چەماوە، لەمبەرد بۆ ئەوبەرد ئەپەڕێتەوە، لەپڕرائەوە ستێ، روخساری ئەنوسێنێ بە زەویەكەوە، بە دەما جەستەی ئەنیشێتە سەر زەوی، ئەڵێ دەمی ناوەتە ناو كانیەك، "لالا" بە ئارامی لێ نزیك ئەبێتەوە، ئارتانی بە ئەستەم بەرز ئەبێتەوە، چاوە قەترانیەكەی بە شادیەوە برووسكەی دێ، ئەڵێ بەنرخترین شتی دونیای دۆزیوەتەوە، لە نێوان بەردەڵانەكە لە سەرزەویە خۆڵاویەكە، تەوقێكی رەنگ سەوز و خۆڵەمێشی و بنەگیایەكی بچووكی گەڵاباریك لەوێدایە، كاتێ "لالا"یش روخساری لێ نزیك ئەكاتەوە بۆنەكەی هەست پێ ئەكات، لەپێشەوە بۆنەكەی كزە، بەرەبەرە زۆر ئەبێتەوە، خۆش بۆنترین گوڵەكان، بۆنی نەعنا و شیبا، بۆنی لیمۆ، بۆنی دەریا و "با"ی كێڵگەكانی هاوینە، هەموئەم بۆنانە و تەنانت زۆرتریش، لەم گیا هەرەبچووكە پیس و كزە، لەپەنای بەردە ڵانەكە و لە نیوان فەڵاتە هەراوە بەیاركە دەرهاتوە...هەر تەنیا "ئارتان"ی بەمەی زانیوە، "ئارتان"ی ئەم بۆنە خۆشانە تەنیا نیشانی "لالا" ئەدات، چونكە حەشارگەكانیان ئەناسێ، بۆنەكان وەك بەردەكان و حەیوانەكانن، ئەوانیش بۆ خۆیان حەشارگەیان هەیە.

بەڵام ئەو ئەزانێ چۆنیان بدۆزێتەوە، وەك سەگ لە "با"دا، بەبۆنكردنی جێ پێكان و ئەمجابێ ئەوە دامێنێ، تا حەشارگەكەیان هەلدێ.

"ئارتانی" فێری "لالا"یشی كردوە. جاران كاتێ لەلای دەوەنێ یان بنەگیا یان شانە هەنگوێنێكەوە رائەبووری هەستی بە هیچ بۆنێ نەئەكرد. هەواسیخناخە لە بۆن گەلی خۆش، كەبێ و چان ئەبزوێن، وەك شنەیەك بەرز ئەبنەوە و ئەخزێنە خوارەوە، تێكەڵ ئەبن و لێك جیائەبنەوە. لەسەر ئاستی جێ پێی كەروێشكێك، بۆنی ترسێكی سەیر ئەبزوێ، لەولاتر "ئارتانی" "لالا" تێئەگەیەنێت كە نزیك بێتەوە،

لەسەر زەویە سوورە کە کێژۆڵە کە هیچ بەدی ناکات، بەڵام بەرەبەرە هەست بە بۆنێکی توند ئەکات، بۆنی ئارەق و پێشاو، هەرخێرابۆنە کە ئەناسێ، سەگێکی وەحشی برسی کە لە نێوان فەلاتەکەدا بە دوای کە روێشکێکدا وەیلان بوە.

***

"لالا" پێی خۆشە هەموو رۆژکانی لەگەڵ "ئارتانی" بێت، "ئارتانی" هەموو ئەمانە هەر بە "لالا"ی نیشان ئەدات.

باوەڕی بە کەسی‌ترنیە، چونکە ئەوان ناتوانن بەدوای بۆنەکان و دیتنی فرینی باڵندەکاندا چاوەڕوان بن، ئەو لەکەس ناترسێ، خەڵک لەو سڵ ئەکەنەوە، ئەڵێن کە مەجنونە.(1)

شەیتان فرێوئەدات ساحرە، چاوی پیسە. نەدایکی هەیە، نەباوک، کەس نازانێ لەکوێوە هاتوە، جەنگاوەرێکی بیابان ڕۆژێ لە رۆژان بێ ئەوە نقەی لێوە بێت لای چاڵەکە دایناوە و ڕۆیشتووە، "ئارتان"ی تەنانەت ناوی نیە.

برێ جار "لالا" زور حەزئەکا بزانێ کێیە، لیێ بپرسێ: لە کوێوە هاتوی؟

بەڵام "ئارتان"ی زمانی مرۆڤ نازانێ، وەڵامی پرسیارەکان ناداتەوە، کورە گەورەکەی عەمە ئەڵێ:ئارتانی چونکە کەرە نایشتوانێ قسە بکات، مامۆستای قوتابخانەیش وتبووی کەئەو کەسانە کەڕ و لاڵن، بە لام "لالا" باوەڕی بەوانە نیە. چونکە "ئارتانی" باشتر لە هەرکەس ئەتوانێ ببیسێ. ئەوکزترین دەنگەکانیش لێک ئەداتەوە، تەنانەت ئەو دەنگانەی کە بە گوێنان لەسەر زەویەوەنابیسرێ، دەنگی بازدانی کە روێشکێ لەوپەڕ فەلاتە بەردینەکەوە ئەبیسێ، یان کاتێ یەکێ لە کوێرەڕێگاکەوە، لەوبەر تەپۆڵکەکان لیان نزیک ئەبێتەوە، ئەتوانێ شوێنێکە کوللەکان گۆرانی ئەخوێنن، یان هێلانەی کەوەکان لەنێوان گژوگیا بەرزەکاندا پەیدا بکات.

---

1_megnoun

بەڵام "ئارتانی" نایەوێ گوێ لەزمانی مرۆڤەکانەوە بێت. چونکە ئەو هـی و ڵاتێکە مرۆڤی تیا نیە.

وڵاتی ڕیخ و تەپۆڵکە و ئاسمان.

"لالا" هەندێ جار قسەی لەگەڵ ئەکات. بۆوێنە ئەڵێ «بیلوو...لا» بە نەرمی چاو ئەبڕێتە قووڵایی چاوی، برووسکە یەکی سەیرلە چاوە قەترانیە ڕەشەکانیدا ئـەدرە و شێتەوە، دەست ئەنێتە سەر لێوەکانی لالا و لێوی خۆی وەک ئەو ئەبزوێنی، بـەڵام هیچ ناڵێ. دوای چەن سات سەری وەردە چەرخێنێ، لەولاتر لەسەر بەردێکی دیکە دائەنیشێ، بەڵام لە راستیدا گرنیگ نیە، چونکە "لالا" پێی وایە قسەکردن بایە خی‌نیە، هەموو ئەو شتانە ئەیەوێ بـیڵێ، لە نـاخیدایـە، وەک نـهێنیەک، وەک بـەردێک، هەرئەوە بایەخی ڕاستە قینەی هەیە، بێ دەنگی پڕەلە وتەی جوان، "لالا" پێش لەوەی "ئارتان"ی پیێ بلێ، نەیدەزانی.

خەڵک هەر چاوەڕوانی وتەو کردەوە و هۆو سۆنگەن، بەڵام ئارتانی بە ڕوانینە جوانەکانزاییەکەی چاو ئەبڕێتە "لالا"، بێ ئەوە ورتەی لێوە بێت، "لالا" لەپرشنگی نگایدا لێی تێ ئەگات، کاتێ نیگەران و پەشێو و خەمینە، یان بە پێچەوانەوە هەست بە بەختەوەری ئەکات، دەستی لەسەر لاجانگی "لالا" دائەنێ و دەستی بەم لاو ئەولای سەریدا دێنی، ماوەیەکی زۆر هەروا ئەمێنێتەوە، چاوی ئەدرەوشێتەوە، لالا گەرمای لەپی دەستی لەسەرگۆنا و لاجانگەکانی هەست پێ ئەکات کە وەک ئاگرێک گەرمی ئەکاتەوە، هەستێکی سەیرە کە پێی شاد ئەبێ و تاناخی ئەڕوا و هێمنی ئەکاتەوە.

خۆشەویستیەکەی "لالا" بۆ "ئارتانی" بەتایبەت بە بۆنەی هێزە سەیرەکەی لەپی دەستەکانیەتی. ڕەنگە لە ڕاستیدا جادووگەرە، بۆ دەستی شوانەکـە ئـەڕوانـێ کـەتێ بگات، دەست گەلی درێژو قامکی باریک نینۆکی سەدەفی و پێستێکی بۆری ناسک کەسەر دەسـتی ڕەش و لەپـی دەسـتی سـوورێکی مـەیلە و زەردە، وەک گـەڵای درەختکە دووڕەنگە.

"لالا" زۆر حەز لەدەستی ئارتانی ئەکات، وەک دەسـتی کـەسی دیکـە نـیە،

چالاک و کارامە و بەهێزە. "لالا" پێی وایە دەستی خانێکە یان شێخزادەیەک یان جەنگاوەرێکی رۆژهەڵاتی کەلە بەغداوەهاتوە.

"ئارتانی" بە دەستی هەموو جۆرە کارێ ئەکات، نەک تەنیا بەردی پێ ئەگرێ و داری پێ ئەشکێنێ، بەڵکو بە تاڵە درێژەکانی دارخورما تەڵە دروست ئەکات، ئاهەنگ لێ ئەدات دەنگی "کەو" وواشە و ڕێوی دەردێنێ.

بەتایبەت "لالا" ئەوەی پێ خۆشە کە بە ئاماژەو وشەکانی دەست ئەدوێ، لاسایی "با" و دەریا ئەکاتەوە، برێ جار کە بیەوێ قسەبکات، لەسەر بەردێ لە بەر هەتاودا دائەنیشێت، لاقەکانی لە ژێر کراسە درێژە بۆرەکەیدا دیارە.

زۆربەی ئەو چیرۆکانەی کە بۆ لالای ئەگێرێتەوە، دیمەن گەلێکن کەبە بزاوتی دەستی و لێوو برووسکەی چاوی بەدی ئەهێنێ، وێنەکان خێراخێرا رۆشن ئەبنەوە و ئەکوژێنەوە، لە دونیادا هیچ شتێک بەئەندازەی چیرۆکەکانی ئەم جوان نین، تەنانەت چیرۆکەکانی "نوعمان"ی ماسیگرو بەسەر هاتەکانی "ئەلئەزرەق"، کە "عەمە" ئەیگێرێتەوە.

ئەو شتانەی ئەیگرێتەوە، هەر وەک خۆی شێتانەیە، بەڵام لە خەوێک ئەچن، چونکە هەر دیمەنێک کە دەرئەخا لەو شوێنەیە کە ئەم چاوەروانی ناکات.

ماوەیەکی زۆر بەم چەشنە قسەئەکات، وێنەی باڵندەیەک کە باڵەکانی کردوەتەوە، تاشە بەردەکان کە وەک مشتی دەست چەماونەتەوە، سەگ و تۆفان و فرۆکە و گوڵە زەبەلاحەکان و کێوەکان و "با"کە رووومەتی خەوتوەکان ئەداتە بەر قەمچی، هەموو ئەمانە هیچ ناڵێن، بەڵام کاتێ "لالا"بینایی لەسەر روخساری و دەستە رەشەکانی ڕائەگرێ وێنەکان خۆیان دەرئەخەن، گەلێ جوان و روونن، لە برووسکە و ژیان ئەدرەوشێنەوە، ئەڵێی لە ڕاستیدا لە لەپی دەستی ئەمەوە هەڵئەقوڵن، ئەڵێی لە لێوەکانی ئەمەوە ئەپەڕنە دەرەوە، لە شۆڵەی چاوەکانیەوە لە دایک ئەبن.

بە تایبەت جوانیەکەی لەوەدایە کاتێ "ئارتانی" قسە ئەکات، بێدەنگی ناهەژێنێ. هەتاو لە سەر فەلاتە بەردینەکە، لە سەر تاشەبەردە سوورەکان ئەگرێ. "با"یەکی سارد

جار جار هەڵ ئەكات، خرەخری لمەكان لە نێوان شەقاری تاشە بەردەكان بەرز ئەبێتەوە بە قامكە درێژەكانی چەشنی مارێك ئەخزێتە قووڵایی كەناوەكە، ئەمجا رائەوەستێ، سەر هەڵدێنێ، "ئوكراسێكی" سپی گەورە تێئەپەڕێ، شەقەی باڵەكانی بەرز ئەبێتەوە، شەوە، مانگی چواردەیە، "ئارتانی" بە قامكی یەك یەك ئەستێرەكان دائەگیرسێنێ. بارانی هاوینی دەست ئەكاتە بارین، ئاو لە جۆگەلەكاندا رێ ئەكەوێ گۆلاوەكە لەوێدا كە مێشوولەكان ئاپووورەیان‌داوە، گەورە ئەبێتەوە.

راستەوخۆ بەرەو دڵی ئاسمان بەردێكی سێ سووچ فرێ ئەدات، بەرزتر ئەبێتەوە، بەرزتر و "هۆپ" لە پڕ ئەكرێتەوە و ئەبێتە درەختێكی لق و پۆپ داری زەبەلاحی پڕ لە باڵندە.

برێ جار لاسایی خەڵك و حەیوانەكان ئەكاتەوە، لێوی ئەقوونجێنێ و سەری ئەباتەوە بۆ ناوشانی و پشتی گرمۆڵە ئەكات لاسایی كیسەڵ ئەكاتەوە، "لالا" هەمیشە ئەڵێ یەكەمین جاریەتی ئەیبینێ؛ ئەقلێتەوە. یان لاسایی وشتر ئەكاتەوە، لێوی بەرز ئەكاتەوە و دیانەكانی پێشوی دەرئەخات، هەروەها دەمەلاسكێی قارەمانانی سینەمایی كە لە سینەما دیتویەتی، دەردێنێ، وەك "تارزان" و "ماسیست" و فیلمە كارتۆنیەكان.

"لالا" هەندێ جار رۆژنامە و گۆڤاری بچووكی رەنگی بۆ ئەهێنێ كە كورە گەورەكەی "عەمە" پێی‌ئەدا، یان خۆی بە پارە كۆكراوەكانی خۆی ئەیكڕێ. چیروكەكانی "ئاكیم"، "رۆش رافال" كە لە هەسارەكانی تردا روویان دابوو. یان كتێبە بچووكەكانی "میكی مۆس" و "رۆناڵدۆ"، "لالا" خۆی هەڵیان ئەبژێرێ، بەڵام سەوادی خوێندنی نیە، كورەكەی "عەمە" دوو سێ جار بۆی ئەگێڕێتەوە. بەڵام خۆ "ئارتان"ی نیازی بە بیستنی چیرۆك نیە.

بە شێوەیەكی سەیر بۆیان ئەروانێ، بەلادا دای‌ئەنێت و سەری بۆ لار ئەكاتەوە، كاتێ بە باشی بۆ وێنەكان ورد ئەبێتەوە، بە هەردوو پێ هەڵئەبەزێتەوە و لاسایی "رۆش رافاڵ" و "ئاكیم" ئەكاتەوە.

بەڵام "لالا" هەرگیز بۆ ماوەیەكی زۆر لای "ئارتانی" نامێنێتەوە، چونكە هەمیشە

لە ناکاودا وا ئەزانێ روخساری گرژ ئەکاتەوە، ئەم نازانێ چیڕووی داوە، روخساری رەق و بێ جووڵە، بینایی لە سەر دوورێکی نادیار راگیر ئەکات. وەک گوزەری هەورێ لە بەر هەتاو یان شەو بە خێرایی تەپۆڵکەکان و چاڵایی دۆڵەکان دائەپۆشێ.

بۆ "لالا" سامناکە، ئەو ئەیەوێ "ئارتانی" هەر بەختەوەر بێت، پێکەنینەکەی و پرشنگی روانینەکەی ببینێ بەڵام نالوێت، لە پڕ "ئارتانی" مل ئەنێ، لە چاولێکنانێکدا وەک حەیوانێک باز ئەدات و نوقم ئەبێ بێ ئەوە "لالا" تێبگا بۆ کوێ ملی ناوە.

بەڵام ئیتر چاوەڕوانی گەرانەوەی نامێنێ. تەنانەت هەندێ رۆژ، سەر فەلاتە بەردینەکە سیخناخە لە رووناکی و "ئارتانی" بە ئاماژەی دەستی شتی بۆ ئەگێڕێتەوە، ئەم لە پڕ رائەچەنێتە سەرپێ و بە ئەسپایی مل ئەنێ، بێ‌ئەوە ئاوڕ بداتەوە، بەرەو جادەکەی "سیتە" مل ئەنێ،، ئەڵێن ئەمیش وەک "ئارتانی" لێ‌هاتوە. خەڵکیش پێیان خۆش نیە ئەم هێندە زۆر ئەچێتە لای، لەوەی ئەترسن ئەمیش لەوەوە مەجنون بێت. رۆحە شەیتانیەکەی ئەو، ئەمیش بگرێ، کوڕە گەورەکەی "عەمە" ئەڵێ "ئارتانی" دزە چوونکە لە کیفێکی بچووکی چەرمی دەور ملی‌دا، زێڕی هەیە.

بەڵام "لالا" ئەزانێ کە راست نالێ. رۆژێ "ئارتانی" لە سێلاوگە وشکەکە زێڕی دۆزیبووەوە، دەستی "لالا"ی گرتبوو تا قووڵایی درزەکان بردبوی. خۆڵە زێڕی لە ناو لمە خۆڵەمێشیەکەی سێلاوگەکە دیبوو.

ـ «ئەو بە کەڵکی تۆ نایەت». "عەمە" کاتێ لە فەلات گەڕایەوە پێی ئەڵێ.

روخساری "لالا" لە بەر هەتاو وەک "ئارتانی" رەش هەڵ گەڕاوە.

هەندێ جار "عەمە" درێژە بە وتەکەی ئەدات ـ «خۆ ناتەوێ شوی پێکەی، ها؟

ـ «جا بۆ نەیکەم؟» "لالا" ئەڵێت و شانی هەڵئەتەکێنێ.

ئەو هەرگیز بیر لە شوو کردن ناکاتەوە، پێویستی پێی نیە، لەوە کە بتوانی شوو بە "ئارتانی" بکات ئەی هێنێتە پێکەنین. بەڵام هەمیشە دوای کارەکان رێگای ئەو تەپۆڵکانەی کە شوانەکانی لێیە ئەگرێتەبەر، لە رۆژهەڵاتی "سیتە" لای زەویە وشک هەڵاتوەکان و تاشە بەردە بەرزە سوورەکان.

زۆر حەز ئەکات لە کوێرە ڕێگاکەدا بەناو تەپۆڵکەکاندا کە وەک مار هەڵگەڕاون، بەدەم گوێدانی ئاهەنگی کوللەکان و ڕوانینی جێ گوزەری مارەکان بە لمەکەدا سەرکەوێ.

لەولاتر فیکەی شوانەکان ئەبیسێ. زۆربەی لاوەکانی ئێرە، بۆ ئاگادار کردنەوەی مەڕو بزنەکان و بۆ بانگهێشتن و دواندن و دوور کردنەوەی سەگە هەردیەکان، فیکە ئەکێشن.

"لالا" پێی خۆشە لە نێوان تەپۆڵکەکانەوە، تێپەڕێ، پێڵوەکانی لە رووناکیە هەرە سپیەکەدا خێراخێرا لێک بنێ و گوێ لە فیکەکان بگرێ کە لەم لاولا بەرز ئەبنەوە.

بەو گەرمایەش بە ئاستەم ئەلەرزێ، دڵی توند لێ ئەدات، برێ جار وەڵامیشیان ئەداتەوە، "ئارتانی" فێری کردوە، چۆن فیکە لێ بدات.

کاتێ شوانەلاوەکان لە سەر جادەکە ئەیبینن، لە پێشدا ماوەیەک رائەمێنن. چونکە باوڕیان بەکەس نیە، روخسارێکی سافی رەنگ زێوینیان هەیە و تەوێڵێکی بەرز و قژێکی سەیر بە رەنگی سوور.

هەتاو و "با" پێست و قژیانی سووتاندوە، کراسی درێژ لە پارچەی خام یان لە گۆنی ئارد لەبەر ئەکەن، ئەوان لە پێشدا نزیک نابنەوە، چونکە زمانیان "شلۆ"یە و لە زمانی خەڵکی دۆڵەکە تێ ناگەن.

بەڵام "لالا" زۆری خۆش ئەوێن، ئەوانیش لەم سڵ ناکەنەوە، هەندێ جار بتوانێ لە ماڵی "عەمە" خواردە مەنیان بۆ ئەهێنێ، نان، بیسکویت، خورمای وشک.

تەنیا "ئارتانی" ئەتوانێ لەگەڵیان بێت. چونکە ئەویش شوانە و لای خەڵکی شار ناژی.

کاتێ پێکەوە لەگەڵ "ئارتانی" لە سەر فەلاتە بەردینەکەن، ئەوان بێدەنگ لەم بەرد بۆ ئەو بەرد ئەپەڕنەوە و لێیان نزیک ئەبنەوە. بەڵام برێ جاریش بۆ ئەوە ئاگایان کەنەوە فیکە لێ ئەدەن. کاتێ لێیان نزیک ئەبنەوە، "ئارتانی" ئاپوورە ئەدەن و بە زمانە سەیرەکەیان خێرا خێرا قسەی لەگەڵ ئەکەن. ئەمجا بلاّو ئەبنەوە و بەدەم فیکە لێدانەوە

لە فەلاتە بەردینەکە دوور ئەکەونەوە، هەندێ جار "ئارتانی"ش دوایان ئەکەوێ، تەنانەت "لالا"یش ئەیەوێ دوایان کەوێ بەڵام ناتوانێ وەک ئەوان باز بدات.
هەموویان کاتێ ئەم ئەبینن، ئەقلینەوەو بەدەم پێکەنینە پڕ لە شادمانیەکەیانەوە، هەڵدێن.
ئەمجا لە سەر بەردە سپیەکان لە ناوەڕاستی فەلاتەکە خواردەمەنیەکانیان بەش ئەکەن، لە ژێر کراسەکانیاندا، خورما و هەنجیر و پەنیری وشک کەلە پەڕۆیەکدا بە لا قەدیانەوە گرێیان داوە دەردێنن، بە "لالا" و "ئارتانی" ئەدەن. "لالا"یش لە نانە سپیەکەی خۆی بەشیان ئەدات. برێ جاریش سێفێکی سووری پێیە کە سەندوویەتی. "ئارتانی" چەقۆ بچووکە بێ دەسەکەی دەردێنێ و ئەیکات بە قاشی بچووک بچووکەوە، بۆ ئەوە هەموویان لێی بخۆن. لە سەر فەلاتە بەردینەکە دوانیوەڕۆیەکی دڵ بزوێنە. شۆڵەکانی هەتاو بێوچان لە قەراخ بەردەکان هەڵئەبەزنەوە، رووناکی ئابلۆقەیانی داوە، ئاسمان قووڵ و شینێکی تۆخە، بێ هەڵمی سپی سەردەریا و چۆمەکە.

کاتێ "با" بە توندی هەڵ ئەکات، ئەبێ خێرا خۆیان لە پەنای تاشە بەردێکدا حەشار بدەن.

تەنیا ویژە ویژی "با" لە نێوان دڕکە جارەکاندا، ئەبیسرێ. دەنگێ وەک دەریا، بەڵام هێمن‌تر و ماوەدارتر. "لالا" گوێ لە دەنگی "با" ئەگرێ، گوێ لە دەنگی نەرمی شوانەکان، بارە باری دووری مەڕ و بزنەکان، ئەو دەنگانەی لە هەموو دونیا پێ‌خۆش‌ترە، لەگەڵ قیژە قیژی "گاکی"ەکان و زەنازەنای شەپۆلەکان.

یەکێ لەو رۆژانە دوای ئەوەی نان و خورماکەیان خوارد "لالا" تا دامێنی تەپۆڵکە سوورەکان دوای "ئارتانی" کەوت تا لای ئەشکەوتەکان کە شوانەکە لە وەرزی وشکانیدا لەوێ ئەنوێ.

لە سەر تاشە بەردە سوورەکە چاڵ گەلێک لە نێوان دڕکەکاندا نیوەداشاریاون. برێ چاڵەکان هەر بە ئەندازەی کولانەیەکی ژێرزەوینیە، بەڵام کاتێ ئەچنە ناوی، گەورە ئەبێتەوە.

"ئارتانی" بە دەما خۆی ئەخزێنێتە ناوی و "لالا" بە دوایدا، لە پێشدا هیچ نابینێ،

ئەترسی و دەست ئەکات بە قیژاندن. «ئارتانی .... ئارتانی». شوانەکە وەر ئەچەرخێ و باسکی لێ توند ئەکاو لەگەڵ خۆی رایئەکێشێ.

کاتێ چاوی لەگەڵ تاریکیەکە رادێ، سالۆنێکی گەورە ئەبینێ، دیوارەکان هێندە بەرزن ئاخرەکەی نابینێ. خاڵی رەنگ خۆڵەمێشی و شین و نیشانە زەرد و سپی یەکان بە سەریەوە ئەبینرێ.

بە بۆنەی رووناکیەک کە لە کونی تاشە بەردەکانەوە دێت، هەوا رەنگ خۆڵەمێشیە. "لالا" شەقەی بەرزی چەن باڵ ئەبیسێ، خۆی زۆرتر لە "ئارتانی" نزیک ئەکاتەوە، بەڵام شەمشەمە کوێرەکانن کە لە خەو راچەنیون و لە سەر لقە دارێکدا بە جیرە جیر نیشتوونەتەوە.

"ئارتانی" لە ناوەراستی ئەشکەوتەکە، لە سەر بەردێکی ساف دائەنیشێ، "لالا"یش لە تەنیشتیا دائەنیشێ و چاو ئەبڕنە برووسکە بریقەدارەکان کە لە دەرگای ئەشکەوتەکەوە شاڵاو دێنێتە بەردەمیان، ناو ئەشکەوتەکە شەوێکی تاریک و شێداری بێبڕانەوەیە، بەڵام لە دەرەوە لە سەر فەلاتە بەردینەکە رووناکی چاو کوێر ئەکات، ئەڵێی لە وڵاتێکی دی و لە دونیایەکی دیکەدان، ئەڵێی لە قووڵایی دەریا دان. "لالا" ورتەی لێوە نایەت، نیازی بە دواندن نیە. بینایی وەک شەو تێرە، پێستی هاورەنگی سێبەرە، "لالا" گەرمای جەستەی شوانەکە هەست پێ ئەکات. بروسکەی روانینی بەرەبەرە دێتە ناخی ئەمەوە، لەگەڵ وجوودی تێکەڵ ئەبێت و ئەتوانێ گوێی لە شوانەکە بێت، دەمی نزیک ئەکاتەوە بە گوێی، بۆنی قژ و پێستی هەست پێ ئەکات و ناوی بە زمانی لاڵی بە گوێیدا ئەچرپێنێ. سێبەری ئەشکەوتەکە ئاپوورەی داون و وەک پەڕۆیەکی سووک و تۆکمە دایپۆشیون. "لالا" بە روونی گوێی لە دەنگی ئاوەکەیە کە لە درێژای دیواری ئەشکەوتەکە ئەچۆڕێتە خوارەوە، کاتێ پێستی بە "ئارتانی"ەوە ئەنووسێ، شاڵاوێکی سەرگێژئاوەر دایدەگرێ. ئەوە گەرمای هەتاوە کە تەواوی رۆژ جەستەی سیخناخ کردوون و ئێستا بە شەپۆلی تاوداری ماوەدارەوە هەڵدەقوڵێ. هەناسەکانیشیان تێکڵاو ئەبێت. چونکە نیازیان بە دواندن نیە، تەنیا نیازیان

بەو شتەیە کە هەستی پێ ئەکەن، گێژییەک کە هێشتا نامۆیە، مەستیەک کە لە ساتێکدا لە تاریکی ئەشکەوتەکە لە دایک بووە. ئەڵێی ماوەیەکی زۆرە دیوارە بەردینەکان و تاریکیە شێدارەکە بە تەمای هاتنی ئەمانە کە هێزەکەی رزگار بکات. سەرگێژەکە کە تا دێت لە جەستەی "لالا"دا پەرە ئەسێنێ، بە روونی ترپەی خوێنەکەی ئەبیسێ کە لەگەڵ شۆرەی ئاوی ئەشکەوتەکە لە سەر دیوارەکان و قیژەی شەمشەمە کوێرەکان تێکەڵ بوون. ئەڵێی جەستەی ئەوان و ناوەوەی ئەشکەوتەکە هەر یەکێکن، یان زیندانی گەلێکن لە سکی دێوێکدا. بۆنی بزن و مەڕی "ئارتان"ی لەگەڵ بۆنی کچەکە تێکەڵاو بووە، "لالا" هەست بە گەرمای دەستەکانی و ئارەقی تەویلی ئەکات، لە پڕ تێ ناگات خەریکە چی روو ئەدات، ئەترسێ و ئەیەوێ خۆی رزگار بکات. ترس دای ئەگرێت، سەر ئەبزوێنێ و هەوڵ ئەدات لە باوەشی شوانەکە دەربازبێت کە باسکەکانی لەسەر بەردەکانی ماوە و لاقە درێژەرەقەکانی لە لاقەکانی ئەم گرێ داوە. "لالا" ئەیەوێ بقیژێنێ، بەڵام وەک لە خەوێکدا بێت، تەنانەت دەنگی لە گەروییەوە دەرنایەت. سێبەرە شێدارەکە ئەیگوشێ و بەرچاوی ئەگرێ و قورسی جەستەی شوانەکە ناهێڵێ هەناسە بکێشێ.

پاشان لە پڕ ئەقیژێنێ، زایەڵەی دەنگی وەک هەورە تریشقەیەک لە سەر دیواری ئەشکەوتەکە، شەمشەمە کوێرەکان لە خەو رائەچەنێ و ئەیان شڵەژێنێ، شەقەی باڵیان و جیرەجیر و قیرەقیریان تێکەڵ ئەبێت. "ئارتانی" هێشتا لەسەر بەردەکەیە، خۆی دوور ئەخاتەوە، هەر دوو دەستی خێرا خێرا رائەوەشێنێ بۆ ئەوە شەمشەمە کوێرە مەستەکان لە سەر و ملی دوور بکاتەوە. "لالا" روخساری نابینێ، تاریکی ناو ئەشکەوتەکە خەستر بوەتەوە. شاڵاوی خەم و پەژارەیەک دایئەگرێت. ئیتر نە لە تاریکی ئەترسێ نە لە شەمشەمە کوێرەکان. ئەمجا دەستی "ئارتان"ی ئەگرێ، هەست ئەکا هەموو گیانی ئەلەرزێ. جووڵەی لە خۆی بڕیوە، لە لاقەد بەرەو ژووری چەماندوەتەوە و باسکی لە سەر چاوی توند کردوە بۆ ئەوە ئیتر شەمشەمە کوێرەکان نەبینێ. هێندە توند ئەلەرزێ تەقەی ددانەکانی دێت. "لالا" بەرەو دەرگای

ئەشکەوتەکە رایئەکێشێ، تا جێگایەک کە هەتاو سەر و ملیان دائەپۆشێ. رەنگ‌ورووی "ئارتانی" پەڕیوە، روخساری هێندە رەحم بزوێنە "لالا" دێنێتە پێکەنین. قوڕی سەر کراسە دڕاوەکەی خۆی و "ئارتانی" پاک ئەکاتەوە. پێکەوە لە لێژاییەکەی بەرەو فەلاتەکە دائەگەڕێن. هەتاو بە هەموو هێزەوە لە سەر بەردە تیژەکان ئەبریسکێتەوە، زەوی ژێر ئاسمانە رەشەکە سوور و سپی ئەنوێنێ. وەک بڵێی لە هەوایەکی زۆر گەرما بن، کە لە پێشا سەریان بکەن بە ناو ئاوێکی زۆر ساردا بۆ ماوەیەکی زۆر لە ئاوەکەدا مەلە بکەن بۆ شۆردنی هەموو گیانیان. دەست ئەکەن بە راکردن، تا ئەتوانن بە خێرایی لە سەر بەردەکان ئەپەڕنەوە، "لالا" ئەوەستێ، هەناسەی سوار بووە، ئەچەمێتەوە، "ئارتانی" لەم بەرد بۆ ئەو بەرد وەک حەیوانێکی سرک ئەپەڕێتەوە. کاتێ ئەزانێ کە "لالا" بەجێ‌ماوە، خولێ ئەداتەوەو ئەگەڕێتەوە، دەست لە ناو دەستی یەکتر، هەتاو بەرەو ئاسۆ مل ئەنێ، ئاسمان زەرد ئەنوێنێ، لە نێوان تەپۆلکەکاندا لەم‌لاولا فیکەی کزی شوانەکان و ژاوەژاویان بەرز بوەتەوە.

***

"لالا" گەلێ حەز لە ئاگر ئەکات. لێرە لە شاری "سیتە" هەموو چەشنە ئاگرێک پەیدا ئەبێت. ئاگری ژێر تیانە گەورە رەشەکان کە ژن و کیژۆڵەکان بەر لە کازیوە چێشتی پێ لێ ئەنێن، لەگەڵ دووکەڵ و تەم و مژی بەیان تێکەڵ ئەبن، ئاگری دارو دەوەنەکان کە ماوەیەکی زۆر بێ گڕ ئەسوتێن.

ئاگری ئاگردانەکانی دەمەو ئێواران، لە گزنگی دڵرفێنی هەتاودا و بریقە بریقی تیانە مسینەکان. دووکەڵە نزمەکە وەک مارێکی درێژ شەپۆل ئەدات لەم ماڵ بۆ ئەو ماڵ، بە شێوەی ئەڵقەگەلێ خۆڵەمێشی بەرەو دەریا مل ئەنێن. ئاگری ژێر قوتوی کۆنەی خۆراک کە قیری تیا ئەکوڵێنن بۆ ئاخنینی کونی سەرمیچ و دیوارەکان. لێرە هەموو کەس ئاگری خۆش ئەوێ، بە تایبەت پیر و منداڵەکان. کاتێ ئاگرێک ئەگرێ ئاپوورەی ئەدەن و لە سەر پاژنەی پێ هەڵئەتروشکێن و چاو ئەبڕنە سەمای شۆڵەکان و جار جار چیکلەی بۆ توور ئەدەن کە خێرا بە قرچە قرچ نێڵە ئەدا. یان بە مشت گڵ و

گیای بۆ فڕێ ئەدەن کە گەردەلوولێکی شین بەرز ئەبێتەوە. "لالا" لە سەر لمەکە بەرەو دەریا دائەنیشێ. لەوێ "نوعمان"ی ماسیگر بە چیلکە، ئاگرێکی کردوەتەوە و بۆ سواق دانی بەلەمەکەی، قیر ئەکوڵێنێ.

شەو خەریکە دادێت، هەوا ئارام و هێمنە، ئاسمان شینێکی کەم ڕەنگ و ساماڵ و بێ هەورە. لە قەراخ دەریا هەمیشە درەخت گەلێکی ناسکی دڕکاوی هەن کە هەتاو و خوێ سووتاندوونی. کاتێ "لالا" لەوێوە تێپەڕێ مشتێ دڕکی لێ ئەکاتەوە بۆ ئاگرەکەی "نوعمان"ی ماسیگر. چەن دەنک ئەخاتە ناو دەمی بۆ ئەوە بەدەم ڕۆیشتنەوە بیجاوێ، دڕکەکان سوێر و توونن. بەڵام کاتێ لەگەڵ بۆنی دووکەڵ تێکەڵ ئەبێ پێی خۆشە.

"نوعمان" لە هەر جێگایەک چیلکە و دار پەیدا بکات ئاگر دائەگرسێنێ. کۆگایەک چیلکە کۆ ئەکاتەوە، لقە ناسکەکان ئەخنێتە چاڵە بچووکەکانی ناو لمەکە.

کاتێ هەتاو هێشتا بە تاقی ئاسمانەوەیە، ئارەق لە تەوێڵ و گۆناکانی پیاوە پیرەکەوە دائەچۆڕێ. لمەکە وەک ئاگر گری گرتوە. پاشان بە فەنەکەکەی دارەکان دائەگرسێنێ. هەوڵ ئەدا ئاگرەکە لە بەر "با"کەدا نەکاتەوە، "نوعمان" باش ئەزانی ئاگر بکاتەوە. "لالا" بە سەرنجەوە بۆ هەموو هەڵسووکەوتەکانی ئەڕوانێ بۆ ئەوەی خۆشی فێر بێت. هەمیشە لە جێگایەکدا ئاگر ئەکاتەوە، نە زۆر لە کونجدایە، نە زۆر بەرئاوەڵایە، لە چاڵایی دۆڵەکاندا. ئاگرەکە دوو سێ جار ئەیگرێت و ئەکوژێتەوە. کاتێ ئەکوژێتەوە "نوعمان" دەست بە ناو چڵە دارەکاندا ئەگەڕێنێ، بێ ئەوە لە سووتاندن بترسێ.

ئاگر هەروایە، هەر کەس سڵی لێ نەکات، خۆشی ئەوێ. شۆڵەکان دیسان ئەپەڕنە دەرەوە. لە پێشدا بچووکن، تەنیا پۆپەی ئاگرەکە لە نێوان لقە دارەکاندا ئەبینرێن. ئەمجا لە پڕ لە بێخەوە دەست ئەکات بە نێڵە نێڵ. "نوعمان"ی ماسیگر سێ پاچکەیەکی ئاسنی لە سەر دائەنێ و تیانەیەکی گەورەی پڕ لە قیر لە سەریا و بە دیار قیرەکەوە دائەنیشێ و چاو ئەبڕێتە ئاگرەکە. جار جار لقێ داری بۆ ئەهاوێ.

منداڵەکانیش بۆنی دووکەڵە کە هەست پێ ئەکەن، لە دوورەوە لە ئاستی قەراخەوە بە راکردن دێن، دەوری لێ ئەدەن. دەست ئەکەن بە قیژە قیژ و ئەتریقێنەوە. چونکە ئاگرە سیحراویەکە مرۆڤ هەڵئەنێ کە بقیژێنێ، رابکات و بە شادیەوە پێبکەنێ. لەو کاتەدا بەرز و گەش بە قرچە قرچ ئەبزوێن و سەما ئەکەن. هەموو جۆرە جوانیەک لە ناویاندا ئەبینرێ. بە تایبەت "لالا" خۆشی لە لقە نیوە سوتاوەکانی ناوەراستی ئاگرەکە دێ، شۆڵەکان دەوری ئەدەن و رەنگێکی ئاگرینی بێ ناوی هەیە، کە هاو رەنگی هەتاوە، هەروەها چاو ئەبڕێتە بڵێسەکان کە لە ئاستی دووکەڵە رەنگ خۆڵەمێشیەکەدا بەرز ئەبنەوە. ئەگرێن و ئەکوژێنەوە و لە شینایی ئاسماندا نوقم ئەبن، شەو، بڵێسەکان جوانتر ئەنوێنن، لە ریزە ئەستێرە ئەچن.

بۆنی "وارێش"ی سوتاو و بۆنی قیری کوڵاو، مێشەکانی بانگهێشتن کردووە. "نوعمان" هەموو سەرنجی لای ئاگرەکەیە، جار جار هەڵئەسێتەوە و بە چڵە دارێکی تەڕ قیری ناو تیانەکە ئەشێوێنێ، خێرا خێرا لە بەر دووکەڵ پێڵوەکانی لێک ئەنێ. بە لەمەکە چەن مەترێک لەولاتر لە قەراخ، سەرەونخوون کراوە. هەتاو بە خێرایی ئاوا ئەبێ. ئێستا لەو بەر تەپۆڵکەکان، تاریکی پەرەئەسێنێ. منداڵەکان لە تەنیشت یەک لە قەراخ دەریا دانیشتون، ئیتر پێناکەنن. "لالا" بینایی لە سەر "نوعمان" راگیر ئەکات، ئەیەوێ برووسکە رەنگ ئاویەکەی نیگای ببینێ. "نوعمان" ئەیناسێتەوە، بە میهرەبانیەوە دەستی بۆ رائەوەشێنێ، خێرا وەک ئاسایی‌ترین شتی دنیا بێت ئەڵێ: تا ئێستا سەبارەت بە بە "بالابیلوو"* قسەم بۆ کردوی؟

"لالا" سەر ئەلەقێنێ. هەست بە بەختەوەری ئەکات چونکە کاتی بیستنی چیرۆکە، لە قەراخ دەریا، بە دەم سەیر کردنی ئاگرەکە، کە شەپۆلی خستوەتە ناو تیانەی قیرەکەوە.

دەریایەکی شینی شین و "با"یەکی فێنک کە دووکەڵەکە رائەکێشێ و ویزەویزی

---

* ـ Ballabilou

مێش و زەردەواڵەکان، تۆزێک لەولاتریشەوە دەنگی شەپۆلەکان کە بەراییان تا بەلەمە کۆنە سەرەنخونەکەی سەر لمەکە دێت.

- ئێ! یانێ من تا ئێستا چیرۆکی "بالابیلووم" بۆ نەگێراویتەوە؟

"نوعمان"ی پیر هەڵئەسێتەوە سەر لە قیرەکە بدات کە بە توندی ئەکوڵێ. چڵەدارەکە لە ناو تیانەکەدا ئەخولێنێتەوە و بەرەزامەندی تاوەیەکی دەستە سووتاو ئەداتە دەست "لالا"وە:

- پڕیکە لە قیر بۆم بهێنە بۆ ئەوێ، بۆ لای بەلەمەکە.

بە تەمای وەڵام نامێنێتەوە بەرەو بەلەمەکە مل ئەنێ. هەموو جۆرە پەڕەمووچێکی بە پەڕۆ کۆنە و چڵە دار دروست کردوەو ئامادەن.

- وەرە!

"لالا" تاوەکە پڕ ئەکات، لە سەر قیرە کوڵاوەکە بڵقی بچووک دروست ئەبن و بەرز ئەبنەوە. دووکەڵەکەی چاوی "لالا" ئەسووتێنێتەوە. بەڵام تاوەکە ئەگرێت و رائەکات، منداڵەکان بە قلانەوە ئەکەونە دوای لە دەور بەلەمەکە دائەنیشن.

- «بالابیلوو، بالابیلوو»

"نوعمان"ی پیر ناوی بولبولەکە بە ئاهەنگەوە، ئەڵێتەوە، ئەڵێی ئەیەوێ هەموو چیرۆکەکە بێتەوە یادی. پەڕەمووچەکان ئەژەنێتە ناو قیرە کوڵاوەکە و دەست ئەکا بە سواق دانی بەلەمەکە، جەمسەری تەختەکان کە بە تاڵە دەزوو ئاخنراون.

«ماوەیەکی زۆر لەمەو پێش، کاتێ کە من نەبووم، تەنانەت باوکم و باوکی باوکیشم نەبوون، بەڵام رووداوەکە بە باشی گەیشتوەتە ئێمە، لەو زەمانەدا ئەم خەڵکەی ئێستا نەبوون، هێشتا رۆمیەکان نەناسرا بوون و لەگەڵ وڵاتانی دیکەیش پێوەندیەکی وایان نەبوو.

ئەو کاتە هێشتا جنۆکە هەبوو، چونکە خەڵک نەیاندەگرتن. لە شارێکی گەورەی رۆژهەڵات، ئەمیرێکی بە هێز بوو. کە تەنیا کچێکی هەبوو بە ناوی "لەیلا"، یانێ شەو، ئەمیر کچەکەی لە دونیادا لە هەموو شت زۆرتر خۆش ئەویست. کچەکە

جوانترین کچی ئەو وڵاتە بوو، کچێکی لە سەر خۆو ژیر.»

شەو زۆر بە هێمنی هاتوە، رەنگە شینەکەی دەریا تۆخترە، کەفی شەپۆلەکان سپی‌تر ئەنوێنێ. "نوعمان"ی ماسی‌گر پەیتا پەیتا پەرەمووچەکان ئەژەنێتە ناو قیرەکە و ئەیهێنێ بە ئاستی جەمسەری تەختەکاندا، قیرە تراوەکە ئەچێتە ناو درزەکان و ئەتکێتە سەر لمی قەراخ دەریا. هەموو منداڵەکان چاویان بڕیوەتە دەستەکانی "نوعمان". "نوعمان" درێژە بە چیرۆکەکە ئەدا:

«ڕووداوێکی سامناک ڕوویدا، وشک‌ساڵی بەڵایەکی خوایی بوو، هەموو وڵاتی داگرت، تنۆکێ ئاو لە چۆم و خەزینەکانیاندا پەیدا نەدەبوو، هەموو لە بێ ئاویدا ئەمردن، لە پێشدا گژوگیا و درەختەکان وشک بوون پاشان باڵندە و مەڕ و بزن و وشترەکان مرداربوونەوە و دواتر مرۆڤەکان لە هۆڵەکانیاندا لە قەراخ شەقامەکاندا یەک یەک ئەمردن؛ دیمەنەکە گەلێک سامناک و دڵتەزین بوو، بۆیە هێشتا ڕووداوەکە لە بیرەوەری مرۆڤدا ماوە.»

مێشە پانەکان بە ویزە ویز لە سەر لێوی منداڵەکان ئەنیشنەوە، بۆنی توندی قیر و دووکەڵ مەستی کردوون، زەردەواڵەکانیش ویزەیان دەیت، بەڵام کەس نایانگرێت، چونکە "نوعمان"ی پیر خەریکە چیرۆکیان بۆ ئەگێڕێتەوە. وەکوو سیحر کرابن ئەڵێی ئەوانیش جنۆکەن.

«ئەمیری وڵات پەشێو و بێ‌دەرەتان، دائەمێنێ، زانایانی وڵات بانگهێشتن ئەکات بۆ ئەوە چارەیەک بدۆزنەوە، بەڵام کەس چارەسەری وشکساڵی بۆ نەئەکرا.

موسافرێکی غەریبی خەڵکی "میسر" کە سیحری ئەزانی، دێتە وڵاتەکەیان. ئەمیر داوای لێ ئەکات چارەسەرێکیان بۆ بدۆزێتەوە. کابرای "میسر"ی چاو ئەبڕێتە تنۆکێ جەوهەر، بەڵام خێرا ترس دایئەگرێت و لەرز ئەکا و ورتەی لێوە نایەت.

ئەمیر ئەڵێ: بڵێ،

من دەوڵەمەندترین کەسی ئەم وڵاتەت ئەکەم.

بەڵام کابرای نامۆ ورتەی لێوە نایەت، چۆک ئەدا:

-ئەرباب بهێڵە با بڕۆم، با ئەم نهێنیە ئاشکرا نەکەم.»

کاتێ "نوعمان" بێدەنگ ئەبێ، پەرە مووچەکان ئەژەنێتە ناو تاوەکە، "لالا" و منداڵەکان هەناسە ناکێشن. قرچە قرچی ئاگرەکە و قوڵتەقوڵتی ناو تیانەکە بەرز ئەبێتەوە.

«ئەمجا ئەمیر قەڵس ئەبێت و دائەخورێ بە سەر کابرای میسریدا؛ دەی بیڵێ، ئەگینا فەرمان ئەدەم... جەللادەکان بە شمشێرەوە هێرشی بۆ ئەبەن.

کابرای نامۆ ئەقیرێنێ:

-راوەستە، رازی نفرینەکەت پێ ئەڵێم، بەڵام بزانە نفرین کراوی.»

"نوعمان"ی پیر بە شێوەیەکی زۆر تایبەت و ئارام وشەی "مەلعوون"*، نفرین کراوی خوا، دووپات ئەکاتەوە، ساتێ بێدەنگ ئەبێت. ئەمجا بێ ئەوە هیچ بڵێت تاوەکە ئەدات بە "لالا"، ئەویش بەفرکان فرکان تا لای ئاگرەکە ئەڕوا، پری ئەکات لە قیری کوڵاو، "نوعمان" تاگەڕانەوەی "لالا" چاوەڕوان ئەمێنێ.

«ئەمجا کابرای میسری بە ئەمیر ئەڵێ:

-تۆ پیاوێ کە زێری تاجرێکی دزیوە، تەمێت کردووە؟

ئەمیر وتی:

-ئەرێ تەمێم کرد، چونکە دز بوو.

پاشان کابرای میسری وتی:

بزانە کە ئەو پیاوە بێ گوناح بوو. ئیفترا بوو، ئەویش تۆی نفرین کردوە و ئەم وشکساڵیە هاتوە، چونکە لەگەڵ جنۆکە و شەیتان پێوەندی هەیە.»

شەو داهاتووە. گوێیان لە دەنگی قایمی "نوعمان" شل کردوە، ئەڵێی کات بوونی بۆ نیە، یان زەمان گەڕاوەتەوە بۆ دواوە، بۆ زەمانێکی تر، ئارام و ماوەدارتر. "لالا" حەز ئەکات چیرۆکەکەی "نوعمان" هەرگیز دوایی نەیەت. تەنانەت ئەگەر رۆژان و شەوانی زۆریش درێژەی بێت و ئەو و منداڵەکان بنوون و کاتێ لە خەو

---

*- Mlaaoune

هەڵئەسن، هێشتا دەنگی "نوعمان"ی پیر ببیسن.

«ئەمیر پرسیاری کرد:

دەی چارە چیە؟

کابرای میسری چاوی بڕیە ناو چاوی و وتی:

بزانە کە تەنیا یەک چاری هەیە، ئێستا کە خۆت ئەتەوێ ئەیڵێم، ئەبێ تەنیا کچەکەت کە لە هەموو دونیا پێت خۆشەویسترە قوربانی کەیت. بڕۆ بیکە بە خۆراکی حەیوانە وەحشیەکانی دارستان، ئەوجا وشکساڵی وڵاتەکەت دوایی پێ دێت.

ئەمیر دەستی کرد بە شین و گریان، لە تورەیی و رەنجدا ئەیقیراند. چونکە پیاوێکی چاک بوو کابرای میسری ئازاد کرد بڕوا، کاتێ خەڵکی شار ئەمەیان بیست، ئەوانیش دەستیان کرد بە شین و شەپۆر، چونکە "لەیلا" کچی شا، خۆشەویستی هەموویان بوو. بەڵام ئەبوایە قوربانی بکرایەت. ئەمیر بڕیاریدا کچەکەی بۆ حەیوانانی وەحشی دارستان ببرێت. لەو وڵاتە لاوێکی تیا بوو کە لە هەموو زۆرتر "لەیلا"ی خۆش ئەویست بڕیاریدا رزگاری کات، ئەنگوستیلەیەکی هەبوو کە بە میرات پێ گەیشتبوو، کە ئەیتوانی بیکا بە حەیوان. بەڵام هەرگیز نەئەبوو بە مرۆڤ و هەروا بە حەیوانی ئەمایەوە. رۆژی قوربانی کردنەکە گەیشت، ئەمیر و کچەکە رێی دارستانیان گرتەبەر.»

هەوا ساف و خاوێنە، ئاسۆ هێڵێکی بێ بڕانەوەیە، "لالا" تا ئەتوانێ بۆ دوور ئەڕوانێ، ئەڵێی گاکیە و ئەیەوێ راستەوخۆ بەرەو سەر دەریا مل بنێ.

«کاتێ ئەمیر گەیشتە ناوەندی دارستان کچەکەی لە ئەسپەکە داگرت و بەستیەوە بە درەختێکەوە، پاشان بە دەم گریان و ئازارەوە دوور کەوتەوە. دەنگی حەیوانە وەحشیەکانی بیستبوو کە لە قوربانیەکە نزیک ئەبوونەوە.»

دەنگی شەپۆلەکان لە سەر قەراخ روون و ئاشکرایە، ئەڵێی دەریا نزیک بوەتەوە، بەڵام تەنیا ویژەی "با"یە لە چاڵایی دۆڵەکاندا لوول ئەخوات، کۆڵەکەیەک لە تۆزی لم هەڵئەبەزێنێتەوە کە لەگەڵ دووکەڵ تێکەڵاو ئەبن.

«لە دارستان "لەیلا"ی بێچارە بەستراوە بە درەختێکەوە، لە ترسا ئەلەرزی و باوکی بانگ ئەکرد یارمەتی بدات چونکە ئەو جۆرە مردنە لە ورەی ئەودا نەبوو کە حەیوانە وەحشیەکان هەڵیدرن.

گورگێ لێی نزیک بوەوە. چاوەکانی وەک شۆڵەیەک لە شەودا ئەبریسکایەوە. ئەمجا لە پڕ دارستان سیخناخ بوو لە ئاهەنگێ کە هێندە جوان و تایبەت بوو کە ترسەکەی لێی رەویبوەوە، هەموو حەیوانە وەحشیەکانی دارستانیش جووڵەیان لێ برابوو و گوێیان ئەگرت.»

دەستەکانی "نوعمان"ی پیر یەک لە دوای یەک پەرەمووچەکان هەڵئەگرێ و ئەیهێنێ بە لاشەی بەلەمەکەدا، "لالا" بە جۆرێ ماقی دەستەکانی بووە، ئەڵێی ئەوانیش خەریک گێڕانەوەی چیرۆکن.

«ئاهەنگە ئاسمانیەکە بە هەموو دارستانەکەدا بڵاو ببوەوە، حەیوانە وەحشیەکان بە گوێگرتنی، وەک بەرخێکی ئارام و هێمن ئەخەوتن. چونکە ئاوازە ئاسمانیەکە ئەی گۆڕاندن و رۆح و گیانی ئەهەژاندن.

"لەیلا"یش بە حەزەوە گوێی لە ئاهەنگەکە گرتبوو تەنافەکان بۆ خۆیان کرانەوە، لە دارستانەکەدا رێکەوت ، بۆ هەر کوێ ئەرۆیشت، ئاهەنگە نادیارەکە بە سەریەوە بوو، لە نێوان لق و گەڵای درەختەکاندا شاریاوە بوو. حەیوانە وەحشیەکان لە قەراخ رێگاکە راکشا بوون. دەستی کچی پاشایان بێهیچ ئازارێ ئەلستەوە.»

هەوا گەلێ روون و ئارامە، رووناکی نەرم و دڵبزوێنە، ئەڵێی لە دونیایەکی تر دان.

«بەیانی دوای شەوێ رێپێوان "لەیلا" ئەگەڕێتەوە بۆماڵی باوکی، ، ئاهەنگەکە تا کۆشکەکە لەگەڵیا ئەڕوا، کاتێ خەڵک ئاگادار ئەبن شاد و خۆشحاڵ ئەبن، چونکە کچی پادشایان گەلێ خۆش ئەویست. بەڵام کەس سەرنجی باڵندەیەکی بچووکی نەئەدا کە بە نهێنی، لقاولق ئەفڕی، ئەو رۆژە باران ئەباری....»

"نوعمان" ساتێ دەس لە قیر کردن هەڵدەگرێ، "لالا" و منداڵەکان بۆ روومەتە

مسینەکەی و چاوە سەوزەکانی ئەڕوانن. بەڵام کەس پرسیار ناکات. کەس متەقی لێوە نایەت.

«لەژێر باراندا، باڵندەی بالابیلوو تەواوی رۆژ ئاوازی خوێندبوو. چونکە ئەو لە هەموو کەس زۆرتر "لەیلا"ی خۆش ئەویست. ئەو رزگاری کردبوو، بەڵام نەیدەتوانی وەک پێشووی خۆی لێ بێتەوە.

هەموو شەوێ لە سەر لقی درەختی تەنیشت پەنجەرەکەی "لەیلا" ئەنیشتەوە و خۆشترین ئاوازی ئەجریواند. تەنانەت ئەڵێن، کچی پاشا دوای مەرگی ببوو بە باڵندەیەک و لەگەڵ بالابیلوو تا ئەبەد لە دارستان و باخەکاندا ئەجریوێنن.»

کاتێ چیرۆکەکە دوایی پێدێت، "نوعمان" هیچ ناڵێ، بێوچان قیر ئەساوێ بە بەلەمەکەدا، رووناکی نەماوە، هەتاو خزاوەتە ئەو بەر ئاسۆ، ئاسمان زەردە و بە ئەستەم سەوز، ئەڵێی تەپۆڵکەکان لە نێو پانتاییەکی قیردا لەت لەت بوون، دووکەڵی ئاگرەکە ناسک و سووکە، وەک دووکەڵی جگەرەیەک ئەنوێنێ.

منداڵەکان یەک یەک ئەڕۆن. "لالا" بە تەنیا لای "نوعمان"ی پیر ئەمێنێتەوە، ئەویش بێورتە کارەکەی دوایی دێنێت. ئەمجا پەرە مووچەکان و تاوەی قیرەکە هەڵئەگرێ و درێژای قەراخ دەریاکە ئەگرێتە بەر. لە تەنیشت "لالا" تەنیا ئاگرەکەیەکە بە ئارامی ئەکوژێتەوە، تاریکی خێرا قووڵایی ئاسمان داگیر ئەکات. تاریکی شەوانە بەرەبەرە جێگای رەنگە شینە تۆخەکەی رۆژ ئەگرێتەوە.

لە پڕ بێ ئەوە هۆکەی بزانێ دەریا هێمن ئەبێتەوە، شەپۆلەکان شل و داهێزراو ئەکەونە سەر لمەکە و سفرە ئاوەڵاکەی کەفەکە.

یەکەمین شەمشەمە کوێرەکان لە ئاستی سەر دەریاوە بە خوارو خیچی ئەکەونە دوای دەعباکان، پەپوولە رەنگ خۆڵەمێشیە ئاوارەکانیش باڵیان گرتووەتەوە. "لالا" قیژەی مەلەمێش خۆرەکان ئەبیسێ. ناو ئاگرەکە چەند شۆڵەی سووری بێدووکەڵ و بەتین ئەسووتێن، لە گیاندارێکی سەیری بزۆک ئەچن لە ناو خۆڵەمێشدا داشاریابن. دوایین شۆڵە لە دوایین ساتەکانی ژیانیدا بە گڕەوە، وەک ئەستێرەیەک ئەسووتێ.

"لالا" هەڵئەسێت و ئەڕوا.

***

تەپ و تۆزی سەر جادە کۆنەکە پڕە لە جێپێ "لالا" زۆری پێخۆشە دوایان کەوێ. ئەگەر جێی پێی دەعبا و باڵندە بن، رێ بۆ هیچ کوێ نابەن. هەندێ جار بۆ کونەکانی زەوی، یان تا بەر خانوویەکی ئەبەن. "ئارتانی" فێری کردوە چۆن دوای جێ پێ کان کەوێ، بێ ئەوە ونیان بکات. "ئارتانی" وەک سەگێ ئەکەوێتە دوای جێ پێکان. چاوەکانی ئەبریسکێنەوە، کونە لووتەکانی ئەکرێتەوە و دائەنەوێتەوە. تەنانەت جار جار لە سەر زەوی رائەکشێ بۆ ئەوە باشتر دیاریان کات. "لالا"کوێرەرێگاکانی نزیک دۆڵەکانی زۆر پێخۆشە. یەکەمین رۆژەکانی هاتنی بۆ "سیتە" دێتەوە یادی، لە دوای ئەوە دایکی لە نەخۆشینی "یاو" مردبوو. لە دوای کامیۆنێکی برزنتی لەگەڵ خوشکی باوکیدا کە پێی ئەڵێ "عەمە" بۆ "سیتە" هاتبوون. پاڵتۆیەکی گەورەی خوری لەبەر کردبوو، روومەتی بە هۆی تەپوتۆزی بیابانەوە داپۆشیبوو، سەفەرەکەیان لە ژێر برزنتە خنکێنەرەکەی پاشکۆی کامیۆنەکە چەند رۆژی خایاند بوو.

رۆژی دوایی لە کونی برزنتەکەوە، دەریایەکی شینی دیبووو کەفی درێژای قەراخەکەی و دابویە پرمەی گریان، نەیدەزانی گریانی خۆشحاڵیە یان ماندوویەتی. هەر جارکە لە کوێرەرێگاکەی قەراخ دەریا هەرە شینەکە تێئەپەرێ، ئەکەوێتەوە یادی کە لە نێوان تەپوتۆزی خەسی کامیۆنەکەوە دیتبووی.

لەولاتر، لە درێژای قەراخەکە یادی هەموو ئەم بیرەوەریانە ئەکاتەوە، وەک ئەو شتانەی لە کونی برزنتەکەوە دیتبووی، فرمێسک لە چاویدا قەتیس ماوە، هەست بە نیگای دایکی ئەکات کە لە رێگای نێوان تەپۆڵکەکانەوە، ئەیلەرزێنێ و ئابلۆقەی ئەدات، دڵی توندتر لێ ئەدات، چەماوەتەوە و بە دوایدا ئەگەرێ. وەک "ئارتانی"، کاتێ کە بە دوای جێ پێکاندا ئەگەرێ. بە دوای جێگایەکدا ئەگەرێ کە لەوێوە هاتوە زەمەنێکی زۆری بەسەراچووە و ئیتر نایەتەوە یادی.

جارجار بە ئارامی ورتەی دێت: "ئومی".*

برێ جار بە ئارامی، بە هەناسە کێشان، بە دەم سەیر کردنی دەریا هەرەشینەکەی نێوان تەپۆلکە لمەکەوە، لەگەڵیا ئەدوێ. نازانێ ئەبێ چی بڵێ، چونکە ماوەیەکی زۆری لێ گوزەراوە، تەنانەت لە بیری چوەتەوە دایکی چۆن بووە.

«بۆ کوێ چووی دایە؟ زۆر حەز ئەکەم بتبینم، نیازم پێتە.»

لە سەر لمەکە رووەو دەریا دائەنیشێ، چاو ئەبڕێتە بزاوتی ئارامی شەپۆلەکان، بەڵام لەو رۆژە ناچێت کە بۆ یەکەمین جار لە دوای تەپوتۆزە خنکێنەرەکەی کامیۆنەکەوە، لە سەر جادە سوورەکە دیتبووی.

«"ئومی" ناتەوێ بۆ دیتنم بگەڕێیتەوە؟ ئەبینی کە فەرامۆشتم نەکردووە.»

"لالا" لە بیرەوەریدا بە دوای وشەگەلێ ئەگەڕێ کە دایکی بە سرتە پێی وتبوو، بەڵام دۆزینەوەیان ئەستەمە، ئەبێ چاوی بقوونجێنێ و هەڵگەڕێتەوە بۆ دواوە، تا ئەتوانێ دوور کەوێتەوە. ئەڵێی ئەکەوێتە ناو چاڵێکی بێ‌بن. "لالا" دیسان چاوی ئەکاتەو، چونکە لە بیرەوەریدا هیچ نادۆزێتەوە، هەڵئەسێتەوە. هەتاو سەر شان و ملی ئەسووتێنێ و لە چاوی ئەدات، "لالا" پێی خۆشە، "با" دەنکە خوێکان فڕێ ئەداتە سەر لێوی. چاوی بە سەر گوێ ماسیەکانی سەر لمەکەدا ئەگێڕێ. گوێ ماسیە پەمەییەکان وشەیتانۆکە کۆنە پانە رزیوەکان، بە سەر لمەوە هەنگاو هەڵئەگرێت بۆ ئەوە پێ لە سەر بووکە دەریایی و سفرەماسیەکان نەنێت. جارجار کە ئاوەکە پاشەکشێ ئەکات، لمەکە لە شوێنێکدا کە ماسیەکی لووس ئەبزوێ، ئەشڵەژێ.

"لالا" لە درێژای قەراخەکە و دەنگی شەپۆلەکان دوور ئەکەوێتەوە. جارجار ئەوەستێ و بێ جووڵە رائەمێنێ و سەیری سێبەرە رەشەکەی ئەکات، کە ئەخزێتە ژێر لاقەکانی و سەیری بریقەبریقی کەفەکە ئەکات. دیسان ئەڵێ:

«"ئومی"، ناتەوێ هەر بۆ ساتێ بگەڕێیتەوە؟ ئەمەوێ بتبینم. چونکە گەلێ

---

* - Oummi

تەنیام، کاتێ مردی و "عەمە" بە دوامدا هات، من نەمدەویست لەگەڵی بێم، ئەمزانی ئیتر ناتوانم بتبینمەوە، بگەڕێوە، هەر بۆ ساتێ بگەڕێوە.»

بە چاوی نیوە کراوە، بە روانینی بریقە بریقی سەر لمە سپیەکە، ئەتوانێ پانتایی لمەکە ببینێ، لەولاتر، لە وڵاتی "ئومی"، لەدوورەوە ماڵەکە ئەبینێ. لە ناکاو رائەچەنێ، هەست ئەکا درەختێکی وشکی دیوە، دڵی بە توندی لێ ئەدات، بەرەو تەپۆڵکەکان هەڵدێ، لەوێ کە "با" ئەگرسێتەوە.

بە دەما خۆی ئەخاتە سەر لمە داخەکە، درکە بچووکەکان کراسەکەی ئەدڕێنن، سک و رانی ئەگەزن. بەڵام گوێ نادات. ئازارێ لە جەستەیدا ئەگەڕێ. هەست ئەکا خەریکە لە سەر خۆی بچێ. دەستەکانی بە ناو لمەکەدا ئەگەڕێنێ، هەناسەی بۆ نادرێ، وەک داری وشک هەڵاتووە، بە ئەسپایی چاوی ئەکاتەوە، ئەڵێی لە راستیدا تارمایی درەختە وشکەکە ئەبینێ کە چاوەڕوانیەتی. بەڵام هیچ دیار نیە. ئاسمان گەلێ هەراوو شینە، شڵپەی شەپۆلەکان لەوبەر تەپۆڵکەکانەوە ئەبیسرێ. دیسان بەدەم ناڵەوە ئەڵێتەوە:

- "ئومی"، ئای "ئومی".

بەڵام ئێستا دەشتە پان و بەرینە سوورەکە ئەبینێ، لەوبەر درەختە وشکەکە، دەشتێکی هەراوە، ئەڵێی بە بارستای پانتایی زەوی درێژەی هەیە. کیژۆڵەکە لە ناو تۆز و خۆڵدا بەرەو درەختە وشکەکە رائەکات. هێندە بچووکە لە هەراوی دەشتەکەدا خێرا بزر ئەبێت. لە نزیکی درەختە رەشەکەدا، بێ ئەوە بزانێ بۆ کوێ ملی ناوە. ئەمجا بە هەموو هێزیەوە ئەقیژێنی، دەنگی بەسەر بەردە سوورەکانەوە هەڵئەبەزێتەوە، لە نێوان بروسکەکانی هەتاودا بڵاو ئەبێتەوە. ئەقیژێنی، بێدەنگیەکی سامناک ئابلۆقەی داوە، بێدەنگیەکە ئەیگووشێ، ئازاری پێ ئەگەیەنێت. کیژۆڵەکە رێتەکەوێتەوە، ئەکەوێ بە زەویدا و هەڵئەسێتەوە. نووکی بەردەکان لاقە رووتەکانی ئەڕووشێنن. گریان هەنسکە هەنسکی پێ خستوە، ناتوانێ بە باشی هەناسە بکێشێ.

ئەقیژێنێ «"ئومی"، "ئومی"» . ئێستا بە روونی دەنگی ئەبیسێ، دەنگە

خەمینەکەی لە پانتایی بەردەڵان و خۆڵەکە تێئەپەڕێ، ئاپوورەی ئەدا و ئەیخنکێنێ.

بەڵام ئەو وشانە لەو پەر زەمانەوە ئەبیسێ ئازاری ئەدەن... ئاخر مانای ئەوە ئەدەن کە "ئومی" هەرگیز ناگەڕێتەوە. ئەمجا لە پڕ لە بەردەم کیژۆڵە وون بوەکەدا، لە ناوەڕاستی بەردەڵان و خۆڵەکەدا ئەم درەختە وشکە دەرئەکەوێ. درەختەکە لە بەر تینوویەتی‌یان پیری و هەورە تریشقە وشک هەڵاتوە.

زۆر گەورە نیە، بەڵام درەختێکی سەیرەکە بە هەموو لایەکدا لوولی خواردوەو چەن لقی رزیویش کە وەک درکە ماسی راست وێستاون، کۆتەیەکی رەش و ریشەگەلی درێژ کە ئاڵاونەتە بەردەکانی ئاقاری درەختەکە، کیژۆڵەکە بە ئارامی لە درەختەکە نزیک ئەبێتەوە، بێ ئەوە هۆکەی بزانێ دەست دێنێ بە سەریدا. لە پڕ جەستەی ئەنیشێتە سەر ئارەقێکی سارد، لە پۆپەی درەختە وشکەکەوە مارێکی درێژ لە درێژایی لقەکاندا ئەکشێ، زرنگەی پووڵەکەکانی بێبڕانەوە لە سەر لقە وشکەکان بەرز ئەبێتەوە. مارەکە بە ئاسپایی دائەگەڕێ، جەستە رەنگ شین و خۆڵەمێشیەکەی لە روخساری کچەکە نزیک ئەکاتەوە ئەویش جووڵەی لە خۆی بڕیوە، پێڵوەکانی وشک بوون و هەناسە ناکێشێ، ناتوانێ بقیژێنێ.

لە ناکاو مارەکە رائەمێنێ و بۆ کچەکە ئەڕوانێ. ئەویش بە پشتا ئەپەڕێ و تا ئەتوانێ رائەکات. بە شێوەیەک لە پانتایی بەردەڵانەکە هەڵدێ، ئەڵێی ئەیەوێ لە هەموو زەوی تێپەڕێ. زاری وشک هەڵاتوە، رووناکی بە شەوارەی خستووە. هەنکە هەنکی پێکەوتووە، بەرەو ماڵێک رائەکات، بەرەو رۆحی "ئومی" کە بە توندی بە خوێدا ئەیگوشێ و روخساری نەوازش ئەکات. بۆنی قژی "ئومی هەست پێ‌ئەکات. وتە نەرمەکانی دێ بە گوێیدا. بەڵام ئەمڕۆ کەس نیە، لە پانتایی لمە سپیەکەدا کەس نابینێ، ئاسمان پان و بەرین و چۆڵە. "لالا" لە چاڵایی دۆڵەکە جەستەی ئەخاتە سەر زەوی. سەری دائەنەوێنێ بۆ بەین ئەژنۆکانی. هەست ئەکا هەتاو پشتە ملی لە نێوان دوو پەلکەکەی و سەر شانی گڕ تێ‌بەرداوە.

بیر لە "ئێس سێر"، لە "نهێنی" ئەکاتەوەکە لە سەر تاشە بەردەکەی بەرەو بیابان

دیتبوی. ڕەنگە ئەیویست شتێکی پێبڵێ، پێی بڵێ کە تەنیایە، و ڕێگایەک کە بەرەو "ئومی" دەیبا پێی نیشان بدات.

لەوانەیە ڕوانینی ئەوە، شان و پشتە ملی ئەسووتێنێ. بەڵام کاتێ دیسان چاوی ئەکاتەوە، کەس لە قەراخی دەریا نیە، ترسەکەی ڕەویوەتەوە، درەختە وشکەکە، مارەکە و بەردەڵانە سوور و تەپ و تۆزەکە نوقم بوون. ئەڵێی هەرگیز نەیدیون. "لالا" بەرەو دەریا ئەگەڕێتەوە.

دەریا هێندەی ئەو ڕۆژە جوانە کە بۆ یەکەمین جار لە کونی برزنتی کامیۆنەکەوە دیبوی و دابویە پرمەی گریان. هەتاو هەوای سەر دەریای پاک و خاوێن کردوە، شۆڵەکانی لە پۆپەی شەپۆلەکان و پانتایی کەفەکە سەما ئەکەن "با"یەکی فێنک هەڵئەکات، سیخناخ لە بۆنی قووڵاییەکان و گیا و گوێچکەماسی و خوێ و کەف.

"لالا" دیسان بەکاوەخۆ درێژای قەراخەکە ئەگرێتە بەر، لە ناخیدا هەست بە سەر خۆشیەک ئەکات، ئەڵێی بە ڕاستی ڕوانینێک لە دەریاوە، لە ڕۆشنایی ئاسمان و قەراخە سپیەکەوە لە سەر ئەم ڕاماوە. لێی تێناگات بەڵام دڵنیایە کەسێ لە هەموو جێگایەکدا سەیری ئەکات و بە ڕوانینی ڕووناکی ئەکاتەوە و کەمێ نیگەرانی ئەکات. بەڵام گەرمایشی پێئەبەخشێ، شەپۆلێ کە لە ناخیدا ئەبزوێ، لە ناخی سیەکانیەوە تا یەکبەیەکی ئەندامەکانی لەشی ئەگەڕێ. ڕائەمێنێ، بینایی بۆ دەورووبەری ئەچەرخێنێ، کەسی لێ نیە تارمایی هیچ مرۆڤێ بەدی ناکات، تەنیا تەپۆڵکەی لم و درکەجاڕێ کە حەشاری داوە و ئەو شەپۆلانەی کە یەک لە دوای یەک بەرەو ساحل ئەکشێن.

ڕەنگە ئەوە دەریایە، کە بێوچان بۆی ئەڕوانێ و چاودێری ئەکات، نیگای قووڵی شەپۆلەکانی ئاو، نیگای برووسکەداری شەپۆلی تەپۆڵکەکانی لم و خوێیە؟

"نوعمان"ی ماسیگر ئەڵێ دەریا لە ژن ئەچێ، بەڵام هەرگیز مانای ئەو ڕستەیە بۆ نالێتەوە.

نیگاکە لە هەموو لایەکەوە دێت. پۆلێ باڵندەی دەریایی تێئەپەڕن، سێبەرەکەی

ئەکەوێتە سەر قەراخەکەوە.

"لالا" ئەوەستێ، قاچی چەقیوەتە لمە تەڕەکە، سەری بەرز ئەکاتەوە؛ ماقی گوزەری باڵندە دەریاییەکان ئەبێت کە بە ئەسپایی تێئەپەڕن. باڵە درێژەکانیان لە هەوادا ئەجووڵێننەوە. سەریان کەمێ لار کردوەتەوە، دەنووکیان نیوە کراوەیە. ناڵە و جریکە جریکێکی پێکەنین هێنەریان لێبەرز ئەبێتەوە.

"لالا" یەکێ لە گاکیەکان باش ئەناسێ. چونکە سپی سپیە. تەنانەت خاڵێکی ڕەشیشی پێوە دیار نیە. بە ئارامی لە ئاسمانی سەر "لالا"وە ڕەد ئەبێ. بە هەموو هێزەوە لە بەرانبەر دەریادا بەرخۆدان ئەکات.

پەڕی باڵەکانی کەمێ لێک جیابوونەتەوە، دەنووکی نیوە کراوەیە، بینایی لەسەر "لالا" ڕاگیر کردوە، سەرە بچووکەکەی کەمێ چەماندوەتەوە بەرەو ساحل، چاوە گردەکەی وەک تنۆکی ئاو ئەبریسکێتەوە.

ـ تۆ کێی؟ بۆ کوێ ئەڕۆی؟

گاکیە سپیەکە بۆی ئەڕوانێت و وەڵامی ناداتەوە، شوێن ئەوانی دیکە ئەکەوێتەوە. ماوەیەکی زۆر لە درێژای قەراخەکە بە دوای شتێکدا بۆ خواردن چاوە چاو ئەکات. "لالا" پێی وایە گاکیە سپیەکە ئەیناسێ بەڵام ناوێرێ لێی نزیک بێتەوە. چونکە گاکیەکان لە مرۆڤەکان سڵ ئەکەنەوە.

"نوعمان"ی پیر ئەڵێ کە باڵندەکانی دەریا ڕۆحی مرۆڤەکانن کە لە تۆفاندا، لە دەریا مردوون. "لالا" پێی وایە گاکیە سپیەکە ڕۆحی ماسیگرێکی زۆر گەورەی لاوازە، پێستی ڕۆشن و قژی بە ڕەنگی تیشکە. چاوی وەک شۆڵەیەک ئەدرەوشێتەوە. ڕەنگە پەریەکی دەریایی بێت.

لە قەراخ ما بێنی تەپۆڵکەی لمەکان دائەنیشێت و چاو ئەبڕێتە پۆلی گاکیەکانی درێژای قەراخەکە، کە بە ئاسانی ئەفڕن. بێ ئەوە هەوڵ بدەن. باڵە درێژەکەوانیەکانیان پاڵ بە "با"وە ئەدەن، سەریان لار ئەکەنەوە. بە دوای خواردندا ئەگەڕن چونکە زبڵدانی شار لەوێ زۆر دوور نیە، لەوێدا کە گرەگری بێوچانی کامیۆنەکان

ئەبیسرێ.

جارجار گاکیە سپیەکە، شای دەریا، بە ئاستی سەر "لالا"وە ئەفرێ و بازنەگەلێکی گەورە لە سەر تەپۆڵکەی لمەکان بە جێ دێڵێ. ئەڵێی "لالا"ی ناسیوەتەوە، "لالا" بە بزاوتی باڵی ئیشارەی پێ ئەکات.

هەوڵ ئەدات بانگی لێ بکات. هەر ناوێ کە ئەزانێ ئەیڵێتەوە، لەوانەیە بە هێنانی ناوی راستەقینەی، وەک پێشووی لێبێتەوە، لە نێوان کەفەکەدا، شای دەریا بە قژە بریسکەدارەکەی و چاوە رووناکەکەیەوە دەرئەکەوێ.

«"سولەیمان"!، "مومین"!، "دانیال"!»

بەڵام گاکیە سپیەکە بێوچان لە ئاسماندا ئەسوورێتەوە. نوکی باڵەکانی ئەنوسێ بە شەپۆلەکانی دەریاوە، چاوەکانی، بێ وەڵام بە سەر تارمایی "لالا"دا ئەمێنێتەوە. هەندێ جار "لالا" رقی هەڵدەستێ، بە دویدا رائەکات. دەستی رائەوەشێنێ و بە هەڵکەوت ناوگەلێ دێت بە زاریا، بۆ ئەوە شای دەریا توورە بکات. "مریشکەکان"، "چۆلەکەکان"، "کۆترە بچووکەکان" و تەنانەت "واشەکان"، لاشخۆرەکان" چونکا گاکیەکان رقیان لەم پەلەوەرانەیە.

بەڵام باڵندە سپیەکە بێوچان لە درێژای قەراخەکە دوور ئەکەوێتەوە، لە نێوان "با"ی رۆژهەڵات هەڵواسراوە. "لالا" لە سەر لمە رەقەکەدا توند هەڵدێ، بەڵام پێی ناگاتەوە.

باڵندەکە لەگەڵ باڵندەکانی دیکەدا، ئەڕوات، تەنیا خاڵ گەلێکی رەش لە شینایی ئاسماندا ئەمێنێتەوە.

***

ئاویش جوانە، کاتێ لە ناوەڕاستی زستاندا باران ئەبارێ، ئاو لە سەر بانە لۆحین و قیرتاوەکاندا ئەچۆڕێتە خوارەوەو ئاوازی نەرمی ئاو لە ناو تەنەکە گەورەکان و لە ژێر ناودانەکاندا بەرز ئەبێتەوە.

"لالا" گوێ لە گرمەگرمی هەورەتریشقەکە ئەگرێ کە لوول ئەخوات و لە

سەر دۆڵ و دەریاکەوە تا دێت گەورە ئەبێتەوە. لە نێوان شەقاری درەختەکانەوە بروسکە جوانەکەی چاو ئەکات کە بێوچان رۆشن ئەبێتەوەو ئەکوژێتەوە و شت و مەکی ناو ماڵەکە ئەلەرێنێتەوە. "عەمە" لە ناو جێگەکەیدا نابزوێ. سەری لە ژێر بەتانیەکەیدا، بێ ئەوە گوێ لە دەنگی تۆفان بێت، نوستووە... بەڵام لەو لای هۆڵەکە، دوو کورەکە لە خەو راچەنیون، "لالا" گوێی لە پێکەنینە نزمەکەیانە کە لە سەر دۆشەکەکەیانەوە، لە شەقاری تەختەکانەوە چاو بۆ دەرەوە ئەگێرن.

"لالا" بە ئەسپایی بەرەو دەرگاکە ئەروا، ئەیەوێ بروسکەکان باش ببینێت. بەڵام "با" دەست ئەکا بە ویژەویژ و تنۆکە ساردە گەورەکان دائەبارێن و بە تەقەتەق ئەکەونە سەر بانەکە.

"لالا" ئەخزێتەوە ناو جێگاکەی، لە تاریکی هۆڵەکەدا، چاوەکانی زاق ئەروانێ، جارجار بن میچەکە لە پڕ رۆشن ئەبێتەوە و لە دوای ساتێکدا تەقەتەق دەست پێ ئەکات، ئەڵێی لە ئاسمانەوە بەرد ئەبارێ. چۆرەچۆری ئاوی ناودانەکان لە بن بەرمیلە خاڵیەکاندا بەرز ئەبێتەوە "لالا" هەست بە بەختەوەری ئەکات. ئەڵێی هەموو ئەو تنۆکە ئاوانە ئەو ئەیخواتەوە.

لە پێشدا تەقەی تەنەکەکان بەرزە، بەڵام بەرەبەرە بەرمیلەکان پڕ ئەبنەوەو دەنگی تنۆکەکان قایم و پتەو ئەبنەوە.

ئەمجا لە هەموو کونج و قوژبنێکەوە ئاو رەوان ئەبێت. جۆگەلەو تیانە و تەنەکە توورهەڵدراوەکان پڕ ئەکاتەوە بۆنێکی خۆش و دڵبزوێن لە خۆڵەکە بەرز ئەبێتەوە.

چەند منداڵ خۆیان رووت کردوەتەوە و بە قیرە قیرو پێکەنین لە ژێر باراندا، لە شەقامەکاندا هەڵدێن. "لالا" زۆر حەز ئەکا وەک ئەوان دەرپەڕێتە دەرەوە بەڵام ئەو ئیتر گەورە بووە و کچانی هاوتەمەنی ئەو ناتوانن ئاوا خۆیان رووت کەنەوە.

دیسان ئەخەوێتەوە، بەدەم گوێگرتنی تەقەتەقی بێوچانی ئاو لە سەر تەنەکەکان و بیرکردنەوە لە دوو کانیە جوانەکەی ئەم لاوئەلای سەر بانەکە، کە هەڵئەقوڵێ و بەرمیل و تەنەکەکان پڕ ئەکاتەوە. کاتێ بۆ ماوەی چەن رۆژ بەو جۆرە ئەبارێ، باشیەکی

هەیە، ئەتوانن لە حەمامی ئەوبەر چەمەکە بە ئاوی گەرم حەمام کەن.

"عەمە" بڕیاری داوە، دوانیوەڕۆ، "لالا" بۆ حەمام ببات، کاتێ کە تینی گەرمای هەوا ئەڕەوێتەوەو هەورە سپیەکان لە ئاسماندا کۆئەبنەوە.

ڕۆژی حەمام کردنی ژنانە، هەموو لە کوێرەڕێگاکەی درێژای چەمەکە هەڵئەگەڕێن. سێ چوار میتر سەرتر، پردەکەیە و جادەی کامیۆنەکان؛ بەڵام لە خوارترەوە ژنەکان لە قەراخ چەمەکەوە تێئەپەڕن.

"عەمە" و "زوهرە"ی ئامۆزای لەگەڵ "زوبەیدە" لە پێش هەموویانەوەن. "لالا" بە رواڵەت ژنەکانی دیکە ئەناسێ، بەڵام ناویانی لە بیر چوەتەوە.

کراسەکانیان هەڵئەکەن و بە دەم ژاوەژاو و پێکەنینەوە لە بووارەکە ڕەدئەبن، "لالا" لە دوای ئەوانەوەیە، شاد و رازیە، چونکە لە ماڵەوە کاریان نیە، ناچاریش نیە بۆ کۆڵە چیلکە بڕوا. زۆریش حەز لە هەورە سپیە گەورەکان ئەکات کە ئەڵێی داکشاون و نزیک بونەتەو و هەروا حەز لە ڕەنگی سەوزی گیاکانی ئاقاری چەمەکە ئەکات. ئاوی چەمەکە سەهۆڵی بەستووە، کاتێ لە بووارەکە ڕەدئەبێ، لە ژێر پێیدا ئەلەرێتەوە، کە ئەگاتە ناوەڕاستی چۆمەکە، ئەبزوێ، "لالا" تا حەن سکی ئەکەوێتە ناو ئاوەکە، بە پەلە قاژە خۆی هەڵئەکێشێ، کراسەکەی بە ران و سکیا نووساوە.

حەمامەکە ئەنبارێکی زلی ئاجۆریە لە تەنیشت چۆمەکەوە.

کاتێ "لالا" هاتبوو بۆ "سیتە"، "عەمە" بۆ یەکەمین جار هێنابووی بۆ حەمام، "لالا" هەرگیز شتی وای نەدیبوو ساڵۆنێکی گەورە و وان گەلی پڕ لە ئاوی گەرم و کوورەگەلێ کە بەردەکان داخ ئەکەن.

ڕۆژێ سەرەی ژنانە و ڕۆژێ سەرەی پیاوەکان. "لالا" ئەم ساڵۆنەی زۆر پێخۆشە، چونکە شالاوی رووناکی لە دەلاقەکانی سەر دیوارەکانەوە خۆیان ئەکەن بە ژوورا.

بە هۆی بێئاویەوە، هەر لە وەرزی زستاندا حەمامەکە ڕۆشن ئەکەن.

لە هەماراوەکانی سەر بانەکەوە لوولەیان کێشاوە و وەک تاڤگە، ئاو ئەڕژێتە ناو

تەشتێکی گەورەی سیمانی. لە پێشدا لەوێ خۆیان ئەشۆن، ئەمجا بە جام ئاوی سارد بە خۆیاندا ئەکەن و لە سەرمادا دەست ئەکەن بە قیژەقیژ.

شتێ تریش کە "لالا" زۆری حەز لێ ئەکات، هەڵمە سپیەکەی ناو ساڵۆنەکەیە، کە وەک سفرەیەک تا بن میچەکە بەرز ئەبێتەوە، ئەمجا لە رووناکی بەر پەنجەرەکاندا ئەلەرێتەوەو ئەڕواتە دەرەوە. کاتێ ئەڕۆنە ناو ساڵۆنەکە، بە هۆی هەڵم و بۆقەوە بۆ ماوەیەک هەناسەیان بۆ نادرێت جلەکانیان دائەکەنن و لە سەر سەندەڵیەکانی ئەو پەر ئەنبارەکە دەقی ئەکەن.

جاران شەرمی ئەکرد و حەزی نەئەکرد لای ژنانی دیکە خۆی رووت بکاتەوە. عادەتی بەم شێوە حەمام کردنە نەبوو، لای وابوو بە هۆی ئەوەوە کە پێستی زۆر سپیە و مەمکی نیە، گاڵتەی پێ ئەکەن. بەڵام "عەمە" لۆمەی ئەکرد و مەجبووری ئەکرد هەموو جلەکانی داکەنێ، ئەمجا قژی لە پشتە ملیەوە کۆئەکردەوەو ئەیبەست.

بەڵام ئێستا ئیتر بەلایەوە گرینگ نیە. تەنانەت ئیتر سەرنجی ئەوانی دیکەیش نادات، جاران زۆری سڵ لێ ئەکردنەوە. چونکە هەندێ لە ژنەکان گەلێ ناحەز و پیرن، پێستی ئەندامیان وەک دارێکی وشک و مردوو پڕە لە چرچ و لۆچ یان هەندێکیان هێندە قەڵەون کە مەمکیان وەک مەشکە ئەلەرێتەوە، بڕێکیان نەخۆشن، لاقیان لە واریس ماسیوە.

بەڵام ئێستا وەک جاران سەرنجیان نادات، دڵی بۆیان ئەسووتێتەوە و سڵیان لێ ناکاتەوە. ئەمجا ئاوەکەش گەلێ جوان و خاوێنە، ڕێک لە ئاسمانەوە، لە هەماراوەکانەوە، ئەڕژێتە خوارەوەو تا رادەیەک روونە کە نەخۆشەکانیش چاک ئەکاتەوە.

دوای چەند مانگ وشکساڵی، کاتێ جەستەی ئەنیشێنێتە ناو ئاوەکە، هەموو لاشەی دائەپۆشێ، پێستی لاق و سک و سینەی ئەگووشێ، "لالا" بۆ ساتێ هەناسەی هەڵنایەت.

ئاوەکە گەرم و رەقە، خوێن ئەزێتە سەر پێستی، شەپۆلی گەرماکەی، یەکبەیەکی

ئەندامانی لەشی ئەگرێ، ئەڵێی ئاوەکە هێزی لە ئاسمان و هەتاو گرتووە.

"لالا" خۆی ئەخزێنێتە ناو ئاوەکە، ئاوە داخەکە لە چەناکەی تێئەپەڕێ و ئەگاتە لێوەکانی و دروست لە ژێر کونە لووتیدا ئەوەستێ، ماوەیەکی زۆر جووڵە لە خۆی ئەبڕێ و چاو ئەبڕێتە بن میچە لۆچینەکە، کە ئەڵێی لەو هەڵمە خەسەدا هەر نزیکتر ئەبێتەوە.

ئەمجا "عەمە" بە سابوون و شامپۆوە بەرەو "لالا" دێت. دەست ئەخاتە هەموو ئەندامی لەشی، پشتی و شانی و لاقەکانی، "لالا" خۆی شل ئەکات. "عەمە" زۆر باش ئەزانێ بیشوات. ئەمجا تا لای تەشتە گەورەکە ئەڕوا و خۆی ئەخاتە ناو ئاوە تازە ساردەکە، پێستی ساف و لووس ئەبێ. دەمارو ماسولکەکانی ئەکێشرێن. بەدەم گوێدانی خوڕە خوڕی ئاو لە هەماراوەکەوە لەگەڵ ژنانیتر خۆی ئەشوات.

"لالا" ئاوەکەی پێخۆشە، وەک ئاوی کانیەکانی کوێستان روون و سووکە، ئەڵێی لە سەر بەردێکی کۆنەوە ئەخزێتە سەر پێستی. لەبەر رووناکیدا هەڵدەبەزێتەوە و هەزاران تنۆک پرژ و بڵاو ئەکاتەوە. لە بەر شێرەکەدا، ژنەکان قژە رەشەکانیان ئەشۆرن، تەنانەت لاشە هەرە ناحەزەکانیش لە ناو کریستاڵی ئاوە خاوێنەکەدا جوان ئەنوێنێ. ئاوە ساردەکە دەنگیان بەرز ئەکاتەوەو پێکەنینە گومەکانیان دەنگ ئەداتەوە، "عەمە" بە مشت ئاو لە دەم و چاوی "لالا" ئەپرژێنێ، دیانە هەرە سپیەکانی لە ناو روخسارە مسینەکەیدا ئەدرەوشێتەوە. تنۆکە بریسکەدارەکانی ئاو بە ئەسپایی لە سەر مەمکە بۆرەکانی و سک و رانەکانیدا ئەخزێتە خوارەوە. ئاوەکە پێستیان شل و ساف ئەکات و لەپی دەستیان نەرم ئەکات. گەرچی هەمارەکە سیخناخە لە هەڵم، بەڵام ساردە.

"عەمە"، "لالا" بە خاولیەکە دائەپۆشێ، مەلافەیەکیش تا سەر سینەی خۆی هەڵئەبەسێ. ئەڕۆن تا ئەو پەڕ هەمارەکە بۆ لای جلەکانیان. "عەمە" دەست ئەکات بە داهێنانی قژە درێژەکەی "لالا". دەسە دەسەی ئەکات و بە قامکەکانی دەستی چەپی ئەسپێکانی ئەگرێ. ئەویش پێی خۆشە، ئەڵێی لە خەودایە، بیر لە هیچ ناکاتەوە، ئاوەکە

ماندوو خەواڵوی کردوە. هەڵمەکە بە سەختی تا ئاست دەلاقەکان، تا جێگایەک کە رووناکی هەتاو ئەلەرێتەوە، بەرز ئەبێتەوە. ژاوەژاوو پێکەنینی ژنەکان، شەوقی ئاو و کڵپەکڵپی کوورەی ئاگرەکان کە بەردەکان ئەسووتێنن، گێژ و مەنگیانی کردووە. لەسەر سەندەڵیە ئاسنیەکە دائەنیشێ. لاقە رووتەکانی لە سەر سیمانەکەوە، لە ناو خاولیەتەرەکەدا ئەلەرزێ. دەستە کارامەکانی "عەمە" بێماندوو بوون قژی دائەهێنێ، ئەیکێشێ و سافی ئەکات، دوایین تنۆکە ئاوەکان لە سەر گۆنا و پشتی، دائەچۆڕن. دوای ئەوە هەموو شت دوایی دێ، جلەکانیان لەبەر ئەکەن و هەموو پێکەوە لە دەرەوە لە گەرمای هەتاوی دەمەو مەغریبدا، دائەنیشن. لە لێوانی بچووکداکە نەقش و نیگاری زێرینی بە سەرەوەیە، چایی نەعنا ئەخۆنەوە، بێ ئەوە متەقیان لێوە بێت، ئەڵێی لە سەفەرێکی دوورەوە هاتوونەتەوەو رووداوی سەیر و سەمەرەی زۆریان دیتوە.

جادەی بەرەو "سیتە"ی دارین و لۆحی قیرتاوکراو، دوورتر، لەوبەر چۆمەکەیە.

شەوێکی رەش و شین داهاتووە، کاتێ ئەگەنەوە ماڵەوە، ئەستێرەکان لە نێوان هەورەکاندا بریسکەیان دێت.

***

برێ رۆژ لە رۆژانی دیکە ناچن، وەک رۆژانی جێژن، بۆ ئەو رۆژانەیە کە ئەژین، چاوەروانی ئەکەن و هیواداریان ئەکات. کاتێ لەو رۆژانە نزیک ئەبنەوە، لەملاولا، لە کۆڵانەکانی "سیتە"، لە ناو ماڵەکان و سەرکانی، هەموو قسەی لێ ئەکەن. هەموو بێ ئۆقرەن و ئەیانەوێ بە زووی رۆژی جێژن بێت. برێ بەیانی کاتێ "لالا" لە خەو هەڵدەسێ دڵی دەست ئەکا بە خورپە خورپ و قوڵ و قاچی دەست ئەکەن بە مێروولە کردن، وائەزانێ رۆژی جێژنە. رائەچەنێ، بێ ئەوە تەنانەت دەست بە سەر و قژیا بێنێ، دەرئەپەرێتە ناو کۆڵان بۆ ئەوە لە هەوای ساردی بەیانیدا، هەڵبێ. هەتاو هێشتا هەڵنەهاتووە، هەموو شت خۆڵەمێشیە و دونیا کپ و خامۆشە. هەر جریوەجریوی چەن باڵندە دێت. چونکە کەس چاوناکات ئەزانێ کە ئەو رۆژە هێشتا نەهاتووە. بە ناچاری ئەگەرێتەوە ژێر لێفەکەی. بەڵام برێ جار تا نێوان تەپۆڵکەی لمەکان بۆ سەیر

کردنی گزنگی هەتاو لە پۆپەی شەپۆلەکاندا مل ئەنێ.

رۆژە درێژەکانی رۆژوو گرتن تەنگیان پێهەڵئەچنن. چونکە رۆژانێکی زۆر بەر لە جەژن، تا داچوونی هەتاو ناخۆن و ناخۆنەوە. کات کە تێئەپەرێ، ئەڵێی لە ناخیدا بۆشاییەک گەورە ئەبێتەوە بۆشاییەک کە ئەسووتێنێ و ئەزرنگێتەوە.

بە هەموو ئەمانەوە، "لالا" رۆژوو گرتنی گەلێ پێخۆشە، چوونکە دوای ئەوماوە زۆرەکە زار لە خواردن و خواردنەوە نادەن، ئەڵێی ناخیان ئەشۆریەتەوە.

ماوەی سەعاتەکان زۆرتر و تەواتر ئەبێت، چوونکە هەر شتێ سەرنجیان بۆ خۆی رائەکێشێ.

منالان ناچن بۆ مەکتەب، ژنان ئیتر لە کێڵگەکار ناکەن، کورەکان ناچن بۆ شار. هەموو لە سێبەری کەپر و درەختەکان دائەنیشن، کەمتر ئەدوێن و زۆرتر سەیری بزاوتی درەختەکان ئەکەن. کاتێ رۆژوون، ئاسمان بە جۆرێکی تایبەت، لە ئاستی سەر زەویە سپیەکەدا، شین‌تر و ساف‌تر ئەنوێنێ، دەنگەکان زۆرتر دەنگ ئەدەنەوە، ئەڵێی لە ناو ئەشکەوتێکدان، پرشنگی رۆژ جوان‌تر و خاوێن‌ترە، تەنانەت رۆژەکان درێژن، وتنی چۆنیەتیەکەی دژوارە، لە کازیوەی بەیانەوە تا رۆژئاوا ئەڵێی بە مانگێ لێیان ئەگوزەرێ.

"لالا" پێی خۆشە رۆژوو بگرێ. کاتێ هەتاو بە تینەوە ئەسووتێ و وشکی بە سەر هەموو شتێکدا زاڵ ئەبێت، تۆز و خۆڵ تامی بەرد لە زاریدا بە جێ دێڵێ، ئەبێ جارجار گیاگەلێ کە بۆنی لیمۆ و شیبا ئەدەن بمژێ، بەڵام ئەبێ ئاوی دەمی تف کاتەوە.

رۆژانی رۆژوو گرتن، هەموو رۆژ سەر لە "ئارتانی" ئەدات. ئەویش تەواوی رۆژ زار لە خواردن و خواردنەوە نادات. بەڵام ئەو هیچ گۆرانکاریەکی بە سەردا نایەت. رەنگی روخساری هەر وەک جاران ئەڵێی سووتاوەتەوە، چاوەکانی لە نێوان روخسارە تاریکەکەیدا، بە توندی ئەبروسکێتەوە، کاتی پێکەنین ددانەکانی ئەدرەوشێنەوە. بەڵام بە پێچەوانەی جاران خۆی بە تەواوەتی لەناو پاڵتۆ بۆرەکەیدا

دائەپێچێ بۆ ئەوە ئاوی جەستەی بە فیڕۆ نەدات. لەبەر هەتاودا بێ جوولە ماوەتەوە، لە سەر قاچێکی وەستاوەو ئەو قاچەکەی بە سەر ماسولکەی خوار ئەژنۆیدا داناوە. بینایی بەرەو دوور راگیر کردووە، بەرەو سەمای هەوا، بەرەو مێگەلی مەڕو بزنەکان.

"لالا" لە سەر بەردێکی ساف لە تەنیشتیا دائەنیشێ، گوێ بۆ دەنگەکان ئەگرێ کە لە هەموو لایەکەوە دێن. قیژەی دەعباکان، فیکەی شوانەکان و قرچە قرچی گەرما کە بەردەکان ئەماسێنێ، و گوزەری "با". رۆژانی رۆژوو هەموو کاتی خۆیەتی، چونکە ئیتر ناچار نیە لەکانی ئاو بێنێ یان بۆ کۆکردنەوەی چیلکە بڕوا. هەر باشترە لەکاتی رۆژوو گرتن‌دا لەم وشکیەدا بمێنێتەوە، چونکە لە ئازارێکی بێ برانەوە ئەچێ کە باڵی بە هەموو لایەکدا بڵاو کردوەتەوە، وەک روانینێک کە بێ پسانەوە دێت و ئەچێت. شەو، مانگی چواردە لە قەراخ تەپۆڵکەکانەوە دەرئەکەوێ، "عەمە" شۆربای نۆک و نان ئامادە ئەکات. هەموو بە پەلە نان ئەخۆن، تەنانەت "سەلیم"، شوەکەی "عەمە" کە پێی ئەڵێن "سووسی"، خێرا نانەکەی ئەخوات، بێ‌ئەوە وەک جاران رۆنی زەیتون بکا بەسەر نانەکەیدا.

کەس ورتەی لێوە نایەت. "لالا" زۆر حەز ئەکات بدوێ، کۆڵێ قسەی هەیە بیکا، بەڵام ئەزانێ کە نابێ قسە بکات، چونکە نابێ بێ‌دەنگی رۆژووەکە بهەژێنێ. کاتێ رۆژوون، ئەڵێی رۆژووی هەموو وشەکانن، ئەڵێی هەموو مێشک و سەریان رۆژووە.

بە ئەسپایی هەنگاو هەڵئەگرن، قاچیان بە دوای خۆیاندا راناکێشن. شتەکان و مرۆڤەکان بە قامک نیشان نادەن، بە دەمیان فیکە لێ نادەن.

جار جار منداڵەکان لە بیریان ئەچێتەوە کە رۆژون، ئاخر سەختە هەموو کات بەر خۆیان بگرن، ئەقلێنەوەو لە کۆڵانەوە رائەکەن و لاسایی سەگ ئەکەنەوە. بەڵام پیرەکان بە سەریاندا دائەخوڕێن و بەردیان بۆ تووڕ ئەدەن. ئەوانیش دوای ساتێ ئەوەستن، رەنگە لەبەر ئەوە بوەستن کە رۆژوو وزەی بۆ نەهێشتون.

ماوەکە ئەونە زۆرە، "لالا" تەنانەت لە بیری نایەتەوە بەر لەو رۆژانە، چۆن

بووە.

ئەمجا رۆژێ "عەمە" رێگای تەپۆڵکەکان ئەگرێتە بەر بۆ کڕینی مەڕ، ئیتر هەموو ئەزانن کە ئەو رۆژە هاتوە، "عەمە" بە تەنیا ئەڕوا، چونکە ئەڵێ کە "سەلیمە سووسی" " نازانێ شتی باش بکڕێ.

لە کوێرە ڕێگاکە سەر ئەکەوێ و بەرەو تەپۆڵکەکان ئەو شوێنەی کە شوانەکان تێیدا ئەژین، پێچ ئەکاتەوە، "لالا" و منداڵەکان دووراودوور دوای کەوتون، کاتێ ئەگاتە تەپۆڵکەکان، "لالا" چاو ئەگێڕێت بەڵکو "ئارتانی" ببینێ، بەڵام ئەزانێ کە بێهوودەیە؛ شوانەکە خۆشی لە خەڵک نایەت، کاتێ خەڵکی "سیتە" بۆ کڕینی مەڕ سەر ئەکەون، ئەو لەوێ ئەڕوا. زڕ دایکی و باوکی پەشمی مەڕەکان ئەچنن، کەپرێ دروست ئەکەن و لە ژێریا چاوەڕوانی کڕیارەکان دائەنیشن.

فرۆشیاریتر و هەروەها شوانەکانیتریش لەوێن، بۆنی ناحەزی پیەو پیشاو لە سەر زەویە وشکەکە بڵاوبوەتەوە. قیژە قیژی گومی ئاژەڵە زیندانیەکان، لە ناو پەرژینەکان ئەبیسرێ.

لە "سیتە"وە خەڵکێکی زۆر هاتون، تەنانەت لە شاریشەوە هاتون، ماشینەکانیان لەبەر "سیتە"، لە کۆتایی جادەکەدا، دائەنێن و خۆیان لە کوێرە ڕێگاکە سەر ئەکەون. ئەوانە خەڵکی باکوورن، زەرد پێستن، ئاغەگەلێکی کۆت و شەڵوار لەبەرن، یان دێهاتیەکانی باشوور، "سوسیەکان"، "فاسیەکان" و خەڵکی "مۆگادر". ئەوان ئاگادارن ئێرە شوانی زۆری تیایە. ناسیاو و ئاشنایان لەوێ هەیە، بەهیوان حەیوانیان بە قیمەتی باش بۆ پەیدا بکەن. لە بەر پەرژینەکاندا کۆئەبنەوە دەست ئەکەن بە قاڵە قاڵ و وتووێژ، دەستیان ڕائەوەشێنن و دائەنەونەوە بۆ ئەوە باشتر مەڕەکان ببینن. "عەمە" بێ پەلە لە بازارەکە تێ ئەپەڕێ، بێ ئەوە ڕاوەستێ، دەوری پەرژینەکە ئەداتەوە و چاوێکیان پیا ئەگەڕێنێ، کاتێ هەموو پەرژینەکان ئەبینێ، ئەو شتەی ئەیەوێ پەیدای کردووە. ئەمجا ئەڕوا بۆ لای فرۆشیارەکە و قیمەتەکەی ئەپرسێ. چونکە هەر ئەوەی ئەوێ، بێ چەنە لێدان، پارەکەی پێ ئەدات. بۆ قایمەکاری تەنافێکیشی لەگەل خۆی هێناوە.

شوانەكە تەنافەكە لە ملی مەڕەكە گرێ ئەدات، ئێستا ئیتر ئەبێ مەڕەكە ببرێتەوە.

شانازی بردنەوەی مەڕەكە بە كوڕە گەورەكەی "عەمە" ئەگات. مەڕێكی بە هێز و گەورەیە، خوریيە پیسەكەی بۆنی پیشاو ئەدات. بەڵام "لالا" دڵی بۆ ئەسووتێتەوە. مەڕەكە سەری داخستوە، چاوەكانی پڕن لە ترس، كوڕەكەی "عەمە" بە هەموو هێزیەوە تەنافەكە رائەكێشێ، كە خەریكە ئەیخنكێنێ.

لە كۆڵێتێكی بچووكی پشت ماڵ "عەمە"، كە هەر بۆ ئەوە دروستیان كردوە، مەڕەكە ئەبەستنەوە و ئاو و گیا ئەخەنە بەردەمی تا كاتی سەر برینی ئەگات.

ئەمجا، بەیانیەكی جوان، كە لە خەو هەڵئەسێ، بێ ئەوەكەس شتێكی پێ بڵێ، هەر بە دیتنی رووناكی رۆژ، ئەزانێ كە رۆژی جێژنە، لە ساتێكدا خۆی لە كۆڵان ئەبینێتەوە. ژاوەژاوی جەژن، وەك جریوە جریوی باڵندەكان، لە ماڵەكاندا بەرز بوەتەوە.

"لالا" تا ئەتوانێ بە توندی لە سەر زەویە ساردەكەی دەمەو بەیان رائەكات، لە كێڵگەكان، لە كوێرە رێگاكان هەڵئەگەڕێ و بەرەو دەریا مل ئەنێ.

كاتێ ئەگاتە سەر تەپۆڵكە لمەكان، "با"ی دەریا لە ناكاو ئەیداتە بەر قەمچی، پەڕەی لووتی ئەگوشرێ و تلاوتل بەدوادا ئەكەوێ. دەریا تاریك و وەحشیە، بەڵام ئاسمان رەنگ خۆڵەمێشیەكی دڵبزوێن و سووكە. ترسەكەی "لالا" ئەڕەوێتەوە. خێرا جلەكانی دائەكەنێ و بە بێ گومان كردن سەری بە ناو ئاوەكەدا ئەكات، شەپۆلێ تێك ئەشكێ و ئەو دائەپۆشێ، ئەكوتێ بە سەر پێڵوەكانیدا و گوێی و لووتی پڕ ئەكاتەوە. ئاوە سوێرەكە لە ناو دەمیەوە ئەچێتە ناو گەرووی. بەڵام "لالا" لە دەریا سڵ ناكاتەوە.

قومێ ئاوی سوێری خواردوەتەوە، وەك مەست بووبێ، لەرزۆك، لە شەپۆلەكە جیا ئەبێتەوە، خوێ چاوی كوێر كردوە. خۆی ئەگیرێنێتە شەپۆلەكە، ماوەیەكی زۆر لە درێژای قەراخەكە مەلە ئەكات. كاتێ دەریا پاشەكشێ ئەكات، ئەژنۆی ئەساوێ بە لمەكەدا، ئەمجا ئەكەوێتە سەر شەپۆلەكان كە بەرەو دەریاكە ئاوساون. گاكیە خۆشەویسەكەی بە قیرە قیر لە ئاستی سەریەوە رەد ئەبێ.

"لالا" ئیشارەی پێ ئەکات و بە هەڵکەوت هەندێ ناو ئەڵێ، بەشکو بگەڕێتەوە،

- هێی، کالا!، ئیلا!، زمار!، حوریا!، حەبیب!، شەرارە!، حەیم!....

کاتێ دوایین ناوەکە بە هاوارەوە ئەڵێ، گاکیەکە سەر دائەنەوێنێ و بۆی ئەڕوانێ و لە بازنەیەکدا بە سەر کچە لاوەکەدا ئەسوڕێتەوە. "لالا" ئەقیژێنێتەوە:

- "حەیم"، "حەیم".

ئێستا ئیتر دڵنیایە کە ئەوە ناوی مەلەوانەکەیە، کە ڕۆژێ لە ڕۆژان لە دەریا وون بووە، چونکە ناوەکەی یانێ "ئاوارە".

- "حەیم"!، "حەیم"!، تۆ خوا وەرە!

بەڵام گاکیە سپیەکە هەر لە بازنەیەکدا ئەسوڕێتەوە، ئەمجا لەگەڵ "با"دا لە درێژای قەراخەکە ئەڕوا بەرەو جێگایەک کە هەموو گاکیەکان، هەموو بەیانیەک، کۆ ئەبنەوە و بەرەو کارخانەکەی شار ئەڕۆن. سەرمای دەریا و "با" لەرزی پێ ئەکات. هەتاو ئێستا دوور نیە. کازیوەیەکی سوور و زەرد خەریکە لە پشت تەپۆڵکە بەردینەکانەوە لە دایک ئەبێت، ئەو شوێنەی کە "ئارتانی" ئەژیەت.

تنۆکە ئاوەکان لە سەر پێستی "لالا" ئەبریسکێنەوە. "با"یەکی توند هەڵ ئەکات، کراسە شینەکەی لە نێوان لمەکەدا بزر بووە، هەر بە تەڕی کراسە شینەکەی ئەکاتەوە بەری. بە هەڵهاتن ڕێگای "سیتە" ئەگرێتە بەر. "عەمە" لەبەر دەرکەی ماڵەکەدا، لە ناو تاوەیەکی گەورەی پڕ لە ڕۆنی داخ "ناوساجی" سوور ئەکاتەوە.

ئاگردانەکە لە تاریکیەکدا کە هێشتا لای ماڵەکان ماوەتەوە، شۆڵە سوورەکانی بڵاو ئەکاتەوە، ڕەنگە ئەم کاتانەی جەژنەکە پێی خۆشە. هێشتا لە سەرمای دەریا لەرزی کردوە، لە تەنیشت ئاگرەکە دائەنیشێ و "ناوساجی"یەک ئەخاتە ناو دەمی، خرمە خرمی لە ژێر دیانەکانیدا بەرز ئەبێتەوە.

تامی هەویرەکە و بۆنی توندی دەریا کە هێشتا لە گەروویدا ماوە، هەست پێ ئەکات.

"عەمە" قژە تەڕەکەی ئەبینێ و ئەقیژێنێ بە سەریا، بەڵام چونکە ڕۆژی جەژنە،

لەسەری ناچێ. منالەکانی "عەمە" دێن لە دەوری ئاگردانەکە دائەنیشن، هێشتا چاویان پڕ لە خەوە، ئەمجا "سەلیمە سووسی" دێت. بێ ئەوە ورتەیان لێوە بێت دەست ئەکەن بە خواردنی "ناوساجی". مێردەکەی "عەمە" بە ئارامی ئەخوات، چەناکەی ئەجوولێنێ، ئەڵێی کاوێژ ئەکات. جار جاریش دەست لە خواردن هەڵئەگرێ و دەستە ڕۆناویەکەی ئەلیسێتەوە. مروڤێکی کەم قسەیە. بەڵام خەڵکی زۆر بۆ قسەکانی بایەخ دانانێن.

ئیمرۆ، بۆنی خوێنی لێ دێت چوونکە ئەبێ مەڕەکە سەر ببڕن. ئەوە ئەبێ بە هۆی کاردانەوەیەکی سەیر و وەک ڕووداوێکی ئاژو دڵتەزێن ئەیخاتە ناو بیرەوەری و خەیاڵێکی ناخۆش.

ژن و پیاو، هەموو شادن، هەر چیان بیەوێ ئەتوانن بخۆن. بەڵام "لالا" لەبەر مەڕەکە کە سەری ئەبڕن، خۆشحاڵ نیە. وتنی ئەستەمە، بەڵام لە ناخیدا شتێکی بە پەلە، وەک نیاز بە هەڵهاتن و دوور کەوتنەوە، ئەیهەژێنێ، بەتایبەت لە ڕۆژانی جەژندا. ڕەنگە ئەویش وەک "ئارتانی"ە و جەژنەکان پێوەندیان بەوەوە نیە.

قەسابەکە بۆ سەر بڕینی مەڕەکە دێت. هەندێ جار "نوعمان"ی ماسیگر قەسابی ئەکات، چونکە ئەو مووساییە و بێ یاساسەری ئەبڕێ.

یان کابرایەکی دیکە کە لە جێگایەکی دیکەوە دێت، دووباسکی قەڵەوی تۆکمە و ڕوخسارێکی شەڕانی هەیە. "لالا" زۆری ڕق لێیەتی. بەڵام "نوعمان" جیاوازە، ئەگەر پێی بڵێن، وەکوو خزمەتێ ئەنجامی ئەداو هیچی ناوێ، هەر پارچەیەک گۆشتی برژاوی لێ ئەخوات. بەڵام کابرای قەساب نارەسەنە. بۆ سەر بڕینی پارەیان لێ ئەسێنێ. پیاوەکە بە تەنافێ حەیوانەکە ڕائەکێشێ. "لالا" بۆ ئەوە هاوارە دڵتەزێنەکانی مەڕەکە، کاتێ بەرەو کانیەکەی کێش ئەکەن، نەبیسێ، بە فڕکان ڕێگای دەریا ئەگرێتەبەر، بۆ ئەوە کاتێ بە چەقۆ تیژەکەی سەری ئەبڕێ و خوێنەکەی فیشقە ئەکات، نەیبینێ.

بەڵام خێرا ئەگەڕێتەوە، چونکە برسیەتی زۆری بۆ دێنێ. کاتێ لە ماڵی "عەمە" نزیک ئەبێتەوە قرچە قرچی ئاگرەکە ئەبیسێ و بۆنی دڵبزوێنی گۆشتی برژاو سەر

مەستی ئەکات. "عەمە" نایەوێ کەس یارمەتیی بدات. پێی خۆشە تەنیا بێ، لەبەر ئاگرەکە هەڵئەتروشکێ و سیخەکان ئەم دیو و ئەو دیو ئەکات. کاتێ ژیگو و پەراسوەکان جوان ئەبرژێن، ئەی خاتە ناو جامێ لای ئاگرەکە، ئەمجا بانگی "لالا" ئەکات. چونکە کاتی ئەوەیە کە بە دووکەڵ وشک بکرێنەوە، ئەمەیش یەکێ لەو کاتە خۆشانەی جێژنە کە "لالا" پێی خۆشحاڵ ئەبێت. کەمێ نزیک "عەمە" دائەنیشێت و لە نێوان شۆڵە و دووکەڵەوە سەیری روخساری "عەمە" ئەکات. کاتێ "عەمە" بە مشت گیای تەڕ ئەخاتە ناو ئاگرەکە، دووکەڵی رەش بەرز ئەبێتەوە. "عەمە" جار جار لە کاتی گۆشت برژاندندا، قسە ئەکات.

"لالا" لەگەڵ قرچە قرچی ئاگرەکەو قیرە قیری منداڵەکان کە کایە ئەکەن و ژاوە ژاوی پیاوان، گوێ لە دەنگی "عەمە" ئەگرێ، هەست بە بۆنێکی توند و گەرم ئەکات کە روخسار و قژ و جلەکانی دائەگرێ.

"لالا" بە چەقۆیەکی بچووک گۆشتەکە توا ئەکاتەوە و ئەیخاتە ناو سەوەتەیەک کە بە داری تەڕ دروست کراوە و بە سەر دووکەڵی ئاگرەکەوە هەڵواسراوە.

لەو کاتەدا "عەمە" دەست ئەکات بە گێڕانەوەی بە سەر هاتە کۆنەکان، ژیان لە وڵاتەکانی باشوور، لەوبەر کێوەکان، لەوێوە کە لمی بیابان دەست پێ ئەکات. ئەو شوێنەی کە کانیەکان هەر وەک ئاسمان شینن.

"لالا" جارێکی دیکە ئەپاڕێتەوە: تۆ خوا "عەمە"، قسەی "حەوا" م بۆ بکە.

بەو رۆژگارە درێژە، کارێکیان نیە، جگە سەیر کردنی گۆشتە ریشاڵ ریشاڵەکە لە نێوان گەردەلوولی دووکەڵەدا، یان بەیناوبەین بە لقە دارێک گۆشتەکە هەڵگەڕێننەوە یان دەستی لێ بدەن کە نە سووتابێ.

"عەمە" دەست پێ ئەکات. لە پێشەوە دەنگی ئارام و بە گومانەوەیە، ئەڵێی زۆر بۆ خۆی دێنێ بێتەوە یادی. هاڵاوی گەرما بە ئەسپایی لە ئاسمانە شینەکەدا بڵاو ئەبێتەوە، قرچە قرچی شۆڵەکان و بۆنی گۆشت و دووکەڵ تێکەڵ ئەبن.

ـ "لالا حەوا" (ئەڵێی خەریکە بانگی لێ ئەکات) لە من گەورتر بوو بەڵام بە باشی لە بیرمە کاتێ بۆ جاری یەکەم لەگەڵ باوکت، لە باشوورەوە هاتنەوە بۆ ماڵەوە. لە بیابانی گەورە ناسیبووی، چونکە ئەو لە هۆزەکانی باشوور بوو، لە "ساگیت ئەلحەمرا"، نزیک شاری پیرۆزی "سمارا"، لە بنەماڵەی "مائەلعەینەین"ی گەورە بوو، کە پێیان ئەوت ئاوی چاوەکان.

بەڵام هۆزەکەی ناچار ببوون وڵاتەکەیان بەجێبێڵن، چونکە سەربازە مەسیحیەکان ماڵ و زەویان لێداگیر کردبوون و دەریان کردبوون. پیاو ژن و منداڵ، بۆ ماوەی رۆژان و مانگان لە بیابان تێپەڕیبوون. دایکت ئەمانەی بۆمان ئەگێڕایەوە. ئێمە لەو کاتەدا لە "سوس" دەست کورت و فەقیر بوین. بەڵام پێکەوە بەختەوەر بووین، چونکە باوکت "لالاحەوا"ی زۆر خۆش ئەویست.

ئەو بە جوانی پێئەکەنی و گۆرانی ئەخوێند. هەر وەها گیتاری لێ ئەدا، لەبەر هەتاودا، لەبەر ماڵەکەمان دائەنیشت و گۆرانی ئەچڕی.

ـ چی ئەوت، "عەمە"؟

ـ گۆرانی باشووری بوون، بە زاراوەی "شلۆ"، گۆرانیەکانی "ئاساکا"، "گولیمنی" و "تان تان" بەڵام من نازانم وەک ئەو بیڵێم.

ـ قەیناکا "عەمە"، هەر بیڵێ من گوێم لێ بێت.

ئەو جا "عەمە" بە دەنگێکی نزم، ئامێتە لەگەڵ قرچە قرچی شۆڵەکاندا ئەخوێنێ.

"لالا" هەناسە ناکێشێ بۆ ئەوە گۆرانیەکەی دایکی باشتر ببیسێ.

«رۆژێ، ئای، رۆژێ قاڵاوە رەشەکان سپی ئەبێت، دەریا وشک ئەبێ، هەنگوێن لە ناو گوڵی کاکتوسدا ئەڕوێ، لە چڵی ئەقاقیا نوێن دروست ئەکرێ، ئای، رۆژێ، ئیتر ژەهر لە زاری ماردا نیە، گوللەی تفەنگەکان ئیتر مەرگ هێنەر نین، بەڵام ئەوە رۆژێکە کە من ئەوینەکەم بە جێ دێڵم.»

"لالا" گوێی لە دەنگەکە گرتووە، کە لە نێوان ئاگرەکەوە ورتەی دێت، روخساری "عەمە" نابینێ، ئەڵێی دەنگی دایکی ئەبیسێ.

«ئای، رۆژێ، ئیتر "با" ویژه ویژ لە بیابانەوە هەڵناکات، دەنکە لمەکان وەک شەکەر نەرمن، لە ژێر هەر بەردێکی سپی، کانیەک چاوەڕوانمە، رۆژێ، ئای رۆژێ زەردەواڵەکان بۆ من ئەخوێنن چونکە لەو رۆژەدا من ئەوینەکەم لە دەست داوە.»

دەنگی "عەمە" ئێستا گۆڕاوە، نەرم و بە هێزە، وەک دەنگی فلوت بەرز ئەبێتەوە و وەک زەنگۆڵەیەکی مسی ئەزرنگێتەوە. ئیتر دەنگی خۆی نیە، ئێستا دەنگی یەکێکی دیکەیە، دەنگی ژنێکی لاوی نەناسراو کە لە نێوان پەردەی شۆڵەو دووکەڵەوە، بۆ "لالا" ئەخوێنێ، تەنیا بۆ "لالا".

«رۆژێ، ئای رۆژێ، هەتاو لە شەودا هەڵئەکات، ئاوی مانگ لە سەر زەوی رەوان ئەبێت کاتێ ئاسمان هێندە نزم ئەبێتەوە من ئەتوانم دەست بە ئەستێرەکانەوە بگرم، ئای رۆژێ من ئەبینم کە سێبەرەکەم لە بەردەممدا سەما ئەکات، رۆژێ دێت کە من ئەوینەکەم لە دەست ئەدەم.»

دەنگە دوورەکە وەک لەرزەیەک ئەخزێتە سەری و ئابلۆقەی ئەدات. کاتێ سەیری پزیسکەکان ئەکات کە لە رووناکی هەتاودا سەما ئەکەن، بینایی تێک ئەچێ، بێدەنگی دوای گۆرانیەکە زۆرتر ئەبێتەوە "لالا" زرم و هۆری تەپڵ و مۆسیقای جەژن ئەبیسێ. ئێستا تەنیایە، ئەڵێی "عەمە" رۆیشتوە و ئەوی لەگەڵ دەنگێکی نامۆدا بەجێ هێشتوە.

«رۆژێ، ئای رۆژێ، بۆ ئاوێنە ئەڕوانم و تۆ ئەبینم، دەنگت لە بنی چاڵەکانەوە ئەبیسم، جێ پێکانت لە ناو لمەکە ئەناسمەوە، رۆژێ، ئای رۆژێ، من کاتی مردنم ئەزانم. ئاخر ئەو رۆژەیە کە ئەوینەکەم لە دەست ئەدەم...»

دەنگەکە وەک ئاخێک کپ و قورسە، لە نێوان شۆڵە لەرزۆکەکاندا کەمێ ئەلەرزێ و لە ناو ئەستوونی دووکەڵە شینەکەدا نوقم ئەبێ.

«رۆژێ، ئای رۆژێ، هەتاو ئەکوژێتەوە، زەوی تا ناوەڕاستی شەق ئەبات، دەریا پانتایی بیابان دائەپۆشێ، رۆژێ، ئای رۆژێ، چاوم ئیتر رووناکی نابینێ، زارم ئیتر ناتوانێ ناوی تۆ بڵێتەوە دڵم ئیتر لێنادات، چونکە رۆژێکە من ئەوینەکەم بەجێ

دیلم.»

دەنگە نامۆکەکەوتووەتە ورتە ورت، لە نێوان ئاگر و دووکەڵە شینەکەدا وون ئەبێ، "لالا" ماوەیەکی زۆر چاوەڕێ ئەبێ، بەڵام دەنگەکە نایەتەوە. چاوەکانی پڕ ئەبن لە فرمێسک، دڵی لەتاو ئازار ئەگوشرێ بەڵام هیچ ناڵێ، "عەمە" دەست ئەکاتەوە بە ریشاڵ ریشاڵ کردنی گۆشتەکان و ئەیخاتە ناو سەوەتەی سەر دووکەڵەکە.

ـ دیسان بڵێ، "عەمە"!

ـ «ئەو گۆرانی زۆری ئەزانی. "لالاحەوا" دەنگی زۆر خۆش بوو، ئەویش وەک تۆ گیتار و فلوتی لێئەدا و بە جوانی سەمای ئەکرد. دوای ڕووداوەکەی باوکت، لە پڕ ئەو گۆڕا، ئیتر هەرگیز نە گۆرانی وت و نە گیتاری ئەژەند. تەنانەت کاتێ تۆ لە دایک بوی، ئەو هەر گۆرانی نەئەچڕی. مەگەر شەوانە، کاتێ تۆ ئەگریای، بۆ ئەوە ئارامت کاتەوە، ئەیخوێند.»

زەردەواڵەکان هاتوون، سەدان زەردەواڵە، لە دەور ئاگردانەکەدا ویزەویزیان دێت لە دوای هەڵێک ئەگەڕێن لە سەر گۆشتەکە بنیشنەوە. بەڵام دووکەڵەکە ڕاویان ئەنێ، ئەیان خنکێنێ و ئەوانیش گێژ و مەنگ دوور ئەکەونەوە. بڕێکیان ئەکەونە ناو ئاگرەکە و شۆڵەیەکی زەردی بچووکیان تێبەر ئەبێ. ئەوانی دیکەیش، سوتاوو کەنەفت ئەکەونە سەر زەوی.

زەردەواڵە بەسەزوانەکان!، ئەوان هاتبوون بەشە گۆشتەکەیان بەرن. بەڵام نازانن چۆن کەن. دووکەڵە توندەکە گێژ و توورەیان ئەکات. چونکە ناتوانن لە سەر سەوەتە دارینەکە بنیشنەوە، ئەمجا ڕاستەوخۆ بەرەو ناو دووکەڵەکە دائەبەزن و گێژ و کوێر وەک پەپوولەی شەو ئەمرن. "لالا" لەتێک گۆشتیان بۆ فڕێ ئەدات بۆ ئەوە لە ئاگرەکە دوور کەونەوە. بەڵام یەکێکیان پشتە ملی ئەگەزێ: ـ«ئای»، "لالا" ئەقیژێنێ.

زەردەواڵەکە ئەگرێت و فڕەی ئەدات. ئێشی زۆرە، بەڵام پێشی عاجز نابێ. چونکە لە ناخەوە زەردەواڵەکانی خۆش ئەوێ.

"عەمە" سەرنجیان نادات. بە پەرۆیەک دووریان ئەکاتەوە و گۆشتە ریشاڵ

ریشاڵەکانی ناو سەوەتەکە هەڵئەگەڕێنێتەوە و ئەڵێ: «حەزی نەئەکرد زۆر لە ماڵ بمێنێتەوە...» ئەڵێی دەنگی تۆزێ گیراوە، وەک خەوێکی کۆن بگێڕێتەوە.

«زۆربەی کات تۆی بە حەگاڵێ ئەبەستەوە بە کۆڵیەوە و لە ماڵ ئەڕۆیشتەدەر، دوور ئەکەوتەوە دوور... کەس نەیئەزانێ بۆ کوێ ئەڕوا، بە ئوتووبووس بەرەو دەریا یان دیهاتەکانی دەوروبەر ئەڕۆیشت. ئەڕۆیشت بۆ بازار و کانیەکان، شوێن گەلی پڕلە حەشامەت کە ئەم نەیئەناسین لە سەر بەردێک دائەنیشت و سەیریانی ئەکرد. خەڵک وایان ئەزانی کە سواڵکەرە... بەڵام ئەو پێی خۆش نەبوو لەماڵەوە بمێنێتەوە و کار بکات. چونکە لە ماڵەوە زۆر لەگەڵی خراپ بوون، بەڵام من زۆرم خۆش ئەویست. وەک خوشکی خۆم بوو.»

- چۆن مرد، "عەمە"؟

- باش نیە لە ڕۆژی جەژندا باسی مردن بکەم.

- قەیناکا، چۆن مرد؟

ئاگرەکە لەیەک جیای کردوونەتەوە، "عەمە" و "لالا" یەکتر نابینن، بەڵام ئەڵێی نیگایەکی تر لە ناخیاندا نزیک ئەبێتەوە و ئازاریان پێ ئەگەیەنێت.

ئەستوونەشین و خۆڵەمێشەکانی دووکەڵ سەما ئەکەن، وەک هەور لێک ئەترازێن و ئەنووسێنەوە بەیەکدا. گۆشتە ریشاڵەکانی ناو سەوەتەکە، وەک چەرمی کۆن قاوەیی ئەنوێنێ، لەولاتر هەتاو بە ئەسپایی دائەچێ، "با" خێزاوونیشتاو هەڵئەنێ. ئاوازی کوللەکان، قیرە قیری منداڵەکان کە لە کۆڵانەکانی "سیتە" رائەکەن، ژاوەژاوی پیاوەکان و دەنگی مۆسیقا بەرز بوەتەوە، بەڵام "لالا" ئەوانە نابیسێ، ئەو بە تەواوەتی لەگەڵ سرتە سرتی دەنگێکدا تێکەڵاو بووە کە چیرۆکی مەرگی دایکی ئەگێڕێتەوە.

-«ئاگامان لێ نەبوو قەرارە چی روو بدات، رۆژێ "لالاحەوا" بە هۆی ماندوویەوە نووستبوو لەرزی کردبوو، چەن رۆژ هەروا بوو، بێ ئەوەی زار لە شتێکەوە بدات، بێ جووڵە کەوتبوو، بەڵام ناڵە و گلەیشی نەئەکرد. کاتێ لێمان ئەپرسی کە چی ئەوێ، تەنیا ئەیوت، هیچ، هیچ من هەر ماندووم.

من چاودێری تۆم ئەکرد، چونکە "لالاحەوا" تەنانەت ئیتر نەیدەتوانــی بێتە دانیشتن. دێهاتەکەمان پزشکی لێ نەبوو. دەرمانگەکەیش زۆر دوور بوو، نەمان ئەزانی ئەبێ چیبکەین.

پاشان، رۆژێ، شەشەمین رۆژ، "لالاحەوا" بانگی لێ کردم، دەنگی زۆر کز و لاواز بوو. ئیشارەی پێ کردم لێی نزیک بمەوە. تەنیا پێی وتم: "من ئەمرم". هەر ئەوە، دەنگی زۆر سەیر بوو، روخساری خۆڵەمێشی بوو، چاوەکانی ئـەسووتان. مـن زۆر ترسام. تۆم هەڵگرت و تاتوانیم دوور کەوتمەوە، لە ژێر درەختێکی ژێر تەپۆڵکەکە مامەوە. تۆیش لەولاوە کایەت ئەکرد.

کاتێ گەرامـەوە بـۆ مـاڵ لە بـاوەشما ئـەگـریای. گـوێم لە شـیوەنی دایک و خوشکەکانم بوو، لە بەر دەرگاکە باوکمم بینی، پێی وتم "لالاحەوا" مردوە...».

"لالا" بە هەموو هێزیەوە گوێی لێ گرتووە، بینایی لە سەر شۆڵەکان کە سـەما ئەکەن و قرچە قرچیان دێت ماوەتەوە و گەردەلوولی دووکەڵەکە کە بەرەو ئاسمانی شین بەرز ئەبێتەوە.

زەردەواڵەکان دیسان باڵیان گرتوەتەوە، وەک کوللە لە نێوان ئاگرەکە تێئەپەرن، ئەکەونە سەر زەویەکە، باڵەکانیان سووتاوە، "لالا" گوێ لە موسیقاکەیان رائەگرێ، تەنیا مۆسیقای راستەقینەی سیتەی دارین ولۆحینەکەیە.

«کەس بە تەمای ئەو رووداوە نەبوو، بەڵام کاتێ روویدا هەموو شیوەنیان ئەکرد. من لەرزم کردبوو خەریک بوو بمرم، بۆ تۆ پەژارەو خەمبار بووم، چـونکە تـۆ زۆر مناڵ بووی و هێشتا تێ نەئەگەیشتی. دواتر تۆم لەگەڵ خۆم برد. کاتێ باوکم مرد، من ناچار بووم بێمە "سیتە" و لەگەڵ "سووسی" بژیم.»

هێشتا ماوەیەکی زۆری مابوو گۆشتەکان ببرژێن. "عەمە" دەست ئەکاتەوە بە قسە کردن، بەڵام ئیتر سەبارەت بە "لالاحەوا" هیچ ناڵێ. بەڵکوو قسـەی "ئـەلئەزرەق" ئەگێرێتەوە، کە پێی ئەڵێن پیاوی شین. کەسێکە فەرمانی بە "با" و باران ئەدا و ئەیتوانێ هەموو بوونەوەرێ گوێ رایەڵی خۆی بکات، تەنانەت بەردوو دەوەنەکانیش. "عەمە"

سەبارەت بە کۆلیتەکەی ئەلێ کە لە لق و پۆپی دار خورما دروست کرابوو. تەنیا لە ناوەراسی بیاباندا ئەژیا. لە ئاسمانی سەریەوە هەزاران باڵندەی جۆراوجۆر ئاوازیان ئەخوێند، بۆ ئەوە لە گەڵ نوێژەکانی ئەودا هاودەنگی کەن. بەڵام تەنیا ئینسانە دڵپاکەکان ئەیان توانی کۆلیتەکەی بدۆزنەوە، ئەوانی دیکە لە بیابان وێڵ و وەیلان ئەمانەوە.»

"لالا" ئەپرسێ:قسەی لە گەڵ زەردەواڵەکانیش ئەکرد؟

«لە گەل زەردەواڵەکان و هەنگەکانیش، ئاخر ئەو خاوەنیان بوو تەنانەت ئەیتوانی دەستەمۆیان بکات، تەنانەت بە خوێندنی ئاوازەکەی زەردەواڵە و هەنگ و مێشەکان شاڵاویان ئەبردە سەر دوژمنەکان، ئەگەر بیویستایە ئەیتوانی شارێک وێران بکات. بەڵام ئەو ئینسانێکی ڕاست و پیاو چاک بوو بۆ کاری چاکە لە هێزەکەی کەڵکی وەر ئەگرت.»

"عەمە" قسەی بیابانیش ئەکات، بیابانێکی هەراوکە لە باشووری "گولیمین"ەوە و لە ڕۆژ هەڵاتی "تارودانت" دەست پێ ئەکات تا ئەگاتە دۆڵی "درا". "لالا" لە بیابان لە دایک بوە، لە ژێر درە ختێکدا. "عەمە" ئەلێ لە وڵاتی بەرینی بیاباندا، ئاسمان پان و پۆرە و ئاسۆیەکی بێ بڕانەوەی هەیە، چونکە هیچ شتێ بەربینایی ناگرێت . بیابان وەک دەریایە، شەپۆلەکانی "با" لە سەر لمە ڕەقەکە و کەفی درکە بزۆکەکە، بەردە ساف و لووسەکان و گوڵە بەردەکان و خاڵەکانی خوێ، "عەمە" ماوەیەکی زۆر قسەی بیابان ئەکات، بەدەم وتەکانی ئەوەوە، شۆڵەکان بەرەبەرە دائەمرکێنەوە. دوکەڵەکە کەمتر ئەبێتەوە و تەپ و تۆزێکی زێوینی لەرزۆک پشکۆکان دائەپۆشێ.

«...لە بیابانی گەورە، ڕۆژانێکی زۆر ڕێ ئەبرن، بێ ئەوە سەرچاوەی ئاو پەیدا بکەن چونکە بیابان هێندە پان و بەرینە کەس بە تەواوەتی نایناسێ، مرۆڤەکان لە بیابان لە بەلەمی سەر دەریا ئەچن، کە کاتێ ئەڕۆن، کەس نازانێ کەی دێنەوە. هەندێ جار کە تۆفانە، نەک وەک تۆفانەکانی ئێرە، بەڵکوو تۆفانی سامناک، گێژەڵووکە لمی بیابان تا ئاستی ئاسمان بەرز ئەکاتەوە و مرۆڤەکان وون ئەبن، وەک بەلەمی ناو دەریا لە

ناو لمەکە دائەشاریەن و ئەمرن. بیابان و ئێرە جیاوازیان زۆرە، هەتاو جۆرێکی دیکەیە، بە هەموو هێزەوە ئەدرەوشێتەوە.

شەو ئینسانە وون بوەکان، لەتاو سەرمادا ئەناڵێنن، سەرما ئێسکیان تێک ئەشکێنێ. تەنانەت مرۆڤەکانی لە خەڵکی ئێرە ناچن، بێبەزەیی و نامیهرەبانن. وەک رێوی خۆیان لە نێچیرەکانیان دائەگرن و بێورتە نزیک ئەبنەوە. وەک "ئارتانی" رەشن و جل و بەرگی شین لەبەر ئەکەن، دەمامک هەڵئەبەسن... مرۆڤ نین، جنۆکەن، منالی شەیتانن، لەگەڵ شەیتان هەڵس و کەوتیان هەیە، جادووگەرن...»

ئەمجا دیسان "لالا" بیر لە "ئەلئەزرەق" ئەکاتەوە، پیاوی شین، خاوەنی بیابان، کەسێکە ئاو لە ژێر بەردەکانی بیابان هەڵئەقوڵێنێ. "عەمە"یش بیر لە "ئەلئەزرەق" ئەکاتەوە، ئەڵێ: «پیاوی شینیش هەر لەوان بووە، بەڵام خوا تەبەرِوکی کرد و ئەو هۆزەکەی و خێزانەکەی بەجێهێشت و بە تەنیا ئەژیا، بەڵام ئەویش وەک خەڵکی بیابان هێزەکانی لە دەستیدا بوو. "لالاحەوا" یش ئەو هێزەی بوو خەوی تەعبیر ئەکردەوەو ئاگای لە داهاتوو بوو و شتە نهێنی وون بوەکانی ئەدۆزیەوە.

خەڵک کە ئەیانزانی ئەو لە بنەچەی "ئەلئەزرەق"ە، ئەهاتن کە ئامۆژگاریان بکات. هەندێ جار وەڵامی ئەدانەوە، جار وابوو هیچی نەئەوت.»

"لالا" سەیری دەستی خۆی ئەکات، ئەیەوێ تێبگات چی تێدایە. دەستی گەورە و بە هێزە، لە دەستی کورِ ئەچێ، بەڵام پێستی دەستی نەرمە و قامکەکانی درێژن.

- «منیش ئەو هێزەم هەیە، "عەمە"!»

"عەمە" پێئەکەنێ، بەدەم باوێشکەوە هەڵئەسێتەوە:

- بیری لێ مەکەوە، گۆشتەکە ئێستا ئامادە بوە، ئەبێ بیخەینە ناو دەوریەکە.

کاتێ "عەمە" ئەروا، "لالا" سەوەتەکە دائەگرێ و گۆشتە ریشاڵ کراوەکە ئەکاتە دەوریەکەوە چەن لەت ئەخاتە دەمیەوە.

ئاگرەکە ئەکوژێتەوە، زەردەواڵەیەکی زۆر شالاو دێنن. ویزەویز دەست

پێیەکەن، لە دەور دەست "لالا" ئەسوورێنەوە و خۆیان لە قژی دەئاڵێنن. "لالا" سڵیان لێناکات. بە ئەسپایی دەستی رائەوەشێنێ و دووریان ئەخاتەوە و دیسان لەتێ گۆشتی برژاویان بۆ فڕێ ئەدات. ئەمڕۆ بۆ زەردەواڵەکانیش رۆژێکی تایبەتە.

دوایی بەرەو دەریا مل ئەنێ، لە کوێرە رێگاکە بەرەو تەپۆلکە لمەکان هەڵئەگەڕێ. لەناو لمەکەدا بە دوای چاڵایەکدا ئەگەڕێ، هەڵاژیەت. سووچێکی بێدڕک و بێمێروولە پەیدا ئەکات، بە پشتا رائەکشێ و دوودەستی لە ئاستی جەستەیدا شل ئەخاتە سەر زەوی، چاوەکانی ماقی ئاسمانە، هەورە سپیەکان تێدەپەڕن، دەنگی ئارامی دەریا دێت کە لمەکان ئەساوێتەوە، باشتر ئەوەیە گوێی لێوە بێت تا بیبینێت. خشەی دەوەنە وشکەکان و گەڵا وردەکانی ئەقاقیا ئەبیسێ. هێشتا چەند زەردەواڵە لە دەور دەستیدا ویزەیان دێت، چونکە هەست بە بۆنی گۆشت ئەکەن. دیسان هەوڵ ئەدا دەنگی نامۆی ئاوازەکە ببیسێ، دەنگەکە لە دوورەوە لە وڵاتێکی دیکەوە دێت. دەنگەکە بەرز و نەرم ئەبێتەوە و وەک دەنگی کانیەک روون و ئاشکرایە و وەک هەتاو رووناکە.

ئاسمانی بەرانبەری، بەرەبەرە خۆی دائەپۆشێ. بەڵام شەو زۆر بە ئەسپایی نزیک ئەبێتەوە. چونکە ئاخر و ئۆخری زستانەو سەرەتای وەرزی رۆشنایی. لە پێشدا ئاسۆ خۆڵەمێشە، پاشان سوور ئەنوێنێ، هەورە گەورەکانیش لە یاڵی ئاگر ئەچن.

"لالا"، لەناو چاڵە لمەکە، لە نێوان تەپۆلکەی لمەکانەوە، جووڵەی لە خۆی بڕیوە، چاوی بڕیوەتە ئاسمان و هەورەکان. بە راستی لە نێوان هاژەی دەریا و "با"دا، لە ناو قیرە قیری گومی گاکیەکاندا، دەنگی نەرمی لاوەندنەوەیەک ئەبیسێ. دەنگێکی روون بەڵام لەرزۆکە، ئەڵێی لە مێژە ئەزانێ مەرگ شاڵاوی بۆ دێنێ. دەنگێکی پاک و زوڵاڵ، لە دوای ئەو هەموو رۆژە ئاگرینانەدا، بێئەوە لێی تێر بێت، ئەیخواتەوە. مۆسیقایەک کە لە ئاسمان و هەور لە دایک بووە، لە نێوان تەپۆلکەی لمەکاندا دەنگ ئەداتەوە، زایەڵەکەی هەموو جێگایەک ئەگرێ و ئەلەرێتەوە، تەنانەت لە نێوان گەڵا وشکەکان و دڕکەجارەکەدا ئەسوورێتەوە، ئەو تەنیا هەر بۆ "لالا" گۆرانی ئەچڕێ،

ئابلۆقەی ئەداو بە ئاوە نەرمینەکەی ئەیشواتەوە، دەست بەسەر و قژیا دێنێ، سەر تەوێڵ و لێوەکانی نەوازش ئەکات و ئەوینەکەی ئەسەلمێنێ بە سەریا، ئەرژێتە خوارەوە و تەبەرکی ئەکات. "لالا" روخساری لەناو لمەکەدا دائەشارێ، شتێ لە ناخیدا تێک ئەشکێ و ئەیهەژێنێ، فرمێسکەکان بە ئەسپایی ئەخزێنە خوارەوە. هیچ کەس نیە دەست بنێتە سەر شانێ و بڵێ: "لالا" چکۆلە، بۆ ئەگریت؟

بەڵام دەنگە نامۆکە فەرمێسکە نەرمەکان ئەچۆڕێنێتەوە. دیمەن و وێنەی ساڵانێکی زۆر لە ناخیدا ماوەتەوە کە ئەیهەژێنێ و فرمێسکەکانی ئەرژێتە سەر لمەکە. لمەکە ئەنوسێ بە گۆناو لێوەکانیەوە. لەپڕ، هیچ نامێنێ، دەنگەکە لە قووڵایی ئاسماندا کوژاوەتەوە و شەو داهاتوە.

شەوێکی دڵبزوێنی شینی تۆخی مەخمەڵین، لەویاکە ئەستێرەکان لە نێوان هەورە فسفۆریەکانەوە ئەدرەوشێنەوە، داهاتوە. لەرزی کردوە، بێ ئامانج لە درێژای تەپۆڵکەی لمەکاندا مل ئەنێ، ئەستێرۆکەکان چاو ئەقرتێنن، بەڵام لە ترس ماردا ئەگەرێتەوە سەر کوێرە رێگاکە، کە هێشتا جێ پێکانی بەسەرەوە ماوە. رێگای "سیتە" ئەگرێتە بەر. هێشتا جەژنە.

***

"لالا" چاوەروانە، خۆیشی نازانێ چاوەروانی چیە. لە "سیتە" رۆژەکان درێژن، رۆژە بارانیەکان رۆژە پڕ لە "با"کان، رۆژەکانی هاوین. برێ جار "لالا" پێی وایە کە هەر بە تەمایە رۆژ بێتەوە، بەڵام کاتێ رۆژ ئەبێتەوە، ئەزانێ کە ئەوە نیە کە ئەم چاوەروانی بوە. ئەو چاوەروانە، هەر ئەوە، خەڵک سەبریان زۆرە، رەنگە هەمووی ژیانیان چاوەروانی شتێکن کە هەرگیز روونادات. زۆربەی کات لە سەر بەردێک، لە بەر هەتاو ئەمێننەوە و سەریان بە پاڵتۆکەیان یان بە دەستە سرێکی هەوری دائەپۆشن و چاو ئەبرنە رووبە روویان؛ بۆچی ئەروانن؟

ئاسۆ خۆڵاویەکە، جادەی کامیۆنەکان، تارمایی تەپۆڵکە بەردینەکان، هەورە سپیەکان کە تێدەپەرن... "لالا" بۆ ئەوانە ئەروانێ. خەڵک نیازیان بە هیچی تر نیە.

ژنەکانیش لەبەرکانیەکە چاوەڕوانن، دەمامکی ڕەش هەڵئەبەسن و ورتەیان لێوە نایەت. تەنانەت منداڵەکانیش ئەزانن چاوەڕوان بن. لەبەر دووکانی وردە فرۆشیەکە دائەنیشن و بێقیرە قیر و بێ ئەوەکایە بکەن، چاوەڕوان ئەمێنن. جار جار یەکێکیان بتڵێکی "فانتا" یان مشتێ نوقڵی نەعنا ئەکڕێ، ئەوانی دیکە بێ‌ئەوە ورتەیان لێوە بێت، بۆی ئەڕوانن.

بڕێ ڕۆژ، کەس نازانێ چی ئەبێت و چی ڕووئەدات. هەموو لە کۆڵان و قەراخ جادەکان چاوەڕوانن. منداڵە جل شڕەکان بە تەمای ئوتوبوسە شینەکە ئەمێننەوە، یان بۆ گوزەری کامێونە گەورەکان ئەڕوانن کە گازۆئیل و دار و سیمانیان پێیە. "لالا" بە باشی دەنگی کامێونەکان ئەناسێ. هەندێ جار لەگەڵ منداڵەکانی دیکە لە لێژاییەکەی بەر "سیتە" دائەنیشن، کاتێ کامێونێ نزیک ئەبێتەوە هەموویان سەریان بەرەو ئەو پەڕی جادەکە، لەو شوێنەکە هاڵاو لە سەر قیری جادەکە سەما ئەکات و لە سەر تەپۆڵکەکان لوول ئەخوات، وەرئەچەرخێنن.

ماوەیەکی زۆر بەرلە دەرکەوتنی کامێونەکە، دەنگی ماتۆرەکەی ئەبیسن، نەڕەیەکی گوم وەک فیکەیەک جار جار لەگەڵ هۆڕنی کامێونەکە بەرز ئەبێتەوە. زایەڵەکەی لەسەر دیواری ماڵان دەنگ ئەداتەوە. ئەمجا گەردەلوولی تەپ و تۆزێک ئەبینن کە لەگەڵ دووکەڵی شینی ماتۆرەکە تێکەڵ ئەبێت. کامێونێکی سوور لەو پەڕی توانایی لە سەر جادە قیرەکە نزیک ئەبێتەوە، لە سەر جێگای شۆفیرەکە دووکەڵێکی شین لە لوولەیەکەوە دێتە دەرەوە، هەتاو بە هەموو هێزەوە لە سەر شووشەکەی بەردەمی و کرۆمەکان بەرق ئەداتەوە. چەرخەکانی جادەکە ئەدڕێنن و ئەچنە پێشەوە، بە هۆی "با"وەبە ئەستەم لێ ئەخوڕێ. بە هۆڕن لێدان لە بەر منداڵەکانەوە تێئەپەڕێ، زەوی لە ژێر چواردە تایە ڕەشەکانیدا ئەلەرێتەوە. "با"ی تەپ و تۆز و بۆنی توندی بەنزینی سووتاو، وەک هاڵاوی هەناسەیەکی داخ، بە سەریانەوە ڕەد ئەبێ. بۆ ماوەیەکی زۆر منداڵەکان هەر باسی کامێونەکە ئەکەن. چیرۆکی کامێونەکان ئەگێڕنەوە، کامێونە سوورەکان، کامێونە باربەرە سپیەکان، کامێونە جەرسەقیلیە زەردەکان. کاتێ

چاوەڕوانن، بەم شێوە رایدەبوێرن. چاو ئەبڕنە جادە و پردەکان و دەریا، بۆ دیتنی ئەو شتانەی کە نامێننەوە و بە زوویی تێئەپەڕن.

***

هەندێ رۆژ ئەڵێی لە رۆژانی دیکە درێژترن، چونکە برسیانە. "لالا" ئەو رۆژانە چاک ئەناسێ. کاتێ لە ماڵەوە پارە پەیدا نابێت، "عەمە" لە شارکاری پەیدا نەکردووە و تەنانەت "سەلیمە سووسی" " شووی "عەمە"یش بێکارە، پەژارە و خەم هەموویان دائەگرێت.

لەم کاتانەدا "لالا" تەواوی رۆژ ناڕواتەوە بۆ ماڵەوە. تا ئەتوانێ لە ماڵ دوور ئەکەوێتەوە، بەرەو فەلاتە بەردینەکە مل ئەنێ. بە دوای "ئارتانی"دا ئەگەڕێ.

هەمیشە وایە ، کاتێ زۆری نیاز پێیەتی، لە چاڵاییەکدا دەرئەکەوێ، لەسەر بەردێک دانیشتووە و بە پەڕۆیەکی سپی سەری داپێچاوە، چاودێری لە مەڕ و بزنەکان ئەکات.

روخسارێکی رەش و دوودەستی لەڕ و بە هێزی وەک پیاوێکی بە ساڵاچووی، هەیە.

نانە رەش و خورماکەی لەگەڵ "لالا"دا بەش ئەکات. تەنانەت بەشی ئەو شوانانەش ئەدات کە لە دەورووبەریدا بن. بەو کارەی شانازی ناکات، ئەڵێی ئەو شتە ئەیبەخشێ بۆی گرینگ نیە. "لالا" جار جار سەرنجی ئەدات. چەنێ ئەو روخسارە ئارامە خوێنساردەی خۆش ئەوێ! و لووتە قەڵانگەکە و پرشنگێ کە لە ناخی چاوە تاریکەکەیەوە، ئەدرەوشێتەوە.

"ئارتانی"ش چاوەڕوانی شتێکە، بەڵام رەنگە تەنیا کەسێکە ئەزانێ چاوەڕوانی چیە.

نایدرکێنێ، ئاخر ئەو زمانی مرۆڤەکان نازانێ. بەڵام چاوەکانی ئەیدرکێنن کە چاوەڕوانی چیە و بە دوای چیدا ئەگەڕێ. ئەڵێی بەشێ لە وجوودی لە شوێنی لە دایک بوونەکەی ماوەتەوە.

لەوبەر تەپۆڵکە بەردینەکان و کێوە بەفراوەکان، لە پانتایی بیاباندا...و ئەبێ ڕۆژێ بەشەکەی دیکەی وجودی بدۆزێتەوە بۆ ئەوە بێت بە ئینسانێکی دانامە.

"لالا" تەواوی ڕۆژ لای شوانەکە ئەمێنێتەوە، بەڵام ئاگادارە زۆر لێی نزیک نەبێتەوە، لەولاتر لەسەر بەردێ دائەنیشێ و بۆ بەردەمی ئەڕوانێ، سەیری "با" ئەکات کە سەما ئەکا و لە ئاستی سەر دۆڵە وشکەکەوە هەڵئەگەڕێتەوە. بۆ ڕووناکی بریسکە داری ڕۆژ ئەڕوانێ و ڕێپێوانی بە کاوە خۆی مەڕو بزنەکان لە نێوان بەردە سپیەکاندا. لەم ڕۆژانەی پڕ لە پەژارەو ترسەدا، باشترین جێگا لای "ئارتانی"ە، کە نیازی بە قسە کردن نیە، هەر نیگایەک بەسە کە تێبگات و بێهیچ چاوەڕوانیەک نان و خورمای پێئەدات. "ئارتانی"ش وای پێخۆشە کە زۆر لێی نزیک نەبێتەوە، وەک مەڕ و بزنەکان کە هەرگیز بە تەواوەتی پشت بە کەس نابەسن. تەواوی ڕۆژ گوێ لە قیرە قیر و فیکەی شوانەکان ئەگرێ کە بێدەنگیە سپیەکە ئەهەژێنن. کاتێ بەرەو "سیتە"ی دار و لۆحە قیرتاویەکە ئەگەڕێتەوە، هەست بە ئازادی ئەکات، تەنانەت ئەگەر "عەمە" بە سەریدا بقیڕێنێ، بە خاتر ئەوەی کە هیچ خواردنێکی نەبردوەتەوە.

هەر یەکێ لەم ڕۆژانەیە کە "عەمە" "لالا" ئەبات بۆ لای تاجری قاڵیەکە، لەوبەر چەمەکە، لە ناوچەیەکی فەقیر نشینی شار. ماڵێکی سپی گەورە کە پەنجەرەکانی بە میلە گیراون. لە ناو سالۆنی کارگەکە دەنگی ئامێری قاڵی چنینە کە ئەبیسێ. بیست کەس یان زۆرتر، لە ریزێکدا یەک لە دوای یەک، لە تاریک و لێڵی شیری ڕەنگی سالۆنەکە خەریک جاجم کردنن.

لەبەر دار قاڵیەکاندا، کیژووڵەکان لە سەر چوار پایەگەلی بچووک دانیشتون و بە توندی کار ئەکەن، مەکۆکان لە نێوان تاڵە زنجیرەکان ڕەد ئەکەن و بە دوێردی پۆلاینی بچووک، ئەیبڕنەوە و کوڵکەی سەر تاڵەکان کۆئەکەنەوە. ڕەنگە گەورەترینیان هەر چواردە ساڵی تەمەنە. ئەوان تەنانەت بۆ "لالا" و "عەمە" و تاجرەکە ناڕوانن، تاجرەکە بانگی زوهرە ئەکات. ژنێکی کەڵەگەتی جل ڕەش کە شووڵێکی بە دەستەوەیە کە ئەیماڵێ بە ڕان و شانی کیژۆڵەکاندا کاتێ بە توندی کار ناکەن یان لەگەڵ

پاڵ دەستەکانیان ورتەیان بێت.

بێ ئەوە بۆ "لالا" بڕوانێ ئەپرسێ: تا ئێستا قاڵی کردووە؟

"عەمە" ئەڵێ: زووتر پێم نیشان داوە.

"زوهرە" سەری ئەلەقێنێ، ڕەنگی زەرد ئەنوێنێ، ڕەنگە بە هۆی جلە ڕەشەکانیەوە بێت، یان لەبەر ئەوە هەرگیز لە دووکانەکە ناچێتە دەرەوە.

بە ئەسپایی بەرەو دار قاڵیەکی بێکار ئەڕوا، قاڵیەکی سووری تۆخ بە خاڵی سپیەوە.

- ئەبێ ئەمە تەواو کات.

"لالا" دائەنیشێ و دەست پێ ئەکات. بۆ ماوەی چەن سەعات لە ساڵۆنە گەورە تاریکەکەدا، دەستەکانی وەک ئامێرێک کار ئەکەن. بەیناوبەین دەست لە کار هەڵئەگرێ، چونکە قامکەکانی زوو ماندوو ئەبن. بەڵام نیگای ژنە ڕەنگ زەردەکە هەست پێ ئەکاو خێرا دەست پێ ئەکاتەوە.

ئەزانێ چونکە لە هەموویان گەورەترە شووڵەکەی پیا ناماڵێ. کاتێ چاویان بە چاوی یەکتر ئەکەوێ ئەڵێی بەرق "لالا"ی گرتوە، ڕق و توورەیی لە چاویدا ئەبینێ. بەڵام ژنە قەڵەوە جل ڕەشەکە تۆڵەی خۆی لە بچووکترینیان ئەگرێتەوە. لە کیژۆڵە لاوازەکان کە وەک سەگ ئەترسن، لە کچی سواڵکەرەکان و وێڵ کراوەکان، کە تەواوی ساڵ لە ماڵی "زوهرە"دا ئەژین. کاتێ ئارام کار ئەکەن. یان لەگەڵ یەک سرتە سرتیان دێت ژنە قەڵەوەکە خێرا خۆی ئەگەیەنێت و بە هەموو هێزیەوە شووڵەکە ئەماڵێ بە پشتیاندا. بەڵام کیژۆڵەکان هەرگیز ناگرین، تەنیا دەنگی ویژەی شووڵەکە و لێدانی کپی شووڵەکە لە سەر پشتیان دێت. "لالا" ددانەکانی ئەساوێ بە یەکدا، سەری دائەنەوێنێ بۆ ئەوە دەنگیان نەبیسێت و نەیانبینێت. چونکە هەڵی ئەنێ ئەویش بە سەر زوهرەدا بقیژێنێ و لێی بدات. بەڵام چونکە ئەبێ پووڵ بۆ "عەمە" بباتەوە، هیچ ناڵێ، تەنیا بۆ ئەوە تۆڵەی لێ بسێنێ، چەند گرێی پێچەوانە لە قاڵیە سوورەکە ئەدات.

ڕۆژی دوایی ئیتر خۆی بۆ ناگیرێ، ژنە قەڵەوە ڕەنگ زەردەکە دەست ئەکا بە

لێدانی "مینا"، کچێکی لەڕ و لاوازی تەمەن خوارتر لە دە ساڵان. "لالا" هەڵئەسێتەوە و ئەڵێ:

- بەسە ئیتر.

"زوهرە" ساتێ بۆی ئەڕوانێ، تێناگات. روخسارە قەڵەوە زەردەکەی وەها حاڵەتێکی نەفامانەی هەیە کە "لالا" دیسان ئەڵێتەوە:

- ئیتر بەسە، لێی مەدە.

روخساری "زوهرە" لە تووڕەییدا رەنگ ئەگۆڕێ، شووڵەکەی توند بۆ روخساری "لالا" بەرز ئەکاتەوە، بەڵام هەر شانی چەپی بەر ئەکەوێ، چونکە "لالا" خۆی ئەکێشێتە دواوە.

"زوهرە" ئەقیژێنێ : «ئەبینی کە چۆن لە خۆیشت ئەدەم.»

- «پەستی بەدفەڕ.» "لالا" شووڵەکەی "زوهرە" ئەفڕێنێ و بە ئەژنۆ ئەیشکێنێ. ئێستا روخساری ژنە قەڵەوەکە لە ترسدا گۆڕیاوە. خۆی ئەکێشێتە دواوە بە پرتە پرت ئەڵێ:

- برۆ دەرەوە، خێرا برۆ.

بەڵام "لالا" هەر زووتر لە ساڵۆنە گەورەکە تێپەڕیوە و دەرپەڕیوەتە ناو رۆشنایی هەتاو.

تا ماڵی "عەمە" رائەکات، ئازادی جوانە! ئەتوانێ دیسان سەیری هەورەکان بکات کە بە پشتا ئەخزێن، سەیری زەردەواڵەکان بکات کە لە ئاقاری کۆگای زبڵەکاندا ویزە ویزیان دێت. مارمیلکەکان، خۆر پەرستەکان و گیالەرزۆکەکانی بەرانبەر "با". لە سێبەری بەر ماڵە تەختەیەکان دائەنیشێ و بە چنۆکی گوێ لە دەنگ و سرتە هەرە نزمەکان رائەگرێ.

شەو کاتێ "عەمە" دێتەوە، ساکارانە ئەڵێ: ئیتر لای "زوهرە" کار ناکەم، ئیتر هەرگیز ناچم.

"عەمە" ساتێ بۆی ئەڕوانێ بەڵام هیچ ناڵێ.

لەو رۆژەوە لە "سيتە" هەموو شتەكان بۆ "لالا" گۆڕاون. ئەڵێ لە پڕ گەورە بووە، خەڵك بە سەرنجەوە بۆی ئەڕوانن، تەنانەت كورەكانی "عەمە" وەك جاران لەگەڵی توورە نین و بە چاوی سووكەوە بۆی ناڕوانن، كەمێ خۆزگە بەو رۆژانە ئەخوازێت. كاتێ بچووك بوو، كاتێ كە تازە هاتبوو بۆ "سيتە" و كەس ناوی نەئەزانی. ئەيتوانی لە پشت دەوەنێكەوە خۆی داشارێ، لە ناو سەتڵێكدا، لە ناو كارتۆنێكدا.... زۆر حەز ئەكات وەك رۆحێك بێت و بڕوا، كەس نەيبينێ، كەس لەگەڵيا قسە نەكات.

تەنيا "نوعمان"ی پير و "ئارتانی" نەگۆڕياون. "نوعمان"ی ماسیگر هەر وەك جاران بەدەم دروست كردنەوەی تۆڕەكانيەوە، يان كاتێ لای "عەمە" دائەنيشێ كولێرەی گەنمە شامی ئەخوات چيرۆكی سەيری بۆ ئەگێڕێتەوە.

"نوعمان" ئيتر ماسی ناگرێ، بەڵام خەڵك زۆريان خۆش ئەوێ، هەميشە ئەيبەنەوە بۆ ماڵ خۆيان، چاوە گەشەكانی وەك ئاو روونە، روخساری ئەڵێی بە چرچ و لۆچ دووورياوەتەوە، نيشانی برينی كۆنی بەسەرەوە ديارە.

"عەمە" گوێ رائەگرێ بۆ بەسەر هاتەكانی لە "ئيسپانيا" و "مارسێ" و "پاريس"، هەموو ئەو شارانەی كە گەڕابوو و ناوی كۆڵان و خەڵكەكەيشی ئەزانی.

"عەمە" لێی ئەپرسێ براكەی "نوعمان" ئەتوانێ كارێكی لەوێ بۆ پەيدا بكات؟

"نوعمان" سەری ئەلەقێنێ: بۆ ناتوانێ.

"نوعمان" بەڵێنی پێئەدابۆ براكەی نامە بنوسێ.

ـ بەڵام رۆيشتن گەلێ سەخت و دژوارە، ئەبێ پووڵ و ناسنامەت بێت.

"عەمە" رائەمێنێ، چاوەكانی بە سەر جێگايەكی دووری ناديارەوە ئەوێستێتەوە. لە خەياڵی شارە سپيەكاندايە، كۆڵان و ماڵ و ئوتوبوسەكان، رەنگە ئەو هەر ئەمانەی بوێ.

بەڵام "لالا" زۆر بيری لێ ناكاتەوە، بەلايەوە گرينگ نيە. كاتێ بۆ چاوەكانی "نوعمان" ئەڕوانێ وەك ئەوەيە هەموو ئەو دەريا و وڵات و ماڵانە ئەبينێ.

"ئارتانی"ش بیر لەویّ ناکاتەوە. ئەو هەمیشە وەک منداڵێک ئەمێنێتەوە، گەرچی بە رواڵەت بە هێزو کەڵەگەتە، جەستەی لاواز و باڵا بەرزە. روخساری وەک ئابنوس ساف و لووسە، رەنگە هەر بەم هۆیەوە ناتوانێ قسە بکات.

هەمیشە لەسەر تاشە بەردێک دائەنیشێ، بینایی بەسەر جێگایەکی دوورەوە ئەگرسێتەوە، کراسێکی بۆرو دەمامکێکی سپی لەبەر دایە. لەو دەوروبەرەدا، هەمیشە شوانگەلی رەش وەک ئەو هەن، وەحشین و جلی شڕیان لەبەرە لەم تاشە بەرد بۆ ئەو تاشەبەرد بەدەم فیکە کردنەوە ئەپەڕنەوە.

"لالا" زۆر حەز ئەکات لێرە لای ئەمان بێت، لەم جێگا پڕ لە رووناکیە سپیە، لێرەدا کەکات وەستاوە و هەر گەورە نابێت.

***

کابراکە، بەیانیەک سەرتای هاوین هات بۆ ماڵی "عەمە"، پیاوێکی شاری، کۆت و شەڵواری رەنگ خۆڵەمیشی مەیلەو سەوزی لەبەردابوو، پێڵاوە چەرمەکانی وەک ئاوێنە بریقەیان ئەهات.

کۆڵێ دیاری بۆ "عەمە" و کورەکانی هێنا بوو و ئاوێنەیەکی بەرقی لەناو پلاستیکێکی سپیدا، رادیۆیەکی ترانزیستۆری کە هەر بە ئەندازەی قوتوە شقارتەیەک بوو. قەڵەم گەلی سەر زێڕین و ساکێ پڕ لە قەن و خۆراکی ناو قوتو.

کاتێ هاتە ماڵەوە، لە بەر دەرگاکە چاوی کەوت بە "لالا"، بەڵام جوان سەرنجی پێنەدا. دیاریەکانی لەسەر زەوی دانا. "عەمە" پێی وت دانیشێ، ئەویش بە دوای سەندەڵیەکدا ئەگەڕا. بەڵام هەر سەریناکانی لێ بوو و سەندووقێکی "لالاحەوا"، کە "عەمە" لە باشوورەوە لەگەڵ "لالا" هێنابووی.

پیاوەکە لەپی دەستی پیا هێنا و لە سەر سەندووقەکە دانیشت، بە تەما بوو چایی و کەیکی بۆ بەرن. "لالا" دوایی زانی پیاوەکە بۆ داوای ئەو هاتوە، ترسی لێ نیشت، سەری گێژی ئەخوارد، دڵی بە خورپە کەوت، "عەمە" خۆی پێی نەوت، کورە گەورەکەی "عەمە" "بارکی" پێی وت.

- دایکم بڕیاری داوە تۆی پێ بدات، چونکە زۆر دەوڵەمەندە.

"لالا" قیراندی: بەڵام من نامەوێ شوو بکەم.

"بارکی" وتی: بەڵام هیچ ناتوانی بڵێیت، ئەبێ گوێ رایەڵی پوورت بیت.

"لالا" بە قیژەوە دەرپەڕیبوە دەرەوە: هەرگیز، هەرگیز.

چاوی پڕ ببو لە فرمێسکی تووڕەیی و قین. کاتێ گەڕابوەوە بۆ ماڵەوە، پیاوە کۆت و شەڵوار لەبەرەکە رۆیشتبوو. بەڵام دیاریەکان لەوێ بوون. "عەلی"، کوڕە بچووکەکەی "عەمە"، رادیۆکەی لکاندبوو بە گوێیەوە و گوێی لە مۆسیقا گرتبوو، کاتێ "لالا" رۆیشتە ماڵەوە بە رقەوە بۆی روانی.

"لالا" بە تووڕەییەوە بە "عەمە"ی وت: بۆ دیاریەکانی ئەو پیاوەت وەرگرتوە، من نامەوێ شووی پێ کەم.

کوڕەکەی بە گاڵتەوە وتبووی: رەنگە ئەتەوێ شوو بە "ئارتانی"کەی.

"عەمە" وتی: «بۆ دەرەوە.» کوڕەکە بە رادیۆکەیەوە رۆیشتە دەرەوە.

"لالا" وتی: ناتوانی مەجبوورم کەی شووی پێ کەم.

- مێردێکی باش ئەبێ بۆت، زۆر لاو نیە، بەڵام دەوڵەمەندە، ماڵێکی گەورەی لە شار هەیە و زۆر لە پیاوە بە دەسەڵاتدارەکان ئەناسێ، تۆ ئەبێ شووی پێ کەیت.

- من هەرگیز شووی پێناکەم.

"عەمە" ساتێ بێدەنگ مایەوە، کاتێ دەستی کردەوە بە قسە دەنگی نەرمتر بوو، بەڵام "لالا" هەر لەسەر قسەی خۆی بوو.

- من تۆم وەک کچی خۆم بە خێو کردوە و خۆشم ئەوێیت، بەڵام تۆ ناسزام پێ ئەڵێیت.

"لالا" بە تووڕەییەوە بۆ "عەمە"ی روانی، بۆ یەکەمین جار وایزانی درۆی لەگەڵ ئەکات.

- بەلامەوە گرینگ نیە، نامەوێ شوو بەو پیاوە بکەم، ئەو دیاریە مەسخەرانەیشم ناوێ.

"لالا" بە توندی لە ماڵ دێتە دەرەو بەرەو دەریا مل ئەنێ. بەڵام وەک جاران لە کوێرە ڕێگاکەدا ڕاناکات، بە ئەسپایی سەر ئەکەوێ. ئەمڕۆ هەموو شت گۆڕاوە، هەموو شت لێڵ ئەنوێنێ.

"لالا" بە دەنگی بەرز ئەڵێ: «ئەبێ بڕۆم.» بەڵام خێرا تێئەگات کە تەنانەت نازانێ روولەکوێ بنێ. لە تەپۆڵکە لمەکان تێئەپەڕێ و لە ساحل بە دوای "نوعمان"ی پیردا ئەگەڕێ.

زۆری پێخۆشە وەک هەمیشە لەو شوێنە بێت، لە سەر بنی دار هەنجیرەکە خەریکی دروست کردنەوەی تۆڕەکە بێت.

هەموو چەشنە پرسیارێکی ئاراستە ئەکات. سەبارەت بە شارەکانی "ئیسپانیا" بە ناوە سیحراویەکانیانەوە. سەبارەت بە "ئەلجەزیرە"، "مالاگا"، "گرانادا"، "ترۆل"، "ساراگۆزا"، کەشتیەکان کە بە ئەندازەی شارێکی گەورە ئەبن لە بەندەرەکان وەرێ ئەکەون، سەبارەت بە شەقامەکان کە ئوتوبوسەکانی بەرەو باکوور دەئاژون، قەتارەکان و فرۆکەکان. ئەیەوێ بۆ ماوەی چەندین سەعات لە کێوە بەفراویەکان بدوێ، لە تۆنێل و چەمەکان کە بە ئەندازەی دەریایەک گەورەن.

کێڵگەکانی گەنم، دارستانە پان و بەرینەکان. بە تایبەت شارە بۆن خۆشەکان و کۆشکە سپیەکانی کلیساکان، دووکانەکان کە سیخناخ لە رووناکی، ئەدرەوشێنەوە. لە "پاریس" و "مارسێی" هەموو کۆڵان و ماڵەکان کە ئەونە بەرزن ئاسمان بە سەختی ئەبینرێ. باخ و کافە و ئوتێل و چوار ڕێکان کە خەڵکی هەموو دونیا لەوێدا ئەبینرێن.

بەڵام ماسیگرە پیرەکە پەیدا ناکات. تەنیا گاکیە سپیەکە بە ئەسپایی باڵی گرتوەتەوە، خۆی بە دەستی "با"وە داوە و لە ئاستی سەر ئەوەوە ئەفڕێ.

"لالا" ئەقیڕێنێ: ئوهۆ، پادشا!

باڵندەکە چەن جارتر ئەسووڕێتەوە و بە توندی دوور ئەکەوێتەوە و "با" هاوتەریبی چۆمەکە لەگەڵ خۆی ئەیبا. "لالا" ماوەیەکی زۆر لە ساحل ئەمێنێتەوە. تەنیا ویژەی "با" و لرفە لرفی دەریا لە گوێیدایە.

رۆژانی دوایی، له ماڵی "عەمە" کەس قسەی لێناکات، پیاوە کۆت و شەڵوار لەبەرەکەیش نەگەڕایەوە. رادیۆ ترانزیستوریەکە خراپ ببوو، خۆراکی ناو قوتوەکانیش هەموو خورا. تەنیا ئاوێنە بەرقیەکە لە ناو پلاستیکەکە لە سەر زەوی لای دەرگاکە دانراوە. "لالا" خەوی لێ شێواوە بە هەر سرتەیەک رائەچڵەکێ، بە سەر هاتی ئەو کچانە دێتەوە یادی کە نەیانویستبوو شوو بکەن بە زۆر دزی بوونیان. هەر رۆژ لەگەڵ هەڵهاتنی خۆر بەر لە هەموو کەس خۆی ئەگەیەنێتە سەر کانی بەم جۆرە ئاگای لە هاتووچوەکانی "سیتە"یە.

"با"ی بەدبەختی بۆ چەند رۆژ بێوچان هەڵئەکات. "با"یەکی سەیرەکە هەموو ساڵێ، جارێ یان دووجار لە ئاخری زستان یا پاییزدا هەڵئەکات. سەیر ئەوەیە کە لە پێشەوە کەس هەستی پێناکات، بە ئەسپایی دێت، هەندێ جار بە تەواوەتی ئەکوژێتەوەو لە بیر ئەچێتەوە، وەک "با"ی تۆفانکە لە ناوەڕاسی زستاندا هەڵئەکات ساردنیە، کاتێ دەریا شەپۆلە توورەکانی لە ئاسمان ئەکوتێ. وەک "با"ی بیابانیش داخ و وشک نیە، کە وەک شۆڵەیەکی سوور بە سەر ماڵەکانەوە بگرێ و سەر بانەکان لم باران بکات.

"با"ی بەدبەختی وانیە، "با"یەکی زۆر ئارامە کە ئەسووڕێتەوەو تۆف و کرێوە ئەکات و بە سەر بانی ماڵەکانەوە و بە سەر شان و سینەی مرۆڤەکانەوە قورس ئەنیشێتەوە.

کاتێ دێت، هەوا قورس و گەرمە، ئەڵێی هەموو شت تاریک و ماتە. بە هاتنی هەموو نەخۆش ئەکەون، بە تایبەت منداڵە بچووکەکان و پیرەکان، ئەمجا بەرە بەرە ئەیانکوژێ. بۆ ئەوەیە پێی ئەڵێن: "با"ی بەدبەختی. کاتێ ئەمساڵ لە سەر "سیتە" هەڵ ئەکات، "لالا" خێرا ئەیناسێتەوە، گەردەلوولی تەپ و تۆزێکی خۆڵەمێشی ئەبینێ کە لە سەر دەشتەکەوە نزیک ئەبێتەوە، دەریا و جەمسەری چۆمەکە ئەهەژێنێ، بەو گەرمایە خەڵک خۆیان لە پاڵتۆکانیاندا ئەپێچن ئەمجا دێنە دەر. ئیتر زەردەواڵەکان دیار نین، سەگەکانیش خۆیان داشاردوە، پۆزەیان کردووە بە ناو چاڵەی بەر ماڵەکاندا.

خەم بەر بینی "لالا"ی گرتوە، بیر لەو شتە ئەکاتەوە کە "با" لەگەڵ خۆی هێناویەتی. کاتێ ئەبیسێ کە "نوعمان"ی پیر نەخۆش کەوتوە، دڵی ئەگوشرێ. بۆ ساتێ هەناسەی هەڵنایەت. هەرگیز وای لێ نەهاتووە. بۆ ئەوە نەکەوێتە سەر زەوی دائەنیشێ، ئەمجا تا ماڵی ماسیگرەکە هەڵدێ. لای وایە ئێستا خەڵکێکی زۆر، بۆ یارمەتیدانی لە دەوری کۆبوونەتەوە و ئاگایان لێیەتی.

بەڵام "نوعمان" تەنیایە، لە سەر حەسیرەکە راکشاوە و سەری لە سەر باڵی داناوە، لە تاو لەرز ددانی تەقەی دێت.

کاتی "لالا" ئەرواتە ماڵەوە، ئەو تەنانەت ناتوانێ لە سەر ئەنیشکی خۆی راگرێ، کە "لالا" ئەناسێتەوە بزەیەکی دێتە سەر لێوی و چاوەکانی زۆرتر ئەگەشێنەوە... چاوەکانی هێشتا بە رەنگی دەریایە، بەڵام روخسارە لاوازەکەی سپیەکی مەیلەو خۆڵە مێشیە، کە جێگای ترسە.

"لالا" دائەنیشێ و بە دەنگێکی نزم ئەکەوێتە قسە کردن. جاران نوعمان چیرۆکی ئەگێرایەوە، بەڵام ئەمرۆ هەموو شت گۆڕاوە، "لالا" لە هەموو شت ئەدوێ، ئەیەوی نیگەرانی و ئازارەکەی برەوێتەوە و گەرماو ئومێدی پێ ببەخشێ.

سەبارەت بە سەفەرەکانی لە شارەکانی "ئیسپانیا" و "فەرەنسە" ئەدوێ کە خۆی بۆی گێرابوەوە.

بە شێوەیەک ئەیگێرێتەوە کە ئەڵێی ئەو شتانە خۆی دیویەتی و سەفەری کردوە.

شەقامەکانی "ئەلجەزیرە"، شەقامە تەنگ و پێچەکانی نزیک بەندەر، لەویاکە سیخناخە لە بۆنی ماسی و دەریا. وێستگەکانی بەندەر کە بە ئاجۆری شین داپۆشراون، پردە گەورەکانی جادە ئاسینەکان کە لە چۆم و کەناوەکان تێئەپەرن. لە شەقامەکانی "کەدیز" ئەڵێ، باخە پڕ لە گوڵە رەنگا و رەنگەکان، دارخورما گەورەکان کە لە بەر کۆشکە سپیەکاندا ریچکەیان بەستوە، باسی شەقامەکان دەکا کە خەڵک بەماشینی رەش و ئوتووبووسەوە دێن و دەچن، لە نێوان شەوق دانەوەی ئاوێنەکاندا و لە بەر خانوەکاندا کە وەک کێوی مەرمەرین هەڵچوون. لە شەقامی شارەکان ئەدوێ،

ئەڵێی خۆی لێیان ڕەدبوە: "سیویلا"، "گوردوبا"، "گرانادا"، "ئالمارن"، "بوَلدوَ"، "ئارانجو"، شارێکی هێندە گەورە کە ئینسان ماوەی چەن ڕۆژ تیایدا بزر ئەبێت، "مادری"کە خەڵکی هەموو دونیای تیایە.

"نوعمان"ی پیر بێ ورتە گوێ لە "لالا" گرتووە بەڵام چاوەکانی بروسکەی دێت، "لالا" ئەزانێ کە ئەو گوێ گرتنی ئەو چیرۆکانەی پێ خۆشە. کاتێ بێ دەنگ ئەبێ، جەستەی پیرە مێردەکە ئەکەوێتە لەرزە، هەناسەی سیخە سیخی پێ کەوتووە، "لالا" خێرا دەست ئەکاتەوە بە قسەکردن بۆ ئەوە ئەو دەنگە دڵتەزین و سامناکانە نەبیسێ.

ئێستا قسەی شاری گەورەی "مارسێی" ئەکات. بەندەری لەنگەرگە گەورەکان کە کەشتی هەموو وڵاتەکانی دونیای لێ بەسراوەتەوە، کەشتیە باربەرە گەورەکان کە هێندەی قەڵایەکی گەورەن، دەکەڵە بەرزەکان کە لە درەختەکان گەورترن، کەشتیە بازرگانیە سپیەکان کە هەزاران پەنجەرەیان هەیە، بە ناو و پەرچەمی سەیر سەیرەوە ناوی شارەکانیان پێوەیە، "ئودیسا"، "ریگا"، "برگن"، "لیمازل".

لە شەقامەکانی "مارسێ"دا خەڵک بە پەلە دێن و دەچن، شان لە شانی یەکتر ئەدەن. لەبەرکافەکان، رستوران و سینەما و ماشینە رەشەکان، لە شەقامەکاندا کە ئەو سەری دیار نیە، رێ ئەبڕن. شەمەندەفەرەکان لە سەر پردە هەواییەکانەوە تێئەپەڕن، فڕۆکەکان لە زەوی بەرز ئەبنەوە و بە ئەسپایی لە ئاسمانە رەنگ خۆڵەمێشیەکەدا ئەسووڕێنەوە. کاتێ نیوەڕۆ، زایەڵەی ناقوسی کلیساکان لە درێژای شەقامەکان، لە سەر گۆڕەپانەکان و قووڵایی تونێلە ژێر زەوینیەکاندا دەنگ ئەداتەوە.

شەو، شار رۆشن ئەبێ، چرای ماشینەکان چاو ئەتروکێنن. کۆڵانە تەنگەکان خامۆش و بێدەنگن دز و تاڵان کەرەکان بە چەقۆی ئەمریکاییەوە، لە سووچی دەرگاکاندا خۆیان لە رێبوارە بە جێماوەکان داگرتوە هەندێ جار لە زەویە بایرەکاندا، یان لە سەر لەنگەرگەکە، لە پەنای کەشتیە باربەرە لەنگەرگرتووەکاندا شەڕێکی قورس رووئەدات.

"لالا" ماوەیەکی زۆر ئەدوێ، دەنگی هێندە نەرمە "نوعمان"ی پیر ئەخەوێنی، کاتێ لە خەودایە، جەستەی نالەرزێ و هەناسەیشی رێک و پێکە. "لالا" ئیتر ئەتوانێ بێتە دەرەوە. رووناکی زۆری رۆژ چاوی دێنێتە ئێش، خەڵکێکی زۆر لە "با"ی بەدبەختی ئازار ئەکێشن. فەقیرەکان، ساواکان، کاتێ لەبەرماڵەکانیانەوە تێئەپەڕێ ناڵە و هاوارەکانیان ئەبیسێ، شین و گریانی ژنەکان، گریانی منداڵەکان، بڵێی لەویاش یەکێک مردبێ؟! خەم بەریینی گرتووە، ئەیەوێ بڕوا، دوور کەوێتەوە، تا ئەو بەر دەریا تا ئەو شارانەی کە بۆ "نوعمان"ی باس کردبوو. بەڵام پیاوەکۆت و شەلوار خۆڵەمێشیە مەیلە و سەوزەکە دێتەوە. رەنگە نەزانێ کە "با"ی بەدبەختی لە سەر سیتەی دارین و لۆحی قیرتاویدا، هەڵی کردوە! لە هەر حاڵدا بۆ ئەو گرینگ نیە. چونکە "با"ی بەدبەختی لە و جۆرە کەسانە نزیک نابێتەوە، ئەو پیاوە لە گەڵ بەدبەختی و هەژاریدا نامۆیە. پیاوە کە دێت بۆ ماڵی "عەمە"، لە بەر دەرگاکە چاوی بە "لالا" ئەکەوێ. کاتی "لالا" ئەیبینێ ترسی لێ ئەنیشێ و قیژەیەک ئەکا. دڵنیا بوو کە ئەگەڕێتەوە و هەر لەم کاتە ئەترسا. پیاوەکۆت و شەلوار خۆڵە میشیە مەیلە و سەوزەکە بە نیگایەکی سەیرەوە بۆی ئەڕوانێ. چاوەکانی وەک کەسانێکە دەستوور ئەدەن وشک و رەقە، پێستی روومەتی سپی و وشکە، ڕدێنی سەرچەناکە و گۆناکانی شینێکی تۆخ ئەنوێنێ.

دیسان چەن ساک دیاری پێیە، کاتێ لە بەر دەمیەوە ڕائەبوورێ، "لالا" خۆی ئەکێشێتەوە دواوە و بۆ ساکەکان ئەڕوانێ. پیاوەکەیش هەنگاوێ لیێ نزیک ئەبێتەوە و دیاریەکانی بو ئەگرێ.

بەڵام "لالا" بە پڕتاو خۆی گوم ئەکات، بێ ئەوە ئاوربداتەوە، تا کاتێ کە لە کوێرە ریگاکەی بەرە و تەپۆڵکە بەردینەکاندا هەست بە لمی ژێر پێی ئەکات.

نازانێ کوێرەریگاکەکەی دوایی پێ دێ، چاوەکانی پڕن لە فرمێسک، دڵی گووشراوە، تا ئەتوانی بە توندی هەڵدێ، لێرە هەمیشە هەتاو بە هەمووهێزەوە ئەدرەوشێتەوە، ئەڵێی لە ئاسمان نزیکترە، بەڵام "با" قورسەکە لەسەر تەپۆڵکە رەنگ ئاجۆری و گەچیەکە هەڵ ناکات، بەردەکان ڕەق و شەقار شەقار، قوت ڕاوەستاون،

درکێ بنەگیا ڕەشەکانی داپۆشیوە، لەم لاولا خوری بزنەکانی پێوە گرساوەتەوە. تەنانەت گەڵای گیاکان وەک چەقۆ تیژن. ماوەیەکی زۆر لە نێوان تەپۆڵکەکانەوە ڕێ ئەبڕێ هەندێکیان بەرز و لێژن، لەگەڵ تاشەبەردەکانی ڕۆخی دەریاکە وەک دیوار ڕوو لە ئاسمان قوت هەڵچوون. هەندێ تریشیان لە کۆگای بەردەوردە ئەچن. ئەڵێی منداڵ دروستی کردون. هەر جاکە "لالا" دێتە ئێرە ئەڵێی لەم دونیایەدا نیە. ئەڵێی زەمان و هاماجی دەوروبەری گەورەتر بوون، ئەڵێی پرشنگی ئاگرینی ئاسمان هاتوەتە ناوسیەکانیەوە و واڵاتری کردوون. جەستەی لە هی مێردەزمەیەک ئەچێ کە ماوەیەکی زۆر بە ئارامی ژیاوە.

بە ئەسپایی بە درێژای سێڵاوگە وشکەکەدا سەر ئەکەوێ، بەرەو فەلاتە بەردینەکە، بەرەو ژوانگەی "ئێس سێر" مل ئەنێ.

خوێشی نازانی بۆ ملی ئەو ڕێگەیەی گرتووە، ئەڵێی دوو "لالا"یە، یەکێکیان کە هۆی هاتنەکەی نازانێ و توورەیی و نیگەرانی کوێری کردووە و لە دەست "با"ی بەدبەختی هەڵهاتووە، ئەویان کە ئەزانێ و ڕێگای جێژوانی "ئێس سێر"ی گرتووەتەبەر و بەرەو فەلاتە بەردینەکە سەر ئەکەوێ. مێشکی خاڵیە، تێناگات، پێ ڕووتەکانی، جێ پێ کۆنەکانی کە "با" و هەتاو هێشتا پاکیان نەکردوەتەوە، ئەدۆزێتەوە. بە ئارامی بەرەو فەلاتە بەردینەکە سەر ئەکەوێ. هەتاو ڕوخسار و سەر شانەکانی ئەسووتێنێ، بەڵام گوێی پێنادات. ڕووناکیە ئازادەکە بیرەوەریەکەی ئەشواتەوە، وەک بەردێکی سپی پاکی ئەکاتەوە. ڕووناکیەکە "با"ی بەدبەختی ئەشواتەوە، نەخۆشین و نەفرەتەکە ئەسوتێنێ. "لالا" ڕێ ئەبڕێ، چاوەکانی لە بەر بریسکەی ڕووناکیەکە قوونجاندوە. کراسەکەی لە ئارەق نووساوە بە سک و سینە و پشتیدا. ڕەنگە هەرگیز هێندە ڕووناکی نەدیتبێ. "لالا" هەرگیز هێندە تینوی ڕووناکی نەبووە. ئەڵێی لە قووڵایی دۆڵێکی تاریکەوە هاتووە، کە تاریکی و مەرگ بە سەریا زاڵ بوون. هەوا لێرە جمەی نایەت. بەڵام لە سەر گۆرەپانەکە ئەلەرێتەوە، ئەڵێی دەنگی شەپۆلەکانی نوور دێت. مۆسیقایەکی سەیر کە لە ئاوازی هەنگەکان ئەچێت.

کاتێ ئەگاتە سەر پانتایی فەلاتی بیابان، "با" دیسان شالاوی بۆ دێنێ، ئەیلەرزێنێ، "با"یەکی سارد و رەق کە وەستانی بۆ نیە، پاڵی پێوەئەنێ، جلەکانی کە شەلاڵی ئارەقن، لەرزی پێ ئەکات.

رووناکی بە شەوارەی ئەخات، رووناکی لە "با"دا ئەبرسکێتەوە، لە سەر ئاستی تاشەبەردەکانەوە، ئەستێرەکان پرژ و بڵاو بوون. ئێرە نەگیای لێیە، نەدرەخت و نە ئاو، سەدان ساڵە هەر رووناکی و "با" لێرە دەسەڵاتدارە، نە جادەی هەیە، نە جێ‌پێی مرۆڤ بە دی ئەکرێ. "لالا" بێ‌ئامانج لە ناوەڕاسی فەلاتەکە، کە پڕ لە دوپشک و خشخشۆکەیە رێ ئەبڕێ. تەنانەت شوانەکانی بیابانیش بۆ ئێرە نایەن. کاتێ حەیوانەکان مل ئەنێن و بۆ ئێرە دێن، بە فیکەکێشان و هاوێشتنی بەرد ئەیانگەڕێننەوە. "لالا" بە ئەسپایی رێ ئەکات. چاوی قوونجاندوە و نووکی قاچی ئەنێتە سەر بەردە داخەکان. ئەڵێی لە دونیایەکی دیکە دایە.

ئەچێتە پێشەوە، بەڵام دڵی لای خۆی نیە، ئەڵێی هەموو وجوودی لەبەر دەمیایەتی، لە بینایدا، لە گوێ‌ڕایەڵیەکەیدا، تەنیا جەستەی لە دواوەیە، لەسەر تاشەبەردەکان بە جێ ماوە.

بێ سەبرانە چاوەڕوانی کەسێکە، کە ئەبێ هەر ئێستا بێت، ئەزانێ کە ئەبێ بێت، هەر لەو کاتەوە کە لە دەست پیاوە کۆت و شەلوار خۆڵەمێشیە مەیلە و سەوزەکە رایکرد، هەر ئەو کاتە لە مەرگی "نوعمان"ی پیر هەڵهات ئەیزانی کە لە سەر فەلاتە بەردینەکە بە تەمایەتی، لەویاکە هیچ مرۆڤێکی تیا نیە.

جەنگاوەرێکی جل شینی بیابانە کە "لالا" تەنیا روانینە نادیارەکەی ئەناسێ کە وەک شەپۆلە. لە ئاستی بەرزترین تەپۆڵکەکانی بیابانەوە سەیری ئەکات، نیگای، رێک تا ئێرە رایئەکێشێ. ئێستا لە ناوەڕاسی فەلاتە گەورەکە بێ جووڵە ماوەتەوە. لەو دەوروبەرەدا تەنیاکۆگای بەردە وردەکان و پزیسکی رووناکی هەیە و ئەم "با" سارد و رەقە و ئاسمانێکی سەختی بێ‌هەور و تەم و مژە.

"لالا" لە سەر بەردەڕێژی لێژاییەکە، بێ‌جووڵە ماوەتەوە. بەردەڕێژێکی رەق و

وشک کە تنۆکی ئاویش بە خۆیەوە ناگرێ. بروسکەیەک لێی ئەدا، بە سەر تەوێڵیەوە ئەلەرزێ، بە سەر سینە و سکیدا ئەبزوێ، برووسکە کە نیگایەکە کە سەیری ئەکات. بێ گومان جەنگاوەرە شینەکە هاتووە. نابێ لەمە دێرتری کردبێ، "لالا" پێی وایە دەنگی هەنگاوەکانی لە سەر تەپ و تۆزەکە ئەبیسێ، دڵی ئەکەوێتە خورپە خورپ، گەردەلوولی رووناکیە سپیەکە دایئەپۆشێنێ، بروسکەکانی بە دەور لاقەکانیدا لوول ئەدات، لەگەڵ قژیا تێکەڵ ئەبێ، هەست ئەکا زمانە زبرەکەی و لێو و پێڵوەکانی ئەسووتێنێتەوە. فرمێسکە سوێرەکانی لە سەر گۆناکانیەوە ئەچۆڕێتە ناو دەمی ئارەقێکی سوێر تنۆک تنۆک لە ژێر باڵیەوە تا ئێسقانەکانی ناو شانی رێچکە ئەبەسن.

جەنگاوەر شینەکەی بیابان ئەبێ هاتبێ. نیگا ئاگرینەکەی وەک شۆڵەی هەتاو سوتێنەرە. "لالا" لە نێوان فەلاتی بیابان، بەسەر بەردە رێژەکەوە، تۆزێ چەماوەتەوە. "با" ساردەکە ئەیسووتێنێتەوە.

"با"یەکی سامناک کە پێی خۆش نیە مرۆڤەکان زیندوو بن. ئەیانرزێنێ و ئەیانکات بە خۆڵی ورد. ئەم "با" هەر دووپشک و هەزار پێی و مارمیلک و مارەکانی خۆش ئەوێ ولەوانەیە رێویە پێست سووتاوەکانیش، بەڵام "لالا" سڵی لێ ناکاتەوە. چونکە دڵنیایە، لە جێگایەکدا، لە بەین بەردەکاندا، یان لە بێخی ئاسماندا نیگای پیاوە شینەکە هەیە، "ئێس سێر"، نهێنی، چونکە شاریاوەیە و نابینرێ. دڵنیایە کە هاتووە و بینایی تا ناخی ئەم رۆچووە، هێزی راوەستان لە بەرانبەر پیاوە کوت و شەڵوار لە بەرەکەی پێداوەو راوێستان لە بەرانبەر مەرگێکدا کە نزیک "نوعمان"ی پیردایە.

هێزێکە ئەیکاتە باڵندەیەک و ئەیهاوێتە ناو ئاسمانەوە، رەنگە ئەو کاتە بگاتەوە بە گاکیە گەورە سپیەکە، کە پادشایە و بێ ماندوو بوون لە ئاستی سەر دەریادا باڵ ئەگرێتەوە.

کاتێ بەم دەگا، گەردەلوولێ لە ئاستی سەر دەریا، وەک شەپۆلی رووناکی لوول ئەخوات. نیگای "ئێس سێر"، سووتێنەرترە لە شۆڵەی ئاگر، رووناکیەکی شین و ئاگرین وەک بروسکەی ئەستێرەکان.

"لالا" بۆ چەند ساتێ هەناسە ناکێشێ، چاوەکانی زاق ئەڕوانن، لە ناو خۆڵەکە هەڵئەتروشکێ، چاوی ئەقوونجێنێ و سەری وەرئەچەرخێنێ، هەست بە قورسیەکی سامناک لە رووناکیەکەدا ئەکات، قورسیەکە ئەخزێتە ناخی ئەم و وەک بەردێک قورسی ئەکات.

ئەو بێسرتە هاتووە، لەسەر بەردەڵانە تیژەکەوە خزاوەتە ئێرە. جلەکانی وەک جەنگاوەرانی پێشووی بیابانە و پاڵتۆیەکی گەورەی لە خوری سپی لەبەردایە و دەمامکی شینی هەڵبەستوە. "لالا" بە هەموو هێزیەوە چاوی تێبڕیوە، کە بەرەبەرە دێتە ناو خەیاڵەکەیەوە. دەستە نیلی کراوەکانی ئەبینێ و رووناکیەک کە نیگا خەمینەکەیەوە هەڵئەقوڵێ، ورتەی لێوە نایەت. ئەو هەرگیز قسە ناکات. بە نیگای ئەدوێ، چونکە لە دونیایەکدایە کە نیازی بە وت وێژنیە. لە دەور پاڵتۆ شینەکەی گەردەلوولی رۆشناییەکی زێڕین هەیە، ئەڵێی "با" شەپۆلی لمەکە ئەهەژێنێ، بەڵام "لالا" هەر خورپە خورپی دڵی ئەبیسێ کە توند و دوورە. "لالا" نیازی بە قسە و پرسیار نیە. تەنانەت نایەوێ بیریش بکاتەوە. بە چاوی بەسراوە لە ناو خۆڵەکەدا هەڵئەتروشکێ، هەست بە نیگای پیاوە شینەکە ئەکاکە بۆی ئەڕوانێ، گەرمایەک کە ئەخزێتە ناو جەستەی و یەک بە یەکی ئەندامانی لەشی ئەلەرزێنێ و ئەمە خۆشیەکی لە رادەبەدەرە.

گەرمای روانینەکەی هەموو کونج و قوژبنێ ئەگرێ، ئازار و یاوو خوێنە دەڵەمە بووەکەی ئەتارێنێ، هەموو ئەو شتانەی کە ئەبێ بە هۆی نەخۆشین.

"ئێس سێر" نابزوێ، لە بەردەمیا وەستاوە. شەپۆلی رووناکی لە دەوریدا لوول ئەخۆن و ئەخزێنە جەستەیەوە. چی ئەکات؟ "لالا" ناترسێ، هەست ئەکا گەرما و تینەکەی بەرفراوانتر بووە، ئەڵێی بروسکەکان لە روخساریەوە تێئەپەڕن و هەموو جەستەی رۆشن ئەکەنەوە. ئەو شتەی کە لە بینایی پیاوە شینەکە دایە، ئەیبینێ. لە دەوروبەریایەتی، لە بێ نەهایەتدا، بیابان کە شەپۆل ئەدا و ئەبریسکێتەوە، پۆلی شەپۆلەکان،شەپۆلی ئارامی تەپۆڵکەی لمەکان کە بەرەو نەناسراوەکە پێش ئەڕۆن، شارە سپیەکان و بورجەکان کە وەک تەنەی دار خورماکان باریکن، کۆشکە

سوورەکان کە بە لق و گەڵاو گیای خزۆکە داپۆشراون، گـوڵە زەبـەلاحەکـان. دوو رووباری ئاوی شین وەکوو ئاسمان، ئاوێکی گەلێ جوان و خاوێن کە وێنەی پەیدا نابێت. "لالا" خەو ئەبینێ، چاوی قوونجاوە، سەری بەرز کردوەتەوە و بە دوو دەستی ئەژنۆکانی گرێ داوە. خەوێ کە لە جێگایەکی دیکەوە دێت، کە ماوەیەکی زۆر پێش لەو، لە سەر فەلاتە بەردینەکە بووە، خەوێ کە ئەمیش ئەچێتە نـاوی و لە بـەر دەمـیا ساحلەکەی ئاوەڵا ئەکات.

ئەم جادە رێگای کوێ ئەگرێ؟ "لالا" نازانێ بۆ کۆی ئەڕوا، لە رێگا بـە دەر بووە، "با"ی بیابان لەگەڵ خۆی ئەیبا و برێ جار پێڵوو لێوەکانی ئەسووتێنێ، کوێری ئەکات و ئازاری ئەدا. بـرێ جـاریش سـاردو ئـارامـە. "بـا"یـەک کـە مـرۆڤەکـان ئەپووکێنێتەوە، بەردەکانی داوێنی تاشەبەردی قەراخەکان ئەروخێنێ.

"با" بەرەو بێ نەهایەتی ئەبا، بەرەو ئاسۆ، ئەوبەر ئاسمان، تا بـورجـە ئـاسمانیە سەهۆڵ بەستووەکان، بەرەو کاکێشانی رێی شیری، تا هەتاوی ئەبا. "با" تا سەر جادە بێ‌بنەتاکە ئەیبات، تا سەر فەلاتە بەردینە پان و بەرینەکان کە رووناکی زاڵە بە سەریدا.

بیابان کێڵگە بێ‌بەرەکانی، بە رەنگی لم و شەقار شەقار، کە وەک پێستی مردوو پڕ لە چرچ و لۆچن، ئاوەڵا کردوەتەوە. بینایی پیاوە شینەکە، لەو شوێنە و لە هەموو جێگایەک، تا ئەوپەڕی ئاستی بیابان ئەبڕێت و هەر بە هۆی نیگای ئەوەوە "لالا" ئەم رووناکیە ئەبینێ، هەست بە گڕ و تینی نیگای بەسەر پێستیەوە ئەکات لە تـاو "بـا" و وشکی لێوەکانی تام و بۆنی خوێ ئەدەن. تارمایی تەپۆڵکەی لمەکان ئەبینێ، حەیوانە زەبەلاحە خەوتووەکان، دیوارە بـەرزە رەشـەکـانی "ئـامادا" و پـانتایی شـارە وشـک هەڵاتوەکەی زەویە سوورەکە. ولاتێکە کە مرۆڤی نیە، شاری نیە و هـیچ شـتێ کـە راوەستی و سافی پانتایەکە تێک شێوێنێ.

تەنیا بەرد و لم و "با" بوونی هەیە، بەڵام "لالا" هەست بە بەختەوەری ئەکات، چونکە هەمووشت ئاشنایە و ئەیناسێتەوە. یەکبەیەکی کونج و قـوژبنی دیـمەنەکـە، یەک‌بەیەکی دەوەنەسووتاوەکانی دۆڵە هەراوەکە ئەناسێتەوە. ئەڵێ پـێشتر رێگـای

کەوتوەتە ئەوێوە، خوێ قاچی سووتاندوە، چاوی ماقی ئاسۆ بووە، چڵە شکاوەکان و دەوەنەکان لە "با" دائەلەرزن.

چاوەڕوانە، لێی ڕوونە بەزووی ئەگاتە جێ، ئێستا زۆر نزیکە، نیگای پیاوە شینەکە لە ناوشەقارەکانی زەوی، لە ناوکارێزەکان و لە درێژای سێڵاوەگە و شکەکان لە گەڵ خۆی ئەیبا. ئەمجا لەپڕ ئاوازە سەیرەکە ئەبیسێ، ون و کپ کە لەدوورەوە ئەلەرزێ. ئەڵێی لە لمەکانەوە هەڵئەقووڵێ و لەگەڵ "با" لەرزۆکە بێ و چانەکەی سەر بەردەکان و لەگەل دەنگی ڕووناکی تێکەڵ ئەبێ.

ئاوازەکە لە ناخی "لالا" دائەلەرزێ، ئەیناسێتەوە، ئاوازەکەی "لالاحەوا" یەکە "عەمە" ئەیوتەوە.

«ڕۆژێ، ئای ڕۆژێ، قاڵاوە ڕەشە سپی ئەبێت، دەریا وشک ئەبێت، هەنگوێن لە ناو گوڵی کاکتوس‌دا دەردێ، نوێن لە لقەکانی گوڵی ئاقاقیا ساز ئەکەن...»

بەڵام ئیتر وشەکان نابیسێ، ئێستا کەسێکی دیکە لە زۆر دوورەوە گۆرانی ئەڵێ، بەزاراوەی "شلۆ"، ئاوازەکە لە دوورەوە ڕاستەوخۆ بەرەودڵی ئەم دێت. گەرچی پێڵوەکانی توند قوجاندووە، چاوی پڕ ئەبێ لە فرمێسک. مۆسیقاکە ماوەیەکی زۆر دەوامی هەیە. "لالا" هەمووی شارە سوورەکەی ئەو پەڕ دۆڵە هەراوەکە ئەبینێ. لە ڕاستیدا لەو شارانە ناچێ کە ئەیناسێ، کە شەقام و خانویان هەیە.

شارێکی گڵینەیەکە زەمەن وێرانی کردووە و "با" رزانـدویەتی، وەک مـاڵی مۆریانە و هەنگەکان. ڕووناکی سەر شارە سوورەکە جوان و دڵبزوێنە. ڕووناکیەکە وەک گۆمەزێکی نەرم‌لە ئاسمانی هەمیشە کازیوەدا ڕوون و خاوێنە.

خانوەکان سەر چاوەی ئاوەکەیان ئاپوورە داوە، چەن داری بێ‌جووڵە و ئەقاقیا سپیەکان وەک پەیکەر قوت وەستاون. بە تایبەت "لالا" قەبرە سپیەکە چاو ئەکات کە لە سەر زەویە سوورەکە وەک هێلکەی پاک کراو ئەنوێنێ. ئەڵێی لەوێوەیە کە ڕۆشنایی نیگاکە دێت. "لالا" ئەزانێ کە پیاوی شین لەویایە. شتێکی تێکرا سامناک و جوانە کە "لالا" هەستی پێ‌ئەکات. ئەڵێی لە ناخیدا شتێ لەت لەت ئەبێ و تێک

ئەشکێ، ئەبێ بە هۆی ڕەدبوونی مەرگ، ڕەدبوونی نەناسراوەکەوە بێت. سووتاوی بیابان لەودا بڵاو ئەبێتەوە، بە دەمارەکانیدا سەر ئەکەوێ و لەگەڵ هەناوەکانیدا تێکەڵ ئەبێت. بینایی "ئێس سێر" سامناکە و ئازاری ئەدا. چونکە لە بیابانەوە، ئازار و بر سیەتی و ترس و مەرگ دێن، کاتێ دێن، تێک دەشکێن، ڕۆشنایە جوانە زێڕینەکە، شارە سوورەکە و قەبرە سپی و سووکەکە کە ڕووناکیە نا ئاساییەکە لەوێوە سەر چاوە ئەگرێ. بەدبەختی و نیگەرانی و وەیلانیش لەگەڵ خۆیان دێنن.

نیگایەکی ماوەداری پڕ لە چەرمەسەری دێت، چونکە زەویە ڕەقەکە و ئاسمان، مرۆڤەکانیان ناوێ. "لالا" بێجووڵە ماوەتەوە. ئەژنۆکانی ئەشکێن، هەتاو سەر شانە و پشتە ملی ئەسووتێنێ. چاوی ناکاتەوە، فرمێسکەکانی بە دوو ڕێچکەدا ئەچۆڕێتە خوارەوە. خۆڵی سوور نوساوە بە سەر گۆناکانیەوە. کاتێ سەری بەرز ئەکاتەوە و چاوی ئەکاتەوە، بینایی تێک چووە، هەوڵ ئەدا دیمەنەکان لە جێی خۆیان ببینێ، تارمایی تەپۆڵکەکان دەرئەکەون، ئەمجا پانتایی فەلاتەکە، کە نە گیای لێیە، نەدرەخت، تەنیا ڕووناکیە و "با". هەنگاو هەڵئەگرێ، بە تلاوتل لە کوێرەڕێگاکە دائەگەڕێ، بەرەو دۆڵەکە، بەرەو دەریا و بەرەو "سیتە"ی تەختە و لۆحینەکە ئەڕوا.

سێبەرەکان ئێستا درێژن، هەتاو نزیک ئاسۆیە، "لالا" هەست ئەکات هەتاو ڕوخساری ئاوساندووە وائەزانێ کەس نایناسێتەوە، وەک "ئارتانی" لێهاتوە.

کاتێ ئەگاتە جەمسەری چەمەکە، لە "سیتە" شەو داهاتوە، گڵۆپەکان خاڵ گەلێکی زەردن، لەسەر جادەکە، کامیۆنەکان بە چرا ڕۆشنەکانیانەوە دەئاژوون. "لالا" تاوێ ڕائەکات و تاوێ هێندە بە ئەسپایی هەنگاو هەڵئەگرێ ئەڵێی ئەیەوێ ڕاوەستێ، لە خانوە تەختەیەکان کە جوان پێکەوە نەلکاون، ژن و منداڵەکان لە ژێر بەتانیەکاندا بە هۆی نمی شەوانەوە هێشتا گینگڵیانە. تاونە تاوێ "با" کزەکە کارتۆنە بەتاڵەکان تل ئەکاتەوە و لەتە لۆحێک تێک ئەشکێنێ. سەگەکان خۆیان داشاردوە، ئاسمانی ئاستی سەر "سیتە"، سیخناخە لە ئەستێرە، "لالا" بە ئەسپایی لە گوزەرگاکان تێئەپەڕێ. وائەزانێ لێرە کەس نیازی بەو نیە، بێئەو، هەموو شت تەواوە. ئەڵێی ساڵانێکی زۆرە

ڕۆیشتوە، ئەڵێی هەرگیز وجودی نەبوە.

لە جیاتی ئەوە بەرەوماڵی "عەمە" بڕوا، ڕێگای ئەو پەڕی "سیتە" ئەگرێتەبەر، لەوێ کە "نوعمان"ی پیر ئەژی و لە هەوای شێداری شەو لەرزی کردووە، ئەژنۆکانی ئەلەرزێ، لە دوێنێ شەوەوە دەمی لە هیچ نەداوە. لەو سەرەوە لە سەر فەلاتە بەردینەکە ڕۆژگار گەلێ درێژ و ماوەدار بوو، "لالا" وائەزانێ، چەندین ڕۆژ، بڵێی چەندین مانگە لەماڵ هاتوەتەدەر، ئەڵێی بە ئەستەم کۆڵانەکانی "سیتە" ئەناسێتەوە. کۆڵێتە تەختەییەکان و دەنگی ڕادیۆکان و گریانی منداڵەکان، بۆنی پیشاو و خۆڵ.

لە پڕ بیر ئەکاتەوە، ڕەنگە بە ڕاستی چەن مانگ لەوێ ماوەتەوە، بەو سەرەوە، لە سەر فەلاتە بەردینەکە؟ کەچی هەر ڕۆژێک بووە؟ ئەمجا بە یادی "نوعمان"ی پیر دڵی ئەگوشرێ، گەرچی هێزی لانەماوە لە کۆڵانەکانی "سیتە" دەست ئەکا بە ڕاکردن، سەگەکان تەپەی هەنگاوەکانی ئەبیسن و دەست ئەکەن بە حەپ حەپ، کاتێ ئەگاتە بەر ماڵی "نوعمان"، دڵی توندتر لێ ئەدات، هەناسەی سوار بووە، دەرگاکە نیوەکراوەیە، تاریکی باوەشی بە ماڵەکەدا کردووە، "نوعمان"ی پیر لە سەر حەسیرەکە ڕاکشاوە، سیخە سیخی پێ کەوتووە، چاوەکانی لە تاریکی هۆڵەکەدا زاق ئەڕوانن، "لالا" بەرەو ڕوومەتی دائەنەوێتەوە بەڵام ئەو نایناسێ، زاری کراوەتەوە. بە هەموو هێزیەوە هەوڵ ئەدا هەناسە بکێشێ. ناتوانێ زەردەخەنە لێبدات. بە ورتە ئەڵێ: «"نوعمان"... "نوعمان"» . "نوعمان"ی پیر وزەی لا نیە. "با"ی بەدبەختی لە "یاو"دا سووتاندویەتی و جەستە و سەری قورس کردووە. نەیتوانیوە زار لە خۆراکەوە بدات ڕەنگە "با" ئەیەوێ لەگەڵ خۆی بیبات. "لالا" بە نیگەرانیەوە بەرەو ڕوخساری ماسیگرەکە دائەنەوێ و ئەڵێ: «ئێستە نارۆی، ئێستا نە، هێشتا زووە؟»

ئەیەوێ "نوعمان" قسەی بۆ بکات. جارێکی دیکە چیرۆکی باڵندە سپیەکە، کە شای دەریا بوو، بۆی بگێڕێتەوە. یان چیرۆکی بەردێ کە جبرەئیلی فریشتە، بە مرۆڤەکانی دابوو و بە هۆی گوناهەکانیانەوە ڕەش ببوەوە. بەڵام "نوعمان"ی پیر ئیتر توانای چیرۆک گێڕانەوەی نیە. ئەو هەر وزەی بەرز کردنەوەی سینەی و

هەناسەکێشانی هەیە. ئەڵێی قورساییەکی نادیار بە سەریەوەیەتی. جەستە لاوازەکەی نیشتوەتە سەر ئارەقێکی پیس و پیشاو.

"لالا" ئێستا بۆ گێرانەوەی چیرۆکێکی دیکە، گەلێ ماندووە، گێرانەوەی بەسەر هاتەکانی ئەوبەر دەریا، شارەکانی "ئیسپانیا" و "فەرەنسە"، جەستەی ئەخاتە سەر زەوی و لای پیرە مێردەکە دائەنیشێ، بەدەم بیستنی سیخە سیخی هەناسەی "نوعمان"وە لە لابەلای دەرگا نیوەکراوەکەوە چاوئەبڕێتە ڕووناکی شەو.

ویژەی سامناکی "با"کەی شەو ئەبیسێ، کە قوتوە بەتاڵەکان ئەتلێنێتەوەو لۆحەکان ئەلەرێنێتەوە. پاشان بە دانیشتنەوە، سەری بە سەر ئەژنۆکانیەوە، خەوی لێ ئەکەوێ جار جار نەفەس تەنگیەکەی "نوعمان"ی پیر رایئەچڵەکێنێ، و ئەڵێ:

ـ تۆ هێشتا لێرەی، هێشتا نەرۆیشتوی؟

"نوعمان" وەڵام ناداتەوە، خەوی لێ نەکەوتوە، روخسارە خۆڵەمێشیەکەی رووەو دەرگاکە گواستوەتەوە ئەڵێی چاوە گەشەکانی ئیتر توانای دیتنیان نیە. بەڵام ئەڵێی هەست بە رووداوەکانی دەرەوە ئەکات. "لالا" نایەوێ خەوی لێ بکەوێ. چونکە نازانێ کاتێ ئەخەوێ چی رووئەدا.

وەک ماسیگرەکان کە دوور لە دەریادا، بێ ئەوە هیچ جێگایەک چاوکەن ون بوون، لە نێوان شەپۆلەکاندا دیلانێ ئەکەن و گەردەلوولی تۆفانەکە ئاپوورەیان ئەدات. ئەوان نابێ بۆ ساتێ بخەون. چونکە دەریا ئەیانگرێت و هەڵیان ئەلووشێ. "لالا" ئەیەوێ هەستێتەوە بەڵام لە ناکاو پێڵوەکانی ئەبەسرێ و بە پشتا ئەکەوێ، ماوەیەکی زۆر لەگەڵ دەنگی ئارامی هەناسەکانی "نوعمان"ی پیر مەلە ئەکات بێ ئەوە بزانێ بەرەو کوێ ئەڕوا!

بەر لە هەڵاتنی رۆژ، لە خەو رائەچڵەکێ، پیاوە پیرەکە لە سەر زەویەکە درێژ کەوتووە، روخسارە ئارامەکەی لە سەر باسکی دایە، ئێستا بێدەنگی زاڵە چونکە ئیتر هەناسە ناکێشێ، لە دەرەوە "با" هەڵناکات. ئیتر هیچ مەترسیەک نیە، هەموو شت ئارام وهێمنە، ئەڵێی هەرگیز، لە هیچ کوێ، مەرگ نەبووە.

***

کاتێ بڕیاریدا بڕوا، بە کەس هیچی نەوت. بڕیاریدا بڕوا، چونکە پیاوە کۆت و شەڵوارە خۆڵەمێشیە مەیلە و سەوزەکە چەن جار سەری لێدان و هەر جار بە چاوە بریقە دارە رەقەکانیەوەکە وەک بەردی رەش بوون بۆی ڕوانیبوو، لە سەر یەغانەکەی "لالاحەوا" دانیشتبوو و چایی نەعنای خواردبووەوە.

"لالا" لێی ناترسێ، بەڵام لێی روونە، ئەگەر دەر نەچێ رۆژێک بە زۆر پێی ئەدەن، چونکە دەوڵەمەندە و دەسەڵاتدارە و پێی خۆش نیە کەس لە بەرانبەریدا راوەستێ.

بەیانی پێش خۆر هەڵهاتن، لە ماڵ دێتە دەر. تەنانەت بۆ تارماییەکەی "عەمە"کە لە ناو مەلافەکەیدا خۆی داپێچاوە، ناڕوانێ. نانێکی رەق و چەن دەنک خورمای وشک ئەنێتە ناو پەڕۆیەکی شین و دەسبەنە زێرەکەی دایکی هەڵئەگرێ. بە ئەسپایی لە ماڵ ئەکاتە دەرەوە. بێ ئەوە تەنانەت سەگێ و خەبەر کاتەوە. بە پێی پەتی، بەسەر زەویە ساردەکەدا، لە نێوان ڕیزەماڵە خەوتوەکاندا هەنگاو هەڵئەگرێ. ئاسمان کراوەتەوە، کەمێ بێ‌ڕەنگە، رۆژ خەریکە هەڵدێ.

تەم و مژ وەک هەورێکی نەرم لە ئاستی سەر دەریاوە بەرز ئەبێتەوە و وەک باڵندەیەکی زەبەلاح باڵە چەماوەکانی بەرز ئەکاتەوە و لە درێژای چەمەکە هەڵئەگەڕێ. "لالا" ئەیەوێ بۆ دواین جار سەرلە ماڵی "نوعمان"ی پیر بدات، چونکە تەنیا کەسێکە، کەبۆ لەدەست دانی بە خەم و پەژارەیە.

بەڵام ئەترسێ بکەوێتە دێر، لە سیتە دوورئەکە وێتەوە، بە درێژای بزنەرێگاکەدا بەرەو تەپۆڵکە بەردینەکان مل ئەنێ.

کاتێ سەر ئەکەوێ، هەست بە بایەکی سارد ئەکات کە تەشەنە ئەکاتە ناو جەستەیەوە، ئێرە چۆڵە و کەسی لێ‌نیە، شوانەکان هێشتا لە ناو کۆڵیتە تەختەیەکانیاندا، نوستون، جاری یەکەمە "لالا" دێتە ئێرە بێ‌ئەوە گوێ لە فیکە فیکی شوانەکان بێت، و هەر ئەمە کەمێ ئەیترسێنێ، ئەڵێی "با" سەرزەوی چۆڵ و هۆڵ کردووە. بەڵام گزنگی

هەتاو بەرەبەرە لەو بەرتە پۆڵکەکانەوە خۆیان دەرئەخەن خاڵێکی سوور و زەردکە لە گەڵ رەنگی خۆڵە مێشی شەودا تێکەڵبووە. "لالا" بە دیتنی خۆشحال ئەبێت.

پیێ وایە بەزوویی ئەبێ بەرەو ئەوێ بڕوا، ئەویاکە زەوی و ئاسمان سیخناخە لە خاڵێکی گەورەی گزنگی بەیان، بەدەم هەنگاو هەڵنان لە سەر تاشە بەردەکانەوە، بیرو هزرەکان لە مێشکیدا گینگڵیانە.

ئەزانێ ئیتر ناگەڕێتەوە بۆسیتە، ئیتر هەموو ئەوکەسانەی خۆشی ئەوێن نایانبینێتەوە، پانتایی دەشتە بایرەکە، ڕۆخە سپیەکە، لەویاکە شەپۆلەکان یەک لە دوای یەک خۆیانی بە سەردا ئەکوتن، خەم بەربینی گرتووە بیر لە تەپۆڵکەی لمە بێبزاوتەکان ئەکاتەوە، کە هەمیشە دائەنیشت و بینای ئەگرتە سەر هەورەکان کە لە ئاسماندا تێدەپەڕین.

ئیتر باڵندە سپیەکە، شای دەریا نابینێتەوە، ئیتر تارمایی "نوعمان"ی پیر، لە سێبەری دارهەنجیرەکە، لە تەنیشت بەلەمە هەڵگەڕاوەکە نابینێ. هەنگاوەکانی ئارام ئەکاتەوە، ئەیەوی ساتێ ئاوڕ بداتەوە و بڕوانی.

بەڵام لە بەردەمیا تەپۆڵکەبێ دەنگەکان هەن، بەردە تیژەکان کە بروسکەی ڕۆشنایی هەڵئەگەڕیننەوە دەوەنە دڕکاویە بچووکەکان کە چەن تنۆک نمی ئاسمان بە سەریەوە ئەیلە ڕێنێتەوە، چەن مێشی سووک کە خۆیان بە دەست "با" وەداوە...

پاشان بێ ئەوە ئاوڕ بداتەوە ئەڕوا و بوخچەی نان و خورماکەی لە سینەی توند ئەکات.

کاتێ لە کوێرەڕێگاکە کە تێئەپەڕێ، ئیتر لە دەورو بەریدا مرۆڤێک نابینێ، بەردە تیژەکان لە زەویەوە هەڵتۆقیون. ئەبێ بەرد بۆ بەرد باز بدات، بەرەو بەرزترین تەپۆڵکەکان هەڵگەڕێ، لەویا "ئارتانی" بە تەمایەتی، بەڵام هێشتا چاوی نەکردوە، ڕەنگە لە ئەشکە و تێکدا لەوبەر تاشە بەردەکانی قەراخ خۆی داگرتبێ. لە شوێنێکدا کە ئاگای لە هەموو دوڵەکە تا دەریا ببێت، یان زۆرلیێ نزیکە لەپشت بنەگیایەکی سووتاوەوە، وەک مارێ تاملی چەقیوەتە چاڵی نێوان بەردەکان و وەک سەگێکی

وەحشی ئامادەی پەڕینە، ئامادەی ڕاکردن.

لە وانەیە ئیمرۆ ئیتر نەیەوێ خۆی دەربخات؟

بەڵام دوێنێ پیێ و بتوو کەدێت و "لالا" بە دەستی هێلێکی گەچینی پێ نیشان دابوو کە ئەتوت ئاسمانی ڕاگرتووە،لە وێوە کە بیابان دەست پێ ئەکات. ئەویش چاوی بروسکابووەوە، چونکە هەرلە منداڵیەوە بەئانوسات بیری رویشتن بەری نەدابوو، "لالا" هەر بەدیتنی شێوەی روانینی بۆ ئاسۆ بە چاوە بێجووڵەکانی لە نێوان روخسارە درێژەکەیدا، تێگەیشتبوو.

هەرگیز جوان دانانیشێ، بەڵکو بە چۆکەوەدائەنیشێ، ئەڵێی هەردەم ئامادەی راپەڕینە.

ئەو جادەی بیابانی بە "لالا"نیشان داوە، جادەیەک کە بزری ئەکات، جادەیەکە کەس هەرگیز لێ ناگەرێتەوە و ئاسمانی ئاستی سەری گەلێ پاک و جوانە.

ئێستا هەتاو وەک جەغزێکی ئاگرین لە بەردەمیا دەرهاتووە و ئەبرسیکێتەوە، لە بەردە زەبەلاحەکان سەر ئەکەوێ و هەتاو زۆرتر دەئاوسێ. هەرگیز تا ئەو ڕادەیە هەتاوی پێجوان نەبووە

گەرچی چاوی هاتوەتە ئێش و فرمێسک شۆڕە شۆڕ بە سەر گۆناکانیەوە رێ کەتوون، بێ ئەوە چاو بتروکێنێ، چاو لە هەتاو هەڵناگرێ. هەروا کە "نوعمان"ی پیر وتبوی کە پاشاکانی دەریا بەو جۆرە ئەڕوانن رووناکی تەشەنەی تێئەکات، هەموو داشاریاوەکانی جەستەی، بە تایبەت دڵی ئەگرێ.

ئێستا ئیتر لە سەر ڕێگاکە جێ پێ نابینێ. "لالا" ئەبێ خۆی لە نێوان بەردەکاندا ڕێگایەک پەیدا بکات بە سەر سێڵاوگە وشکەکاندا، لەم بەرد بۆ ئەو بەرد بپەڕێتەوە، دیواری تاشە بەردەکانی قەراخ دەریا دەور بداتەوە.

هەتاو کە سەر ئەکەوێ، لە گلێنەیدا خاڵێکی گەورەی بریقەدارە، بە هەڵکەوت ملی ڕێگای گرتوەتە بەر و بۆ ئەوە نەکەوێ کەمێ چەماوەتەوە.

یەک لە دوای یەک لە تەپۆڵکەکان تێئەپەڕێ. پاشان لە بەردەڵانەکە ڕائەبووری،

کەسی لێ‌نیە تا چاو بڕ ئەکات، هەر پانتایی بەردەڵانە ڕەقەکەیە و چەن کۆگای "فرفیون" و "کاکتوس"ەکانە.

هەتاو ئێرەی لە هەموو شتێک چۆڵ کردوەتەوە، بە هەموو هێزیەوە بە شێوەیەک ئەسووتێ و ئەڕژێنێ کە هەر بەردی سپی و دڕک لە سەر زەویەکە ماون. لەیەک ساتدا وەک بروسکە ئەسوتێنێ. ئاسمان سیخناخە لە ڕووناکی، وەک شۆڵەیەکی گەورەی شینی ئاگرین، "لالا" بۆ ئەوە بەر پێی چاو بکات چاوەکانی تەنگ ئەکاتەوە.

هەر چی هەتاو لە ئاسماندا زۆرتر سەر ئەکەوێ، شتەکانی سەر زەوی زۆرتر دەئاوسێن و سیخناخ ئەبن لە ڕۆشنایی.

لێرە هیچ دەنگێ نیە. بەڵام جار جار پێی وایە گوێی لە خرِو هووری بەردەکانە کە دەئاوسن. ماوەیەکی زۆر پێش ئەڕوا، چ ماوەیەکە؟ بێ‌گومان چەندین سەعاتە، بێ‌ئەوە بزانێ ملی لە کوێ ناوە، هەر بە پێچەوانەی درێژەی سێبەرەکەی بەرەو ئاسۆ ئەڕوا، ئەو شوێنە کە کێوە سوورەکانی لێیە و هێندە بەرزن ئەڵێی بە ئاسمانەوە هەڵواسراون، گوندەکان و چەمێک و ڕەنگە ڕووبارە ڕەنگ ئاسمانیەکانیش.

لە پڕ بێ‌ئەوە بزانێ لە کوێوە سەری دەرهێناوە، "ئارتانی" لەویایە، لە بەرانبەریدا بێ‌جووڵە ڕاوەستاوە وەک هەمیشە جلە بۆرەکانی لەبەریایەتی و سەری بە پەڕۆیەکی شین داپۆشیوە کاتێ بە دەم "لالا"وە پێئەکەنێ، ڕوخسارە ڕەشەکەی ئەگەشێتەوە.

«ئۆ، "ئارتانی"، "ئارتانی"...». "لالا" خۆی پێوە ئەنووسێنێ. بۆنی ئارەقەکەی لە ناو جلە خۆڵاویەکەیدا ئەناسێتەوە، ئەویش کەمێ نان و خورمای لە ناو پەڕۆکۆنەیەکی تەڕدا بەستوە بە لاقەدیا.

"لالا" بوخچەکەی ئەکاتەوە و لە نانەکەی بەش "ئارتانی" ئەدات، بێ‌ئەوە دانیشن، بە پەلە ئەیخۆن چونکە ماوەیەکی زۆرە برسیانە، شوانە لاوەکە چاو بە دەوروبەریدا ئەگەڕێنێ، هەموو سووچ و قوژبنی دیمەنەکە ئەتۆژێتەوە. وەک باڵندەیەکی چاو چنۆک چاو ناتروکێنێ. جێگایەکی پێ‌نیشان ئەدات. دوور لە ئاسۆ

ئەوبەر کێوە سوورەکان. لەپی دەستی ئەنێتە ژێر لێوەکانی: ئەو شوێنە ئاوی تیایە.

ڕێ ئەکەون، "ئارتانی" لە پێشەوە، خێرا و چالاک لە سەر بەردەکان ئەپەڕێتەوە. "لالا" هەوڵ ئەدات پێ لە سەر جێ پێکانی ئەو بنێ. چاو لە تارمایی سووک و ناسکی کوڕەکە هەڵناگرێ کە ئەڵێی بە سەر بەردە سپیەکاندا سەما ئەکات.

لەبەر چاویدا، وەک شۆڵەیەک، وەک زایەڵەیەکە، ئەڵێی لاقەکانی بە ئاهەنگی "ئارتانی" ئەنێتە سەرزەوی. هەتاو ئێستا توند و سوتێنەر بە سەر و شانیەوە نیشتوەتەوە و ئازار بە ناخی جەستەی ئەگەیەنێ. ئەڵێی ڕووناکیەکە لە بەیانیەوە لە ناخیدا سەقامگیر بووە و ئێستا داگرساوە و لە هەڵچووندایە.

هەست ئەکات لە درێژای لاق و باڵەکانیدا شەپۆلی درێژی بەژان سەر ئەکەون ئەچنە ڕوچنەکانی سەریەوە. گڕ و سووتانی ڕووناکیەکە وشک و خۆڵاویە. تنۆکی ئارەق بە جەستەیەوە دیار نیە. کراسە شینەکەی بە قرچە قرچی ئەلەکتریکی ئەنوسێ بە ران و سکیدا. فرمێسک لە چاویدا قەتیس ماوە دەنکە خوێ نووساون بە سوچی پێڵوەکانیەوە. زاری وشک و ڕەق هەڵاتووە، تا نووکی قامکەکانی دێنێ بە سەر لێویدا، وائەزانێ زاری وەک هی وشتر وەها ئەستوور بووە، ئەتوانێ کاکتوس و درکەکان بەبێهەست کردنی ئازار، بخوات. "ئارتانی" بێئەوە ئاوڕ بداتەوە لەم بەرد بۆ ئەو بەرد باز ئەدات. تارمایە سپی و سووکەکەی هەر دوور و دوورتر ئەبێتەوە، وەک حەیوانێک بێئەوە ئاوڕ بداتەوە بێوچان باز ئەدات. "لالا" ئەیەوێ پێی بگاتەوە، بەڵام ئیتر وزەی لانەماوە. لە ناو بەردەکاندا تلاوتل ڕێ ئەبڕێ. بەرێکەوت بینایی لە بەر پێیدا گرساوەتەوە، پێست بە قاچیەوە نەماوە. خوێنی لێ ئەچۆڕێ. لە چەند جار هەڵکەوتندا ئەژنۆکانی بریندار بوون. بەڵام هەست بە ئێش ناکات. ئەو جگە لە لێکدانەوەی سامناکی ڕووناکی هەست بە هیچ ناکات.

ئەڵێی کۆمەڵێ حەیوان لە دەورو بەریدا بە سەر بەردەکاندا هەڵئەبەزنەوە، سەگە وەحشیەکان، ئەسپ و مشک و بزنەکان وەک پزیسک هەڵدەبزنەوە. هەروەها باڵندە گەورە سپیەکانیش، ئۆکراسەکان لاشخۆرەکان و لەقلەقەکان، باڵە گەورە بروسکە

دارەکانیان لێک ئەدەن، وەک ئەوە بیانەوێ هەڵفڕن، سەمایەکی بێبڕانـەوە دەست پێ ئەکەن.

"لالا" ترپەی باڵەکانیان لە ناو قژیا هـەست پـێ ئەکـات، هـەست بـە بـزاوتـی شاپەڕەکانیان لە ناو هەوا خەسەکەدا ئەکات. ئەمجا ئاوڕ ئەداتەوە، ئـەیەوێ هـەموو باڵندەکان چاوکات، هەموو حەیوانەکان، تەنانەت شێرەکان کە بە تیلەی چاو دیتوونی. بەڵام کاتێ ئەڕوانێ هەموویان خێرا ئەتوێنەوە. وەک سەرابێک بزر ئەبن کە دیسان لە پشتە سەریەوە سەر هەڵبێنەوە.

بە ئەستەم "ئارتانی" چاو ئەکات. تارماییە ناسکەکەی لە سەر بەردەڵانە سپیەکەدا سەما ئەکات ئەڵێی سێبەرێکە و لەزەوی بڕاوە. "لالا" ئیتر هەوڵ نادات بکەوێتە دوای هەنگاوەکانی، تەنانەت ئیتر کێوە سوورە بێجووڵەکەی ئاسمان، لەو پەڕ دەشتەکە، چاو ناکات.

لەوانەیە ئیتر نەچێتە پێشەوە؟ قاچە رووتەکانی بەسەر بەردەڵانەکەدا ئەڕوشێن و ئەخزێتە ناو چاڵەکان. ئەڵێی جادەکە لە پشت سەریەوە، بێوچان ئاوەڵا ئەبێتەوە، وەک ئاوی رووبارەکان کە بە نێوان لاقەکانیدا تێئەپەڕن.

بە تایبەت رۆشناییەکەیە کە تێدەپەڕێ، لە ئاستی سەر دەشتە کاکی بە کاکیەکە دائەگەڕێ. لەگەڵ "با"دا رەد ئەبێ و ئاسمان و هەواگسک لێ ئەدات. لە رووناکیەکە دەنگی ئاو ئەبیسرێ. "لالا" بێئەوە توانای خواردنەوەی بێت ئاوازەکەی ئەبیسێ.

رووناکی لە دڵی ئاسمانەوە دێت، لە سەر زەوی لە نێوان بەردەگە چینەکان و میکاکاندا ئەسوتێ. بڕێ جار لە نێوان تەپ و تۆزە رەنگ نـارنجیەکـاندا، لە نـێوان بەردەڵانە سپیەکەدا، بەردە ئاگر پژێنەکان وەک پزیسک ئەدەن پێیەوە.

"لالا" بەدەم تێپەڕینەوە چاو لە پزیسکەکان هەڵناگرێ، ئەڵێی هێزی لە بەردەکان ئەگرێ، ئەڵێی نیشانە و رەمزی لە "ئیس سێر"ەوە پێ ئەدەن و جادە مسینەکەی پێ نیشان ئەدەن.

یان دوورتر وەرەقە میکایەک وەک زێڕ ئەدرەوشێتەوە، لە لانەی دەعبایەک

ئەچێت، "لالا" پێی وایە ویزە ویزی باڵەکانیشیان ئەبیسێ.

جار جاریش بە ڕێکەوت بەردێکی خڕی ڕەنگ خۆڵەمێشی، بەردێکی ساکاری دەریایی ئەبینێ، "لالا" بە هەموو هێزیەوە چاوی تێئەبڕێ، لە ناو لەپی دەستیدا ئەیگوشێ بۆ ئەوە یارمەتی بدات بەردەکە داخ و ئاگرینە، هێڵی سپی بە ناوەڕاستیدا هاتووە، جادەیەکی پێ‌نیشان ئەدەن، کە جادەکانی لێ‌جیا بوەتەوە، وەک قژی مناڵ باریک و لق‌لقە.

بەردەکە لە ناو لەپی دەستیا ئەگوشێ و ڕێ ئەکەوێ، هەتاو لەو پەڕی دەشتەکە کشاوەتە خـوارەوە، "بـا"ی شـەو سـات بـۆ سـات گـەردەلوولی تـۆز و خـۆل هەڵدەبەزێنێتەوە و کێوە گەورە سوورەکەی بناری ئاسمان دائەپۆشێنێ.

"لالا" ئەقیژێنێ: «"ئارتانی... "ئارتا...ا...نی"».

ئەژنۆی ئەکەوێتە سەر بەردەڵانەکە، ئیتر وزەی تیا نەماوە، لە ئاستی سەریەوە ئاسمان چۆڵ و هەراوو ساماڵە، تەنانەت دەنگی زایەڵەیەکیش نـایەت، هـەموو شت روون و خاوێنە.

"لالا" ئەتوانێ بچووکترین بەردیش چاو کات، تا ئاسۆ هیچ بزاوتێ نابینێ، زۆر حەز ئەکات زەردەواڵەکان ببینێت. زەردەواڵەکان کە لە هەوادا جەغزە نادیارەکانیان بە دەور قژی مناڵەکاندا دروست ئەکەن. تامەزرۆی دیتنی باڵندەیەکە، تەنانەت قـاڵاوە ڕەشەیەک، داڵێک، بەڵام هیچ نیە، کەس نیە، تەنیا سێبەرە ڕەشەکەی لە دوایەوە هەر درێژ ئەبێتەوە، وەک چاڵێک لە نێوان زەویـەکـی زۆر سـپیدا. لە سـەر زەویـەکـە ڕائەکشێ. وائەزانێ بە زوویی ئەمرێ. چونکە جەستەی لە هێز کـەوتووە، ئـاگـری رووناکیەکە سیەکانی و دڵی پووکاندوەتەوە. ڕۆشنایەکە بەرەبەرەکەم ئەبێتەوە ئاسمان خۆی دائەپۆشێ. ڕەنگە بێ هێزی ئەوەکە هەتاوی دامرکاندوەتەوە.

لە ناکاو "ئارتانی" دەرئەکەوێ، لە بەردەمیا لە سەر لاقێکی وەستاوە. لێی نزیک ئەبێتەوە، دائەنەوێتەوە، "لالا" کراسە بۆرەکەی توند ئەگـرێ، بـە هـەموو هـێزیەوە ئەیگوشێ، نایەوێ بەری بدات "ئـارتانی" لە تـەنیشتیا هـەڵئەتروشکێ، روخساری

تاريكه، بەڵام چاوەكانی ئەبريسكێنەوە. دەستی بە سەر روخساری "لالا"دا دێنێ، بە تەوێڵ و چاوەكانيدا، قامكەكانی ئەنوسێنێ بەسەر لێوە قڵيشاوەكانيدا، لە سەر بەردەڵانەكە لە شوێنی داچوونی هەتاودا، خاڵێكی پێ‌نيشان ئەدات، درەختێ لە تەنيشت تاشەبەردێكەوە.

ـ ئاو، دوورە يان نزيكە.

"لالا" ئەيەوێ بەرز بێتەوە بەڵام جەستەی لەگەڵی نايەت.

ـ "ئارتانی"، من ئيتر ناتوانم. "لالا" ورتەی دێت. لاقە رووشاوەكانی كە لە ژێر جەستەيدا چەماوەنەتەوە پێی نيشان ئەدات.

ـ برۆ، تۆ برۆ من بە جێ بهێڵە.

شوانەكە دوو دڵە، هێشتا لە تەنيشتيا هەڵتروشكاوە.

ئەروا؟!

"لالا" بێ‌ورتە چاوی تێ‌بريوە، ئەيەوێ بنوێ، ئەيەوێ خۆی نوقم بكات. بەڵام "ئارتانی" هەر دوو باسكی لێ توند ئەكات و بە ئەسپايی بەرزی ئەكاتەوە، "لالا" هەست بە ماسولكەی قاچی كورەكە ئەكات كە لە ژێر هەوڵدانەكەيدا كەوتوەتە لەرزين. ئەويش هەر دوو باسكی بە دەور ملی "ئارتانی"دا گير ئەدا. ئەيەوێ قورسايیەكەی لەگەڵ هی‌شوانەكە تێكەڵاو كات.

"ئارتانی" لە سەر بەردەڵانەكە باز ئەدات. ئەڵێی تەنيايە و كەسی پێ‌نيە. بە لاقە درێژە لەرزۆكەكانيەوە هەنگاو هەڵئەگرێ، لە كەناوەكان تێئەپەرێ. لە شەقارەكان ئەپەرێتەوە. هەتاو و "با"ی تۆز و خۆڵ گەشت و گوزارەكەيان دوايی پێ‌هاتوە. بەڵام هێشتا جم و جووڵێكی ئارام لە ئاسۆ سوورەكەوە دێت و پرشنگەكانی ئەهاوێتە سەر بەردە ئاگر پژێنەكان.

ئەڵێی لە بەر پێيدا چاڵێكی گەورەی پر لە رووناكی لەو شوێنەی كە هەتاو بەرەو زەوی دائەگەرێ، ئەگەشێتەوە.

"لالا" گوێی لە ترپە ترپی دڵی "ئارتانی" لە دەمارەكانی مليدا، ئەگرێ. مشەی

هەناسەکانی ئەبیسێ. پێش لە داهاتنی شەو ئەگەنە بەر بەرد و درەختەکە، لە شوێنێکدا کەکانیەک هەڵئەقوڵێ. چاڵێکی ساکار لە ناو بەردەکاندا و ئاوێکی رەنگ خۆڵەمێشی. "ئارتانی" بە ئەسپایی لە قەراخ ئاوەکە "لالا" دائەنێ. بە مشت ئاو بەدەمیەوە ئەکات. ئاوەکە ساردو کەمێ توونە.

شوانەکەیش دائەنەوێتەوە و ماوەیەکی زۆر دەمی ئەنێتە ناو ئاوەکە.

بە تەمای شەو ئەمێننەوە. شەو لێرە خێرا دادێت، لە ناو چەمکە پەردەیەکی بێدووکەڵ و بێهەور و بێدیمەندا، ئەڵێی ئیتر نە هەوا ماوە نە ئاو. تەنیا پرشنگەکانی هەتاوکە کێوەکان قووتیان ئەدەن.

"لالا" لە سەر زەوی لە تەنیشت "ئارتانی" راکشاوە، نابزوێ. قاچی کووتراوو بریندارە، خوێنی دەڵەمە لە ژێر تەختایی قاچیدا رەقەڵەی کردوە. ئازارێ لە ژێر قاچ و ئەژنۆ و درێژای ئیسقان و ماسولکەکانی تا رانی دائەگەرێ.

هاوارێکی لێبەرز ئەبێتەوە، ددانەکانی توند لە سەر یەک ئەنێ بۆ ئەوە نەقیژێنێ، دەستەکانی لە سەر باسکی کورەکە رەق داکەوتوە. ئەو بۆ "لالا" ناروانێ، بینایی راستەوخۆ لە سەر ئاسۆ، ئەوبەر کێوە رەشەکان گرساندوەتەوە، یان رەنگە سەیری ئاسمانی بەرینی شەوانە بکات.

روخساری بە هۆی تاریکی شەودا تێر ئەنوێنێ.

بیر لە چی ئەکاتەوە؟ "لالا" حەز ئەکات بچێتە ناخیەوە، ئەیەوێ بزانی چی ئەوێ؟ بۆ کوێ ئەروا. دەست ئەکا بە قسەکردن، "ئارتانی" وەک سەگێ گوێی تیژ کردوەتەوە، قسەی پیاوەکۆت و شەڵوار رەنگ خۆڵەمێشیە مەیلە و سەوزەکە ئەکات. قسەی چاوە رەقە رەشەکانی، لەو شەوە ئەڵێ کە لای "نوعمان" مابوەوە، کاتێ "با"ی بەدبەختی لە سەر "سیتە" هەڵی کردبوو.

ئەڵێ: «ئیستا من تۆم بۆ مێردم هەڵبژاردووە، کەس ناتوانێ بمبات، کەس ناتوانێ بە زۆر بمبات و مارەم بکات. ئیستا ئیتر ئەرۆین پێکەوە ئەژین. منالێکمان ئەبێت. کەس ناتوانێ مێردی من بێت، تۆ تێ‌ئەگەی "ئارتانی"؟ تەنانەت ئەگەر بمانگرن، من

ئەڵێم تۆ مێردی منی و خەریکە منالیشمان ئەبێت. ئیتر لەوە ناتوانن بەرگری کەن، ئیدی لێمان ئەگەڕێن و ئەڕۆین. ئێمە ئەتوانین لە ناوچەکانی باشوور، زۆر دوور، لە بیابان بژین....»

هەست ئەکا ئازار و ماندوویەتیەکەی رەویوەتەوە. تەنیا هەست بە مەستی‌یەکی ئازاد لە ناو دەشتی بەردەکان و لە بێدەنگی شەودا ئەکات. بە توندی جەستەی لاوەکە ئەگووشێ، بۆن و هەناسەکانیان تێکەڵ ئەبێت و گوێی لە ترپەی بە هێزی دڵی لە ناو سینگیدایە.

"لالا" روخساری بەرەو دڵی ئاسمان وەردە چەرخێنێ، چاوی تێ‌ئەبڕێ. شەوێکی سارد و دڵبزوێن ئابڵۆقەیان ئەدات و لە ناو شینایە قووڵەکەیدا ئەیان گوشێ. "لالا" هەرگیز شەوی بەو جوانیە نەدیوە، نە لە "سیتە" نە لە قەراخی دەریا. هەمیشە شتێ کەوتوەتە نێوانیان، هەڵم یان تەپ و تۆز، هەمیشە دەمامکێ شەوی مات و لێڵ نیشان داوە، ئاخر لەوێ، لەو دەوروبەرە مرۆڤی لێبوو، بە ئاگرەکانیانەوە، بە خواردەمەنیەکانیان و هەناسەکێشانەکانیانەوە.

بەڵام لێرا هەموو شت پاک و خاوێنە. "ئارتانی" لە تەنیشتیا راکشاوە و سەر گێژەیەکی گەورە لە نێوانیاندا لوول ئەخوا. گلێنەی چاویان گوشاد ئەکاتەوە. روخساری "ئارتانی" پان بوەتەوە. ئەڵێی پێستی تەوێڵ و گۆناکانی لە بەردی ساف و لووسە.

لە ئاستی سەریانەوە، ئاسمان بەرەبەرە پڕ ئەبێ لە ئەستێرە، هەزاران ئەستێرەکە چاو ئەتروکێنن و رۆشنایەکی سپی پرژ و بڵاو ئەکەن. رواڵەتە رەمزیەکانیان دروست ئەکەن و دوو هەڵهاتوەکە بێ ئەوە هەناسە بکێشن چاویان تێبڕیون. هەست بە وێنەی بورجی گەردونی بە سەر روخساریانەوە ئەکەن. ئەڵێی ئەوان هەر بۆ سەیر کردنی ئەمان دروست کراون، ئەڵێی ئەوان رووناکی نەرمینی شەو ئەخۆنەوە. ئیتر بیر لە هیچ ناکەنەوە، نە لە جادەی بیابان، نە لە رەنج و چەرمەسەریەک کە بەیانی بەرۆکیان ئەگرێت، نە لە رۆژەکانی‌تر.

ئیتر هەست بە زامەکانیان ناکەن، برسیەتی و تینویەتی و هیچی تری زەوینی هەست پیّ ناکەن. تەنانەت هەتاوە سووتیّنەرەکەیان لە بیر چوەتەوە، کە روخسار و جەستەیانی رەش هەڵگەڕاندوە. رۆشنایی ئەستێرەکان بە ئارامی کەوتوەتە بارین، بیّ دەنگ، بیّ ئەوە تۆز و خۆڵ هەڵبەزێنێتەوە. بیّ ئەوە "با" هەڵ بکات.

ئیستا بەردەڵانەکەی رووناک کردوەتەوە و لە تەنیشت قەراخ چاڵەکان درەختە سووتاوەکە وەک دووکەڵی سووک و زەعیف دیارە.

زەوی ئیتر زۆر ساف نیە، وەک بەردەمی بەلەمیّک ئەکشیّ و بە ئەسپایی پیّش ئەروا، لەرزۆک، ئەخزیّت و ئەخولیّتەوە. بە ئەسپایی ئەخزیّتە نیّوان ئەستێرەکان، لە حالیّکدا دوو منالەکە نووساون بەیەکەوە.

بیّ وچان ئەستێرەی تازە دەرئەکەویّ، ئەستێرەی زۆر بچووک کە بە ئەستەم چاو ئەکریّ و تالە نادیارە رووناکیەکەی بەوانی دیکەوە گریّ ئەدریّ. دارستانی رۆشنایی خۆڵەمیّشی و سوور و سپی لەگەڵ شینایی بیّخی ئاسمان تیّکەڵ ئەبن و وەک بلقگەلیّ سەهۆڵ ئەبەستن.

پاشان، کاتیّ "ئارتانی" ئارام نوستووە، "لالا" چاو بۆ هەموو نیشانەکان ئەگیّریّ. هەموو بروسکەی رۆشناییەکان، هەموو ئەو شتانەی خورپەیان دیّت و ئەلەرزن، یان وەک چاو بیّ جووڵە ئەمیّننەوە.

بەرزتر، لە ئاستی سەریەوە، ریّگای شیریە، ریّگایەک کە خویّنی بەرخەکەی جبرەئیل کیّشاویەتی، هەرواکە "نوعمان"ی پیر ئەیگیّرایەوە.

"لالا" لە رۆشناییە کزەکە ئەخواتەوە کە لە کۆگای ئەستێرەکانەوە دیّت. لە پڕ هەست ئەکا زۆر نزیکە، وەک لە ناو ئاوازەکەی "لالاحەوا" دا، هەر بە دریّژ کردنی دەستی، کۆشیّ لە رۆشناییە جوانە بریقەدارەکە ئەچنیّتەوە.

بەڵام ئەو نابزویّ. دەستی بە سەر گەردنی ئارتانیەوە داناوە، گوییّ لە خورپەی خویّنی ناو دەمارەکانی گرتووە و گوزەری ئارامی هەناسەکانی. شەو، یاوی هەتاوو وشکیەکەی رەواندوەتەوە.

ڕۆشنایی کاکێشان لە دڵەخورپێ و برسیەتی و تینویەتی دامرکاندووەتەوە. لەسەر پێستی نەقش و نیگاری ئەستێرەکانی ئاسمان وەک تنۆکی ئاو ئەدرەوشێتەوە.

ئێستا ئیتر زەوی نابینێ، دوو منداڵەکە لە تەنیشت یەکەوە، لەدڵـی ئـاسماندا لە گەشت دان.

***

تائەهات زەوی گەورە و گەورەتر ئەبووەوە، کاروانەکە ببوون بە سێ دەستە. دوو یان سێ سەعاتیان بەین بوو کاروانەکەی "لارداف" لە لای چەپەوە ئەڕۆیشت، نزیک زنجیرە شاخی "هوا" بەرەو "سیدئەلهاش". دەستەی "سەعدبوو"، کوڕی بچووکی شیخ، لە لای راستەوە و لە بنەتاوە لە وشکایی "ژانگ ساکوم"، لەناوە راستی دۆڵی "ساگیت ئەلحەمرا" سەر ئەکەوتن.

لەنێوان ئەواندا و لە دواترەوە، "مائەلعەنیەین" و جەنگاوەرەکانی بە سواری و شترەکانیانەوە ئەچوونە پێش.

پاشان دوابە دوای ئەوان ژن و پیاو و منداڵەکان ، ئاژەڵەکانیان لە پێش خۆیانەوە ڕێ خستبوو و لە نێوان گەردە لوولی سووری تەپ وتۆزەکەدا ئەچوونە پێشەوە.

بە پێچەوانەی بزاوتی هەتاو، هەر ڕۆژ لە قووڵایی دۆڵەکە دائەگەڕان.

ئاخر و ئۆخری زستان بوو، هێشتا باران زەوی نەرم نەکردبوو. قووڵایی "ساگیت ئەلحەمرا" وەک پێستێکی پیرڕەق و شەقار شەقار ببوو.

بەڵام ڕەنگە سوورەکەی پێست و چاوی ئەسووتاندن.

دەمەو بەیان بەر لە هەڵهاتنی هەتاو، بانگی بەیانی هەموو وڵاتی داگرتبوو، قاڵە

قاڵی حەیوانەکان بەرز ببووەو ئاگردانەکان سیخناخ لە دووکەڵ بوون.

لە دوورەوە قیرەی یەک دەنگی سەربازەکانی "لارداف "و وەڵامی پیاوەکانی "سەعدبوو" ئەهات.

بەڵام پیاوەکانی شێخی گەورە بێدەنگ نوێژیان ئەخوێند. کاتێ یەکەمین تەپ و تۆز بەرز بووەوە، مێگەلەکەیان خستە وەرێ. هەرکەس کۆڵەکەی خۆی هەڵگرت و لە سەر زەویەکەکەهێشتا سارد و خۆڵە مێشی بوو رێ کەوتن. گزنگی هەتاو بەئەسپایی لە ئاسۆوە لە سەر ئامادەوە، دەرئەکەوت.

خەڵکەکە کەبۆ جەغزە بروسکە دارەکەیان ئەروانی کە قووڵایی دۆڵەکەی رووناک ئەکردەوە، چاویان تەنگ ئەکردەوە و نەختێ ئەچەمینەوە، وەک بڵێی لەگەڵ قورسایی کۆڵەکانیان و ئازاری شۆڵەکانی هەتاو لەسەر تەوێڵ و شانەکانیان، بە رانبەرکێیان ئەکرد. جار جار مێگەلەکانی "لارداف" و "سەعدبوو" ئەونەڵییان نزیک ئەبوونەوە، دەنگی سمی ئەسپەکان ونەرە و پرمەی وشترەکانیان ئەبیسرا.

پاشان، لە سێ لاوە، سێ گەردەلوولی تەپ و تۆز لێک دەئاڵان و هەتاویان داپۆشی.

کاتێ هەتاو ئەگەیشتە تاقی ئاسمان، با هەڵی ئەکرد و ئاسمانی گسک لێئەدا و دیواری سووری تەپوتۆز و لمەکانی پاک ئەکردەوە و پیاوەکان ئاژەڵەکانیان لە نیوە بازنەیەکدا ریز ئەکرد و خۆیان لە پەنای وشترە هەڵتروشکاوەکان، یان لە تەنیشت دەوەنە درکاویەکاندا دائەنیشتن.

زەویش بە قەد ئاسمان هەراو بوو، بە قەد ئاسمان بروسکەدار و چۆڵ. لە دوای دەستەی شێخی گەورە، "نوور" کۆڵە ئازوخەکەی بە پەرۆیەکی گەورە لە دەور سینەیەوە گرێ دابوو. هەر رۆژ لە دەمەو بەیانەوە تا داچوونی هەتاو ئەکەوتە دوای جێ پێی مرۆڤ و ئەسپەکان. بێ ئەوە بزانێ ملی کام رێگای گرتووە، بێ ئەوە دایکی و باوکی و خوشکەکانی چاوکات. برێ جار شەوانە، ئەیدۆزینەوە، کاتێ موسافرەکان بۆ دروست کردنی چایی و ئاردی دانەوێڵە بە چیلکە ئاگریان ئەکردەوە.

لەگەڵ کەس نەئەدوا، کەسیش قسەی لەگەڵ نەئەکرد. ئەتوت ماندویەتی و وشکی وشەکانی لەگەرویاندا سوتاندبوو. شەو کە دائەهات و ئاژەڵەکان ئەنووستن، "نوور" ئەیتوانی دەوربەری خۆی ببینێ، دۆڵی بیابانە هەراوەکەی ئەدی. کەمێ لەولاتریەو وشترەکان ئەوەستان. هەستی ئەکرد بە قەد درەختێ گەورەن. ئەتوت دۆڵەکە بێبنەتایە، پانتایی بێپایانی بەرد و لمەکەکە لە ئەوەڵی دونیاوە گۆرانکاری بە سەردا نەهاتبوو. دوور لە یەکتر، تارمایی رەش هەڵگەراوی ئەقاقیا بچووکەکانی ئەبینی و دەوەنەکان و دار هەنجیر و خورماکورتەکان، لەو شوێنەی کە تەرایی دۆڵەکە وەک خاڵێکی گەورەی رەش بوو.

زەوی رەنگێکی کانزایی بە خۆی گرتبوو. "نوور" بە سەر پێوە، جوولەی لە خۆی بڕیبوو. تاریکی بە ئەسپایی وەک ئاوێکی نەبینراو دۆڵەکەی سیخناخ ئەکرد. بە زووی دەستەکانی تریش گەیشتنەوە بە "مائەلعەینەین"، لەگەل سەرۆک هۆزەکاندا دەستیان کردبوو بە باس و دەمەتەقێ، ئەیانویست ئەوانیش شوێن ئەمان کەون.

ئێستا هەزاران کەس بوون کە لە دۆڵەکە تێئەپەڕین و ملی چاڵەکانی "هۆسا"، "ئێل فونات" و "یۆرفیان"گرتبوەبەر. "نوور" لە بیری چووبوەوە کەی رێکەوتون. رەنگە ئەو ماوەیە هەر تەنیا یەک رۆژی بێکۆتایی بوو کە بەم شێوەیە تێئەپەڕی، لە حاڵێکدا هەتاو لە ئاسمانە پڕ بڵێسەکەدا هەڵدەهات و دائەچوو، گەردەلوولی تەپ و تۆز لە ئاستی سەریانەوە لوولی ئەخوارد و وەک شەپۆلێ تێک ئەشکا. پیاوانی کورەکانی "مائەلعەینەین"، دوورتر لەمان لە پێشەوە بوون، ئەبوایە لە قووڵایی دۆڵی "ساگیت ئەلحەمرا" تا ئەو بەر قەبرەکەی "رایم موحەممەد ئامبارک" داگەڕێن.

تەنانەت ئەسپەکانیان بە ئەستەم لە تاشەبەردەکان سەرئەکەوتن و دەیانبینی لە دوایانەوە، پانتایی دۆڵی "ساگیت ئەلحەمرا" ئاوەڵا ئەبێتەوە کە شەپۆلی نارنجی پیاوەکان و مێگەلەکانی "مائەلعەینەین" لوول ئەخۆن.

ئێستا ژنان و پیاوانی دوایین ریز، هەنگاوەکانیان ئارامتر هەڵدەگرت، جار جار "نوور" ئەوەستاو چاوەڕوانی دەستەی دایکی و خوشکەکانی ئەبوو. جەستەی ئەخستە

سەر بەردێکی داخ و داوێنی پاڵتۆکەی بەرز ئەکردەوە و چاوی ئەبڕیە سەر مێگەلەکە کە تێئەپەڕی.

جەنگاوەرە پیادەکان لە ژێر قورسایی کۆڵەکانیاندا چەمابوونەوە. هەندێکیان خۆیان دابوو بە سەر چەک و نێزە درێژەکانیاندا. روخساریان رەش هەڵگەرابوو. "نوور" لەگەڵ خرە خرِی هەنگاوەکانیاندا لە ناو لمەکەدا سیخە سیخی هەناسەیانی ئەبیست.

دوا بە دوای مێگەلی مەڕ و بزنەکانەوە شوانەکان و منداڵەکان بە دەم بەرد توردانەوە، رێیان ئەبڕی. گەردەلوولی تەپ و تۆز چەشنی تەم و مژ ئاپوورەی دابوون. "نوور" سەیری تارماییە سەیرەکانیان و قژە تێکچووەکانیانی ئەکرد کە ئەتوت لە نێوان گەردەلوولی تەپ و تۆزەکەدا سەمایان ئەکرد.

ژنەکان لە تەنیشت وشترە کۆپانداڕەکانەوە ئەڕۆیشتن. بڕێکیان منداڵەکانیان نابووە ناو پاڵتۆکانیان و بە ئەسپایی پێخاوسەکانیان بە سەر زەویە داخەکەدا، دائەنا. "نوور" گوێی لە خرەی ملوانکە زێڕ و مسینەکان و ئەلقەی قولەپەی پێیان بوو. بەدەم رێ بڕینەوە ئاوازێکی خەمین و بێبڕانەوەیان ئەخوێند، کە وەک هاژەی "با" ئەهات و دەچوو.

لە دوای هەمووانەوە، پەککەوتەکان، پیر و مناڵ و بریندارەکان و بێوەژنەکان بوون، کە کەسیان نەبوو یارمەتیان بات و نان و ئاویان پێبدات. ژمارەیەکی زۆری پرژو بڵاو بوون کە رێگای دۆڵی "ساگیت"یان گرتبوەبەر دوای ئەوان، سەربازەکانی شێخ، بۆماوەی چەندین سەعات تێپەڕیبوون و "نوور" بە تایبەت بە سۆزەوە سەیریانی کردبوو.

لە قەراخ رێگاکە وەستابوو و سەیری ئەکردن کە بە ئاستەم هەنگاوە لاواز و ماندوەکانیان هەڵدەگرت. روخساریان لاواز و تاریک بوو چاوەکانیان لە "یاو"دا ئەسووتا. خوێن لە لێویان ئەهات، جێگای زام و برین بە سەر دەست و سینگیانەوە دیار بوو، خوێنی دەڵەمە لەگەڵ تەپ و تۆزە زیڕینەکە تێکەڵ ببو هەتاو بە شێوەیەک

تیشكی ئەپرژاندە سەر بەردە سوورەكان و سەر ملیان ئەتوت بەراستی ئەوانی دابووە بەر قەمچی.

ژنەكان پێخاوس بوون. لم لاقیانی سووتاندبوو و خوێ دایرزاندبوو. بەڵام بێدەنگیەكەیان لە هەموو بە ژانتر بوو، دڵەخورپێی زیاد ئەكردن و هەست و سۆزیانی ئەورووژاند.

كەس ورتەی لێوە نەئەهات، كەس ئاوازی نەئەخوێند، كەس گلەیی نەئەكرد، نەئەگریا...

هەموو ژن و پیاو و منداڵ، بە قاچ و قولی خوێناویەوە، بێئەوە ورتەیان لێوە بێت، وەك بەزبو و دۆڕاوەكان ملی ڕێگایان گرتبوو. تەنیا خشپەی پێیان لە سەر لمەكە و هەناسە كورتەكانیان ئەبیسرا.

"نوور" لە قەراخ ڕێگاكە وێستابوو و كۆڵەكەی لە سەر پێی دانابوو. جار جار، كاتێ پیرێژنێك یان سەربازێكی بریندار تێئەپەڕین، لێیان نزیك ئەبووەوە و قسەی لەگەڵ ئەكردن.

ـ سەلام، سەلام، یارمەتیت بەم؟

بەڵام ئەوان ورتەیان لێوە نەئەهات، تەنانەت بۆیشیان نەئەڕوانی. ڕوخساریان وەك بەردی دۆڵەكە ڕەق هەڵگەڕابوو، ئازار و ڕووناكی گوشیبوونی.

دەستەیەك لە پیاوەكانی بیابان، جەنگاوەرانی "شانگیتی" ڕەد بوون. پاڵتۆ شینە ئاسمانیەكانیان شڕ و دڕ ببو. قاچ و قولیان بە پەڕۆ كۆنەی خوێناوی هەڵبەستبوو، هیچیان پێنەبوو، تەنانەت كیسەیەك برنج یان قومێ ئاو. هەر چەك و نێزەكانیان پێبوو. وەك پیر و پەككەوتە و ناڵەكان ڕێیان ئەبری. یەكێكیان كوێر بوو، داوێنی جەنگاوەرێكی گرتبوو، تلاوتل لە سەر بەردی جادەكان و بە سەر ڕیشەی درکەكاندا هەڵدەكەوت.

كاتێ لە تەنیشت "نوور"ەوە تێئەپەڕی دەنگی كوڕێكی لاوی بیست كە سڵاوی لێ كردن. پاڵتۆی هەڤاڵەكەی بەر داو ڕاوەستا، پرسیاری كرد. گەیشتوین؟

ئەوانی دیکە بێ ئەوە تەنانەت ئاوڕ بدەنەوە ڕێکەوتنەوە.

جەنگاوەرەکە هێشتا لاو بوو، بەڵام ماندوویەتی پووکاندبوویەوە. بە پەرۆیەکی چڵکن چاوە سووتاوەکانی هەڵبەستبوو نور" ئاوی پێ دابیخواتەوە، کۆڵەکەی نایە سەر شانی و دەستی جەنگاوەرەکەی لەسەر پاڵتۆکەی دانا :

- وەرە، ئێستا من یارمەتیت ئەدەم.

بەرەوپیری گەردەلوولی تەپ و تۆزە سوورەکە، بەرەو ئەوپەڕی دۆڵەکە ملی ڕێگایان گرت. پیاوەکە ورتەی لێوە نەئەهات. هێندە توند دەستی بەسەر شانی "نوور"دا ئەڵقە کردبوو، ئێشی پێ ئەگەیاند.

شەو، کاتێ گەیشتنە چاڵەکانی «یۆرف»، کوڕە لاوەکە وزەی لا نەمابوو. ئێستا لە داوێنی تاشەبەردەکانی ڕۆخی دەریا بوون، ئەو شوێنەی کە ناوچەی "هۆرا" دەستی پێ ئەکرد و دۆڵێکە بەرەو باکوور ئەچوو. لێرا، هەموو کاروانەکان یەکیان گرتبووەوە. کاروانی "لارداف" و "سەعد" بوو و پیاوە شینەکانی شێخی گەورە.

لەبەر ڕووناکی شەودا، "نوور" هەزاران کەسی ئەبینی کە لە دەور چاڵەکاندا لەسەر زەویە وشکەکە دانیشتبوون. تەپ و تۆزەکە بە ئەسپایی ئەنیشتەوە و دووکەڵی ئاگردانەکان لە ئاسماندا بەرز ئەبوونەوە. کاتێ "نوور" ماندوویەتیەکەی ڕەویەوە، کۆڵەکەی بەرز کردەوە، بەڵام بەدەور لاقەدیا گرێی نەدا، دەستی جەنگاوەرەکەی گرت و تا لای سەرچاوەی ئاوەکە ڕۆیشتن. هەموو لە ئاوەکەیان خواردبوەوە. ژن و پیاوەکان لای ڕۆژهەڵاتەوە و ئاژەڵەکان لە ڕۆژئاواوە، ئاوەکە لێڵ بیوو، لەگەڵ قوڕە سوورەکەی ڕۆخی دەریا ئامێتە ببوو، بەڵام لای ئەوان جوان و ڕوون بوو. ئاسمانە ساماڵەکە، وەک لەسەر کانزایەکی ساف و لوس بێت، لەسەر ئاستی ئاوە ڕەشەکەدا، ئەبریسکایەوە.

"نوور" بەسەر ئەژنۆوە، لەقەراخ چاڵەکە، چەمایەوە. بێ هەناسە کێشان بینی پێوەنا. جەنگاوەرە کوێرەکەش بە چنۆکی دەمی پێوە نابوو. کاتێ تێری خواردەوە، لەقەراخ چاڵەکە جەستەی نیشاندە سەرزەوی، بە ڕوخساری تاریک و ردێنیدا ئاو

دائەچۆرا.

گەڕانەوە بۆلای مێگەلەکان، فەرمانی شێخ بوو، بۆ ئەوەی ئاوەکە لێڵ نەبێ، کەس نەئەبوایە لای ئاوەکە بمێنێتەوە.

لە ئاقاری ئامادا شەو خێرا داهات، دۆلەکە سیخناخ ببوو لە تاریکی، تەنیا ترۆپکی بەردەکان هێشتا ئەبریسکانەوە. "نوور" نەختێ بەدوای باوك و دایکیدا چاوە چاوی کرد، رەنگە ئەوان لەگەڵ سەربازەکانی لارداف بەرەو باکوور رۆیشتبێتن

لە نزیك مێگەلەکەوە سووچێکی بۆ حەوانەوەی شەو هەڵبژارد. کۆلەکەکەی دانا و نانی هەرزەن و خورماکەی لەگەڵ جەنگاوەرەکە بەش کرد. پیاوەکە خێرا خواردی و دەستی نایە ژێرسەری و راکشا. "نوور" دەستی کرد بە دواندنی، ئەیویست بزانێ کێیە. پیاوەکە بە نەرمی، بە دەنگە گرەکەی دەستی کرد بە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکانی. هەموو ئەو رووداوانەی زۆر دوور لەوێ، لە «شانگتی»، لە نزیك چەمە گەورەکەی «شەنشان» رووی دابوو.

سەربازە مەسیحیەکان کاروانەکانیان گەمارۆ دابوو، گوندەکانیان سووتاندبوو و منالەکانیان لەگەڵ خۆیان بردبوو بۆ ئوردووگا. کاتێ سەربازە مەسیحیەکان لەرۆخی دەریاوە، یان لە باشوورەوە هێرشیان کردبووە سەریان، جەنگاوەرە سپی پۆشەکان و رەش پێستەکانی «نیجریە» و خەڵکی بیابان، بەرەو باکوور رایان کردبوو.

لەیەکێ لەو شەڕانەدا، ئەم بریندار و کوێر ببوو. هاواڵەکانی بەرەو باکوور، بەرەو شاری پیرۆزی "سمارا" بردبوویان، چونکە ئەیانوت شێخی گەورە بریندارەکانی شەڕ لەگەڵ مەسیحیەکان، خۆش ئەکاتەوە و ئەو ئەتوانێ چاوی ساغ کاتەوە. بەدەم گێڕانەوەی بەسەرهاتەکەی، فرمێسك لە پێلوە بەسراوەکەیەوە ئەڕژایە خوارەوە. یادی هەموو ئەو شتانەی لەدەستی دابوو، خەمینی کردبوو :

- تۆ ئەزانی ئێستا لە کوێین ؟

ئەم پرسیارەی بێوچان ئاراستەی "نوور" ئەکرد. ئەتوت لەوە ئەترسێ کە لە

بیاباندا بە جێی بهێڵێ.

- ئەزانی لە کوێین ؟... هێشتا زۆرمان ماوە ؟

"نوور" ئەیوت : - نە، بەزوویی ئەگەینە ئەو شوێنەی کە شێخ بەڵێنی پێ داوین. لەوێ کە هیچ کەم و کووڕیەکمان نابێت، ئەو شوێنەی کە وەک وڵاتی پادشایەتی خوایە.

بەڵام ئەو هیچی نەئەزانی. لە ناخیەوە پێی وابوو کە هەرگیز ناگەنە ئەو شوێنە. تەنانەت ئەگەر لەبیابان و کێو و دەریا تێپەڕن و بڕۆن تا شوێنێ کە هەتاو لە ئاسۆ، لەدایک ئەبێت.

جەنگاوەرەکە دەستی کردبوو بە قسەکردن، بەڵام ئیتر باسی شەڕی نەئەکرد. بە دەنگێکی نزم قسەی منالی ئەگێڕایەوە، بیرەوەری جادەی خوێکە، خوشک و باوک و براکانی، پەروەردە بوونی لە مزگەوتی شانگتی، ڕێکەوتنی کاروانە گەورەکان لە نێوان دەریا پان و بەرینەکەدا بەرەو «ئادرا»، دوورتر، بەرەو ڕۆژهەڵات بەرەو کێوەکانی «هانگ»، بەرەو چاڵەکەی «عەبدولمەلیک»، شوێنێ کە قەبرە پیرۆزەکەی تیایە، بە نەرمی و سرتەسرت ئەدوا، لەسەر زەویەکە هەڵاژیابوو، شەو سێبەرێکی فێنک بوو ڕوخسارە سووتاوەکەی دائەپۆشاند.

"نوور" لە پاڵیا، خۆی لەناو پاڵتۆ پەشمینەکەیدا دایپێچابوو، سەری نابووە سەر کۆڵەکەی، بە چاوی کراوەوە جووڵەی لە خۆی بڕیبوو، ماقی ئاسمان، گوێی لە پیاوەکە گرتبوو.

شەوانی بیابان سارد بوو، بەڵام زمان و لێوەکانی "نوور" بێوچان ئەسووتانەوە، ئەتوت سکڵی لەسەر نراوە. با، لەسەر تاشەبەردەکان ڕەد ئەبوو، لە ئاستی سەر دۆڵەکاندا بە ویژەویژ تێئەپەڕی. خەڵکەکە لە نێوان جلە شڕەکانیاندا یاو و لەرزیان کردبوو، لە جێگەیەکدا، لە نێوان جەنگاوەرە خەوتووەکاندا شێخی گەورە، پاڵتۆیەکی سپی لەبەر بوو، ماقی شەو ببوو، لەماوەی ئەم چەند مانگەدا ئەوە پیشەی بوو، بینایی تا ئەستێرە تێکەڵ و پێکەڵەکان ئەگێرا، کە بە شاڵاوی ڕووناکیەکەیانەوە زەوییان حەمام

ئەدا. برێجار لەنێوان پیاوە خەوتووەکاندا دەورێکی ئەدایەوە، ئەمجا ئەگەڕایەوە سەر جێگاکەی خۆی و بەدەم گوێدان بە قرچەقرچی ئاگرەکەوە، چایی ئەخواردەوە.

رۆژەکان بەم جۆرە تێئەپەڕین، سامناک و سووتێنەر، خەڵکەکە و مێگەلەکان لە دۆڵەکە بەرەو باکوور هەڵئەگەڕان، ئێستا لە نێوان فەلاتە بێبەرەکەی «ئامارا» رێگای «تاندوف»یان گرتبووە بەر.

کورەکانی "مائەلعەینەین" لەگەڵ پیاو چاکەکاندا، لە کێوەکانی «ئـوارکـزیز» سەرئەکەوتن، بەڵام رێگاکە بۆ ژن و منداڵەکان گەلێ دژوار و ئەستەم بوو. شێخ رێگای رۆژهەڵاتی هەڵبژاردبوو. جەنگاوەرە کوێرەکە شانی "نـوور"ی گـرتبوو و لە دوای کاروانەکەوە بوون. تا ئەهات کۆڵی خواردەمەنیەکە سووکتر ئەبووەوە. "نوور" لێی روون بوو تا ئاخری بەشیان ناکات.

ئێستا لەسەر فەلاتە بەردینەکەوە بـوون، لە ئـاسمان گـەلێ نـزیک بـبوونەوە، برێجار لە شەقارەکان و برینە رەشە گەورەکانی ناو بەردە سپیەکان و بەردە تیژەکان تێئەپەڕین، جـەنگاوەرە کـوێرەکـە بـەتوندی شـانی "نـوور"ی ئـەگـرت بـۆ ئـەوە هەڵنەکەوێ، پێڵاوەکانیان دڕابوو زۆربەیان قـاچیان بـە پـەڕۆ هـەڵبەستبوو بـۆ ئـەوە خوێنەکەی بگرسێتەوە. ژنەکان بە پێخاوس رێیان ئەبڕی، چونکە هەر لەمناڵیەوە وا راهاتبوون، بەڵام بـرێجار کـە قـاچیان ئـەچوو بـە بـەردەتیژەکـاندا، بـەدەم نـاڵەوە رێگاکەیان ئەگرتەوە بەر.

لەماوەی رۆژدا، جەنگاوەرەکە ورتەی نەئەکرد، روخسارە ماتەکەی بـە پـاڵتۆ شینەکەی و زامپێچی چاوی، داپۆشیبوو.

بێ ناڵە و گلەیی رێی ئەبڕی. لەوکاتەوە "نوور" دەستی گرتبوو، ئیتر لە ون بوون نەئەترسا. تەنیا کاتێ هەستی بە داهاتنی شەو ئەکرد، کـاتێ پـیاوەکـانی "لارداف" و "سەعد" بوو، دوورتر، لەناو دۆڵەکـانەوە، فـەرمانی راوەسـتەیان ئـەدا. جـەنگاوەرە کوێرەکە هەمیشە بەهەمان پەشێوی و نیگەرانیەوە ئەیوت:

- ئێرایە؟ گەیشتین؟ پێم بڵێ، گەشتووینەتە جـێگایەک کـە ئـەبێ بـۆ هـەمیشە

بووەستین؟

"نوور" بینایی بە دەور و بەریدا ئەگێرا و تەنیا پانتایی بێپایانی بەرد و خۆڵی ئەبینی و زەویە هەمیشە یەکجۆرەکەی ژێر ئاسمان، کۆڵەکەی دائەنا و ساکارانە ئەیوت

- نە، هێشتا نەگەشتووین.

ئەمجا وەک هەموو ڕۆژ، جەنگاوەرە کوێرەکە چەن قوم ئاوی لە مەشکەکە ئەخواردەوە و چەن پارو نان و خورما، ئەمجا لەسەر زەویەکە ڕائەکشا و دیسان دەستی ئەکرد بە گێرانەوەی بەسەرهاتی وڵاتەکەی. باسی شاری شانگتی لە تەنیشت دەریاچەی "شان شان"ی ئەکرد.

سەبارەت بە مەڵبەندێ قسەی ئەکرد، کە ئاوەکەی سەوز بوو، دارخورماکانی گەلێ گەورە بوون و خورماکانی وەک هەنگوێن، سێبەرەکانی سیخناخ لە جریوە جریوی ئاوازی باڵندەکان و قلانەوە و پێکەنینی کچانی سەر کانی بوو.

بە دەنگێکی ئاهەنگینەوە ئەیگێرایەوە، ئەتوت خۆی ئەلاوێنێتەوە و بۆ ئەوە لە ئێش و زامەکەی کەم کاتەوە، بڕێجار هەڤاڵەکانی ئەهاتن و لای دائەنیشتن. نان و خورمایان بە "نوور"یش ئەدا. یان بە گەڵای شیبا چایان دروست ئەکرد و گوێیان لە قسەکانی جەنگاوەرەکە ئەگرت.

ئەوانیش قسەی سەر زەوی و چاڵەکانی باشور "ئاتار"، "ئوجێفت"، "تامشاکات" و شاری گەورەی "بوالاتا"یان ئەکرد. بە زمانێکی نەرم و سەیر وەک دۆعا، ئەدوان. روخسارە لاوازەکانیان بەرەنگی کانزا بوو. کاتێ هەتاو ئەکشایە نزیک ئاسۆ و فەلاتی بیابان ئەبریسکایەوە، چۆکیان ئەدا و نوێژیان ئەخوێند. تەوێڵیان لەسەر تەپ و تۆزەکە دائەنا، "نوور" یارمەتی جەنگاوەرە کوێرەکەی ئەدا بەرەو ڕۆژهەڵات سوژدە ببات، پاشان ڕائەکشا و خۆی لەناو پاڵتۆکەی دائەپێچا و بەدەم گوێدانی سرتەسرتی پیاوەکانەوە خەوی لێ ئەکەوت.

بەم شێوە لە کێوەکانی "ئوراکریز" تێپەڕین، لە شەقار و سێلاوگە وشکەکان،

کاروانەکە لەمپەڕ تا ئەوپەڕ ئاسۆ ڕێچکەی بەستبوو. گەردەلوولی تەپ و تۆزێکی سوور هەر ڕۆژ لە ئاسمانە شینەکەدا بەرز ئەبووەوە و "با" ئەیشەکاندەوە، مێگەلی مەڕ و بزنەکان و وشترە کۆپان دارەکان، کە لە نێوان پیاوەکانەوە ڕەت ئەبوون، تەپ و تۆزی هەڵبەزینەوەیان چاوی پیاوەکانی پڕ ئەکردەوە. دوورتر لەوان، پەک کەوتەکان ژنە نەخۆشەکان و منالە بێکەسەکان، جەنگاوەرە بریندارەکان، لە ڕووناکی کوشندەی ڕۆژدا، ڕێیان ئەبڕی، سەریان داخستبوو، قاچیان لەڕ و لاواز بوو، جار جار لەسەر جێ پێکانیان، تنۆکی خوێن بەجێ ئەما.

جاری یەکەم کە "نوور" کەسێکی دیبوو لە قەراخ ڕێگاکە کەوتبوو، ویستبووی بووەستێت، بەڵام جەنگاوەرە شینەکان و دەور و بەرەکانی بێ ئەوە هیچ بڵێن، پاڵیان پێوە نابوو کە بڕوا، چونکە ئیتر هیچیان لەدەس نەئەهات. ئێستا ئیتر "نوور" نەئەوەستا، بڕێجار تارمایی جەستەیەکی لەناو خۆڵی قەراخ جادەکە ئەبینی کە وەک خەوی لێکەوتبێ دەست و پێی گرمۆڵە کردبوو، پیاوێکی پیر، یان ژنێ بوو کە ماندوویەتی و نەخۆشین لەپێی خستبوو، جەستەی وشک و ڕەق هەڵاتبوو. "با"کە هەڵی ئەکرد، مشت مشت لمی بۆ ئەهاویشت، بێ ئەوە نیازی بە قەبرکەندن بێت، خێرا دایدەپۆشی. "نوور" پیرەژنەکە کە لە ئوردووگای "سمارا" چاپی پێدا بوو کەوتەوە بیری، ڕەنگە ئەویش کەوتبێ، ڕۆژێ لەم ڕۆژانە هەتاو بۆ هەمیشە پەکی خستبێ و لمی بیابان دایپۆشیبێ.

بەڵام زۆر بیری لێ نەکردەوە، چونکە هەر هەنگاوێ کە هەڵیئەگرت وەک مەرگی کەسێ بوو کە بیرەوەریەکانی ئەسڕیەوە. ئەتوت تێپەڕین لە بیابان هەمووی وێران کردبوو. لە بیرەوەریدا سووتاندبووی و ئەوی کردبوو بە کوڕێکی دیکە.

کاتێ هەنگاوەکانی سووک ئەکردەوە، دەستی جەنگاوەرە کوێرەکەی سەرشانی پاڵی پێوە ئەنا. ڕەنگە ئەگەر ئەو دەستەی سەرشانی نەبوایەت، ئەویش بەدەست و پێی گرمۆڵەوە ئەکەوتە قەراخ جادەکە. لەبەرانبەریاندا هەمیشە کێوگەلێ بوو وە فەلاتە بەردینەکە و لمە بێپایانەکە کە وەک دەریا بێوچان بوو، کاتێ

/

جەنگاوەری بیابانەکە دەنگی "راوەستە"ی ئەبیست، بە "نوور"ی ئەوت: - ئێرایە؟ گەیشتین؟ ئەمجا ئەیوت: - بۆم بڵێ چی ئەبینی؟

بەڵام "نوور" تەنیا ئەیوت: نە، ئێرا نیە، ئێرا هەر بیابانە و بیابان، ئەبێ زۆرتر برۆین.

نائومێدی بەرۆکی خەڵکەکەی گرتبوو، تەنانەت جەنگاوەرانی بیابان، پیاوە شینە نەبەزەکانی «"مائەلعەینەین"» ماندوو ببوون، شەرمەزاری لە نیگایاندا ئەبینرا، ئەتوت پەیمان و بەڵێنیان شکاندووە، لەدەستەی بچووک بچووکدا دائەنیشتن، چەکەکانیان بەدەستیانەوە، ورتەیان لێوە نەئەهات. کاتێ "نوور" بۆ ئاو، رۆیشت بۆلای دایک و باوکی، بێدەنگیەکەیان زۆری ترساندبوو، ئەتوت هەرەشەی مەرگ هەناوی لێ سەندبوون و ئیتر هێزی خۆشەویستیان لا نەمابوو. زۆربەی خەڵکی کاروانەکە ژن و منداڵە داماو و پەککەوتەکان بوون وا بەتەمای هەتاو بوون، گەرچی دەنگی بانگی شێوانی پیاوەکانی "مائەلعەینەین" هەموو فەلاتەکەی گرتبوو، بەڵام تەنانەت هێزی نوێژ خوێندنیان نەما بوو. "نوور" سەری لەسەر کۆڵە خاڵیەکە، راکشا بوو. بەدەم گوێدانی ورتەورتی کوێرەکەوە چاوی بریبووە ئاسمانە بێبنەتاکە، کە هەرسات رەنگی ئەگۆری.

برێجار هەستی ئەکرد هەموو ئەمانە هەر خەوێکن و بەس، خەوێکی سامناک و بێبرانەوە کە بە چاوی کراوەوە ئەیدی. خەویکە لەگەڵ خۆی لەجادەی ئەستێرەکانەوە ئەیبرد، لەسەر زەویە ساف و رەقەکە، کە وەک بەردێکی ساف و لووس بوو.

زام و دردیش دەرزی ئاژنیان کردبوو، ئەویش بێئەوە گوێ بدات ملی رێگای ئەگرت، وەک بڵێی خۆی لە قاڵبی لەشی دەرهێنابێ، جەستەی لەسەر زەویە داخەکە بەجێ هێشتبێ و لاشە بێ جووڵەکەی لە بیابانی پڕلە بەرد و رێخەکە وەک خاڵێ، وەک کۆگای پەڕۆ کۆنە توور درابێتە سەر زەوی، لە نێوان هەموو کۆگا پەڕۆ کۆنەکانی دیکەدا. رۆحیشی لە ئاسمانەکەدا خۆی خستبووە مەترسیەوە، لەناو ئەستێرەکاندا بە

چاو تروکاندنێک رەت ئەبوو، لە هەموو ئەو فەزایەی کە تەواوی ژیانی بەس نەبوو بۆ ناسینی.

پاشان وەک تراویلکەیەک شارە سەیرەکان دەرئەکەوتن، کۆشکە بەردینە سپیەکان، قەڵا و باخە گەورەکان بە ئاوی رەوانەوە، درەختە پڕ مێوەکان، تەوقە گوڵ و کانیەکان کە کیژۆڵەکان بە پێکەنینەوە ئاپورەیان دابوون، هەموو ئەمانەی بە روونی ئەبینی، لە ئاوە فێنکەکەدا ئەخزی، ئاوی لە تاڤگەکان ئەخواردەوە، یەک بە یەکی مێوەکانی ئەچێشت، هەموو بۆنێکی هەڵدەمژی، بەڵام لە هەموو سەیرتر ئاهەنگێک بوو کە کاتێ رۆحی لە جەستەی دەرئەهات، ئەیبیست.

هەرگیز شتی وای نەبیستبوو، دەنگی ژنێکی لاو کە بە زمانی شلۆ ئەیخوێند، ئاوازێکی نەرم کە لە هەوادا ئەبزوا و هەمیشە هەر هەمان ئاوازی دووپات ئەکردەوە.

«رۆژێ، ئای رۆژێ، قالاوەرەشە سپی ئەبێت، دەریا وشک ئەبێ، هەنگوێن لە گوڵی کاکتوس‌دا دەردێت، بەلقەکانی ئەقاقیا نوێن ساز ئەکەن، ئای رۆژێ ئیتر ژەهر لە زاری‌ماردا نیە، ئیتر گوللەکان مەرگ هێنەر نین، چونکە ئەو رۆژەیە کە من ئەوینەکەم بەجێ دێڵم...»

ئەم دەنگە روون و نەرمە لە کوێوە دێت؟ "نوور" هەستی ئەکرد بیری بۆ دوورتر ئەخزێ لە زەوی و ئاسمان تێئەپەرێ بەرەو وڵاتێ کە هەورەکان پڕ لە بارانن، رووبارە قووڵ و گەورەکان، شوێنێ کە ئاو بێ‌وچان رەوانە.

«رۆژێ، ئای رۆژێ، "با" ئیتر لە سەر زەوی هەڵناکات، دەنکە لمەکان وەک شەکر نەرمن، لە ژێر هەر بەردێکی جادە کانیەک بەتەمای منە، رۆژێ، ئای رۆژێ، زەردەواڵەکان گۆرانیم بۆ ئەڵێن، چوونکە ئەوە رۆژێکە من ئەوینەکەم بەجێ‌دێڵم...»

نەرەی گومی تۆفان دێت، سەرما و مەرگ زاڵن.

«رۆژێ، ئای رۆژێ هەتاو لە شەودا هەڵدێت، ئاوی مانگ لە جۆگەلەیەکی سەر زەوی رێچکە ئەبەسێ. رۆژێ، ئای رۆژێ، ئەبینم کە سێبەرەکەم سەمام بۆ ئەکات چوونکە ئەوە رۆژێکە ئەوینەکەم بەجێ‌دێڵم...»

لەوێوەیە، کە فەرمانی نوێ ئەنێردرێت، فەرمانێ کە پیاوە شینەکانی بیابان راو ئەنێ، ترس بە هەموو لایەکدا زاڵ ئەبێت.

«رۆژێ، ئای رۆژێ، هەتاو ئەکوژێتەوە، زەوی تا ناوەندی شەق ئەبا، لم دەریا دائەپۆشێ، چاوم ئیتر رووناکی نابینێ، ناوت ئیتر بە زارمدا نایەت، دڵم ئیتر لێ نادات، چونکە رۆژێکە کە من ئەوێنەکەم بە جێ دێڵم... »

دەنگەکە بە سرتەسرت دوور ئەبێتەوە، "نوور" دیسان ئاوازە خەمین و ئارامەکەی جەنگاوەرە کوێرەکە ئەبیسێتەوە کە بۆ خۆی قسە ئەکات و بینایی بەرەو ئاسمان وەرچەرخاندووە کە "نوور" نایبینێ.

یەکێ لەو شەوانە کاروانەکەی "مائەلعەینەین" گەیشتنە قەراخ درا، ئەوپەڕ کێوەکان، بەدەم داگەڕان بەرەو رۆژئاواوە دووکەڵی ئوردووگاکانی دەستەی لارداف و "سەعدبوو" یان چاو پێکەوتبوو. بە دیتنی یەکتر تۆی هیوا و ئومێد لە دڵیاندا روا بوو. باوکی "نوور" هاتبوو بۆلای و کۆڵەکەی بۆ هەڵگرتبوو:

جەنگاوەرە کوێرەکە پرسیبووی :لە کوێین؟ ئێرایە؟

"نوور" بۆی روون کردبووە کە لە بیابان تیپەڕیون و ئیتر لە ئامانج زۆر دوور نین.

ئەو شەوە بۆ ئەوان وەک جەژن وابوو. دوای ماوەیەکی زۆر دیسان ئاهەنگی گیتار و تەپڵەکانیان و ئاوازی روونی فلووتەکان ئەبیسرا.

شەو، دۆڵەکە هێمن تر ببوو، بۆ ئاژەڵەکانیان گژوگیایان پەیدا کردبوو.

"نوور" لەگەڵ دایک و باوکی نانی هەرزەن و خورمای خواردبوو، بە جەنگاوەرەکەشیان دابوو. بەسەرهاتی رێگاکەیان گێرابوۆە، لە "ساگیت ئەلحەمرا" تا قەبری پیرۆزی "سەیدی موحەممەد ئەلقانی"، ئەمجا دەستی شەرکەرە کوێرەکەی گرتبوو و لە نێوان کێڵگە تەپ و تۆزاویەکە تا دەشتە وشکەکەی درا تیپەڕیبوو.

ئەویا پڕ بوو لە مرۆڤ و ئاژەڵ، چونکە هەموو ببوون بە یەک دەستە، مرۆڤ و ئاژەڵەکانی کاروانی شێخی گەورە، لەگەڵ چادرنشینەکانی «درا» و چادرنشینەکانی

«تاسوف»، «موسەید»، «تکارت»، «ئێل کابا»، «سەید ئیبراهیم ئەدهەم»...

هەموو ئەوانەی کە بەدبەختی و هەڕەشەی هێرشی فەرەنسەویەکان، لەو مەڵبەندانە راوی نابوون و ئاگادار ببون کە شێخی گەورە، "مائەلعەینەین" بۆ دەرکردنی بێگانەکان لە وڵاتی ئیمانداران، بۆ شەڕی پیرۆز (جیهاد) ڕێ کەوتووە.

ئیتر ئەو چاڵۆکانەی کە مەرگ لەڕیزی ژن و پیاوەکاندا ئەیکەند، نەئەبینرا، تەنیا پیاوە بریندار و نەخۆشەکان ئەبینران، مناڵە بچووکەکان کە لە باوەشی دایکیاندا بە ئارامی بەدەم یاو و لەرزەوە ئەمردن. لە هەموو لایەک لەسەر سێلاوگە وشکە رەش هەڵگەڕاوەکە تەنیا ئەم تارماییانە کە ئەهاتن و ئەچوون ئەبینران و مێگەلی مەڕ و بزنەکان و پیاوە وشترسوار و ئەسپ سوارەکان کە بەرەو چارەنووسیان ملیان نابوو.

ماوەی رۆژانێکی زۆر لە دۆڵی هەراوی «درا» سەرئەکەوتن. لەسەر پانتایی لمە شەقار بردووەکە ئەتوت زەویەکە لەناو تەنووردا برژاوە و رەق هەڵاتووە، لەسەر ئاستی چەمەکە، لەویا کە هەتاو بە تاقی ئاسمانەوە وەک شۆڵەیەک ئەگڕا، لەوبەر دۆڵەکە پیاوەکانی "لارداف" و "سەعد" بوو و ئەسپەکانیان لە سێلاوگەیەکی تەنک بەرەڵاکردبوو و ژن و پیاو و ئاژەڵەکان ملی جادەکەیان گرتبووە بەر.

جەنگاوەرانی "مائەلعەینەین" لەدوای هەموویانەوە بەسەر وشترەکانیانەوە بوون. "نوور"یش دەستی کوێرەکەی گرتبوو و لەگەڵیان بوو، زۆربەی سەربازەکانی "مائەلعەینەین" پیادە بوون، بە یارمەتی چەک و نێزەکانیان لەکەناوەکان سەرئەکەوتن، هەر ئەو شەوە کاروانەکە گەیشتە چاوانەیەکی قووڵ کە پێیان ئەوت «عەین راترا»، کە لە «تۆرکۆز» لە داوێنی کێوەکان زۆر دوور نەبوو.

وەک هەموو شەوێ "نوور" بەرەو سەرچاوەی ئاوەکە رۆیشت کە ئاو بۆ کوێرەکە بێنێ، دەستنوێژیان گرت و نوێژیان خوێند. لە نزیکی جەنگاوەرانی شێخ بۆ خەوتن ئامادە بوون.

"مائەلعەینەین" رەشماڵەکەی دانەمەرزاندبوو، وەک بیابانیەکان لە دەرەوە ئەخەوت، تەنیا پاڵتۆکەی بە خۆیەوە پێچابوو ، لەسەر رووکەشی زینەکە

هەڵتروشکابوو، چونکە کێوە بەرزەکان ئابلۆقەیان دابوون شەو خێرا داهات. لەسەرما لەرزیان کردبوو، جەنگاوەرە کوێرەکە ئیتر ئاوازی نەئەخوێند، لەوانەیە لەبەر شێخ نەیویّرابێت، یان ئیتر وزەی لانەمابوو. کاتێ "مائەلعەینەین" و جەنگاوەرەکانی شێویان ئەکرد، نان و چایی بۆ "نوور" و هەڤاڵەکەیشی نارد. "نوور" هەستی کرد کە خۆشترین چایەک بووە تا ئەو کاتە خواردبووی.

خوراکەکە و ئاوی تازەی چاڵەکە وەک رۆشنایەک لە جەستەیانداهەموو وزەو هێزەکانی پێدابوونەوە "نوور" بەدەم سەیر کردنی تارمایی دانیشتوی پیاوە پیرەکە، کە لەناو پاڵتۆ سپیەکەی خۆی داپێچابوو، شێوی ئەکرد. جارجار خەڵکەکە لە شێخ نزیک ئەبوونەوە، بۆئەوە دۆعایان بۆ بکات، ئەویش لەلای خۆی دایئەنان و دۆعای بۆ ئەکردن، لە نانەکەی پێ ئەدان و لەگەڵیان ئەدوا. ئەوانیش داوێنی پاڵتۆکەیان ماچ ئەکرد و دوور ئەکەوتنەوە. سەحرانشینەکانی «درا» بوون، شوانە جل شڕەکان، یان ژنە شینەکان کە مناڵەکانیان لەناو پاڵتۆکانیان داپێچابوو، ئەیانەویست شێخ ببینن. بۆ ئەوە وزەیان پێ بدات و هیواداریان کات و زامەکانیان تیمار بکات.

شەو، "نوور" لە خەو راچڵەکی، جەنگاوەرە کوێرەکە بەرەو روخساری چەما بووەوە، رووناکی ئەستێرەکان بە شێوەیەکی نادیار روخسارە پڕ لە دەردەکەی ئەدرەوشاندەوە، کاتێ "نوور" بە ترسەوە خۆی کشاندە دواوەوە، پیاوەکە بە دەنگێکی نزم وتی:

- بینایم پێ ئەداتەوە؟ من ئەتوانم دیسان ببینم؟

"نوور" وتی :نازانم.

جەنگاوەرە کوێرەکە ناڵاندی و خۆی خست بەسەر زەویدا، سەری کەوتە ناو تەپ و تۆزەکە، "نوور" چاوی بە دەور و بەریدا گێراند، قووڵایی دۆڵەکە، لە داوێنی کێوەکاندا، ئیتر جمە و خشپەیەکی نەئەدی. تەنانەت سرتەیەکی نەئەبیست، لە هەموو لایەک پیاوەکان نووستبوون، لەبەر سەرما خۆیان لەناو جلەکانیان داپێچابوو، تەنیا لەسەر رووکەشی زینەکە ئەتوت ماندوویەتی و خەو مانای نیە. "مائەلعەینەین" ماقی

دیمەنی شەو ببوو، "نوور" سەری خستە سەر باسکی و ماوەیەکی زۆر چاوی بڕیە پیاوە پیرەکە، کە نوێژی ئەخوێند، ئەتوت جارێکیتر لە خەوێکی بێکۆتایی دایە. خەوێ گەورەتر لە خۆی کە بەرەو دونیایەکیتر ئەیبرد. هەر رۆژ لەگەڵ هەڵاتنی هەتاودا پیاوەکان مات و خامۆش کۆڵەکانیان هەڵدەگرت، ژنەکان مناڵەکانیان بە کۆڵیانەوە ئەپێچایەوە، ئاژەڵەکانیش قوت ئەوەستان، سمیان لە زەویەکە ئەگیراند و تەپ و تۆزیان هەڵدەبەزاندەوە.

ئەمە فەرمانی پیرەمێردەکە بوو کە لەگەڵ تینی هەتاو و مەستی «با»دا ئەویش دەرئەچوو.

بەرەو باکوور، لە نێوان کێوە لەت لەتەکانی «تایسا» ئەکەوتنەرێ و لە درێژایی تەنگەڵانە ئاگرینەکان کە لە بناری چیایەکی ئاگری تێئەپەرێ ئەکەوتنە رێ.

برێجار، شەوانە، کاتێ ئەگەیشتنە بەر چاوانەکە، ژن و پیاوە شینەکانی بیابان، شیری دەڵەمە و نانی هەرزەنیان ئەهێنا. شێخی گەورە دۆعای پیا ئەخوێند، بۆ مناڵەکانیان کە نەخۆشی سک و چاویان بوو. "مائەلعەینەین" ئاوی دەمی لەگەڵ خۆڵەکە تێکەڵ ئەکرد و ئەیساوی بە ئەندامەکەدا، پاشان دەستی لەسەر تەوێڵیان دائەنا.

ژنەکان هەروا کە هاتبوون بەرەو بیابانە سوورەکە ئەگەڕانەوە. برێجاریش پیاوەکانیان بە چەک و نێزەکانیانەوە ئەچوونە ریزی جەنگاوەرەکان.

ئەوانە گوند نشینە روخسار زبرەکان بوون، بە قژی کاڵ و خەنەیی و چاوی سەوزی سەیرەوە. لەوبەر کێوەکان، کاروانەکە گەیشتە دارستانی خورمای «تایدالت»، شوێنێ کە چەمی «نون» و ڕێگای «گولیمینی» دەستی پێ ئەکرد.

"نوور" ئەیویست کە لەوێدا بحەسێتەوە و تێر و پڕ ئاو بخۆنەوە، بەڵام دارستانی خورماکە بچووک بوو، «با»ی دەریا و وشکەساڵی دایانڕزاندبوو، تەپۆڵکە گەورە رەنگ خۆڵەمێشیەکان، مەڵبەندەکەیان قووت دابوو و ئاوەکەش هەر قوراو بوو. دارستانی خورماکە، کەسی لێنەبوو، تەنیا چەن پەککەوتەکە لە برسا لەوێ گرسابوونەوە ئەمجا دەستەی "مائەلعەینەین" رۆژی دوایی، لە درێژایی چەمە وشک

هەڵاتووەکە بەرەو گولمینی ڕێ کەوتبوون.

پێش لەوە بڕۆنە ناو شار، دەستەی کوڕەکانی "مائەلعەینەین" لە پێشەوە ڕۆیشتبوون و دوو ڕۆژ دواتر گەڕابوونەوە .هەواڵی خراپیان پێ بوو: سەربازە مەسیحیەکان لە «سیدی ئیفنی» لەکەشتی دابەزیبوون و ئەوانیش بەرەو باکوور گەڕابوونەوە. لارداف ئەیویست بەهەر لەونێ بووە، بەرەو "گولیمین" بڕۆن و لەگەڵ فەڕەنسە و ئیسپانیۆلیەکان بە شەڕ بین، بەڵام شێخ تەنیا ئیشارەی بە ئوردووگاکە کردبوو و پرسیبووی : ئەوە سەربازەکانتن؟

"لارداف" سەری لەقاندبوو، شێخی گەورە فەرمانی ڕێکەوتنی دابوو، لە پانتایی گولمینین بەرەو دارستانی «ثایت بوخا»کان، پاشان لە نێوان کێوەکانەوە تا ڕێگای «بووئیزاکارن» لە ڕۆژهەڵاتەوە.

گەرچی ماندوو بوون، ژن و پیاو ماوەی چەندین حەوتوو لە نێوان کێوە سوورەکاندا بە درێژای سێڵاوگە وشکەکە تێپەڕی بوون. پیاوە شینەکان و ژنەکان، شوانەکان و مێگەلەکانیان، وشترەکۆپاندارەکان و ئەسپ سوارەکان ئەبوایە لە نێوان گاشەبەردەکانەوە جێگای خۆیان کەنەوە و ڕێگایەک لەسەر کارێزەکان پەیدا بکەن. بەمجۆرە گەیشتبوونە شاری پیرۆزی سەیدی ئەحمەد، سەرۆکی ئاکرۆبات و چالاکیەکان.

کاروانەکە لە هەموو جێگایەکی دۆڵە وشک و بایرەکە جێگیر ببوون، تەنیا شێخ وکوڕەکانی لەگەڵ کوڕەکانی «گودفیا» لە ئاقاری قەبرەکە مابوونەوە و نەجیبزادەکان ئەهاتن پەیمانی ئەمەگناسیان لەگەڵ کوڕەکانی ئەبەست و نوێژیان بە جەماعەت ئەخوێند. لەژێر ئاسمانە پڕ ئەستێرەکەدا لای ئاگرەکاندا، ژن و پیاو لەدەور قەبرە پیرۆزەکە کۆ ببوونەوە. تەنیا قرچە قرچی دارە وشکەکان بێدەنگی ئەهەژاند. "نوور" تارمایی ناسکی شێخی ئەبینی لە سەر عەرزەکە هەڵتروشکابوو و بە دەنگێکی بەرز زیکری ئەکرد، بەڵام نوێژی ئەو شەوە بێ ئاهەنگ و ناڵە بوو. چونکە مەرگ گەلێ لێیان نزیک بوو و ماندوویەتی گەروویانی ئەگووشی. تەنیا دەنگی زۆر نەرم و هێمنی

شێخ بوو که وەک دووکەڵێکی سووک لە بێدەنگیدا ئەیخوێند. "نوور" بینایی بە دەوروبەریدا گێڕا، هەزاران پیاوی پاڵتۆ خوری لەبەر، لەسەر زەویەکە دانیشتبوون. دژوارترین و بە ئازارترین دۆعایەک بوو کە بیستبوویان. کەس نەئەبزوا، تەنیا جار جار ژنێ ئەچوو ناڵەکەی بخەوێنێت، یان قۆزەی پیرێک بەرز ئەبووەوە. لە دۆڵە بەرزەکان هەوا نەئەبزوا، شۆڵەی ئاگرەکان زۆر بە تەوژمەوە هەڵکرابوون، شەوێکی جوان و بەستەڵەک بوو، ئاسمان سیخناخ لە ئەستێرە، پاشان تیشکی مانگ لە ئاسۆوە شاڵاوی ئەهێنا، لەسەر تاشەبەردەکانەوە، خەرمانەی زێوینی مانگ تا ئەهات بەرەو تاقی ئاسمان سەرئەکەوت. تەواوی شەو دۆعا و نوێژی خوێندبوو. لە کاتێکدا ئاگرەکان یەک لەدوای یەک دامرکابوونەوە و ماندوویەتی پیاوەکانی لەپێ خستبوو.

"نوور" دوو سێ جار بۆ میز کردن بۆ پشت دەوەنەکان لە قووڵایی دۆڵەکە دوور کەوتبووەوە، خەو نەئەچووە چاویەوە، ئەتوت یاو جەستەی سووتاندووە. لە تەنیشتیەوە دایک و باوکی و خۆشکەکانی وەنەوزیان ئەدا، خۆیان لەناو پاڵتۆکانیاندا داپێچابوو. جەنگاوەرە کوێرەکەش سەری لەسەر زەویە ساردەکە دانابوو و خەوی لێ کەوتبوو. "نوور" بینایی لەسەر پیاوە پیرەکەی تەنیشت قەبرەکە گرساندبووەوە کە بە ئەسپایی لە بێدەنگی شەودا ورتەی ئەهات، ئەتوت منداڵ رائەژەنێ.

لەگەڵ هەڵهاتنی رۆژ، کاروانەکە رێکەوتەوە، لەگەڵ "ئایدەکان و موسا"، کێونشینەکانی «ئیلیر»، «تافرنی»، «ئیداگوگمار»، «ئیفرانەکان»، «تیرمی»و... و هەموو ئەوانەی ئەیانویست بەدوای "مائەلعەینەین"دا بڕۆنو بۆ دامەزرانی حکوومەتی سەڵتەنەتی خوایی شەڕ بکەن. هێشتا رۆژانێکی زۆریان لەبەر بوو کە لەکێوەکانی بیابان و لە درێژای کە ناوەکان و سێلاوگە وشکەکان تێپەڕن. هەر رۆژ هەتاو بەتینەوە ئەسووتا، تینوویەتی و ئاسمانە هەر سپیەکە، گاشەبەردە سوورەکان و تەپ و تۆز کە ئاژەڵ و مرۆڤەکانی ئەخنکاند.

"نوور" لەبیری چووبووەوە نیشتەجێ بوون لە جێگایەکدا چۆنە ؟ ئیتر چاوانەکەی لەیاد نەمابوو، کاتێ ژنەکان بە گۆزەکانیانەوە بۆ ئاو ئەچوون و وەک

باڵندەکان جریوە جریویان دەست پێ ئەکرد، ئاوازی شوانەکانی لەبیر نەبوو، گەمەی منالەکان لە نێوان لمی تەپۆلکە لمەکاندا، ماوەیەکی زۆر، بێوچان ڕێی بڕیبوو، تەنیا تەپۆلکە یەک جۆرەکانی دیبوو و کەناوەکان و تاشەبەردە سوورەکان بڕیجار حەزی ئەکرد لەسەر بەردێک دانیشێت. هەر بەردێ بێت، لە قەراخ جادەکە تێپەڕینی درێژایی کاروانەکە سەیر کات و تارمایی ڕەشی پیاوەکان و وشترەکان کە لە هەوا لەرزۆکەکەدا کە وەک سەراوێ خەریک بوو ئەکوژایەوە و نوقم ئەبوو ڕێ کەوتبوون، بەڵام دەستی جەنگاوەرە کوێرەکە لەسەرشانی وێڵی نەئەکرد. پاڵی پێوە ئەنا و ناچاری ئەکرد ڕێ کەوێ.

کاتێ ئەگەشتنە گوندێ، ئەوەستان. ناوی گوندەکە دەمبەدەم بە ورتەورت لەنێوانیاندا ئەگەڕا، «تیرمی»، «ئانیزی»، «ئاساکا»، «ئاسێرسیف»...

ئێستا لە درێژایی چەمێکی ڕاستەقینەوە کە ئاوەکەی ڕەوان بوو، تێئەپەڕین. ڕۆخی چەمەکە پڕ ببوو لە ئەقاقیای سپی، پاشان لە ڕیخەڵانێکی هەراوکە وەک خۆی سپی بوو و بەشەوارەی ئەخستن، تێپەڕین. یەکێ لەو شەوانە کاتێ کاروانەکە جێگیر بوو، دەستەیەک لە جەنگاوەرەکان لەگەڵ پیاوێکی ئەسپ سوار کە پاڵتۆیەکی گەورەی سپی لەبەر بوو لە باکوورەوە هاتن.

شێخی گەورە «لائوسین» بوو کە جەنگاوەرەکانی بۆ یارمەتی و خۆراکی بۆ مسافرەکان هێنابوو. خەڵکەکە زانیبوویان کە سەفەرەکەیان کۆتایی پێهاتووە، چونکە گەیشتبوونە دۆڵی چەمی گەورەی "سوس" شوێنێ کە ئاو و لەوەڕگە بۆ ئاژەڵەکان و زەوی بۆ هەموو مرۆڤەکان پەیدا ئەبوو. کاتێ هەواڵەکە دەمبەدەم لە نێوان مسافرەکاندا بڵاو ئەبووەوە، "نوور" جارێکی دیکە هەستی بە سێبەری مەرگ و بۆشایی کردبوو، وەک کاتێ لە سماراوە ویستبوویان ڕێکەون.

خەڵکەکە لەناو خۆڵەکەدا هەڵیان ئەخستەوە و ئەیانقیژاند و بانگیان لەیەک ئەکرد:

- گەیشتین... گەیشتین...

جەنگاوەرە کوێرەکە شانی "نوور"ی ئەگووشی و ئەویش ئەیقیژاند:
- گەیشتین...

بەڵام دوو رۆژی دواتر گەشتنە دوڵی گەورەی چەمەکە، لەبەر شاری «تارودانت» بۆ ماوەی چەندین سەعات لەگەڵ رەوتی ئاوی چەمەکەدا رێیان ئەبری، گەرچی چەمەکە ئاوی هەبوو، رۆخەکەی وشک و رووت بوو و زەوی رەق هەڵاتبوو.

هەتاو و «با» سووتاندبوویان، "نوور" لەسەر بەردەڵانی رۆخی چەمەکە، جەنگاوەرە کوێرەکەی لەگەڵ خۆی ئەبرد، بە پێچەوانەی تیشکی ئاگرینی هەتاو، ئاوەکە سەهۆڵی بەستبوو. چەند دەوەنی ناسک لەسەر دوورگە بچووکەکانی بەردەڵانی رۆخەکەی شین ببوون. هەروەها چەن کۆتەی سپی گەورە لەویا بوو کە لافاو لەگەڵ خۆی هێنابووی. "نوور" هەستی مەرگی لەبیر چووبووەوە و هەستی بە بەختەوەری ئەکرد، چونکە ئەویش وای ئەزانی سەفەرەکەیان کۆتایی پێ هاتووە. ئەویا هەر ئەو سەرزەویە بوو کە "مائەلعەینەین" بەرلە بەجێ هێشتنی "سمارا"، بەڵێنی پێ دابوون. هەوا سیخناخ بوو لە بۆن و بەرامەی ئەوەڵی بەهار. "نوور" بۆ جاری یەکەم بە تامەزرۆییەوە بۆنەکەی هەڵدەمژی، لەسەر ئاستی رەوتی ئاوەکە دەعباکان و زەردەواڵە و مێشە ناسکەکان سەمایان ئەکرد. ماوەیەکی زۆر بوو "نوور"گیانلەبەری نەدیبوو، بۆیە لە دیتنی ئەو مێش و زەردەواڵانە هێندە بەختەوەر ببوو، تەنانەت کاتێ مێشە کەرانەیەک بەسەر جلەکانیەوە گەزتبووی، تووڕە نەبوو، تەنیا بە گرتنی لەناو لەپی دەستیا رازی ببوو.

لەوبەر رۆخانەی "سووس"ەوە، لای کێوە سوورەکەدا، شارە گەورەکە بە ماڵە گڵێنەکانیەوە وەک خەیاڵێکی ئاسمانی قوت وەستابوو. شارێکی خەیاڵی کە ئەتوت لە رۆشنایی هەتاودا هەڵواسراوە و چاوەروانی مرۆڤەکانی بیابانە، بۆ ئەوە پەناگا و جێگایان پێشکەش بکات. "نوور" هەرگیز شاری بەو جوانیەی نەدیبوو، دیوارە بەرزە بەردینە سوورەکان، بێپەنجەرە، لەبەر تیشکی هەتاوی ئاوابووندا، ئەدرەوشانەوە،

خەرمانەی تەپ و تۆز لەسەر شارەکە وەک گەردەی گوڵ، شەپۆلی لێئەدا و بە هەورە سیحراویەکەیەوە شاری ئاپوورە دابوو. مسافرەکان لە دۆڵەکە بەرانبەر شارەکە وەستابوون. ماوەیەکی زۆر بەترس و ئەوینەوە چاویان تێبریبوو. ئێستە بۆ جاری یەکەم لەماوەی سەفەرەکەیاندا، هەستیان کردبوو کە چەندە ماندوون.

جلەکانیان شڕ ببوو، قاچیان بە پەڕۆ شڕی خوێناوی داپێچابوو، لێو و پێڵوەکانیان لەبەر تینی هەتاوی بیاباندا سووتابون. لەسەر بەردەڵانی چەمەکە جەستەیان خستە سەر زەویەکە، برێکیان ڕەشماڵەکانیان دامەزراندبوو، یان بە لق و گەڵاکە پریان کردبووەوە. "مائەلعەینەین" وکورەکانیشی لە ڕۆخی چەمەکە وەستابوون، وەک بڵێی ئەوانیش هەستیان بە ترسی خەڵکەکە کردبێ.

ئێستا ڕەشماڵەگەورەکانی سەرۆک هۆزەکانیان دائەمەزراند، باری وشترەکانیان دائەگرت. شەو لەسەر خاکرێژەکان، داهاتبوو، ئاسمان لە پەل‌وپۆ کەوتبوو. زەویە سوورەکە تاریک و لێڵ ببوو. تەنیا لووتکەکانی «ئەتلاس»، «تیشکا»، کێوی «تینیرگوێت» کە سەرماریژ داپۆشیبوون، هێشتا لەبەر هەتاودا ئەبریسکانەوە.

لە دۆڵەکە شەو داهاتبوو، دەنگی بانگی شێوان لەشار بەرز ببووەوە، دەنگێ کە وەک ناڵە و هاوارێکی سەیر دەنگی ئەدایەوە.

لەسەر بەردەڵانی ڕۆخی چەمەکە، مسافرەکانیش سوژدەیان ئەبرد و نوێژیان ئەخوێند. بێ ئەوەی دەنگیان بەرز بکەنەوە. نوێژەکەیان لەگەڵ خوڕەی ئارامی ئاوەکە ڕەوان ببوو.

"نوور" بەیانی کە لە خەو هەڵسا، سەری سوور مابوو، هەستی بە بەردەڵانە تیژەکە نەکردبوو کە برینداریان کردبوو، لەخەو ڕانەچڵەکیبوو، تەنانەت هەستی بە سەرما و نمی چەمەکە نەکردبوو.

کاتێ لە خەو هەڵسابوو، تەم و مژ بە ئەسپایی لە درێژایی دۆڵەکەدا ئەگەڕا، ئەتوت رووناکی ڕۆژ پاڵی پێوە ئەنێ. لە ڕۆخی چۆمەکە، لە نێوان پیاوە خەوتووەکاندا، ژنەکان بۆ ئاو و کۆکردنەوەی چیلکە ئەچوون. مناڵەکان لەژێر

تاشەبەردەکاندا بەدوای «مێگو»دا ئەگەڕان، بەڵام "نوور" لە دیتنی شارەکە سەری سووڕ مابوو. لە هەوای خاوێنی دەمەوبەیاندا، لە بناری کێوەکاندا، شاری "تاروودانت"، قەڵایەکی بەرز و ڕاوەستاو بوو. بەردی سووری دیوارە بەرزەکانی ، بانێژەکان و بورجەکانی روون و ئاشکرا بوون. ئەتوت لە تاشەبەردی کێوێکدا هەڵکنرابوو.

هەڵمێکی سپی جار جار لە نێوان سنگی چەمەکە و شار تێئەپەڕی و شارەکەی ئەشاردەوە. ئەتوت قەڵاکە لەسەر دۆڵەکەوە هەڵواسرا بوو، جۆرە کەشتیەکی زەوینی کە بە ئارامی لەسەر دوورگەی کێوە بەفراوەکاندا، ئەخزی. "نوور" نەیدەتوانی بینایی لەسەر بگوێزێتەوە، دیوارە بەرزە بێ پەنجەرەکان هۆش و هەواسیان لەلا نەهێشتبوو. شتێکی گەلێ سەیر و سیحراوی و پڕمەترسی، ئەتوت مرۆڤی تێدا ناژی، بەڵکوو جنۆکەی ناائاسایی تیا ئەژیان.

هێدی هێدی ئاسمان رووناک ئەبووەوە، ئاڵ، پاشان بوو بە عەمبەری ڕەنگ، ئەمجا ڕەنگی شین هەمووی داپۆشی. رووناکی لەسەر دیوارە گڵینەکان پرتەپرتی ئەهات، لەسەر بانێژەکان لە ئاستی سەر باخی پرتەقاڵەکان و دارخورما بەرزەکاندا ئەلەرایەوە.

بێ جووڵە لە نێوان مرۆڤەکانی بیاباندا، "نوور" چاوی بڕیبووە شارە سیحراویەکە، کە لە خەو هەڵدەستا دووکەڵە ناسکەکان بەرەو ئاسمان هەڵئەگەڕان.

دەنگە خەیاڵی و ناواقعیەکان ئەبیسران، دەنگی ئاشنای ژیان، پێکەنینی منداڵەکان، ئاوازی ژنێکی لاو.

بۆ بیابانیەکان کە لە رۆخی چەمەکەدا بێجووڵە مابوونەوە، ئەم دووکەڵانە، ئەم دەنگانە، ئەتوت خەیاڵی و نائاساین، ئەتوت خەریکن خەوی ئەم شارە تۆکمەیەی تەنیشت کێوەکان و کێڵگەکان و دارستانی خورما و دار پرتەقاڵەکان ئەبینن.

ئێستا هەتاو بە تاقی ئاسمانەوە بوو. بەردەڵانی ناو چۆمەکەی ئەسووتاند، بۆنێکی سەیر تا ئاست ئۆردووگای سەحرانشینەکان ملی کێشا بوو. نوور هەرچی ئەکرد بۆی

راست نەئەبووەوە بۆنی چیە ؟ بۆنی توون و ساردی ڕۆژانی هەڵاتن و ترس نەبوو، بۆنێکە ماوەیەکی زۆر لە بیابانەوە هەستی پێ کردبوو، بۆنی مەستی هێنەری مەشکە و ڕۆن بوو، بۆنی ئاگردانەکان کە لە خەڵووزی دار سدر ئەگەشایەوە، بۆنی گشنیز و بیبار و پیاز بوو.

"نوور" بێ جووڵە بۆ ئەوە نەوەک بۆنەکە نەمێنێ، بە تامەزرۆییەوە هەڵیدەمژی. جەنگاوەرە کوێرەکەش هەستی بەو بەختەوەریە کردبوو، هەموو خەڵک کپ و خامۆش و بێجووڵە مابوونەوە، هێندە چاویان نەئەتروکاند، چاویان هاتبووە ئێش، بینایان لە دیوارە بەرزە سوورەکەی شار هەڵنەئەگرت. سەیری شارەکەیان ئەکرد کە هەم دوور بوو و هەم نزیک. شارێک کە پێیان وابوو هەر ئێستە دەرکەکانی ئەکرێتەوە و هەر بۆیە دڵیان تا بێ توندتر لێی ئەدا.

لە دەور و بەریاندا ڕۆخی بەردەڵانی چەمەکە لەتینی گەرمای ڕۆژدا، ئەلەرایەوە. ئەوانیش بێجووڵە ماقی شارە سیحراویەکە بوون، پاشان کاتێ هەتاو زۆرتر لە ئاسمانە شینەکەدا هەڵگەڕا، یەک لە دوای یەک سەریان بە داوێنی پاڵتۆکانیان داپۆشا.

# ژیان لای کۆیله‌کان

پاڵی داوه‌ته‌وه به ته‌خته‌به‌نی که‌شتیه‌که‌وه و بینایی به‌سه‌ر هێڵی باریکی زه‌ویـدا گرساندووه‌ته‌وه، ئاسۆ وه‌ک دوورگه‌یه‌ک خۆی ده‌رئه‌خات. گه‌رچی ماندووه به‌ڵام به هه‌موو هێزه‌وه چاوی بڕیوه‌ته زه‌وی. ئه‌یه‌وێ ماڵ و شه‌قامه‌کان، ره‌نگه تـه‌نانه‌ت تارمایی خه‌ڵکه‌که‌یش بناسێته‌وه.

مسافره‌کانیش له ته‌نیشتیا کۆ بوونه‌ته‌وه. ئه‌قیڕێنن و سه‌ر و ده‌ستیان ئه‌بزوێنن و به سۆز و شه‌وقه‌وه ئه‌دوێن. ماویه‌کی زۆره چاوه‌ڕوانی ئه‌م ساته‌ن. مناڵ و مێرمنداڵێکی زۆریش هه‌ن. نیشانه‌گه‌لێک به‌سراوه به جله‌کانیانه‌وه که ناو و رۆژی له‌دایک بوون و ناوونیشانی که‌سێ که له "مارسێی" چاوه‌ڕوانیانه، نووسراوه، له خوار نیشانه‌که‌وه ئیمزا و مۆرێک و خاچێکی سووری بچووک له ناو جه‌غزێکی ره‌ش‌دایه.

"لالا" رقیه‌تی له خاچه بچووکه سووره‌که، هه‌ست ئه‌کات له‌سه‌ر جاکه‌ته‌که‌یه‌وه

پێستی ئەسووتێنێ و کەم کەم نیشانەکەی بەسەر سنگیەوە ئەمێنێتەوە. تۆف و کرێوەیەکی سارد لەسەر عەرشەی کەشتیەکە هەڵدەکا. شەپۆلە قورسەکان سەفحەی کانزایی کەشتیەکە ئەلەرێننەوە.

ئازارێ بە دڵیدا ئەگەڕێ، تەواوی شەو خەوی لێ نەکەوتبوو، مناڵەکان قوتوە شیرەکانیان کە خاچی سووری جیهانی پێیان دابوون، تلێر ئەکردەوە. بۆ هەموانیش کورسی درێژ نەبوو. ناچار بوو لەسەر تەختی کەشتیەکە بنوێ. لە نێوان هاڵاوی هێڵنج هێنەری دوای کەشتیەکە و لەناو بۆنی مازووت و گریس و لەرزەلەرزی ماتۆری کەشتیەکەدا.

ئێستا یەکەمین گاکیەکان لە ئاستی سەر دوای کەشتیەکەوە بە قیژە قیژ و قیرە قیر باڵیان گرتووەتەوە. ئەڵێی لە هاتنی ئەم کەشتیە تووڕەیی خۆیان دەرئەبڕن. ئەمان هەرگیز لە پاشای دەریا ناچن، رەنگیان خۆڵەمێشیەکی چڵکنە و دەنووکیان زەرد و چاویان بە توندی ئەبرووسکێتەوە.

"لالا" کازیوەی نەبینی. هێندە هیلاک و ماندوو بوو، پاڵی بە بەرزنتی دوای کەشتیەکەوە دابوو، خەوی لێ کەوتبوو. کاتێ لەخەو هەستا، هەموو لەسەر عەرشەی کەشتیەکە ماقی هێڵی زەوی ببوون. لەدوای کەشتیەکە هەر تەنیا ژنێکی لاوی رەنگ پەڕیو و منداڵێکی ساوا لەباوەشیدا بوو. مناڵە ساواکە نەخۆش بوو، لەسەر عەرزەکە رشا بووەوە و بە ئارامی ئەیناڵاند. کاتێ "لالا" نزیک بووەوە بۆ ئەوە بزانێ یارمەتی ئەوێ یان نە، ژنە لاوەکە بێ ئەوە ورتەی لێوە بێت بە چاوە بێ تینەکانیەوە چاوی تێ بڕی.

ئێستا زەوی نزیک نزیکە، لە ئاستی سەر دەریا رەنگ سەوزەکەدا کە لێوانە لە زبڵ، ئەشەکێتەوە. باران لەسەر عەرشەکە دەستی کردووە بە بارین. بەڵام کەس پەنا ناگرێ. ئاوێکی سارد لەسەر قژی لوولی مناڵەکان ئەچۆڕێتە خوارەوە و لەسەر پۆپەی لووتیانەوە تنۆک تنۆک ئەتکێتە خوارەوە. جلی فەقیرانەیان لەبەرە، کراس گەلی ناسکی بێ قۆڵ و پانتۆڵی شین یا دامەنی رەنگ خۆڵەمێشی. برێکیشیان جلی ناوچەیی

بۆریان لەبەرە. قاچە رووتەکانیان لەناو پێڵاوە چەرمە گەورەکانیاندا دیارە. پیاوە بەساڵا چووەکان کۆتی کۆن و پانتۆڵی زۆر کورتیان پۆشیوە و کڵاوی خوری ئیسکی.

"لالا" سەرنجی ژن و منالّ و پیاوەکانی دەورو بەری ئەدا ؛ پەژارە و ترس لە سیمایانەوە دیارە و روخساریان زەردە و بە هۆی ماندوو بوونەوە ئاوساون.

بۆنی دەریا لەگەڵ بۆنی ماندوویەتی و دڵەخورپێ تێکەڵ بووە. دوورتر، زەویش، وەک خالّێ لەسەر دەریا، خەمین و هیلاک دێتە بەرچاو، ئاسمان نزیکە، هەور ترۆپکی تەپۆڵکەکانی داپۆشیوە. "لالا" ورد ئەبێتەوە، نە ئەو شارە سپیەی کە "نعمانی" ماسیگر باسی لێ کردبوو، چاو ئەکات و نە کۆشک و بورج و کلیساکان. ئێستا تەنیا لەنگەرگە بێ کۆتاییەکە بە رەنگی بەرد و سیمان دیارە. کەشتیە پڕ لە مسافرەکە بە ئەسپایی ئەخزێتە ناو ئاوی رەشی چاڵاوەکانەوە. چەن پیاو راوەستاون و بێ تاقەت چاویان بڕیوەتە تێپەڕینی کەشتیەکە.

مناڵەکان بەهەموو هێزیانەوە ئەقیڕێنن و دەستیان رائەوەشێنن، بەڵام کەس وەڵامیان ناداتەوە. بارانێکی سارد و ورد، بێ‌وچان ئەبارێ. "لالا" بۆ ئاوە چەور و رەشەکەی چاڵاوەکە ئەڕوانێ، پڕە لە زبڵ، تەنانەت گاکیەکان لەویا نافڕن.

رەنگە هەرشار بوونی نەبێ ؟ "لالا" بۆ لەنگەرگە تەرەکان ئەڕوانی. تارمایی کەشتیە باربەرە وەستاوەکان و جەرسەقیلەکان، لەولاتریش خانووبەرە بێ‌جووڵە سپیەکان، دیوارێکیان لەدەور عەرشەکە درووست کردووە. کەیف و شادی مناڵەکانی کەشتیەکەی «خاچی سووری جیهانی» دائەمرکێتەوە. هەر جارنەجارێ هاوارێ بەرز ئەبێتەوە، بەڵام زۆر ناخایەنێ.

راسپاردەو نوێنەرەکان لەسەر عەرشەکە دێن و ئەچن، بە قیڕەقیڕ فەرمان ئەدەن و کەس تێ ناگات. مناڵەکان بەڕیز ئەوێسێنن و ناوەکانیان ئەخوێننەوە... بەڵام دەنگیان لەناو گرەگری ماتۆڕەکە و زەنازەنای خەڵکەکە نوقم ئەبێت.

- «... ماکێل... »

- «... سیفار... »

- «... کودیکی... »
- «... هامال... »
- «... لاژۆر... »

ئەمە هیچ مانایەکی نیە، کەس وەڵام ناداتەوە. بڵندگۆکە دەست ئەکا بە قسە کردن، ئەڵێی ئەسەرێنێ، بەسەر مسافرەکاندا جۆرە ترسێک ئەڕوێنێ. ڕێکیان بۆ بەرۆ هەڵدێن. ئەوەلایان ئەیانەوێ لە پلیکانەکانی عەرشەی سەرەوە سەرکەون بەڵام ماموورەکان بەریان ئەگرن. سەرئەنجام هەموو ئارام ئەبنەوە، چونکە کەشتیەکە بەتەواوەتی لەنگەری گرتووە و ماتۆرەکانی کوژراونەتەوە.

لەسەر لەنگەرەگەکە کۆڵێتێکی ناحەزی سیمانی بە دەلاقەی دووکەڵاویەوە هەیە، ژن و منال و پیاوەکان لە لێواری کەشتیەکەوە چەماونەتەوە. لە نێوان خەڵکەکەی خوارەوە لەوبەر کۆڵێتەکەوە، کە هەر بە ئەندازەی دەعبایەک ئەبن، بە دوای سیمایەکی ئاشنادا چاوەچاو ئەکەن.

بۆ ماوەی چەندین سەعات مسافرەکان لە عەرشەی کەشتیەکەی خاچی سووری جیهانی ئەمێننەوە، چاوەڕوانن کەسێ ئیشارەیان پێ بکات. تاکات تێئەپەڕێ، تووڕەیی منالەکان لەسەر عەرشەکە زۆرتر ئەبێتەوە. منالە بچووکترەکان دەست ئەکەن بە گریان. نالەیەکی بێوچان وەک جیرەجیر کە هیچ سوودێکی نیە، قیرە و هاواری ژن و پیاوەکان دەست پێ ئەکات. "لالا" جەستەی ئەخاتە سەر کۆگایەکی تەناف لە پەنای پەراوێزی عەرشەی ماموورەکان، جانتاکەی لە تەنیشتیەوە دائەنێ و بەدەم سەیر کردنی فڕینی گاکیە ڕەنگ خۆڵەمێشیەکان لە ئاسمانە خۆڵەمێشیەکەدا، چاوەڕوانە. سەرئەنجام کاتی دابەزین دێت، مسافرەکان هێندە ماندوون. ماوەیەک لە جێی خۆیان نابزوێن. "لالا" بەدوای خەڵکەکە تا لای کۆڵێتە گەورە خۆڵەمێشیەکە ئەڕوا. دوو سێ پۆلیس و وەرگر، لەوێ پرسیاریان لێ ئەکەن. بۆ منالەکان زووتر تەواو ئەبێ، چونکە پۆلیسەکان بە خوێندنەوەی نووسراوەی سەر نیشانەکان و نووسراوەی سەر کاغەزەکانیان، رازی ئەبن.

دوای ئەوە نیشانەکەی "لالا" ئەنووسێتەوە، پیاوەکە بۆی ئەڕوانێ و ئەپرسێ :

- ئەتەوێ لە فەرەنسە کار بکەی؟

- بەڵێ...

- چ کارێ ؟

- نازانم.

پۆلیسەکە ئەڵێ :

- کار لە ماڵاندا و لەسەر کاغەزەکە ئەینووسێ. "لالا" جانتاکەی هەڵئەگرێ و لای ئەوانی‌تر چاوەڕوان ئەمێنێ. سالۆنێکی گەورەیە و دیواری ڕەنگ خۆڵەمێشی بە گڵۆپە ئەلکتریکیەکانیەوە ئەدرەوشێتەوە. شتێکی لێ نیە لەسەری دانیشن، گەرچی لەدەرەوە سەرما و باران زۆریان هێناوە، بەڵام گەرمای سالۆنەکە خنکێنەرە.

مناڵە ساواکان لە باوەشی دایکیاندا خەوتوون، یان لەسەر عەرزەکە ڕاکشاون. مناڵە گەورەترەکان هێشتا هەر ئەناڵێنن. "لالا" لە تینوویەتی گەرووی وشک هەڵاتووە، هەر دوو چاوی لەیاودا ئەسووتێ، هێندە ماندووە، بیر لەوە ناکاتەوە چی روو ئەدات. چاوەڕوانە، پاڵی داوەتەوە بە دیوارەکەوە و ئەم پێ‌وئەوپێ ئەکا. لەوپەڕ سالۆنەکە، لەبەردەم پۆلیسەکاندا، ژنە لاوە ڕەنگ‌پەڕیوەکە بە روانینە بێ تینەکەیەوە، مناڵە ساواکەی لەباوەشیدا، لەبەر مێزی پشکێنەرەکەدا وەستاوە.

ترس و سام لە روخساریەوە ئەبارێ. بێ ئەوە ورتەی لێوە بێت، پۆلیسەکە ماوەیەکی زۆر قسەی بۆ ئەکات و کاغەزەکانی وەرگێڕی خاچی سووری جیهانی پێ نیشان ئەدات. پووشێ لە کارەکەدایە.

پۆلیسەکە پرسیاری لێ ئەکات و وەرگێڕەکە بۆی ئەگێڕێتەوە، بەڵام ژنەکە بۆیان ئەڕوانێ و ئەڵێی هیچ تێ ناگات. ئەوان ئەیانەوێ لە ڕۆیشتنی بەرگری کەن. "لالا" بۆ ژنە ڕەنگ پەڕیوەکە ئەڕوانێ کە مناڵەکەی هێندە توند بە خۆیەوە ئەگووشێ، مناڵەکە لەخەو ڕائەچڵەکێ و ئەزریکێنێ. کاتێ دایکی خێرا مەمکی ئەنێتەوە ناودەمی، ئارام ئەبێتەوە. پۆلیسەکە خەمین دیارە، ئاوڕ ئەداتەوە و بە دەور و بەریدا چاوەچاو ئەکات،

بینایی لەگەڵ "لالا"کە خەریکە لێی نزیک ئەبێتەوە، یەک ئەگرن، پۆلیسەکە ئیشارەی پێ ئەکا نزیک بێتەوە :

- تۆ بەو زاراوەیە ئەزانی قسە بکەی ؟

"لالا" ئەڵێ: با بزانم. .

"لالا" چەن وشە بە زاراوەی "شلۆ" ئەدوێ، ژنە لاوەکە ساتێ چاوی تێ ئەپەڕێ، ئەمجا وەڵامی ئەداتەوە.

- پێی بڵێ ئەم کاغەزانە لەڕووی یاساوە نین، ئیجازەی بۆ مناڵەکەی نیە.

"لالا" هەوڵ ئەدات، رستەکان وەرگێڕێتەوە، وائەزانێ ژنەکە لێی تێناگات، بەڵام لەپڕ ژنەکە ئەڕووخێت و دەست ئەکا بەگریان. پۆلیسەکە دیسان چەن وشەیتر ئەڵێ و وەرگێڕی خاچی سووری جیهانی هەڵدەسێتەوە و ژنەکە بەرەو سووچی سالۆنەکە ئەبا بۆ لای دوو یان سێ کاناپە.

خەم بەربینی "لالا"ی گرتووە، چونکە ئەزانێ کە ژنە لاوەکە لەگەڵ مناڵە نەخۆشەکەی ئەبێ بەکەشتیەکە بگەڕێتەوە، بەڵام خۆیشی هێندە ماندووە، زۆر خۆیی پێوە سەرقاڵ ناکات و ئەگەڕێتەوە بۆلای جانتاکەی، پاڵ ئەداتەوە بە دیوارەکەوە.

خەڵکەکە ئێستا ئیتر قسە ناکەن. لەسەر زەویەکە دانیشتوون و چاوەڕوانن، یان وەستاون و پاڵیان داوەتەوە بە دیوارەکەوە و ماق ماون. ئەڵێی لەگەڵ هەر چرکە و تەقەیەک، دەرگەکە ئەکرێتەوە و ئەمان ئەتوانن دەربازبن.

دوای ماوەیەکی زۆر پیاوەکانی خاچی سووری جیهانی لە سالۆنە گەورەکە تێئەپەڕن. دەرگاکە ئەکەنەوە و دەست ئەکەن بە بانگ کردنی مناڵەکان. زەنازەنای دەنگەکان بەرز ئەبێتەوە، خەڵکەکە لە نزیک دەرگاکە کۆ ئەبنەوە، "لالا" جانتا کارتۆنیەکەی بەدەستەوە، ملی بەرز ئەکاتەوە و بۆ ئەوە لە نێوان حەشامەتەکەوە بیانبینێ، چاوەڕوانی خوێندنەوەی ناوەکەیەتی.

هێندە بێئۆقرەیە، لاقەکانی دەست ئەکەن بە لەرزین. کاتێ لێ پرسراوی خاچی سووری جیهانی ناوەکەی ئەڵێ، ئەڵێێ سەگە و ئەوەڕێنێ. "لالا" لێی تێناگات. ئەمجا

بە قیژەوە دیسان ئەڵێتەوە :

- "حەوا" ! "حەوابێن حەوا"

"لالا" بە ڕاکردن لە نێوان خەڵکەکەوە تێئەپەڕێ. لەبەر دەرگاکە ڕائەوەستێ، پیاوەکە بۆ نیشانەکەی ئەڕوانێ، پاشان وەک ئەوەی باڵیان پێوە نابێت بەپرتاو خۆی ئەخاتە دەرەوە.

لە دەرەوە ڕوونـاکـی شـاڵاو دێـنێ، دوای هـەموو ئـەو کـاتەی نـاو سـالۆنە خۆڵەمێشیەکە، ئەکەوێتە تلاوتل، گێژ بووە، لە نێوان سێڵاوی ژن و پیاوەکان، بێ ئەوە سەرنجیان پێ بدات تێئەپەڕێ. ڕاستەوخۆ بۆ بەردەم خۆی ئەڕوات. تا کاتێ هـەست ئـەکـا کـەسێ بـاسکی گـرتووە و ئـەیگووشێ و لە ئـامێزی ئـەگـرێ. "عـەمە" لە لەنگەرەکەوە لەگەڵ خۆی بەرەو شاری ئەبا.

"عەمە"، بەتەنیا لە خانوویەکی شارە کۆنەکە، لە نزیکی بەندەر ئەژی، لەهۆڵی سەرەوەی خانوویەکدا کە خەریکە ئەڕووخێ.

هۆدەیەکە و کاناپەیەک لەناویا و هۆدەیەکی نووستن و تەختەخەوێک کە کۆ ئەکرێتەوە و چێشتخانەیەک و پەنجەرەکانی ڕووەو حەوشی ناوەوە ئەکرێنەوە. بەڵام لەسەر بانە گڵینەکەوە، ئاسمان بە باشی ئەبینرێ. لە بەیانیەوە تا نیوەڕۆ هـەتاو لە دوو پەنجەرەی هۆدەکەوە کە کاناپەی لێیە، تیشک ئەخاتەماڵەوە. "عەمە" ئەڵێ کە شانسی زۆری بووە ئەم خانووەی دەست کەوتووە. کاتێ هاتووە بـۆ مـارسێ چـەن مـانگی ئەوەڵ لە خانوویەکی بە شتومەکی تەواوەوە، لە دەرەوەی شار لەگەڵ پێنج ژنـی دیکەدا، پێکەوە بوون. ژنە پۆلیسێک هەر بەیانی ئەهات و شەقامیش پڕبوو لە شەڕ و ناکۆکی و هەروەها دوو پیاوی چەقۆکێش کە دایم شەڕیان ئەکرد.

"عەمە" ناچار ببوو خۆی دەرباز بکات و جانتاکەی بەجێ بهێڵێ. چونکە لەوە ئەترسا بیبەن بۆ پۆلیسخانە و دەری‌کەن. "عەمە" لە دیتنی "لالا"، دوای ئەو هەموو ماوەیە، زۆر خۆشحاڵ دیارە. کاتێ بردبوویان بۆ نەخۆشخانەی شار، چونکە لەیاو و تینوویەتی‌دا خەریک بوو ئەمرد، "ئـارتانی" خـۆی بـە تـەنیایی ڕێگـاکـەی بـەرەو

کاروانەکان درێژە پێ دابوو، چونکە لەمێژ بوو ئەیویست بۆ ئەوێ بڕوا.

"عەمە" لە ماوەی ئەم چەن مانگەدا زۆر پیر بووە. روخساری لاواز و ماندووە و پێستی رەنگ خۆڵەمێشی بووە. دەورچاوی لە بازنەیەکی قاوەییدا سووتاوەتەوە.

شەوانە، کاتێ لەسەر کار دێتەوە، بەدەم بیسکویت و چای نەعنا خواردنەوە، بەسەر هاتی سەفەرەکەی بە ماشین، لەناو ئیسپانیا ئەگێڕێتەوە کە لەگەڵ ژنان و پیاوانی دیکەدا بەدوای کاردا ئەگەڕان. رۆژانێکی زۆر لەجادەکان تێپەڕیبوون. لەشارەکان رەد ببوون، لەکێو و رووبارەکان...

رۆژێ لێخوڕی ماشینەکە شارێکی پێ نیشان دابوون بەگەلێ ماڵی ئاجۆری لێک چوو بەسەربانی رەشەوە و وتبووی :

- ئاوەتە، گەیشتین.

"عەمە" لەگەڵ ئەوانی دیکە دابەزیبوون. وەک هەر سەفەرێکی دیکە، لەپێشەوە کرایەکەیان دابوو. کۆڵ و بارەکانیان هەڵگرتبوو و کەوتبوونە ناو شەقامەکانی شار. کاتێ "عەمە" پاکەت نامەیەک، کە ناوونیشانی براکەی "نوعمان"ی پێوە بوو، نیشان ئەدان، خەڵک دەستیان ئەکرد بە پێکەنین و پێیان ئەوت کە ئەو لە مارسێ نیە، بەڵکوو لە پاریسە. ئەمجا ناچار ببوو دیسان بە شەمەندەفەر بگەڕێتەوە.

"لالا"، دوای بیستنی چیرۆکەکە، ئەقلێتەوە، چونکە ئەیهێنێتە بەرچاوی کە چۆن مسافرەکان لەناو ماشینێکدا لەناو شەقامەکانی پاریس‌دا خولاونەتەوە و پێیان وابووە لە "مارسێی" دان.

ئەم شارە بە راستی گەورەیە، "لالا" هەرگیز بە مێشکیدا نەئەهات لە ئاوەها شارێکدا بژیەت، لەو رۆژەوە گەیشتووەتە ئێرە، تەواوی رۆژ لەناو شاردا ئەخولێتەوە، لە باشوورەوە بۆ باکوور، لە رۆژهەڵاتەوە بۆ رۆژئاوا. ناوی شەقامەکان نازانێ، نازانێ مل لە کوێ ئەنێ. برێ جار بەرەو لەنگەرەکان ئەڕوا بۆ سەیر کردنی تارمایی کەشتیە باربەرەکان، برێجار لە شەقامەکان سەرئەکەوێ، بەرەو ناوەندی شار، یان لە کۆڵانە پێچ و پلووچەکۆنەکانی شاردائەخولێتەوە، لە پلیکانەکان سەرئەکەوێ،

لەم گۆڕەپان بۆ ئەو گۆڕەپان، کلیسا بۆ کلیسا، تا گۆڕەپانە گەورەکە ئەڕواکە لەوێوە کۆشکە تۆکمەکانی سەر دەریا دیارن. یان لەسەر کورسی باخەکان دائەنیشێ و چاو ئەبڕێتە کۆترەکان کە لە ڕێگا خۆڵاویەکانەوە تێئەپەڕن.

ئێرە هێندە کۆڵان و خانوو و دووکان و پەنجەرەو ماشینی لێیە، ئینسان سەرگێژە ئەگرێ. دەنگە دەنگ و بۆنی بەنزینی سووتاو مەستی ئەکات و تووشی سەرئێشەی ئەکات.

"لالا" لەگەڵ خەڵک قسە ناکات، برێجار لەسەر پلیکانەی کلیساکان خۆی لەناو پاڵتۆ خوریە ڕەنگ بۆرەکەی دائەپۆشێ و چاو ئەبڕێتە تێپەڕینی ڕێبوارەکان. برێکیان بۆی ئەڕوانن و پاشان لە سووچی شەقامەکە ئەوەستن، یانێ خەریکن جگەرە ئەکێشن کەچی چاودێری ئەو ئەکەن. بەڵام "لالا" لە "ئارتانی"ەوە فێر بووە چۆن بەکارامەیی خۆی داشارێ. لە دوو یان سێ شەقام و دووکان ڕەد ئەبێ و لە نێوان ماشینە وەستاوەکاندا، خۆی دائەگرێ و کەس ناتوانێ دوای کەوێ.

"عەمە" ئەیەوێ، ئەویش بڕوا و لە نەخۆشخانە لای ئەو کار بکات. بەڵام "لالا" بۆ ئەو کارە هێشتا منالە. دۆزینەوەی کاریش زۆر ئەستەمە. چەن ڕۆژ دوای هاتنی، ڕۆیشتبوو بۆ لای براکەی "نوعمان"، "ئاسف"، بەڵام خەڵکی ئێرە پێی ئەڵێن "ژۆزف". لەشەقامی کڵاو فرۆشەکاندا دووکانی وردەفرۆشی هەیە کە زۆر لە پۆلیسخانەکە دوور نیە. لە دیتنی "لالا" خۆشحاڵ دیار بوو، "لالا"ی لە ئامێز گرت و قسەی براکەی بۆ ئەکرد. بەڵام "لالا" خێرا دڵی لێ پیس کرد. هەر لە "نوعمان" ناچێ، چکۆلەیە و کەچەڵ و دوو چاوی پیسی سەوزڕەنگ و خۆڵەمێشی هەیە، پێکەنینەکەی مانایەکی باشی نەبوو.

کاتێ زانیبووی کە "لالا" بەدوای کاردا ئەگەڕێ، چاوی برووسکەیەکی کردبوو و تێکچوبوو. وتبووی کە ئەویش هەرپێویستی بە کچێکی لاو بووە کە یارمەتی بدات، شت بۆ دووکانەکە بێنی، دایمەرزێنی و گسکی لێ بدات. تەنانەت حسێبی بۆ بکات. بەڵام کاتێ قسەی ئەکرد، بەچاوە ناحەزەکانیەوە ماقی سکی "لالا" ببوو. "لالا"

وتبووی کە بەیانی دێتەوە و خێرا لە دووکانەکە چووبووە دەرەوە. لەبەر ئەوە نەڕۆشتبووەوە، ئەو خۆی شەو ڕۆشتبووەوە ماڵ "عەمە"، بەڵام "لالا" هەر کە ئەوی بینیبوو لە ماڵ چووبووە دەرەوە و لە کۆڵانەکانی شاردا وەک ڕۆحێکی نەبینراو پیاسەی کردبوو تا کاتێ دڵنیا ببوو کە دووکاندارەکە ڕۆیشتووە.

ئەم شارە بەم هەموو حەشامەتەوە، وڵاتێکی سەیرە، چونکە بەڕاستی ئەگەر خۆتی پێ نیشان نەدەی، کەس سەرنجت پێ نادات. "لالا" فێر بووە، بێ سرتە لە درێژایی دیوارەکان، لەسەر پلیکانەکاندا بخزێ. هەموو ئەو شوێنانە ئەناسێ کە بێ ئەوە کەس ببینێ ئەو هەموو کەس ببینێ. حەشارگەی پشت دارەکان، لەجێگەی وێستگەی ماشینەکاندا، لەکونجی دەرگاکان و لە زەویە بایرەکاندا، تەنانەت لە راستە شەقامەکاندا کە شەپۆلێکی بێوچان لە مرۆڤ و ماشینەکان ، ڕێکەوتوون، ئەتوانێ خۆی نادیار بکات.

ڕۆژانی سەرەتا، هێشتا نیشانەی هەتاوی سووتێنەری پێوە بوو. قژە ڕەشە درێژە لوولەکەی پڕ بوو لە رووناکی هەتاو. خەڵک بە سەیرەوە بۆیان ئەڕوانی، ئەتوت لە هەسارێکی دیکەوە هاتبوو.

بەڵام ئێستا چەن مانگ تێپەڕیوە و "لالا" گۆڕاوە. قژی کورت کردووەتەوە و ڕەنگی قژی مات و خۆڵەمێشیە. لە تاریکی کۆڵانە تەنگەبەرەکاندا، لەسەرمای شێداری خانووکەی "عەمە"، پێستی "لالا"ش مات و بێڕەنگ و خۆڵەمێشی ئەنوێنێ. ئەم پاڵتو ڕەنگ بۆرەکەیشی لە کۆنەفرۆشێکی مووسایی نزیک "کاتدرال"کڕیوە، کە تا قولە پێی ئەگات و قۆڵەکانی زۆر درێژن و شانەکانی داکەوتوون و بەتایبەت کە لە جۆرە روپۆشێکی خوری درووست کراوە. تێپەڕینی زەمان پرووکاندوویەتی و بەرقی تێ خستووە، ڕەنگی کاغەزی کۆنەی دیواری گرتووە. کاتێ "لالا" پاڵتۆکەی لەبەر ئەکات، بەڕاستی هەست ئەکا کەس نایبینێ.

ئێستا بە گوێدان بە قسەی ئەموئەو، ناوی شەقامەکان فێر بووە. ناوگەلێکی سەیریان هەیە، برێجار بەدەم ڕێگە ڕۆشتنەوە، لە ناو ماڵەکانەوە، لەژێر لێوەوە

ئەیلێتەوە.

گۆڕەپانی "لانش"، "لاتوریت"، "لامەژۆر"، گۆڕەپانی "ڤیڤۆ"، شەقامی "پتیت پویت"، "لاتاراسک"، گۆڕەپانی "سادی کارنۆت"، شەقامی "شۆڤال"، بن‌بەستی "موێت"، سەیرانگای "بۆلسوسن". ناو و شەقام گەلێ زۆرن ! هەر ڕۆژ بەرلەوە پووری لەخەو هەستێ، دەرئەپەڕێتەوە دەرەوە. لەتە نانێکی ڕەق ئەخاتە گیرفانی پاڵتۆ بەرەوویەکەی و رێی ئەکەوێ. ئەگەڕێ و ئەگەڕێ، لە پێشدا لە بازنەیەکدا بە دەوری "پانیەر"دا پاشان لە خیابانی "پریزون"دا تا ئەگاتە دەریا لەگەڵ هەنگاو بە هەنگاوی هەتاوێک کە دیوارەکانی هوتێل "دوڤیل" ڕووناک ئەکاتەوە. ساتێ دائەنیشێ بۆ سەیر کردنی گوزەری ماشینەکان بەڵام نەک بۆ ماوەیەکی زۆر، چونکە پۆلیسەکان دێن و لێی ئەپرسن لەویا چی ئەکات؟

بەرەو باکوور مل ئەنێ، لە شەقامە پانە پڕ حەشامەتەکان سەر ئەکەوێ، لە بولوارەکانی «کابنیەر»، «دوگۆمیەر» و «ئاتن» تێئەپەڕێ. خەڵکی هەموو وڵاتەکانی دونیا لەوێ هەن. بە هەموو جۆرە زمانێ ئەدوێن، برێکیان ڕەش ڕەشن، برێ چاو بادامی تەنگ و برێ بە جلی درێژی سپی و پاپۆشی پلاستیکیەوە. برێکیان خەڵکی باشوورن، چاو و قژی بێ‌ڕەنگ، هەروەها سەرباز و مەلەوانەکان و پیاوگەلێ چوارشانە و کەڵەگەت کە هەنگاوی خێرا هەڵئەگرن و جانتاگەلی بچووکی سەیریان پێیە.

"لالا" پێی خۆشە لەسووچی دەرگایەکدا دانیشێ و چاو ببڕێتە خەڵکەکە کە دێن و ئەچن. پیاسە ئەکەن و ڕائەکەن. کاتێ حەشامەتەکە زۆرن، کەس سەرنجی ئەم نادات. ڕەنگە پێیان وایە ئەمیش هەر وەک ئەوانە کە چاوەڕوانی کەسێ یان شتێکە، یان وائەزانن کە سواڵکەرە.

ئەو شوێنە پڕ لە حەشامەتانە، خەڵکی فەقیری زۆری لێیە "لالا" بە تایبەت پێی خۆشە لەوان ورد بێتەوە، ژنە جل شڕەکان کە گەرچی تینی هەتاو زۆرە، زەرد و ڕەنگ پەڕیون و مناڵی ساوایان لەباوەش گرتووە. پیرەپیاوەکانیش کە پاڵتۆی درێژی

پینەکراویان لەبەرە، هەمیشە مەستەکان بە چاوە ماتەکانیاوە، بێ ماڵ و لانەکان، غەریبە برسیەکان کە ساک و کارتۆنی ئازووخەکانیان خاڵیە.

مناڵە بێ کەسەکان ئەبینێ، روخساریان چڵکن و قژیان سێخ وەستاوە، جەستە لاوازەکانیان لە نێوان جل و بەرگە کۆنەکانیان گوم بووە. بە خێرایی هەنگاو هەڵئەگرن، روانینیان وەک روانینی سەگە ون بووەکان ناحەزە و ئەیەوێ دەرباز بێت.

لە حەشارگەکەیدا، لە پشت ماشینە وەستاوەکان، یان لە سێبەری دەرگا گەورەکان، "لالا" چاو بە هەموو کەسدا ئەگێڕێ کە ئەڵێی وێڵ و ئاوارەن، وا هەنگاو هەڵئەگرن ئەڵێی وەنەوز ئەدەن، چاوە تاریکەکانیان کاتێ ئەم بۆیان ئەڕوانێ، بەجۆرێکی سەیر ئەدرەوشێتەوە، رەنگە هەر لەو کاتەدا بۆیان ئەڕوانێ، نەختێ لە تیشکی رووناکی هەوای بیابان بەرەو ئەوان ئەهاوێ. ئەوان بە ئەستەم هەستی پێ ئەکەن و بێ ئەوە بزانن لە کوێوە هاتووە، هەست بە لەرزەیەکی ئان و ساتی ئەکەن، بەڵام خێرا ئەڕۆن و لە نێوان کۆمەڵە نامۆکەدا بزر ئەبن.

بڕێ رۆژ، زۆر دوور ئەکەوێتەوە، ماوەیەکی زۆر بە ناو شەقامەکاندا ئەڕوا، لاقی دێتە ئێش و ناچار ئەبێ لەقەراخ پیادەڕەوەکە بۆ حەسانەوە دانیشێ.

بە درێژایی شەقامە گەورەکەدا، کە قەراخەکەی بە درەخت گیراوە و ماشین و کامیۆنەکان تێدەپەڕن، بەرەو رۆژهەڵات مل ئەنێ، لە نێوان تەپۆڵکەکانەوە، لە قووڵایی دۆڵەکە تێئەپەڕێ. مەڵبەندگەلی پڕلە زەوی بایر و خانووبەرەی زۆر سپی هەن کە بە هەزاران دەلاقەی بچووکی وەک یەکەوە بە قەد تاشەبەردەکانی رۆخی دەریا گەورەن. دوورتریش ویلاکانن کە دار پرتەقاڵ و گەڵابوەکان ئابلۆقەیان داون. لەگەڵ سەگێکی نارەسەن کە لە درێژایی تەلبەندەکاندا هەڵدێ و بە هەموو هێزیەوە ئەوەڕێ، هەروەها پڕە لە پشیلەی وێڵ و لاواز کە مووەکانیان راست بووەتەوە و لەسەر دیوارەکان یان لەژێر ماشینە راوەستاوەکاندا ئەژین.

"لالا" هەروا بێ ئامانج ملی شەقامەکان ئەگرێتەبەر، لە مەڵبەندە پڕ پێچ و پلووچەکان و کەناوە پڕلە مێشوولەکان تێئەپەڕێ . ئەچێتە قەبرسانەکە بەڕیزە بەردە

ڕەنگ خۆڵەمێشیەکان و خاچە ڕەنگاویەکانیەوە، بە ئەندازەی شاریٚ گەورەیە. تا سەر لووتکەی تەپۆڵکەکان سەرئەکەویٚ. هێندە دوور ئەکەوێتەوە کە دەریا لە نێوان خانووبەرە شەش گۆشەکان وەک خاڵێکی شینی چڵکن، بەئەستەم ئەبینریٚ.

تەم و مژێکی سەیر لە ئاستی سەرشارەوە، ئەشەکێتەوە، هەورێکی خۆڵەمێشی و سوور و زەرد لە شوێنێکدا کە ڕۆشنایی بەرە بەرە کز ئەبێتەوە. هەتاو لە ڕۆژئاواوە دائەچێت، "لالا" هەست ئەکا خەو و ماندوویەتی جەستەی داگرتووە، چاو ئەبڕێتە دوورتر، شار ئەدرەوشێتەوە، گرەگری ماتۆڕێک ئەبیسیٚ، شەمەندەفەرەکان ڕێکەوتوون و خۆیان ئەکەن بەناو کونە ڕەشەکانی تونێلەکاندا.

"لالا" ناترسیٚ، بەڵام لەناخیدا شتیٚ وەک سەرگێژە، وەک "با" لوول ئەخوا، ڕەنگە "شێرگی"، "با"ی بیابان بیٚ کە تا ئێرە هاتووە. لەدەریا تێپەڕیوە، لەکێو و شار و جادەکان ڕەت بووە و گەیشتووەتە ئێرە، تێگەیشتنی سەختە، ئەو هەموو هێز و دەنگ و بزاوتانە لێرە هەیە، ڕەنگە «با» لەناو شەقام و پلیکانە و گۆڕەپانەکاندا بزربوو بیٚ.

"لالا" سەیری فڕۆکەیەک ئەکاکە لە ئاسماندا وەک هەورە گرمە، ئەگرمێنیٚ و بە ئاسماندا سەرئەکەویٚ و لەسەر شار دەوور ئەداتەوە. بەبەر هەتاودا ڕەت ئەبیٚ، بۆ چرکەیەک هەتاو ئەکوژێتەوە و بەرەو دەریا ئەڕوا و بەرە بەرە هەر بچووک و بچووکتر ئەبێتەوە. "لالا" چاوی تیٚئەبڕیٚ، تا ئەبێتە خاڵێکی ڕەشی نەبینراو. ڕەنگە بەرەو بیابان بڕوا، بۆ سەر پانتایی لم و بەردەکان، ئەویاکە "ئارتانی" بەڕێوەیە؟

"لالا"ش بەرەو شار دائەگەڕیٚ، لاقەکانی وزەیان لیٚبڕاوە. "لالا" زۆری پیٚ خۆشە جۆرەکاریٚ بکات : لەسەر نەردەی پلیکانەکان دانیشیٚ و بۆ مسافرەکانی وێستگەکە بڕوانیٚ کە سوار ئەبن و دائەبەزن. بڕێکیان کاتیٚ ئەگەنە بەرەوە، هەناسەبڕکێیان پیٚ کەوتووە، چاویان ماندووە و قژیان هەڵشێواوە، بە لۆژەلۆژ لە پلیکانەکان دێنە خوار، بە پەلە ئەڕۆن، نە وەک لە شەمەندەفەرەکە بەجیٚ بمێنن. بە فڕکان لەسەر پلیکانەکاندا تێئەپەڕن و جانتا و ساکەکانیان لە لاقیان ئەکەویٚ. چاو لە دەرگای هاتنە ماڵەوەی وێستگەکە هەڵناگرن، پاڵ ئەدەنەوە بە دوایین پلەکاندا و بانگ

لە یەکتر ئەکەن، نەوەک لە یەکتر ون بین.

"لالا" زۆری پی خۆشە لای وێستگەکە بمێنێتەوە، لەوێوە شارەگەورەکە هێشتا ماویەتی، ئەڵێی لەم چاڵەگەورەیە، هێشتا هەر خەڵک دێن و ئەچن.

زۆربەی کات تامەزرۆیە سواری شەمەندەفەرێک بێت کە بەرەو باکوور ئەڕۆن، بەرەو هەموو ئەو وڵاتانەی سەرنجی رائەکێشن و نەختێکیش ئەیترسێنن، "ئیرون" "بۆردۆ"، "ئامستردام"، "لیۆن"، "دیژۆن"، "پاریس"، "کالێز" و...

کاتێ پارەی هەبێ، ئەڕواتە ناو وێستگەکە و لە بووفەکەی "کۆکا"یەک ئەخواتەوە و بلیتێکی لەنگەرەکە ئەکرێ و ئەچێتە ناو سالۆنی گەورەی رێکەوتنەکە. بەسەر هەموو سەکۆکاندا پیاسە ئەکات، لەبەر شەمەندەفەرەکاندا کە تازەگەیشتوونەتە بەرەوە، یان ئەیانەوێ رێکەون، برێجار تەنانەت لە واگونێ سەرئەکەوێ و ساتێ لەسەر نیمکەتە سەوزەکە دائەنیشێ. مسافرەکان یەک لە دوای یەک دێنە ناوکوویەکە، تەنانەت ئەپرسن، «ـ خاڵیە ؟». "لالا" سەرێ ئەلەقێنێ، کاتێ بڵندگۆکە ئەڵێ کە شەمەندەفەرەکە رێ ئەکەوێ، "لالا" بەپرتاو دێتە خوارەوە بۆ سەر سەکۆکە.

وێستگە،یەکێ لەو شوێنانەیە کە بێ ئەوە چاوی بکەن، ئەتوانێ چاوی لە هەموو کەسەوە بێت، چونکە هێندە قەرەباڵغ و پڕ حەشامەتە، کەس کاری بە کەسەوە نیە.

هەموو جۆرە مرۆڤێکی تێدایە، خراپەکارەکان، تووڕەکان بە سەرە سوورەکانیانەوە، کەسانێک کە بە هەموو هێزەوە لەناخیانەوە ئەقیڕێنن، هەروەها خەڵکی فەقیر و خەمباریش هەن، پیرە ون بووەکان کە بە نیگەرانیەوە بەدوای لەنگەرگەیەکدا ئەگەڕێن کە شەمەندەفەرەکەیان لەوێوە رێکەوتووە، ژنگەلێ کە منالێکی زۆریان هەیە و بە کۆڵ و بارەکانیانەوە لە درێژایی واگونە بەرزەکاندا شەلە شەلیان پێ کەوتووە. هەموو ئەوانەی کە نەداری و فەقیری بەرەو ئێرەی هێناون، رەش پێستەکان کە بە کەشتی هاتوون و بەرەو وڵاتە ساردەکان ئەڕۆن و کراسی بێ‌قۆڵی رەنگاورەنگیان لەبەرە و کۆڵ و باری سەفەریان هەر ساکێکی ساحیلیە.

خەڵکی باکووری ئەفریقا، رەش پێست، بە کۆتی شڕ و کڵاوی کێوی یان

کاسکێت که تا پەناگوێیانی داپۆشیوه، تورکه‌کان، ئیسپانیاییه‌کان، یۆنانیه‌کان، هەموو ماندوو و نیگەران دیارن. لەسەر لەنگەرگەکە لەبەر "با "دا ئاواره و وەیلان، هەر دێن و ئەچن. لەنێوان کۆمەڵی ئەو مسافرانەی کە گوێ بە هیچ نادەن، ئەو سەربازە مەسخەرانەدا کاتێ بەیەک ئەگەن، "لالا" سەیریان ئەکات. بەزۆر لەبەین کابینی تەلەفونەکە و تابلۆی راگەیاندنەکەدا، جێی خۆی کردۆتەوه، خۆی خستووەتە تاریکیەکە و روخسارە رەنگ مسینیەکەی بە یەخەی کراسەکەی داپۆشیوه، بەڵام جار جار دڵی خورپە خورپ دەست پێ ئەکات و چاوەکانی وەک لێکدانەوەی تیشکی هەتاو لەسەر بەردەکانی بیابان، بریسکەیان دێت.

سەیری ئەو کەسانە ئەکاکە بەرەو شارێکی دیکە ئەڕۆن. بەرەو برسیەتی و سەرما و بەدبەختی، کەسانێکە سووکایەیتان پێ ئەکرێ، ئەوانەی کە تەنیا ئەژین، تێئەپەڕن، تۆزێک چەماونەتەوه، چاوەکانیان بێتین، هێندە لەسەر زەوی خەوتوون جلەکانیان شڕ و کۆن بووه، هەر لە سەربازی بەزیو ئەچن، ئەوان بەرەو شارە رەشەکان ئەڕۆن،بەرەو ئاسمانە نزمەکان، بەرەو دووکەڵ و سەرما و نەخۆشین کە سینگیان لەت و کوت ئەکات، بەرەو شارەکانیان لەنێوان زەویە قوراویەکاندا ئەڕۆن. لەخوار ئوتووبانەکەوه بەرەو هۆڵە چاڵ کراوەکانی ناو زەوی ئەڕۆن کە هەر لە قەبر ئەچن و دیوارە بەرزەکان و تەڵبەندەکان ئابلۆقەیان داون.

رەنگە ئیتر هەڵنەگەڕێنەوه. ئەم ژن و پیاوانەی کە وەک تارمایی، منداڵ و ساکە قورسەکانیان ئەخشێنن بە زەویدا، رەنگە لەم وڵاتە نەناسیاوانەدا دوور لە گوندەکانیان و خێزانەکانیان بمرن؟

ئەوان بەرەو ئەم وڵاتانە دێن کە ژیانیان لێ ئەسێنێتەوه، ئازاریان پێ ئەگەیەنێت و وردیان ئەکات.

"لالا" لە کونجە تاریکەکەیدا جووڵەی لە خۆی بڕیوه... بیر لەوانە ئەکاتەوه، بینایی تێک چووه، تامەزرۆی هەڵهاتنە،لە شەقام و شار تێیەڕێ، تا ئەو جێگایە بڕوا کە ئیتر نە ماڵی لێیە و نە باخ، تەنانەت جادە وساحیلیشی نیە، تەنیا کوێرە رێگایەک وەک

ئەوەی جاران کە بەرەو بیابانی ئەبرد.

شەو شاری لەئامێز گرتووە، چرای شەقامەکان و ئاقاری وێستگەکە و چرای بورجە ئاسنیەکان و مێڵە گەورە سوور و سپی و سەوزەکانی سەرکافە و سینەماکان رۆشن بوون. "لالا" بەئەسپایی لە شەقامە تاریکەکاندا، لەپەنای دیوارەکانەوە ئەخزێ، شەوانە سیمای مرۆڤەکان ترسێنەرە، لەبەر چرای داربەرقەکاندا نیوەرۆشنە، چاوەکانیان بەهێزەوە ئەبریسکێتەوە، تەپەی هەنگاوەکانیان لە داڵانەکاندا دەنگ ئەداتەوە.

"لالا" هەنگاوەکانی بەخێرایی هەڵئەگرێ، ئەڵێی را ئەکات. برێجار پیاوێ ئەکەوێتە دوای، ئەیەوێ پێی بگات و بیگرێ، "لالا"یش خۆی لە پشت ماشینێکەوە دائەشارێ و نوقم ئەبێ و سەرلەنوێ وەک سێبەرێک ئەخزێ.

لە شەقامەکانی شارە کۆنەکە تێئەپەرێ تا ئەگاتە "پانیەر"، شوێنێ کە "عەمە" ئەژی. بۆ ئەوە نەیبینن، بێ ئەوە چرا رۆشن بکات لە پلیکانەکان سەرئەکەوێ و بە ئەسپایی لە دەرکەکە ئەدا، کاتێ دەنگی پووری ئەبیسێ، بە ئاسودەگیەوە ناوی ئەڵێتەوە.

ئەمەیە رۆژگاری "لالا"، لێرە لە شاری گەورەی مارسێ، لە درێژایی هەموو ئەم شەقامانە، لەگەڵ هەموو ئەم ژن و پیاوانە کە هەرگیز ناتوانێ بیانناسێ.

کاتی کە تازە هاتبوو، لە دیتنی ئەو هەموو سواڵکەرە سەری سوور مابوو، ئێستا ئیتر لەگەڵیا راهاتووە، بەڵام لە بیری ناچێتەوە کە بۆیان بروانێ، وەک زۆربەی خەڵکی شارکە رێگاکەیان لار ئەکەنەوە بۆ ئەوە پێیان نەگەن، یان تەنانەت کاتێ پەلەیانە ئەپەرن بەسەریاندا.

"رادیکز" سواڵکەرە، بە هاتووچۆی شەقامە گەورەکانی نزیک وێستگەکە ناسیویەتی. رۆژێ بەیانی زوو لە پانیەر هاتە دەر ، هێشتا تاریک بوو، چونکە وەرزی زستان بوو، تاک و تروک لە کۆڵان و پلیکانەکانی شارە کۆنەکەدا بوون، شەقامە گەورەکە لە خواری هوتێل "دیۆ"وە هێشتا چۆڵی چۆل بوو. تەنیا کامیۆنەکان بە چرا رۆشنەکانیەوە تێئەپەرین. چەن ژن و پیاو لەسەر ماتۆرەکانیاندا، خۆیان داپۆشیبوو.

لەویا چاوی کەوت بە رادیکز، لە کونجی دەرگایەک خۆی کرۆشمە کردبوو، پەنای گرتبوو تاکو "با " و بارانە وردەکە لێی نەدا. هەوا گەلێ سارد بوو، کاتێ "لالا" لێی نزیک ببووەوە، بە سەیرەوە چاوی تێ بڕیبوو، نیگا کردنی لە کورانی دیکە نەئەچوو کاتێ کچێ ئەبینن، بێ ئەوە چاوی دابخات چاوی تێ بڕیبوو، بەڵام وەک نیگای حەیوانێک هیچی تیا نەبوو. "لالا" قوت لەبەردەمیا وەستابوو و پرسیبووی :

- لەویا چی ئەکەی ؟ سەرمات نیە؟

کورەکە سەری لەقاندبوو، بێ ئەوە بزە لێ بدات، پاشان دەستی درێژ کردبووەوە:

- شتێکم بەرێ...

"لالا" هەر نانێک و پرتەقاڵێکی پێ بوو، کە بۆ نەهاری هەڵگرتبوو. دابووی بە کورەکە، ئەویش خێرا بێ ئەوە سوپاسی لێ بکات، هەڵمە هەڵم خواردبووی.

بەم جۆرە "لالا" ئەوی ناسیبوو. دوای ئەوە، جار جار لە شەقامەکان، نزیک وێستگەکە ئەیبینێ، کاتێکیش بتوانێ لەناو پلیکانەی وێستگەکە بۆ ماوەی چەندین سەعات دائەنیشێ و چاو ئەبڕێتە بەردەمی بێ ئەوە سەرنج بدات. بەڵام "لالا"ی زۆر خۆش ئەوێ. لەوانەیە لەبەر پرتەقاڵەکە بێت کە پێی دابوو. ناوی خۆی پێ وتبوو، تەنانەت بە چڵەدارێ لەسەر زەوی نووسیبوویەوە. بەڵام زۆری پێ سەیر بوو کاتێ "لالا" وتبووی سەوادی نیە.

قژی رەش و رەقە و پێستێکی مسیڕەنگ و چاوەکانی سەوزن و سەر لێویشی سێبەری تێکەوتووە، بەتایبەت کاتێ بزە لێئەدات، ددانە سپیەکانی برووسکە برووسک دەرئەکەون.

ئەڵقەیەکی بچووک لە گوێی چەپیدایە کە خۆی ئەڵێ ئاڵتوونە، بەڵام جل و بەرگەکەی گەلێ فەقیرانەیە، پانتۆڵێکی کون کون، کۆتێکی پیاوانە کە لەناویا گوم بووە. بە بێ گۆرەوی، پێی لە نێوان پێڵاوە رەشە چەرمەکاندایە، "لالا" زۆر پێی خۆشە، هەروا بە رێکەوت لە شەقامەکەدا چاوی کات، چونکە هەمیشە یەکجۆر نیە،

برێجار خەم و پەژارە لە چاوەکانیەوە ئەبارێ، ئەڵێی نوقمی خەوێکە و هیچ شت ناتوانێ دەری بێنێ. رۆژانی دیکە خۆشحاڵە و چاوەکانی بەرق ئەدەنەوە. هەموو جۆرە چیرۆکی پووچ و بێماناکە خۆی دروستیان ئەکات، ئەگێڕێتەوە و خۆی بۆ ماوەیەکی زۆر ئەقلێتەوە، "لالا"ش نازانێ چی بکا، چونکە پێکەنینی نایەت.

"لالا" حەز ئەکات "رادیکز" لەگەڵ خۆی باتەوە بۆ ماڵی پووری، بەڵام ئەو قەرەجە و دڵنیایە پووری پێی خۆش نیە. رادیکز لە پانیەر نازی، تەنانەت لەو نزیکانەش نیە، زۆر دوورە، جێگایەک لە رۆژئاوا، نزیک هێڵە ئاسنیەکە، لای زەویە بایرەکان و تەغارە شیلەکان. شوێنێ کە شەو و رۆژ لوولە زۆپاکان ئەسووتن. خۆی ئەمانە ئەگێڕێتەوە، بەڵام هەرگیز لەماڵ و خێزانەکەی قسە ناکات، تەنیا ئەڵێ کە ماڵیان هێندە دوورە ناتوانێ هەموو رۆژێ بڕوا و بێتەوە. زۆربەی کات هەر نارواتەوە و لە دەرەوە ئەخەوێ. بە لایەوە گرینگ نیە. ئەڵێ حەشارگەی باش ئەناسێ کە سارد نیە و "با"یشی لێ ناکەوێ و کەس ناتوانێ بیدۆزێتەوە. بۆ وێنە لەژێر پلیکانەی خانووبەرە رووخاوەکانی گومرێک، چاڵگەلێ هەر بە ئەندازەی منالێک کە خۆی تێدا جێ کاتەوە و سەرەکەی بە کارتۆن داپۆشێ، یان هەمارە بچووکەکانی کەرەسەی خانوو کردنەوە، یان لەژێر برزنتی کامیۆنە بچووکەکاندا.

"رادیکز" بە باشی شارەزای ئەم شتانەیە، زۆربەی کات لە دەورووبەری وێستگەکە پەیدای ئەکات، کاتێ هەوا خۆشە و هەتاو تینی هەیە، لەسەر دەستەی پلیکانە گەورەکە دائەنیشێ. "لالا" ئەچێ بۆ لای و پێکەوە سەیری تێپەڕینی خەڵکەکە ئەکەن.

برێجار رادیکز کەسێ نیشان ئەکات و بە "لالا" ئەڵێ:

- بڕوانە!

پاشان بەرەو مسافرەکە ئەڕواو لە وێستگەکە ئەڕواتە دەر، رووناکی لەچاوی ئەدا، داوای دراوێکی لێ ئەکا، چونکە بزەیەکی شیرین و هەروەها شتێکی خەمین لە چاویدایە، مسافرەکە رائەوەستێ و دەست ئەکا بە گیرفانیدا.

زۆربەی ئەوانە پوولی پێ ئەدەن، پیاوگەلێکی تەمەن دەوری سی ساڵان و پۆشتەن کە کوڵ و ساکی زۆریان پێ نیە. پارە سەندن لە ژنەکان دژوارترە، ئەوان ئەیانەوێ پرسیاری لێ کەن و رادیکز پێی خۆش نیە. کاتێ ژنێکی لاوی پۆشتە ئەبینێ، پاڵ بە "لالا"وە ئەنێ:

- تۆ برۆ داوای لێ بکە!

بەڵام "لالا" ناوێرێ داوای پارە بکات، تۆزێ شەرمینە، بەڵام برێجار زۆریشی پێ خۆشە پارەی بێت، بۆ ئەوەی شیرینیەک بخوات یان بروات بۆ سینەما. رادیکز ئەڵێ:

- ئەمە دوایین ساڵێکە من ئەم کارە ئەکەم، ساڵی داهاتوو، ئەڕۆم، ئەچم بۆ پاریس بۆ کارکردن "لالا" لێی ئەپرسێ: - بۆ ؟

- ساڵێکی دیکە من ئیتر زۆر گەورەم، خەڵک ئیتر هیچم پێ نادەن. ئەبێ کار بکەم.

ساتێ چاو ئەبڕێتە "لالا"، پاشان لێی ئەپرسێ کە ئەیەوێ کار بکات؟

"لالا" سەرێ ئەلەقێنێ، رادیکز یەکێکی پێ نیشان ئەدات کە لای ئوتوبوسەکانەوە رەد ئەبێت:

- ئەویش لەگەڵ من کار ئەکات، ئێمە یەک ئەربابمان هەیە.

لاوێکی رەش پێستی زۆر لاوازە کە لە رۆح ئەچێت؛ بەرەو مسافرەکان ئەڕوا و هەوڵ ئەدات جانتاکانیان بۆ هەڵ گرێ، بەڵام ئەو کارەی لێ بەرنایەت. رادیکز شانێ هەڵئەتەکێنێ:

- لێی نازانی، ناوی "باکی"یە، من نازانم یانێ چی، بەڵام رەشەکانی دیکە کاتێ ناوی ئەبەن، پێی پێئەکەنن، هەرگیز پارەی زۆر بۆ ئەرباب ناباتەوە.

"لالا" بە سەیرەوە ئەڕوانێ، ئەڵێ:

- ئەها... تۆ ئەرباب ناناسی، قەرەجێکە وەک من، ناوی "لینۆ"یە، ئەو شوێنەی تیایدا ئەژین پێی ئەڵێن، هوتێل، خانوویەکی گەورەی پڕ لە منداڵە، هەموو کار بۆ لینۆ

ئەکەین. ئەو بەناو هەموو سواڵکەرەکانی شار ئەناسیّ، ئەزانیّ لەکویّ ئەژین وکار بۆ کیّ ئەکەن، تەنانەت ویڵگەرد و ئاوارەکان، ئەوانەی کە بە تەنیا ئەژین. منداڵگەلێکیش هەن کە لەگەڵ برا و خۆشکەکانیان کار ئـەکـەن و هـەروەها لە دووکـان و سـۆپرە گەورەکان دزی ئەکەن.

بچووکترەکان فێر ئەبن کە خۆیان داگرن، یان فرۆشیارەکان بخڵەتێنن، بەتایبەت ژنە قەرەجەکان کە کراسی درێژی گوڵگوڵیان لەبەرە و روخساریان بە پەڕۆی رەش داپۆشیوە. تەنیا چاوە برووسکەدارە رەشەکانیان دیارە کە وەک چاوی پەلەوەرەکان ئەگەشێتەوە، هەروەها پیرەژن و پیرە پیاوە بێچارە و برسیەکان کە کۆت یان دامەنی دەوڵەمەنەکان ئەگرن و بە دەم خوێندنی ویرد و دۆعا، بەریان نادەن تا پارەیان ئەدەنێ.

"لالا" کاتێ ئەم دیمەنانە ئەبینێ، دڵی ئەگووشرێ، یان ژنێکی ناحەزی لاو کە لە سووچی شەقامە پانەکەدا منداڵێکی ساوا بە سینگیەوە، سواڵ ئەکات.

ئەو ئەم ترسەی لانامۆیە، چونکە لەوێ، لای "ئارتانی"، هەر مـار و دوپشک بوون و کاتی پێویستیش، رۆحە خراپەکان کە شەوانە ئەهاتن و ئەچوون. بەڵام لێرە، ترسی بۆشایی، بێچارەگی و برسیەتی، ترسێکی بێ ناونیشان کە ئـەڵێی لە لەولاوەی دەرگا نیوە کراوەکانی ژێر زەویە سامناکە بۆگەنەکانەوە هەڵئەقوڵێ، ئەڵێی لە حەوشە تاریکەکانەوە سەر ئەکەوێ یان وەک رەشە بایەک لە شەقامەکانەوە تێئەپەڕێ، لەویاکە مرۆڤەکان بێ وچان رێ ئەکەن، ئەڕۆن و پاڵ بە یەکەوە ئەدەن. هەروا بێ وچان، شەو و رۆژ، مانگان و ساڵان، لەناو ماشینەکان وپرتەو بۆڵە و میشەی هەناسەکانیان بە هەوا قورسەکەدا سەر ئەکەوێ.

برێجار تووشی وەها سەرگێژەیەک ئەبێ کە خێرا جەستەی ئەخاتە سەر زەوی و چاوەچاو ئەکا جـێگایەک، پـەناگـایەک بـدۆزێتەوە، روخسـارە کـانزاییەکـەی خۆڵەمیشی ئەبێ، چاوەکانی تاریک ئەبن، بە ئارامی ئەرووخێ، وەک لە قـووڵایی چاڵێکی گەورەدا بێ، بێ ئەوە ئومیدی دەرباز بوونی بێت.

- خانم! چیە؟ باشی؟

دەنگەکە لە جێگایەکەوە، زۆر دوور، ئەقیژێنێ، هەست بە بۆنی سیری هەناسەی ئەکات، بەرلەوە چاوی ببەسرێ، لای دیوارێکدا خۆی کرۆشمە ئەکات. کابرایەک دەستی دێنێ و ئەچەمێتەوە:

- هیچ نیە، هیچ نیە...

بە ئارامی ئەدۆی، یان رەنگە ئەو وشانە هەر لە مێشکیدایە، پیاوەکە یارمەتی ئەدا و تا تراسی کافەیەک ئەیبا، خەڵکەکە کە کۆ بوونەتەوە، بڵاوە ئەکەن، بەڵام "لالا" بە ئاشکرایی دەنگی ژنێک ئەبیسێ کە ئەڵێ:

- دیارە کە سکی پڕە.

پیاوەکە لەسەر کورسیەک دایدەنێ، هەروا بەرەو "لالا" چەماوەتەوە، پیاوێکی کورتە باڵا و قەڵەوە، روخسارێکی باریک و سمێل و سەرێکی تاسی هەیە.

- شتێ بخۆرەوە وزەت پێ ئەدات.

"لالا" ئەڵێ: برسیمە...

ئیتر هیچی بۆ گرینگ نیە، رەنگە وائەزانێ خەریکە ئەمرێ، دیسان بە ئارامی ئەڵێتەوە:

- برسیمە...

پیاوەکە تێک ئەچێ، ئەکەوێتە منە من، هەڵئەسێتەوە و بەفرکان بەرەو پێشخوانەکە ئەڕوا و خێرا بە ساندویچێک و سەبەدێ نانشیرینیەوە ئەگەڕێتەوە.

"لالا"گوێ نادات، بە توندی دەست ئەکا بە خواردن، لە پێشەوە ساندویچەکە و ئەمجا نانشیرینیەکان یەک لە دوای یەک ئەخوات. پیاوەکەش چاوی بڕیوەتە خواردنەکەی، روومەتە قەڵەوەکەی هێشتا هەر تێکچووە. بەیناوبەین قسەیەک ئەکا، ئەمجا بێدەنگ ئەبێت، نە وەک "لالا" ماندوو بکات.

- کاتێ ئێوە لەبەردەممدا کەوتن، زۆرم بەلاوە سەخت بوو، جاری یەکەمە واتان لێ دێت ؟ مەبەستم ئەوەیە زۆر سەیر و سامناک بوو. ئەو هەموو خەڵکە لەوێ بوون و لەدوای تۆوە بوون، تەنانەت رانەوەستان، هەنگاویان بەسەرتا هەڵئەنا و ڕەت

ئەبوون.... من ناوم "پۆل"ە، "پۆل ئیستێڤ". ئەی تو ؟ فەرەنسی ئەزانی ؟ هی ئێرە نیت، نە ؟... تێرت خوارد ؟... ئەتەوێ ساندویچێکی دیکەت بۆ بسێنم؟

بۆنی سیر و جگەرە و شەراب لە هەناسەکانیەوە دێت، بەڵام "لالا" لەوەی کە ئەو لەویایە رازیە، پێی وایە میهرەبانە و چاوەکانی ئەگەشێتەوە. ئەویش تێ ئەگات و دەست ئەکاتەوە بە قسەکردن، خۆی پرسیار ئەکات و خۆشی وەڵامی ئەداتەوە.

- ئیتر برسیت نیە ؟ خواردنیەک ئەخۆیتەوە ؟ کۆنیاکێ، نە باشتر ئەوەیە شتێکی شیرین بخۆیتەوە، وزەت پێ ئەدات، کۆکایەک ئەخۆیتەوە یان ئاومێوەیەک ؟... ماندووم نەکردووی ؟ من ئەوە جاری یەکەمەکەسێک ئەبینم ئەبوورێتەوە و ئەکەوێتە زەوی، لە راستیدا من حەپەسام. من کار ئەکەم، کارمەندی T.P، مەبەستم ئەوەیە... رەنگە پێویست بێ دوکتۆرێک بتبینێت، ئەتەوێ تەلەفون بکەم ؟...

هەڵئەسێتەوە سەرپێ، بەڵام "لالا" سەری ئەلەقێنێ، دائەنیشێتەوە، چایەکی داخ ئەخواتەوە، ماندوویی ئەحەسێتەوە، روومەتی دیسان مسی رەنگە چاوەکانی ئەبریسکێنەوە، هەڵئەسێتەوە، پیاوەکە تا لای شەقامەکە لەگەڵی دێت:

- دڵنیای ئێستا باشی ؟ ئەتوانی برۆی؟

"لالا" ئەڵێ: بەڵێ، بەڵێ، سوپاس.

بەرلەوە بڕوا، پۆل ئیستێڤ، ناوونیشانی خۆی لەسەر پەرەکاغەزێ ئەنووسێ و پێی ئەدا:

- ئەگەر پێویستت بە شتێک بوو... دەستی "لالا" ئەگووشێ، نەختێ لە "لالا" بەرزترە، چاوە شینەکانی هێشتا پڕە لە هەست و سۆز.

"لالا" ئەڵێ : - خواحافیز و بێ ئەوەی ئاوڕ بداتەوە، بە توندی دوور ئەکەوێتەوە.

سەگەکان لە زۆربەی جێگاکاندا هەن، بەڵام ئەوان وەک سواڵکەرەکان نین، پێیان خۆشترە لە "پانیەر" بژین، لە نێوان گۆڕەپانی "لانش" و شەقامی "رۆفوژ". کاتێ رەت ئەبن، "لالا" سەیریان ئەکات و لێیان ورد ئەبێتەوە. مووەکانیان سیخ رائەوەستن،

زۆر لەڕ و لاوازن، بەڵام لە سەگە وەحشیەکانی "سیتە" ناچن کە مەڕ و مریشکیان ئەدزی و کەڵەگەت‌تر و بە هێزتر بوون و شتێکی ترس‌هێنەر و پڕلە نائومیدی بەرواڵەتیانەوە دیار بوو، بۆ خواردەمەنی سەر بە هەموو کۆگا زبڵێکدا ئەکەن، ئێسقانە کۆنە و سەلکە ماسیەکان ئەجاون. یان وردە ئێسقانەکان کە قەسابەکان بۆیان فڕێ ئەدەن.

"لالا" یەکێ لەو سەگانە باش ئەناسێ، هەموو ڕۆژ هەر لەو جێگادایە، لە خوار پلیکانەکانەوە، بەرەو شەقامێک کە بەرەو کلیسا خەت خەتەکە ئەڕوا، ڕەش ڕەشە و کەڵەنێکی خوری سپی تا سەر سینەی هاتووە. ناوی "دیب" یان "هیب"ە، دڵنیا نیە، لەڕاستیدا ناوەکەی بۆی گرینگ نیە، چونکە خاوەنی نیە. "لالا" گوێی تێوە بوو کوڕێک لەناو کۆڵانەکە ئاوا بانگی لێ کردبوو. کاتێ چاوی بە "لالا" ئەکەوێ، ڕازی و خۆشحال دیارە. کلکی ئەلەقێنێ، بەڵام لێی نزیک نابێتەوە و ناهێڵێ کەس لێی نزیک بێتەوە... "لالا" هەر بەدەم تێپەڕینەوە لێی ئەپرسێ: چۆنی! بێ ئەوە ڕاوەستێ، ئەگەر خواردەمەنیەکی بێت، تۆزێکی پێ ئەدات.

لێرە لە "پانیەر"، هەموو یەکتر ئەناسن، وەک ئەو بەشەکەی دیکەی شارنیەکە سێڵاوی ژنان و پیاوان لە شەقامەکاندا ڕەوانن و دەنگی ماتۆڕەکان و شەقەی پێڵاوەکانیان بەرز ئەبێتەوە. لێرە لە "پانیەر"، شەقامەکان کورتن و لە پێچێکدا ئەگەنەوە سەر شەقامەکانی تر. ئەگاتە کۆڵان و گوزەرگەکان و پلیکانەکانی دیکە، لە خانوویەکی گەورە ئەچێ بە داڵان و هۆدەکانیەوە کە ڕێگایان بۆ یەک بێت، بەڵام جگە لە سەگە ڕەشەکە، دیب یان هیب و چەن منداڵ کە ئەم ناویان نازانێ، زۆربەی خەڵک تەنانەت بۆشی ناڕوانن. "لالا" بێ سرتە لەم شەقام بۆ ئەو شەقام بەدوای گەردشی هەتاو و ڕووناکیدا ئەڕوا. بڵێی خەڵک سڵی لێ بکەنەوە ! لە چی ؟ وتنی دژوارە. ئەڵێی وائەزانن کە لەژێر چاودێریدان و ئەوان ئەبێ سەرنجی هەموو هەڵس و کەوتەکانیان بدەن. بەڵام لەڕاستیدا کەس ئەوانی نەخستووەتە ژێر چاودێری. لەوانەیە بە هۆی ئەوەوە بێ کە بە زمان وزاراوەی زۆر و جۆراوجۆر لەگەڵ یەک ئەدوێن. خەڵکی

باكووری ئەفریقا، مەراكیشی، ئەلجەزایری و توونسی و مووریتانیایی، ئەمجا ئەفریقاییەكان، سەنگالی و مالی، یەهوودیەكان كە لە هەموو جێگایەكەوە دێن، بەڵام هەرگیز بە زمانی وڵاتی خۆیان نادوێن. پورتەقاڵیەكان، ئیسپانیولی و ئیتالیاییەكان و هەروەها خەڵكە سەیر و سەمەرەكان كە وەك ئەوانی‌تر نین، یۆگسلاویەكان و تورك و ئەرمەنی و لیتوانیەكان. "لالا" مانای ئەو وشانە نازانێ، بەڵام لێرە وایان پێ ئەڵێن. "عەمە"یش ئەو ناوانە چاك ئەزانێ. بەتایبەت قەرەجەكانیش هەن، وەك ئەوانەی وا لە ماڵی دراوسێكەیاندا ئەژین. هێندە زۆرن كە هێشتا نازانێ هەموویانی دیتووە یان نە. خۆشیان لە عەرەب و ئیسپانیۆلی و یۆگسلاویەكان نایەت. ئەوان خۆشیان لە كەس نایەت، چونكە عادەتیان نیە لەیەك جێگادا، وەك "پانیەر" بژین و هەمیشە ئامادەی شەڕ كردنن، تەنانەت كورە بچووكەكان و ژنەكان و ئەوانە كە "عەمە" ئەڵێ لەناو دەمیاندا تێخی ریش تاشین هەڵئەگرن.

برێجار شەو لەناكاو، دەنگی شەڕ لە كۆڵانەكە، لەخەو رایانئەچڵەكێنێ. "لالا" لە پلیكانەكان دێتە خوار و بەرەو شەقامەكە ئەڕوا. لە رووناكی كزی دارچرابرقەكە، پیاوێ خۆی بەسەر زەویەكەدا ئەخشێنێ و چەقۆیەك لەناو سینەیدایە ، رۆژی دوایی شوێنەوارێكی درێژی لەزگن، لەسەر زەوی مێش تێی‌داوە.

برێجار پۆلیسەكان دێن، ماشینە رەشە گەورەكانیان لە خوار پلیكانەكانەوە رائەوەستێنن، ئەڕۆنە ناو خانووەكان، بەتایبەت ئەو خانووانەی عەرەب و قەرەجەكانی تێدا ئەژین. پۆلیسە كاسكێت و یۆنیفۆرم لەبەرەكان، هێندەی ئەوانی دیكە ترس‌هێنەر نین، ئەوانە كە جلی ئاسایی لەبەر ئەكەن، كوت و شەڵواری رەنگ خۆڵەمێشی و پولیوری یەخە گرد. بە توندی لەدەركەكان ئەدەن و ئەبێ خێرا بۆیان بكەنەوە. ئەوانیش بێ ئەوە شتێ بڵێن ئەڕۆنە ناو خانووەكان بۆ ئەوە بزانن كێی تیایە.

لە ماڵی "عەمە"، پۆلیسەكە لەسەر كاناپەكە كە جێگای خەوتنی "لالا"یە، دائەنیشێ. "لالا" پێی وایە كە ئێستایە كە كون بێت و ئیمشەو كاتێ ئەخەوێ شوێنەواری پیاوە قەڵەوەكە لەسەریا ئەمێنێتەوە.

ناو، فامیل، ناوی هۆز، رەوایی مانەوە، رەوایی کار، ناوی خاوەنی کار، ژمارەی ئاسایشی و کۆمەڵایەتی، کرێنامە و پسوڵەی کرایە؟

ئەو تەنانەت بۆ کاغەزەکان ناروانێ کە "عەمە" یەک‌بەیەک ئەیدا بە دەستیەوە، لەسەر کاناپەکە دانیشتووە و بە رواڵەتێکی ماندووەوە، جگەرەی "گولوز" ئەکێشێ. بۆ "لالا" ئەروانێ کە لەبەر دەرگای هۆڵی خەوتندا قوت راوەستاوە. بە "عەمە" ئەڵێ:

- کچتە؟

- نە، برازامە.

هەموو کاغەزەکان هەڵدەگرێ و لێیان ورد ئەبێتەوە

- دایک و باوکی لە کوێن؟

- مردوون.

پۆلیسەکە ئەڵێ: ئاخ ... .

بە جۆرێ بۆ کاغەزەکان ئەروانێ ئەڵێی بیر ئەکاتەوە

- کار ئەکات؟

"عەمە" ئەڵێ: نە هێشتا، ئاغا

"عەمە" کاتێ ئەترسێ ئەڵێ ئاغا.

- ئەیەوێ لێرە کار بکات؟

- بەڵی ئاغا، ئەگەر کاری بۆ پەیدا ببێت، بۆ کچێکی لاو کار دۆزینەوە ئاسان نیە...

- هەژدە ساڵیەتی؟!

- بەڵێ ئاغا

- ئەبێ زۆر ئاگادار بن، بۆ کچێکی هەژدە ساڵان گەلێ مەترسی هەیە.

"عەمە" ورتەی لێوە نایەت، پۆلیسەکە وائەزانێ لێی تێ نەگەشتووە، دووپاتی ئەکاتەوە، بە ئارامی ئەدوێ، وشەکانی یەک یەک شی ئەکاتەوە، چاوەکانی ئەدرەوشێنەوە، ئەڵێی ئێستا زۆرتر سەرنجی راکێشراوە.

- ئاگاداربە! ئاکامی کچەکەت نەگەیەتە شەقامی "پراد دۆلافارین" ها؟... کچ گەلێکی زۆر وەک ئەم لەوێن، تێ ئەگەی؟

- بەڵێ ئاغا، «"عەمە" ئەڵێ». ناوێرێ دووپاتی کاتەوە کە "لالا" کچی نیە. بەڵام پۆلیسەکە نیگا رەقەکەی "لالا" بەسەریەوە هەست پێ ئەکات کە ئازاری ئەدات، چەن ساتێ ورتەی لێوە نایەت، بێدەنگیەکە سامناکە. پیاوە قەڵەوەکە ئەپەشۆکێ، بە توورەییەوە دەست ئەکاتەوە بە قسەکردن، لە تاو توورەیی‌دا چاوی تەنگ بووەتەوە:

- ئەرێ، تێ ئەگەم، ئەرێ، من وتم، رۆژێ کچەکەت لەسەر شۆستەکان بە دە فرانک خۆی ئەفرۆشێ، ئەو کاتە دەست نەکەی بە گریان و بڵێی نەمدەزانی، چونکە من ئاگادارتم کردووە.

ئەقیرێنێ، دەمارەکانی لاجانگی ئاوساون. "عەمە" بێ جووڵە فەلەج بوو، بەڵام "لالا" لە پیاوە قەڵەوەکە ناترسێ. "لالا" بە توندی بۆی ئەڕوانێ، لێی نزیک ئەبێتەوە و تەنیا ئەڵێ: - بڕۆ دەرەوە.

پۆلیسەکە بەسەر سوورمانەوە بۆی ئەڕوانێ، ئەڵێی جوێنی پێ داوە، دەمی کردووەتەوە، هەڵئەسێتەوە، لەوانەیە زللەیەکی لێ بدات، بەڵام نیگای کچە لاوەکە وەک کانزایەک رەقە، بەرگەی ناگرێ. ئەمجا پۆلیسەکە بە توورەییەوە هەڵئەسێتەوە، لەپڕتاوێکدا لەدەرەوەیە. لە پلیکانەکان ئەچێتە خوارەوە، "لالا" تەقەی بەستنی دەرگای سەر شەقامەکە ئەبیسێ، پۆلیسەکە رۆشتووەتە دەرەوە. ئێستا "عەمە" سەری ناوەتە نێوان دوو دەستی و ئەگری. لەسەر کاناپەکەدا دائەنیشێ. "لالا" لێی نزیک ئەبێتەوە، شانەکانی لە ئامێز ئەگرێ و گۆناکانی ماچ ئەکات بۆ ئەوەی هێمنی بکاتەوە.

- رەنگە من ناچار ببم لێرە بڕۆم. ئەڵێی لەگەڵ منداڵێکدا قسە ئەکات، بە هێمنی ئەڵێ:

- ئەگەر بڕۆم، لەوانەیە هەموو شت درووست بێت.

- نە، نە، "عەمە" ئەڵێ و زۆرتر ئەگری.

شەو، کاتێ عالەم خەوتووە، تەنیا تەقە تەقی " با " لەسەر تەنەکەی سەربانەکان و

تکەتکی ئاو لە شوێنێکدا، لە نێوان جۆگەیەکدا ئەبیسرێ. "لالا" لەسەر کاناپەکە ڕاکشاوە و چاوی بڕیوەتە تاریک و لێڵی هەوا. بیر لە خانووەکەیان لە سیتە ئەکاتەوە. لەوێ، دووری دوور، کاتێ "با"ی ساردی شەو هەڵیئەکرد، تامەزرۆی ئەوەیە پاڵ بە دەرگەکەوە بنێت و خێرا لە دەرەوە بێت، وەک جاران لە باوەشی شەوێکی قووڵ بە هەزاران ئەستێرەوە، هەست بە زەویە ڕەق و سەهۆڵ بەسراوەکەی ژێر لاقە رووتەکانی بکات. گوێی لە تەقە تەقی سەرما و قیڕەی مێشوولە خۆرەکان، زیڕە زیڕی کوندەبوو ، وەڕینی سەگە وەحشیەکان بێت، وائەزانێ بەتەنیایی لە نێوان ئاوازی کوللەکاندا، ڕێگای تەپۆڵکە بەردینەکانی گرتووەتە بەر، یا لە درێژایی کوێرە ڕێگاکاندا بۆنی دەریا بۆ خۆی ڕایئەکێشێ. بە هەموو هێزەوە چاوی بڕیوەتە تاریکیەکە، ئەڵێی ڕوانینی هێزی ئاوەلاکردنی ئاسمانی هەیە هێزی دەرخستنی سەرلەنوێی دیمەنە ون بووەکان، دەرخستنی سەربانە تەنەکە و قیرتاویەکان، دیوارە تەختەیین و کارتۆنیەکان، سێبەری تەپۆڵکەکان و ئەوان هەموویان، "نەعمانی" پیر، کچانی سەرکانی سووسی و کوڕانی "عەمە"یان بە تایبەت "ئارتانی"، کە وەک هەمیشە بێ جووڵە لەبەر گەرمای بیاباندا، لەسەر قاچێکی ڕاوەستاوە، ئەڵێی چاوەڕوانی مەرگە. لە کاتێکدا پیاوەکانی خاچی سوور بە دوایدا ئەگەڕێن کە بیبەن ، ئەیەوی "ئیس سێر" نهێنی، چاوکات، کە نیگای لە دوورەوە دێت و ئابلۆقەی ئەدا و وەک تیشکی هەتاو ئەچێتە ناخیەوە.

بەڵام ئەوان ئەتوانن لەو بەر دەریاوە، لەوبەر هەموو شتێکەوە تا ئێرە بێن ؟ ئەتوانن ڕێگاکەیان لە نێوان هەموو ئەو جادانەدا پەیدا بکەن. دەرگاکە لە نێوان هەموو ئەم دەرگایانەدا بدۆزنەوە؟

تاریکیەکە کە هێشتا لێڵە، بۆشاییەکی گەورە، ئەونە گەورەکە لە هۆڵەکەدا لوول ئەخوات و لەبەردەم جەستەی "لالا"دا گێژاوێک ساز ئەکا و گێژاوەکە بەسەریەوە دەم ئەکاتەوە، بۆ بەرەوەی ڕائەکێشێ. بە هەموو هێزیەوە چنگ لە کاناپەکە گیر ئەدات، خۆی ڕاگرتووە، جەستەی خەریکە یەکاڵا ئەبێتەوە. ئەیەوێ بقیژێنێ، هاوار

بکات بۆ ئەوە بێدەنگیەکە بڕەوێنێتەوە. قورسی شەو لابات، بەڵام گەرووی گووشراوە، نووکەی لێوە نایەت، هەناسەی سوار بووە، سیخە سیخی هەناسەی دێت. بۆ چەن سات، ڕەنگە چەن سەعات تەقالا ئەدات. هەموو جەستەی داگیراوە، لە ناکاودا، لە کاتێکدا گزنگی دەمەوبەیان لە حەوشەی ماڵ دەرئەکەوێ، "لالا" هەست ئەکا گەردەلوولە کە تێک ئەشکێ. لێک جیا ئەبێتەوە، شل و شلەژاو ئەکەوێتە سەر کاناپەکە. بیر لە منداڵێک ئەکاتەوە کە پێیەتی، بۆ جاری یەکەم نیگەرانی ئەکات، ئازاری کەسێکی داوە کە پێوەندی بە خۆیەوە هەیە، دوودەستی ئەنێ بەسەر سکیەوە، ئەیەوێ تینی پێ ببەخشێ، ئەگری... ماوەیەکی زۆر، بێدەنگ، بەئارامی، ئەڵێی هەناسە ئەکێشێ.

***

ئەوان زیندانیەکانی "پانیەرن"، ڕەنگە خۆیان پێیان نەزانیوە، ڕەنگە پێیان وایە کە ئەتوانن ڕۆژێ بڕۆن بۆ شوێنێکی‌تر، بگەڕێنەوە بۆ گوندەکانیان، بۆ دۆڵە پڕلە قوڕ و چڵپاوەکانیان، ئەو کەسانەی کە بە جێیان هێشتوون بیاندۆزنەوە، دایک و باوک و منداڵ و دۆستەکانیان.

بەڵام بۆیان نالوێ، ناتوانن، شەقامە تەنگ و تروسکەکان، دیوارە کۆنە ڕزیوەکان، ئاپارتمانە تاریکەکان، هۆڵە شێدارو ساردەکان کە هەوایەکی خۆڵەمێشی بەسەر سنگیانەوە، قورس ئەبێت، کارگە خنکێنەرەکان کە کچەکان لەبەر ماشینەکانی جل و بەرگ ئەدوورن، سالۆنی نەخۆشخانەکان، کارگەکان، جادەگەلێ کە تایەی ماشینەکان بەدەنگی تەقینەوەیەک، ئەتەقنەوە، هەموو شت بە سەریاندا زاڵە، ئابلۆقەی داون، زیندانیان ئەکا و ئەوان ناتوانن خۆیان دەرباز بکەن.

ئێستا "لالا" کاری پەیدا کردووە، خزمەتکاری هوتێلی سانت بلانش لە پێش شارەوە بەرەو باکوور، لە شەقامە گەورەکەدا کە بۆ جاری یەکەم رادیکزی لەوێ بینیبوو.

هەموو ڕۆژان، سەرلەبەیانی، لەماڵ دێتە دەر، بەرلەوە دووکانەکان بکرێتەوە،

لەبەر سەرما خۆی لەناو پالتۆ بۆرەکەیەوە دائەپێچێ و لە نێو شارە کۆنەکەدا، لە نێوان کۆڵانە تاریکەکان تێئەپەڕێ. لە پلیکانەکان سەر ئەکەوێ، لەویا کە ئاوێکی پیس لە یەک بە یەکی پلەکاندا ئەڕژێتە خوارەوە. دونیا چۆڵ و هۆڵە، تەنیا چەند سەگ کە مووەکانیان راست بووەتەوە، بە نێو کۆگای زبڵەکاندا ئەگەڕێن. "لالا" لەتێ نانی خستووەتە ناو گیرفانی، چونکە لە هوتێل هیچی بۆ خواردن پێ نادەن. بڕێجار لەگەڵ سەگە پیرە رەشەکە کە ناوی "دیب"یان "هیب"ە، بەشی ئەکات، کاتێ "لالا" ئەگاتە بەرەوە، خاوەنی هوتێلەکە سەتڵ و بڕۆسێکی پێ ئەداکە پلیکانەکان بشوات. پلیکانەکان تا رادەیەک پیس و چڵکنن، وائەزانێ هەوڵەکەی بێهوودەیە.

خاوەنی هوتێلەکە کابرایەکی زۆر پیر نیە، بەڵام رواڵەتی زەرد و چاوگەلی ماسیون، ئەڵێی کەم ئەخەوێ. هوتێلی "سەنت بلانش"، خانوویەکی سێنهۆمیە کە خەریکە ئەڕووخێ، نهۆمی یەکەمی، دووکانی ڕێ و رەسمی بەرێ کردنی مردووە.

جاری یەکەم کە هاتبوو، هێندە پیس و بۆگەن بوو، ترسابوو و خەریک بوو دەرچێ، بەڵام ئێستا راهاتووە، هەر وەک خانووەکەی "عەمە"، یان وەک گەڕەکی پانیەر، ئەبێ دەمی ببەسێ و بە هێمنی هەناسە بکێشێ بۆ ئەوە بۆنی بەدبەختی و نەخۆشی و مەرگ کە لەوێ زاڵە، نەچێتە ناو جەستەی، پلیکانەکان، داڵانەکان و کونج و قوژبنی هۆتێلەکە پڕە لە جاڵجاڵۆوکە و قالۆنچە.

خاوەنی هوتێلەکە یان یۆنانیە، یان تورک، "لالا" باش نازانێ، کاتێ سەتڵ و بڕۆسەکەی پێ ئەدات، ئەگەڕێتەوە بۆ هۆڵەکەی لە نهۆمی یەکەمداکە بخەوێ. دەرکەی هۆڵەکەی لە شووشەیە، بۆ ئەوە ئاگای لە هات و چۆی هوتێلەکە بێت.

هەر بێچارەکان، پیاوە تەنیاکان و بەدبەختەکان دێنە ناو ئەم هوتێلە. خەڵکی باکووری ئافریقا کە لە کارگە کار ئەکەن، رەش پێستەکانی ئانتیە، هەروەها ئیسپانیۆلیەکان، کە بێ کەس و کار و بێ جێگەن، لەویا ئەمێننەوە تا جێگایەکی باشتر بدۆزنەوە.

بەڵام لەویا نیشتەجێ ئەبن، ئەمێننەوە و زۆربەی کات ئەگەڕێنەوە بۆ

وڵاتەکانیان، بێ ئەوە هیچ پەیدا بکەن. چونکە خانوو گرانە و لەشاردا کەس ئەوانی ناوێ.

ئەوان لە ئوتێلی "سەنت بلانش" ئەژین، دوو یان سێ کەس لە هۆدەیەکدان بێ ئەوە یەکتری بناسن، هەموو بەیانیەک کاتێ بۆ سەر کار ئەچن، لە دەرگا شوشەیەکە ئەدەن و کرێهای شەوی پێشووی پێ ئەدەن.

کاتێ برۆس کێشانی پلە پیسەکان و مشەما چەسپاوەکانی داڵانەکە دوایی دێت، "لالا" ئاودەسەکان و تەنیا حەمامەکەش بە برۆسەکە خاوێن ئەشۆرێ، چڵک و پیسیەکانی تەنانەت برۆسە زبرەکەش خاوێنی ناکاتەوە.

پاشان نۆرەی هۆڵەکانە، ژێرجگەرەکان خاڵی ئەکاتەوە و زبڵ و تەپ و تۆزەکە گسک ئەدات. خاوەن هوتێلەکە شاکلیلەکەی پێ ئەدات و ئەویش هۆڵ بە هۆڵ ئەگەرێ. هۆڵەکان کاریان زۆر زوو تەواو ئەبێ چونکە ئەوانەی لەوێ ئەژین زۆر فەقیرن و هەر هیچیان نیە. تەنیا جانتایەکی کارتۆنی و ساکێ پلاستیکی کە بە بەنێکی چڵکن بەسراوەتەوە، لەتە سابوونێ لە نێوان لاپەرەی رۆژنامەیەکدا و برێجار لەناو پاکەتێکی سەرمێزەکە رەسمگەلێ ئەبینێ. "لالا" بۆ ساتێ چاو ئەبرێتە روخسارە گوم بووەکانی لەسەر کاغەزە بریقەدارەکان. سیمای هێمنی منداڵەکان و ژنەکان، وەک ئەوە لە نێوان تەم و مژدا بن، نیوەیان پاک بووەتەوە.

نامەگەلێ لەناو پاکەتی گەورەدا، یان کلیل و کیفی پووڵی خاڵی و حەواڵە، یادگاریگەلێ کە لە بازاری نزیک بەندەرە کۆنەکە سەنراون، ئامێری پلاستیکی گەمەی منداڵانێ کە لە وێنە تارەکاندا ئەبینرێ. "لالا" ماوەیەکی زۆر لێیان ورد ئەبێتەوە، ئەیانخاتە ناو دەستە تەرەکانی، بۆ ئەو گەنجینەکاتیانە ئەروانێ، ئەڵێی نیوە خەوە، ئەڵێی هێزی چوونە ناو دونیای وێنە لێڵەکان و دونیای دەنگەکان، پێکەنینەکان و تارمایی رووناکی زەردەخەنەکان، پەیدا ئەکاتەوە. ئەمجا ئەمانە لەپڕا نوقم ئەبن و دەست ئەکاتەوە بە گسک لێدانی هۆڵەکە. وردەی خواردەمەنیەکان کە بە پەلە خوراون کۆ ئەکاتەوە. لەو خەم و پەژارە خۆڵەمێشیەکە شتەکان و دیمەنەکانی هۆڵەکە

ببوو بە هۆی، دێتەدەر، بڕێجار لەسەر قەرەوێڵەکان گۆڤارێکی پڕلە ڕەسمی رووت پەیدا ئەکات، ژنانی رووت کە رانیان کراوەتەوە و مەمکیان زل وەک پرتەقاڵی گەورە دیارن. ژنگەلێ کە لێویان سوور و چاویان شین و سەوز کردووە و قژیان کاڵ و سوورە. پەڕەی گۆڤارەکان گرمۆڵە کراون و تۆماویان پیا چەسپاوە، ڕەسمەکان پیس و دڕاون، ئەڵێی لەسەر شەقام و لەژێرپێی خەڵک بوون.

"لالا" ماوەیەکی زۆریش لە گۆڤارەکان ورد ئەبێتەوە و بە نیگەرانی و پەژارەوە دڵی توند لێ ئەدا. پاشان گۆڤارەکان لەسەر قەرەوێڵکە دائەنێ و پەڕەکانی جوان ساف ئەکاتەوە و نوێنەکان ڕێک ئەکات. ئەڵێی ئەویشە بیرەوەریەکی زۆر بەنرخە.

لەو ماوەیەدا کە لە پلیکانە و هۆڵەکانە، چاوی بەکەس ناکەوێ، دانیشتوانی هوتێلەکە ناناسێ، کاتێ ئەوان بەیانی بەپەلە بۆسەرکار ئەڕۆن و ئەم نابینن، بە بەردەمیان ڕەت ئەبن، "لالا"یش بۆ ئەوە نەیبینن خۆی دائەپۆشێ. لەژێر پاڵتۆ بۆرەکەیەوە کراسێکێ ڕەنگ خۆڵەمێشی "عەمە" لەبەر ئەکات کە تا قولاپەی پێی ئەگات. حەگاڵێکی گەورە بەسەریەوە ئەبەسێ و سەرپێیەکی کائوچۆیی لەپێ ئەکات. لە داڵانە تاریکەکانی هوتێلەکە لەسەر مشەما ڕەنگ شەرابیەکە و لەبەر دەرگا لەکاویەکاندا، ئەو هەر تارماییەکی خۆڵەمێشی و ڕەشە، کە بە ئاستەم ئەبینرێ، وەک کۆگایەکی کۆنەپەڕۆ، تەنیا خاوەن هوتێلەکە ئەیناسێ و شەوگەردێ کە تا بەیانیان ئەمێنێتەوە، ئەلجەزایریەکی بەرز و لاوازە بە روخسارێکی ئاژ و چاوگەلی جوانی سەوزەوە، وەک چاوەکانی "نوعمان"ی ماسیگر.

هەمیشە بەفەڕەنسی لە "لالا" سڵاو ئەکات و بەمیهرەبانیەوە چەن وشەیەکی پێ ئەڵێ. چونکە بەئەدەبە و بەدەنگی هێمن لەگەڵی قسە ئەکات، "لالا"یش بە پێکەنینەوە وڵامی ئەداتەوە. ڕەنگە ئەو تەنیا کەسێکە لێرە کە ئەزانێ "لالا" کچێکی لاوە و تەنیا کەسێکە کە لەژێر سێبەری پەڕۆکۆنەکاندا، ڕوومەتە جوان و ڕەنگ مسینەکەی و چاوە پڕلە ڕووناکیەکەی دیتوە، بۆئەوانی دیکە، ئەڵێی "لالا" هەرنیە. کاتێ لە هوتێلی سەنت بلانش کاری تەواو ئەبێت، هەتاو هێشتا لە دڵی ئاسماندایە،

"لالا" لە شەقامە گەورەکەوە ڕێگای دەریا ئەگرێتەبەر.

لەوکاتەدا بیر لە هیچ شتێکی دیکە ناکاتەوە، ئەڵێی هەموو شتێکی لە بیر چووەتەوە. لەشەقام، لەسەر شۆستەکە، خەڵکەکە هەمیشە بە پەلەن، هەمیشە بەرەو جێگایەکی نەناسراو ئەچن. پیاوەکان کە چاویلکەکانیان ئەدرەوشێتەوە، هەنگاوی بەرز هەڵئەگرن، فەقیرەکان کە جل و بەرگی دڕاویان لەبەرە، ڕوو بە ئەوبەر ئەڕۆن، چاوەکانیان ڕێوی ئاسا لە بۆسەدان.

دەستە کچانی لاو جلەکانیان چەسپاوە بە جەستەیانەوە و کاتێ ڕێ ئەڕۆن دەنگی پاژنەی پێیان بەرز ئەبێتەوە، ئاوا: کراکاب، کراکاب...

ماشینەکان، موتورەکان، دووچەرخەکان،کامیۆنەکان، ئوتوبووسەکان، بە هەموو هێزەوە دەئاژوون بەرەو دەریا یان بەرەو لاژووری شار، ئاخنراون لە ژن و پیاوانی وەکوو یەک. "لالا" لە سەر پیادەڕەوەکە بەدەم ڕۆشتنەوە، هەموو ئەمانە ئەبینێ، ئەم جم و جووڵانە، ئەم تەشک و ڕواڵەتانە، بریسکەی ڕۆشنایی هەموو ئەمانە لە ناخیدا ئەبن بە گێجەلووکەیەک.

"لالا" برسیەتی، جەستەی لە کاری هوتێل شەکەت و ماندووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا نیازیشی بە ڕۆشتنە، بۆ دیتنی زۆرتری ڕۆشنایی، بۆ دەرکردنی هەموو تاریکیەک کە لە ناخیدا ماوەتەوە.

"با"ی سەهۆڵ بەستوی زستان لە درێژایی شەقامەکە بۆرانێکی هەڵکردووە، تەپ و تۆز و پەڕە کۆنەی ڕۆژنامەکان هەڵدەبەزێتەوە. "لالا" چاوی نیوە نووقاوە و هەروا ئەڕوا، کەمێ چەماوەتەوە، وەک جاران کە لە بیابان بەرەو سەرچاوەی ڕۆشنایی ئەڕویشت، بەرەو ئەوپەڕی شەقامەکە، کاتێ ئەگاتە بەندەر، هەست بە جۆرە مەستیەک ئەکات، لە قەراخ شۆستەکە کەوتووەتە تلاوتل، لێرەدا "با" بە ئازادی لوول ئەخوات و لەبەردەمیا ئاوی بەندەرەکە ئەهەژێنێ. ڕۆشنایی لە دوورەوە دێت، لەو بەر ئاسۆوە، ڕێک لە باشوورەوە، "لالا" لە درێژای لەنگەرگەکە بەرەو دەریا ملی ناوە، زەنازەنای مرۆڤەکان و ماتۆری ماشینەکان لە دەوریدا ئەسوورێتەوە، بەڵام گوێی

پێنادات، جارجار بە راکردن و جارجار بە ئەسپایی بەرەو کلیسا خەت خەتەکە چەهنگاو هەڵدەگرێت، ، ئەمجا رێگای دوورتر ئەگرێتە بەر، بەرەو مەڵبەندە چۆڵەکەی لەنگەرگەکە، لەویاکە "با" لە ئەستونێکدا تۆز و سیمان بەرز ئەکاتەوە.

لەپڕ بێدەنگی زاڵ ئەبێت. ئەڵێی بەڕاستی چوەتەوە بۆ بیابان، لەبەر دەمیا پانتایی سپی لەنگەرگەکان لەبەر هەتاودا ئەدرەوشێتەوە، "لالا" بە ئارامی لەدرێژای تارمایی کەشتیە باربەرە گەورەکەدا ئەڕوا، لە ژێر جەرسەقیلەکان، لە نێوان ریزی سەندووقە سوورەکانەوە.

لێرەدا کەسی لێ نیە، ماشێنی لێ نیە، تەنیا بەردی سپی و سیمان و ئاوی لێڵی حەوزەکانە، پاشان جێگایەک هەڵدەبژێرێ، لە نێوان دوو ریزە بارکە بە برزنتی شین داپۆشراوە، بە دەم خواردنی نان و پەنێرەکەیەوە و سەیری بەندەر ئەکات. برێ جار باڵندەیەکی گەورەی دەریایی بە قیژە قیژ رائەبوورێ و "لالا" بیر لەوێ ئەکاتەوە، لە نێوان تەپۆڵکە لمەکان، بیر لە باڵندە سپیە دەریاییەکە ئەکاتەوە کە شای دەریا بوو. نانەکەی لەگەڵ گاکیەکان بەش ئەکات، چەند کۆتریش دێن.

لێرا هەموو شت هێمن و ئارامە. کەس هەرگیز ئێرە پەیدا ناکات، جار جار ماسیگرێک لەدرێژایی لەنگەرگەکە رەد ئەبێ، بەداری ماسیگرییەکەیەوە، بە دوای جێگایەکدا ئەگەڕێ، هەر لەژێر چاوەوە سەیرێکی ئەکا و بەرەو ئەوپەڕ بەندەرەکە مل ئەنێ، یان منداڵێک دەستی لەناو گیرفانیدا شەق لە قوتوی خوراکی ژەنگاوی ئەدات و گەمە ئەکات.

"لالا" هەست ئەکات هەتاو ئەچێتە ناخیەوە، بەرەبەرە سیخناخ ئەبێ لە هەتاو، رەشایی و خەم و پەژارە لە ناخیدا ئەتارێنێ، ئیتر بیر لە ماڵی "عەمە" ناکاتەوە، بیر لە حەوشە رەشەکان ناکاتەوە کە تکە تک، تایداوی لێ ئەچۆڕێ، ئیتر بیر لە هوتێلی سەنت بلانش ناکاتەوە. تەنانەت بیر لە هەموو ئەو شەقام و بوارانە ناکاتەوە کە خەڵک بێوچان دێن و ئەچن و پرتە و بۆڵەیان دێت. وەک تاشەبەردێکی لێهاتووە کە قەوزە داپۆشیوە و بێجووڵە، بێهزر و بیر لە گەرمای هەتاودا رەویوەتەوە.

جارجار تەنانەت ئەخەوێ، پاڵ ئەداتەوە بە برزنتە شینەکەوە و چەناکەی ئەنێتە سەر ئەژنۆی، ئەمجا خەو ئەبینێ لەناو بەلەمێکدا لە دەریایەکی هەراودا، تائەوپەڕی دونیا ئەڕوا.

کەشتیە بار بەرە گەورەکان بە ئارامی بەسەر گۆماوە ڕەشەکاندا ئەچنە پێش، لە بەندەر دوور ئەکەونەوە و بەرەو دەریا مل ئەنێن. "لالا" لە درێژایی لەنگەرەکە، بە ڕا کردن شوێنیان ئەکەوێ، ناتوانێ ناوەکانیان بخوێنێتەوە، بەڵام بۆ ئاڵاکانیان ئەڕوانێ و خاڵە ڕەنگاویەکانی سەر لاشەی کەشتیەکان و دەکەڵە گەورەکان کە هێندە قورسن وەک ئانتین لار بوونەتەوە و دووکەڵ کێشەکانیان کە ئەستێرە و خاچ و چوارگۆشە و هەتاویان بەسەرەوە ڕەسم کردووە، لە پێش کەشتیە باریەکانەوە قایەقەکان وەک دەعبایەک بەرۆ بوونەتەوە و کاتێ بەرەو دڵی دەریا ئەڕۆن بە فیکە لێدان خواحافیزی ئەکەن.

ئاوی بەندەریش گەلێ جوانە، "لالا" زۆربەی کات لاقی بەسەر ئاوەکەدا شۆڕ ئەکاتەوە و سەیری پەڵەی ڕەنگاوڕەنگی نەوتی سەر ئاوەکە ئەکات. شووشەی ئاوجۆ، پێستی پرتەقاڵ، کیسە نایلۆن، لەتە دار و تەناف و جۆرە قەوزەیەکی ڕەنگ قاوەیی کە نازانێ لەکوێوە دێت، وەک تف لێک جیا ئەبنەوە.

کاتێ کەشتیەکە تێئەپەڕێ، بزاوتی ئارامی شەپۆلەکان لە هێڵێکدا بەدەم جیابوونەوە و لێک پچڕانەوە ئەچنە پێش و ئەکوترێن بە لەنگەرگەکاندا. "با" جار جار هەڵئەکات و ئاستی سەر چاڵاوەکان چرچ و لۆچ ئەکات و بزاوتی شەپۆلەکانی دوای کەشتیە باربەرەکان تێک ئەشێوێنێ.

ڕۆژانی زستان، کاتێ هەتاو بە تینەوە ئەدرەوشێتەوە، "رادیکز"ی سواڵکەر بۆ دیتنی دێت. لە درێژایی لەنگەرەکەوە بە ئەسپایی دێت، بەڵام "لالا" لە دوورەوە ئەیناسێ و لە حەشارگەکەی دەرئەپەڕێتە دەرەوە و بە دوو قامکی فیکە لێ ئەدات. وەک جاران کە شوانەکان و "ئارتانی" فیکەیان ئەکێشا، کورەکەیش بە ڕاکردن بەرەو ئەم دێت و لە قەراخ لەنگەرەکەدا لای "لالا" دائەنیشێ، بۆ ماوەیەکی زۆر ورتەیان

لێوه نایەت. چاو ئەبڕنە ئاوی بەندەرەکە، کوڕه لاوەکە شتێکی پێ نیشان ئەدات کە تا ئێستا نەیدیوە. لە ئاستی سەر ئاوە ڕەشەکە تەقینەوەگەلی بچووکی بێدەنگ کە شەپۆلەکان درووستی ئەکەن، "لالا" بۆ ئاسمان ئەڕوانێ، وائەزانێ تنۆکی بارانە، بەڵام ئاسمان شینە، پاشان تێ ئەگا بڵقگەلێکن کە لە قووڵایی ئاوەکەوە سەردەردێنن و لەسەر ئاستی سەرئاوەکەدا ئەدرەوشێنەوە، بە ڕوانین بۆ تەقینەوەی بڵقەکان سەرگەرم ئەبن:

- ئەوەیە... ئەویا... دیسان.. دیسان... بڕوانە... ئەویا... ئەی ئەویا... ئەو بڵقانە لە کوێوە دێن؟...

"رادیکز" ئەڵێ ئەوانە ماسیەکانن کە هەناسە ئەکێشن، بەڵام "لالا" پێی وایە کە ئەوانە گژوگیان و بیر لەو گیا سەیرانە ئەکاتەوە کە لە قووڵایی بەندەرەکەدا بە ئارامی ئەبزوێن. پاشان رادیکز قوتوە شقارتەیەک دەردێنێ، ئەڵێ کە ئەوە بۆ جگەرە کێشاندنە ،بە لام لە راستیدا ئەو حەز لە جگەرە ناکات هەر پێی خۆشە شقارتە داگرسێنێ، هەر کاتێ پارەی بێت، لە دووکان شقارتەیەک ئەکرێ کە بە سەریەوە قەرەجێک سەما ئەکات. لە کونجێکی بێدەنگدا دائەنیشێ و یەک‌بەیەکی چڵە شقارتەکان خێرا خێرا دائەگرسێنێ، هەر بۆ چێژ وەرگرتنێک لە سووتانی سەرە بچووکە سوورەکانیان کە وەک فشفشەیک ئەسووتێ، پاشان شۆڵە جوانە نارنجیەکەی بە نووکی چڵە شقارتەکەوە لە ناو لەپی دەستیدا سەما ئەکات. لە ئاستی سەربەندەر، "با"یەکی توند هەڵئەکات و "لالا" ناچارە داوێنی کراسەکەی وەک ڕەشماڵێ هەڵبداتەوە. هەست بە گەرمای توندی فوسفر ئەکات کە لووتی ئەسوڵێنێتەوە. هەرجار کە شقارتەیەک دائەگرسێنن، هەر دووکیان ئەقلێنەوە و هەوڵ ئەدەن چڵە شقارتەکە بە نۆرە بگرن. "رادیکز" بە "لالا"ی نیشان ئەدا کە چۆن شقارتەکان دائەگرسێنێ، نووکی قامکەکانی تەڕ ئەکات و نووکە سووتاوەکەی ئەگرێ. کاتێ "لالا" نووکە سوورەکە ئەگرێ پێستی قامکی دۆشاومژەی ئەسووتێ. بەڵام سووتاندنێکی خۆشە، بۆ شۆڵەکە ئەڕوانێ کە هەموو شقارتەکە دائەگرێ و وەک بڵێی دارە سوورەکە

زیندوو بێت، لوول ئەخوات. پاشان جگەرەیەک بۆ هەر دووکیان دائەگرسێنێ، پاڵ ئەدەنەوە بە برزنتە شینەکەوە و چاو ئەبڕنە بۆشایی ئەو بەر ئاوە تاریکەکەی بەندەر و ئاسمان کە بە ڕەنگی تەپ و تۆز و سیمانە.

"رادیکز" ئەپرسێ:چەن ساڵتە؟ .

ـ هەڤدە ساڵ. بەڵام بەزوویی ئەچمە ناو هەژدە.

ـ من مانگی داهاتوو چواردە ساڵ تەواو ئەکەم.

تاوێ رائەمێنێ، چین ئەخاتە برۆکانی.

ـ تۆ تا ئێستا لەگەڵ پیاو خەوتووی؟

"لالا" لەو پرسیارە سەری سوور ئەمێنێ.

ـ نە، بەڵام ئا، بۆ؟

"رادیکز" هێندە دڵ مەشغوڵ و نیگەرانە بیری نیە جگەرەکە بدات بە "لالا"، خێرا خێرا بێ ئەوە دووکەڵەکەی هەڵمژێ، مژی لێ ئەئەدات.

ـ من ئەو کارەم نەکردووە.

ـ چیت نەکردووە؟

ـ لەگەڵ ژن نەخەوتووم.

ـ تۆ زۆر منداڵی.

ـ نەخێر، هیچیش وانیە. «تووڕە ئەبێ و ئەکەوێتە ترە تر.»

ـ نەخێر وانیە، من، هەموو رفێقەکانم ئەو کارەیان کردووە، بڕێکیان تەنانەت ژنیان هەیە و گاڵتەم پێ ئەکەن کە ژنم نیە.

مژێ لە جگەرەکە ئەدا و رائەمێنێ.

ـ بەڵام ئەوان هەرچی ئەڵێن، بڵێن، من وائەزانم هەر بۆ کاری شەیتانی و گاڵتە پێ کردن لەگەڵ ژنان خەوتن باش نیە، وەک جگەرە کێشاندنە، خۆتۆ ئەزانی من هەرگیز لەبەر چاو خەڵکدا جگەرە ناکێشم، لەوێ لە هوتێل وائەزانن من هەرگیز جگەرە ناکێشم، پێم پێ ئەکەن، چوونکە نازانن. بەڵام بۆ من گرینگ نیە، پێم باشترە

نەزانن.

جگەرەكە ئەداتەوە بە "لالا". جگەرەكە بە تەواوەتی خەریكە ئەكوژێتەوە، مژێكی لێ‌ئەدا و ئەیخاتەوە سەر زەوی و پێی پیا ئەنێ.

- ئەزانی كە من منداڵم ئەبێت؟

نازانێ ئەویە بۆ "رادیكز" وت. ئەویش بێ‌ورتە ماوەیەكی زۆر چاوی تێ‌ئەبرێ. شتێكی تاریك لە چاویایەتی. بەڵام لەپڕ ئەگەشێتەوە.

- زۆر باشە. «بە شێلگیرانە ئەڵێ»: زۆر باشە، زۆرم پێ‌خۆشە.

ئەونە خۆشحاڵە خۆی بەعەرزەوە ناگرێ، هەڵئەستێتەوە، بەرەو ئاوەكە ئەڕوا، پاشان ئەگەڕێتەوە بەرەو "لالا":

- دێیت بۆ ماڵی من، بۆ ئەویاكە ئەژیم؟

"لالا" ئەڵێ: ئەگەر تۆ بتەوێ.

- خۆ ئەزانی زۆر دوورە، ئەبێ بە ئوتوبوسی خەت بڕۆین، پاشان ئەبێ بە پێ زۆر بڕۆین بەرەو مەخزەنەكان، هەركات بتەوێ پێكەوە ئەچین، ئەگینا ون ئەبی.

بەڕاكردن ئەڕوا.

هەتاو ئێستا داكشاوە، لە هێڵی خانووە بەرزەكان لەوبەر لەنگەرگەكە زۆر دوورنیە، كەشتیە باریەكان هێشتا بێ‌جووڵە ماونەتەوە، لە تاشە بەردی ساحلی ژەنگاوی ئەچن. گاكیەكان بە ئەسپایی لەبەر دەمیاندا ئەفڕن و لە ئاستی سەردەكەڵەكاندا سەما ئەكەن.

برێ رۆژ "لالا" دەنگی ترس ئەبیسێ، نازانێ چیە، وەك كوتانێكی قورس بەسەر لەوحێكی كانزایی، یان زەنازەنایەكی كپ، كە لە گوێیەوە نایەت، بەڵكوو لە تەختی قاچیەوە دێت و لە هەموو جەستەیدا ئەزرنگێتەوە. لەوانەیە تەنیایی بێ و برسیەتی، برسیەتی ئارام بوون و هێمنایەتی، برسیەتی رووناكی، گۆرانی، برسیەتی هەموو شت.

هەر كە دوای كار لە دەرگای ئوتێلی "سەنت بلانش" دێتەدەر، هەست بە تیشكی

زۆر رووناکی ئاسمان ئەکات کە بە سەریا ئەبارێ سەر و قژی و تا برۆکانی بە حەگاڵە ڕەنگ خۆڵەمێشیەکەی "عەمە" دائەپۆشێ و تا ئەتوانێ سەری لە ناو یەخەی پاڵتۆ بۆرەکەی دائەشارێتەوە، بەڵام سپیایەتی ئاسمان و بۆشایی شەقامەکان هەمیشە سەرنجی ڕائەکێشن.

شتێ وەک ڕشانەوە، لە ناخیەوە سەر ئەکەوێ، تاگەرووی دێت و ناودەمی تاڵ ئەکات.

"لالا" خێرا جەستەی ئەنیشێنێتەوە سەر زەوی، گرینگ نیە، لە هەر کوێ بێت، دڵنگەرانی خەڵکەکەیش نیە کە بۆی ئەڕوانن. چوونکە لەوە ئەترسێ جارێکی دیکە لە سەر خۆی بچێ، بە هەموو هێزەوە خۆی ڕائەگرێ، هەوڵ ئەدات تـرپە و جـم و جووڵی دڵ و ریخۆڵەکانی هێمن کاتەوە. هەر دوو دەستی لە سەر سکی دائەنێ، بۆ ئەوە گەرمای لەپی دەستی، بە سەر کراسەکەیەوە تا ناخی و منداڵەکەی گەرم کاتەوە، جارێکی دیکەش هەر وای کردبوو. کاتێ ئەو ئازارە پیسانە لە خـوارووی سکـیەوە زۆری بۆ دێنێ و وەک حەیوانێک لە ناخەوە ئەیرزێنێ. ئەمجا بە ئارامی خـۆی بـۆ بەرەوە و بۆ داوەوە ئەشەکێنێتەوە.

لە قەراخ پیادەڕەوەکە، لە تـەنیشت مـاشێنە ڕاوێسـتاوەکـان، خـەڵک بـێ‌ئەوە ڕاوێسن، تێ‌ئەپەڕن، کەمێ هەنگاوەکانیان سووک ئەکەنەوە، ئەڵێی بەرەو ئەم دێن، بەڵام کاتێ "لالا" سەری بەرز ئەکاتەوە تا ڕادەیەک ئێش و ئازار لە چاویایەتی، خێرا ڕێی خۆیان ئەگرن و ئەڕۆن، چوونکە سڵی لێ‌ئەکەنەوە.

دوای ساتێ، ئازارەکە لەژێر دەستی "لالا"وە ئەڕەوێتەوە و ئەتوانـێ ئـازادتـر هەناسە بکێشێ، گەرچی "با"یەکی سارد هەڵی کردووە، بەڵام جەستەی نیشتوەتە سەر عارەق، کراسە تەڕەکەی لکاوە بە پێستیا، ڕەنگە ئەوە دەنگی ترسەکە بە گوێی نابیسێ، بەڵکوو بە قاچەکانی و هەموو جەستەی ئەیبیسێ و هەموو شەقامەکـانی شـار خـاڵی ئەکاتەوە.

"لالا" بەرەو شارە کۆنەکە سەر ئەکەوێ، بە سەختی لە پلیکانە هەڵکنراوەکان

سەر ئەكەوێ، لەوێوە بۆنی زێرابەكان هەست پێ ئەكات. لە سەر پلیكانەكەوە بە دەستی چەپدا ئەچەرخێ، ئەمجا بەرەو شەقامی "بۆن ـ ژێسوس" ئەروا. لە سەر دیواری كۆنی كۆڵانەكان، بە گەچ نیشانەگەلێ نووسراون، نامە و نیگارگەلێكی بێ مانا و نیوە پاك كراوە. لەسەر زەویەكە مێش نیشتوەتە سەر چەن خاڵی سوورکە لە خوێن ئەچن. رەنگە سوورەکە لە مێشكیدا وەك دەنگی فیكە ئەزرنگێتەوە. ویژەویژێكە كە مێشكی كون ئەكات و رۆح و بیری خاڵی ئەكاتەوە، بە ئەسپایی و بە سەرنجەوە لە سەر یەكەمین خاڵ ئەپەڕێتەوە، دووەمین و سێهەمین، شتانێكی سەیر لەگەڵ خاڵە سوورەكان تێكەڵ بوون كە لە كوركرۆژە و ئێسقانی شكاو و پێست ئەچن، فیكەكە لە مێشكی "لالا"دا بە هێز تر لێ ئەدات.

هەوڵ ئەدات لە درێژای لێژایی شەقامەكەدا رابكات. بەڵام بەردەكان تەڕ و خزن. بەتایبەت كە ئەویش سەرپێیی كاتۆچۆیی لەپێیە. شەقامی "تیمون"، دیسان بە گەچ بە دیوارە كۆنەكانەوە شتیان كێشاوە، یان وشەن و لەوانەیە ناوبن!؟ ئەمجا ژنێكی رووت كە هەر دوو سینگی وەك دوو چاون، "لالا" گۆڤارەكەی سەر قەرەوێڵە شپرزەكەی هوتێلەكەی بیر ئەكەوێتەوە، لەولاتر...

"لالا" هەناسەی هەڵنایەت، ئارەق بە تەوێڵ و پشتیا ئەچۆڕێتەوە و كەلەكەی تەڕ ئەكات، ژێربالی ئەسووتێنێتەوە، لەم سەعاتەدا كەس لە شەقامەكان دیار نیە تەنیا چەند سەگ كە موویان راست بووەتەوە و بە بۆڵە بۆڵ ئێسقان ئەجاون.

دەلاقەكانی ئاستی زەوی بە تەلبەند و مێلە بەسراون، لەسەرترەوە پەنجەرە كركرەییەكان كێشراون. سەرمای مەرگ لە دەرگای ژێرزەوینەكان و سەراوەكان و دەلاقە رەشەكانەوە دێتەدەر ئەڵێی هەناسەی مەرگە لە درێژایی شەقامەكانەوە هەڵی كردووە و سووچی قەراخ دیوارە بۆگەنەكان پڕ ئەكاتەوە.

بو كوێ بڕوا ؟ "لالا" رێ ئەكەوێتەوە، بە دەستی راستدا ئەگەڕێتەوە، بەرەو دیواری خانووە كۆنەكە كە هەركات ئەو بەر پەنجەرە تەلبەند كراوانە ئەبینێ، ترس دایئەگرێ، وائەزانێ زیندانێكە كە خەڵكی تێدا مردووە. تەنانەت ئەڵێن بری جار

شەوانەناڵە و هاواری زیندانیەکان لەپشت مێلەکانەوە ئەبیسرێ.

ئێستا لە درێژایی شەقامی "پیستۆل"دا ئەگەرێ کە هەمیشە چۆڵ و هۆڵە. پاشان لە "شاریت"ەوە ئەڕوا بۆ ئەوەی لە نێوان دەرگا بەردینە رەنگ خۆڵەمێشیەکەوە، گومەزە سوورە سەیرەکە چاو بکات کە زۆری خۆش لێ دێت.

بڕێجار لەبەر دەرگای ماڵێک دائەنیشێ و چاو ئەبڕێتە گومەزەکە کە لە هەور ئەچێ و هەموو شتی لەبیر ئەچێتەوە. بەڵام ژنێ دێت و پێی ئەڵێ کە لەویا چی ئەکات و دەری ئەکا. ئیمڕۆ تەنانەت گومەزە سوورەکەش ئەیترسێنێ، ئەڵێی مەترسیەک لە پشت دەلاقە تەنگەکانیەوەیەتی، ئەڵێی قەبرە. بێ ئەوە ئاوڕ بداتەوە بە پەلە لە شەقامە بێدەنگەکاندا بەرەو دەریا مل ئەنێ. "با" لە شەقامە بەردەکانی رۆخی دەریاوە دێت، جلی سەر تەنافەکان ئەشەکێنێتەوە، ئاڵا سپیە گەورەکان کە قەراخەکەیان شیتاڵ شیتاڵ بووەتەوە، جل و بەرگی مناڵ و پیاوەکان، جلی شین و سووری ژێرەوەی ژنان. "لالا" ناتوانێ بۆیان بڕوانێ، چونکە جەستە نادیارەکانیان نیشان ئەدەن، لاق و باسک و... وەک پێستی بێسەر.

لە ئاستی شەقامی "رۆدیبات" بەرەو پێش ئەچێ، پەنجەرە نزمەکانی ئێراش تەلبەند کراون. ژن وپیاوەکانی تێدا زیندانی بوون. "لالا" رستە نیوە تەواوەکان، دەنگی کاسە و کەوچک و چێشتخانەکان، یان ئاهەنگێکی کپ ئەبیسێ، بیر لە هەموو ئەوانە ئەکاتەوە کە لەو شەقامە نیوەتاریک و ساردانەی پڕ لە قوڵانچە و مشکدا زیندانین. هەموو ئەوانەی کە ئیتر چاویان بە رووناکی ناکەوێ و ئیتر "با" هەڵنامژن.

لەویا لە پشت ئەو دەلاقەیە، بە شووشە رەشە درز بردووەکانیەوە، ژنێکی قەڵەوی نەخۆش، تەنیا لەگەڵ دوو پشیلەی لاواز ئەژی، هەمیشە باسی باخەکەی ئەکا، گوڵە سوورەکانی، درەخت و دار لیمۆکانی کە جوانترین مێوەی دونیا ئەگرن، ئەو، کە جگە لەم کونجە سارد و رەشە و دوو پشیلەی کوێر، هیچی تری لەم دونیادا نیە.

ئێرە ماڵی "ئیبراهیمە"، سەربازێکی پیر کە لەگەڵ ئەڵمانیەکان، تورکەکان و سێبریەکان، شەڕی کردووە و هەمیشە بە بێ ئەوەی ماندوو بێت کاتێ "لالا" داوای لێ

ئەکات، دووپاتی ئەکاتەوە. بەڵام ئەویش نامرێ؟ لەدوای خانووە گەڕەکەی و پلیکانە تاریک و خزەکەیدا کە لە هەر پلەیەکدا خەریکە ئەکەوێ و دیوارەکانی بەسەر سینە لاوازەکەیدا وەک پاڵتۆیەکی تەڕ قورس بووە، هەروەها ئیسپانیۆلیەکە و شەش منداڵەکەی لەوێدا ئەژین. هەموویان لە یەک هۆڵدا بە پەنجەرەیەکی تەسک و تەنگەوە ئەخەون.

یان ئەوانەی لە مەڵبەندی پانیەر وێڵن، جل و بەرگی کۆنە و شڕیان لەبەرە، ڕەنگ پەڕیو و هەمیشە برسین. لێرە لەم خانووەدا کە شەقارێک بە دیوارەکانیەوە تا بێ پەرە ئەسێنێ و هەمیشە تەڕە، ئەڵێی ئارەقێکی پیس تەڕی کردووە، ژن و پیاوێکی نەخۆش هێندە توند ئەقۆزن کە "لالا" شەوانە لە خەو راڕەچڵەکێ ئەڵێی بەڕاستی لە نێوان ئەو هەموو دیوارانەوە دەنگیان ئەبیسێ، هەروەها خێزانێکی خارجیش لەویا ئەژین، پیاوەکە ئیتالیاییە و ژنەکەی یۆنانی، پیاوەکە هەموو شەو مەست ئەکات و بە مشت ئەکەوێتە لێدانی سەر و ملی ژنەکەی، تەنانەت ئەو کاتەش کە توورە نیە، هەر بۆ ئەوە کە ژنەکەی بە چاوە پڕلە فرمێسکەکەیەوە بۆ روخسارە ماندووە ئاوساوەکەی ئەوئەڕوانێ، دەست بە لێدانی ئەکاتەوە. "لالا" زۆر رقی لەو پیاوەیە، کاتێ بیری لێ ئەکاتەوە، ددانەکانی جیڕ ئەکاتەوە، هەروەها لەم مەستیە ئارام و نائومێدیە و لە گوێ رایەڵی ژنەکە ئەترسێ، چونکە هەر ئەوەیە لەسەر یەکبەیەکی بەرد و خاڵەکانی شەقامە لەحنەتیەکانی ئەم شارە، لەسەر هەر نیشانە و نووسراوەی سەر دیوارەکانی پانیەر ئەبینرێت.

برسیەتی و ترس و بەدبەختی وەک جل و بەرگە کۆن و دڕاو و تەڕەکان، وەک روخسارە پیرە ژاکاو و رق لێکراوەکان، لە هەموو جێگایەکدا هەن.

شەقامی پانیەر، شەقامی "بولو" و پانتای "بوسونو"، هەمیشە هەمان حەساری خانووی گولیەکان، ترۆپکی خانووبەرەکان کە لە رۆشنایی ساردی ئاسماندا لەیەک ئەکەون، بن دیوارەکان کە ئاوە سەوزەکەی ئەگەنێ و کۆگای زبڵەکان بۆگەن ئەکەن.

ئێرا نە زەردەواڵەی لێیە نە مێش کە بە ئازادی لە هەوادا بفڕن، لێرا هەر مرۆڤ و

مشک و قالۆنچە هەن، هەموو ئەوانەی کە لە چاڵە تاریکەکاندا بێ هەوا و بێ ئاسمان ئەژین. وەک سەگێکی پیری ڕەش مووەکانی "لالا" ڕاست بوونەتەوە بێ ئەوە جێگایەک بدۆزێتەوە لە شەقامەکاندا ئەخولێتەوە. ساتێ جەستەی ئەنیشێنێتە سەر پلیکانەکان، لە تەنیشت دیوارێکدا کە لەو بەریەوە تەنیا درەختی رواوی شار، دار هەنجیرێکی پیرە کە بۆن و بەرامەی بڵاو کردووەتەوە، ساتێ درەختەکەی ئەوێی دێتەوە یاد کە چەنێ حەزی لێ ئەکرد. کاتێ "نوعمان"ی پیر بەدەم درووست کردنی تۆرەکانیەوە چیرۆکی ئەگێڕایەوە. بەڵام ناتوانێ ماوەیەکی زۆر لە جێگایەکدا بمێنێتەوە، وەک سەگێکی پیر لە پێ کەوتووە. لە نێوان تاریکیە پێچاوپلووچەکە وەرێ ئەکەوێ، هێدی هێدی رووناکی ئاسمان ئەرەوێتەوە، دیسان لەسەر نیمکەتێکی ناو گۆرەپانە بچووکەکە لە پارکی منداڵاندا دائەنیشێ. برێجار زۆری پێ خۆشە لەوێ بمێنێتەوە و سەیری منداڵەکان بکات کە بە تلاوتل بە قاچە لەرزۆکەکانیان هەنگاو هەڵدەگرن و هەر دوو قۆڵیان بڵاو ئەکەنەوە. بەڵام ئێستا هەر تاریکیە و تاریکی... تەنیا لەسەر یەکێ لە نیمکەتەکان پیرەژنێکی ڕەش پێست کە کراسێکی درێژی ڕەنگاوڕەنگی لەبەردایە، دانیشتوە. "لالا" لە تەنیشتیەوە دائەنیشێ، هەوڵ ئەدا لەگەڵی بدوێ:

- لێرە ئەژیت ؟ لە کوێوە هاتووی ؟ لە چ وڵاتێکەوە ؟

ژنە پیرەکە تێ ناگات، بۆی ئەڕوانێ، ئەترسێ، بە داوێنی کراسەکەی روخساری دائەپۆشێ. "لالا" دیواری ئەوپەڕ گورەپانەکە باش ئەناسێ، یەکبەیەکی خاڵ و شەقار و ڕەنگەکان ئەناسێ. درووست لەسەر دیوارەکەوە لوولە زۆمپاکان و ناودانەکان، لە خوار بانەکەوە پەنجەرە بچووکە بێ پەردەکان بە شووشە چڵکنەکانیانەوە دیارە، لەخوار هۆدەکەی "ئیدا"ی پیرەوە بە تەنافێکەوە جلیان هەڵخستووە، لەبەر باران و تەپ و تۆز، ڕەق بوون. لە خوارەوە دەلاقەی قەرەجەکان زۆربەی شووشەکانی شکاون، برێکیان مێلیشیان نیە، ئیتر هەر کونگەلێکی ڕەشی دەمئاوەڵان. "لالا" ماقی کونە تاریکەکان ئەبێت، هەست بە وجوودی سارد و سامناکی مەرگ ئەکات،

ئەلەرزێ، بۆشاییەکی بەرین سەر گۆڕەپانەکەی گرتووە. گەردەلوولی نەمان و مەرگ کە لەو دەلاقانەوە دێنە دونیاوە و لە نێوان دیواری خانووەکاندا لوول ئەخۆن.

لەسەر نیمکەتەکە، لە تەنیشتیەوە پیرەژنە دوورەگەکە نابزوێ، هەناسە ناکێشێ. "لالا" هەر باسکە لاوازەکانی ئەبینێ کە دەمارەکانی وەک تەناف بەرزبوونەتەوە و قامکە درێژە خەنەییەکانی کە داوێنی کراسەکەی داوە بەسەر لایەک لە رووومەتیدا.

بڵێی لێراش داوێ هەبێ ؟ "لالا" ئەیەوێ هەڵبێ، بەڵام وەک لە خەوێکدا بێت هەست ئەکات لکاوە بە نیمکەتە پلاستیکیەکەدا. شەو بەرە بەرە شار لە ئامێز ئەگرێ، ئەویا سیخناخ ئەبێ لە تاریکی، کونج و قوژبنەکان درزەکان نوقم ئەکات، لە شووشەی شکاوی دەلاقەکانەوە خۆی ئەخاتە ماڵەکانەوە، ئێستا هەوا ساردە، "لالا" خۆی لە ناو پاڵتۆ قاوەییەکەی دائەشارێ، یەخەکەی تاسەر چاوی بەرز ئەکاتەوە بەڵام سەرما لەژێر سەرپێیە کاتۆچۆیەکانیەوەوە سەرئەکەوێ بۆ ناو قاچەکانی. کەلەکە و سمت و گورچیلەکانی دائەگرێ. "لالا" چاوی ئەقوونجێنێ بۆ ئەوە نەیبینێ بۆ ئەوەی ئیتر بۆشاییەک نەبینێ، کە لە ئاستی سەریەوە ئەسوورێتەوە، بە سەرئامێری گەمەی منداڵەکاندا و لەژێر چاوە کوێرەکانی پەنجەرەکاندا وێڵ کراوە.

کاتێ چاوی ئەکاتەوە، کەسی لێ نیە، بێ ئەوە ئاگای لێ بوبێت پیرەژنە دوورەگەکە بە کراسە رەنگاورەنگەکەیەوە رۆیشتووە.

شەوێکی سەیرە، ئاسمان و زەوی زۆر تاریک نین، ئەڵێی شەو پاشەکشێی کردووە. "لالا" لە کۆڵانە بێدەنگەکاندا رێ ئەکەوێتەوە... لە پلیکانەکان ئەچێتە خوارەوە، ئەو شوێنەی کە بە "کومپرۆسۆر" زەوییان کەندووە، سەرما گسک لە شەقامەکان ئەدات، سەربانی کانزایی هەمارەکان کەوتوونەتە تەقە تەق. کاتێ ئەگاتە بەر دەریا، هێشتا رۆژ دوایی نەهاتووە. خاڵێکی گەورەی رۆشن لەسەر کلیسای کاتدرال لە نێوان بورجەکاندا ئەدرەوشێتەوە. بە راکردن لە شەقامەکە تێئەپەرێت، بێ ئەوە ماشینەکان ببینێ کە بەخێرایی بە هۆرن لێدان و چرا لێدان، رەد ئەبن. بە ئەسپایی لە

گۆرەپانی بەر کلیساکە نزیک ئەبێتەوە، لە پلەکان سەرئەکەوێ، لە کۆڵەکەکان تێئەپەڕێ. یەکەمین جار کە هاتبوو بۆ کلیسا ، دێتەوە یادی، ترسابوو، چونکە هێندە گەورە و چۆڵ بوو، وەک تاشەبەردێکی رۆخی دەریاهاتبووە بەرچاوی.بەڵام دوایی "رادیکز" فێری کردبوو کە شەوانی هاوین کاتێ "با"یەک کە لە دەریاوە دێت وەک شنەیەک نەرم و ئارامە، لە چ شوێنگەلێکدا بەسەر بەرێ.

جێگایەکی پێ نیشان دابوو کە لەوێوە کەشتیە باریەگەورەکانی چاو پێ ئەکەوت کە شەوانە بە ئاگرە سوور و سەوزەکانیانەوە، ئەچوونە ناو بەندەرەوە. هەروەها شوێنێک لە نێوان کۆڵەکەکانی گۆرەپانی بەر کلیسا، کە لەوێوە ئەیتوانی مانگ و ئەستێرەکان چاو کات.

بەڵام ئیمشەو کەسی لێ نیە، بەردە سپی و سەوزەکە سەهۆڵی بەستووە، بێدەنگی زاڵە، تەنیا جیرەی تایەی ماشینەکان ، یان قیژەی شەمشەمەکوێرەکان، کە لە ژێر تاقە کەوانیەکەوە هەڵئەفرن، بێدەنگی ئەهەژێنن. کۆترەکان لەملا و لادا نووساون بە یەکەوە و نیشتوونەتەوە. "لالا" ساتێ لەسەر پلەکان، لە پەنای نەردە بەردینەکان دائەنیشێ، بۆ رێقنەکانی سەر زەوی ئەروانێ و تەپ و تۆزی بەر گۆرەپانی کلیساکە. "با" بە هوژم لە نێوان تەلبەندەکانەوە تێئەپەڕێ. بێدەنگی لێرەدا وەک بێدەنگی کەشتیەک لە دڵی دەریادا، بێ برانەوەیە. ئازار بەرۆکی ئەگرێ، گەروو لاجانگەکانی ئەگووشێ، دەنگەکان بە جۆرێکی سەیر ئەزرنگێنەوە.

کاتێ شەو دێت، "لالا" بەرەو ناوەندی شار مل ئەنێ، لە گۆرەپانی "لانش" تێئەپەڕێ، لەویا کە پیاوەکان لە دەور و بەری دەرگای بارەکان دێن و ئەچن. لە سەرەوژوورکایی "ئەکولەکان" سەرئەکەوێ، دەستی لەسەر میلە دوولاییە ئاسنیە بریقەدارەکە ئەگرێ کە زۆری خۆش لێ دێت. بەڵام لێرەش دڵەخورپێ و نیگەرانیەکەی نارەوێتەوە.بە شوێنیەوەیە، وەک سەگێکی برسی کە مووەکانی راست بووەتەوە و لە درێژایی جۆگەلەی ئاوەکاندا بە دوای ئێسقانێکدا وێڵە، بێ گومان ئەوە برسیەتیە کە لەناخەوە ئەیخوا و مێشکی کون ئەکات. بەڵام برسیەتی هەموو شت،

برسیەتی هەموو ئەو شتانەی فڕێ دراون. ئەو شتانەی دەست نەکەوتوون. ماوەیەکی زۆرە مرۆڤەکان هیچیان نەبووە. بەختەوەری، ئەوین، تەنیا ئەو هۆڵە ساردانەی ژێر زەویە کە هەڵمی نیگەرانی خەسی کردوەتەوە، هەر لەم شەقامە لێڵ و تاریکانەیە کە مشکەکان دێن و ئەچن، لەوێ کە ئاوێکی بۆگەن ڕەوانە، لەوێ کە زبڵی کۆگاکراو و نەخۆشین گەلێ زۆرن.

کاتێ بەسەر هێڵی ڕاستی شەقامەکاندا ئەچێتە پێشەوە، شەقامی "ڕوفوژ"، شەقامی "مولەن"، شەقامی "بێلز - ئێکولز"، شەقامی "مۆنت بریۆن"، هەموو جۆرە زبڵێ چاو ئەکات کە ئەڵێی دەریا تووری داونەتە دەرەوە. قوتوی ژەنگاوی خوراک، کاغەزی کۆنە، لەتە ئێسقان، پرتەقاڵی گەنیو، سەوزە، پەڕۆ کۆنە، بتڵی شکاو، ئەڵقەی کائۆچۆیی، کەپسول، باڵندە مردووە باڵ هەڵکنراوەکان، قۆلانچە پێشێل کراوەکان، تەپوتۆز، پرتوکاوی و... ئەوانە هەموو نیشانەی تەنیایی و کۆچن، ئەڵێی مرۆڤەکان شاربەدەر بوون. لەو دونیایە ڕایان کردووە، لە دونیایەکدا کە ئەوانی کردووە بە نێچیری نەخۆشی و مەرگ و فەرامۆشی.

ئەڵێی هەرچەند کەس ماونەتەوە، بەدبەختگەلێ کە لەو خانووە رووخاوانەدا ئەژین، لەو ماڵانەدا کە هەر لە قەبر ئەچن ، ئەو خانووانەی کە نەمان لە دەلاقە دەمئاوەلاکانیانەوە ئەچێتە ماڵەوە، سەرمای شەو سینگیان ئەگووشێ، بەرچاوی پیر و منداڵەکان ڕەش ئەکات. "لالا" لە خانووە رووخاوەکاندا، بەسەر گەچە داکەوتووەکاندا تێئەپەڕێ، نازانێ بۆ کوێ ئەڕوا. چەن جار لە هەمان شەقامی دەور دیوارە بەرزەکانی ئوتێل "دیۆ" دەور ئەداتەوە. لەوانەیە "عەمە" ئێستا لەوێ لە چێشتخانە ژێرزەوینیە گەورەکە بە دەلاقە چڵکنەکانیەوە، خەریکە گسکە هەورەکە دێنێ بەسەر تەختایە ڕەشەکەدا، کە ئەڵێی هەرگیز هیچ شتێ پاکی ناکاتەوە.

"لالا" نایەوێ هەرگیز بگەڕێتەوە بۆ ماڵ "عەمە"، لە شەقامە تاریکەکاندا ئەسووڕێتەوە، بارانێکی ورد دەست ئەکا بە بارین.

مرۆڤەکان ڕەت ئەبن. تارمایە ڕەشە بێڕوومەتەکان، ئەڵێی ئەوانیش گوم بوون،

"لالا" خۆی کۆ ئەکاتەوە بۆ ئەوە رەت بین، لە چوارچێوەی دەرگاکاندا خۆی بزر ئەکات لە پشت ماشینە وەستاوەکان خۆی دائەشارێ. کاتێ شەقام دیسان چۆڵ ئەبێتەوە، دێتە دەر، بێدەنگ رێ ئەکەوێتەوە، ماندووە، گێژی خەوە، بەڵام نایەوێ بنوێ. لە کوێدا ئەتوانێ خۆی بەدەسەوە بات و خۆی فەرامۆش بکات؟

شار، گەلێ سامناکە، نیگەرانی و دڵەخورپێ دەست بەرداری کچە فەقیرەکان نابێت کە وەک منداڵی دەوڵەمەندەکان بخەون. بێدەنگی شەو سیخناخە لە دەنگە دەنگ، دەنگی برسیەتی، ترس و تەنیایی. دەنگی هەستی وێڵگەردەکان لە پەناگاکان، دەنگی کپی ژنەکە کە لە پێشا ئەقیژێنێ ئەمجا هاوار ئەکات و ئەگری و پاشان ئەناڵێنێ.

"لالا" ئێستا هەموو ئەو دەنگانە بە ئاشکرایی ئەبیسێ و ئەڵێی بێوچان هەر ئەزرنگێنەوە. بە تایبەت دەنگێ کە بۆ هەموو جێگایەک دوای کەوتووە، ئەچێتە ناو سەر و سکی و هەمان بەدبەختی دووپات ئەبێتەوە. دەنگی قۆزەی منداڵێکە، شەو لە شوێنێکەوە، لە ماڵی دراوسێکەدایە، رەنگە کوری ژنە تونسیایە زۆر قەڵەو و رەنگ پەریوەکەبێ بە چاوە سەوز و شینەکانیەوە.

لەوانەیە منداڵێکی دیکە بێت، چەن شەقام دوورتر، لە ماڵێکدا، پاشان یەکێکی دیکە وەڵامی ئەداتەوە، یەکێکی دیکەش، ئەڵێی دەیان کەس، سەدان منداڵی نەخۆش، لە تاریکی شەودا، ئەکۆکن بە دەنگێکی گر کە گەروو قوراچکەیان ئەدرێنێ "لالا" ئەوێسێو پاڵ ئەداتەوە بە دەرگاکەوە، بە دوو دەستی بە هەموو هێزیەوە گوێی ئەگرێ، بۆ ئەوە ئیتر دەنگی قۆزەی ناڵەکان کە لەو شەوە ساردەدا ماڵ بە ماڵ ئەنووزێنن، نەبیسێ.

دوورتر پێچی شەقامەکە وەک لەسەرەوە، لە بانێژەیەکەوە بۆی بروانی دیارە، چوارقاژی گەورەی شەقامەکان، وەک جەمسەری چەمێکە و هەموو رۆشناییەکان کە وەک دڵ کەوتوونەتە ترپە ترپ و ئینسان بەشەوارە ئەخەن.

پاشان "لالا" لە تەپۆڵکەکە، بە درێژایی پلیکانەکاندا دائەگەرێ، لە رێگای "لۆرێت" ئەچێتە ماڵەوە، لە حەوشە گەورەکە کە دیوارەکانی بە دووکەڵی بەدبەختی

ڕەش هەڵگەڕاون، تێئەپەڕێ. دەنگی ڕادوێ و مرۆڤەکان ئەبیسێ. ساتێ ئەوێسێ، سەری بەرەو دەلاقەکان وەرئەچەرخێنی، ئەڵێی کەسێکی دیوە، بەڵام هەر دەنگی ڕادوێکەیە ئەقیڕێنێ و هەمان ڕستە دووپات ئەکاتەوە:

"بەم مۆسیقایە خواکان دێنە ناو مەیدان".

دەنگە نائاساییەکە قۆزەی منداڵەکان و دەنگی پیاوە مەستەکان و هاوار و گریانی ژنەکان، دائەپۆشێنێ. ئەمجا لە ڕێگایەکی تاریکی دیکەوە، وەک داڵانێ بەرەو بولوارەکە ئەڕوا، لێرەدا بۆ ساتێ ترس و پەژارەکەی ئەرەوێتەوە. خەڵکەکە لەسەر پیادەڕەوەکە بە پەلەن. چاویان ئەدرەوشێتەوە و دەستیان بە کارامەیی ئەبزوێنن، هەنگاوەکانیان لەسەر زەویە سیمانەکە دائەنێن، جلەکانیان لۆچ ئەبێ و بەرق ئەدەنەوە. لەسەر شەقامەکان کامیۆنەکان، ماشینەکان و ماتۆڕەکان بە چرا ڕۆشنەکانیانەوە ڕائەبوورن. ویترینەکان بێوچان ڕۆشن ئەبن و ئەکوژێنەوە. "لالا" خۆی ئەدا بە دەست بزاوتی خەڵکەکەوە. ئیتر بیر ناکاتەوە. خاڵی و هەواڵەیە، ئەڵێی لەڕاستیدا هەر نیە. لەبەر ئەوەیە هەمیشە ئەگەڕێتەوە بۆ شەقامە گەورەکان تاکوو لە ناو شەپۆلی خەڵکدا بزر بێت، بۆ ئەوە لە ڕێگەکەی خۆی لابدات، ئێرا سیخناخە لە ڕووناکی، "لالا" بەدەم ڕۆشتنەوە بۆیان ئەڕوانێ. ڕووناکی شین، سوور، نارنجی، مۆر، ڕووناکیە بێجووڵەکان، ڕووناکیەکان کە پێش ئەڕۆن یان لە ئاستی سەر مەیدانەکە وەک پزیسکی شقارتە ئەگرێن.

"لالا" ساتێ بیر لە ئاسمانە پووڵەکیەکەی شەوانی بێپایانی بیابان ئەکاتەوە، کاتێ لەسەر لمە ڕەقەکە لای "ئارتانی" ڕائەکشا و بە ئارامی هەناسەیان ئەکێشا، ئەتوت یەک جەستەن. بەڵام ئەو بیرەوەریانە ئەستەمن، لێرا ئەبێ بڕوات، لەگەڵ ئەوانی دیکە، ئەڵێی ئەزانن بەرەو کوێ ملیان ناوە، بەڵام لە سەفەردا، نە کۆتاییەک هەیە وەنە هیچ حەشارگەیەک، لە چاڵایی تەپۆڵکەیەکی لمدا، ئەبێ بڕوا بۆئەوەی نەکەوێ، بۆ ئەوە ئەوانی دیکە پێشێلی نەکەن. "لالا" تا ئاخری شەقامەکە ئەڕوا، ئەمجا شەقامێکی دیکە ئەگرێتە بەر و یەکێکی دیکە بێ وچان هەر ڕۆشناییە و دەنگی مرۆڤ و ماتۆڕەکانیان

کە بێوچان سوور ئەدرەوشێنەوە.

لەپڕ، دیسان ترس و نیگەرانی شاڵاو دێننەوە، ئەڵێی لە هەموو دەنگە دەنگی تایەی ماشینەکان و هەنگاوەکان لەقەراخ چاڵێکی زۆر گەورە، بازنەگەلێکی یەک ناوەندی درووست ئەبێ.

ئێستا دیسان "لالا" ئەیان بینێتەوە. لەویا پاڵیان داوەتەوە بە دیوارە رەشە کۆنەکانەوە و لەسەر زەوی لە نێوان پیسی و زبڵدا کۆ بوونەتەوە؛ سواڵکەرەکان، پیرە کوێرەکان کە دەستیان درێژ کردووەتەوە، ژنە لاوە لێو قڵیشاوەکان کە منداڵەکانیان هەڵواسراون بە سینە نەرمەکانیانەوە، کیژۆڵە جل دڕاوەکان کە خۆیان بە جلی رێبوارەکاندا هەڵدەواسن، پیرە رەنگ دووکەڵاویەکان بە قژە تێکچووەکانیانەوە، هەموو ئەوانە کە سەرما و برسیەتی لە کوڵێتە سارد و فەقیرانەکەیان وەدەری خستوون، لە زبڵ و ئەشخاڵ گەلێ ئەچن کە شەپۆلەکان فڕێی داوون. هەموویان لەویان، لە ناوەندی شارە کەمتەرخەمەکەدا، لەناو هەرای تەستی هێنەری ماتۆڕەکان و دەنگەکاندا. باران تەڕی کردوون، مووەکانیان راست بووەتەوە، لە رووناکی ناباری گڵۆپەکان ناحەزتر و فەقیرتر دیارن. بە چاوە تێکچووە تەڕەکانیانەوە سەیری هاتوچۆی رێبوارەکان ئەکەن. چاویان وەک چاوی سەگ بێوچان ئەسووڕێتەوە.

"لالا" بە ئەسپایی لەبەردەمیاندا تێئەپەڕێ و سەیریان ئەکات. دڵی ئەگووشرێ و دیسان بۆشاییە سامناکەکە لێرەدا لەبەردەم ئەم جەستە بێکەس و توور دڕاوانەدا، گێژاوێ پێک دێنێ. هێندە بە هێمنی ئەڕوا. وێڵگەردێ پاڵتۆکەی ئەگرێ و ئەیەوێ رایکێشێ بۆلای خۆی. "لالا" بە تووڕەییەوە قامکەکانی کە گرێ دراوە بە پاڵتۆکەیەوە، جیا ئەکاتەوە، بە سۆز و ترسەوە بۆ روخسارە هێشتا لاوەکەی ژنەکە ئەڕوانێ، گۆناکانی لەبەر خواردنەوەی زۆری ئەلکول ئاوساون و لەسەرمادا سوور هەڵگەراون. بەتایبەت دوو چاوە شینە بێ گەردەکانی بە شەوارە کەوتوون. گلێنەی چاوی هەر ئەوەندەی سەرە دەرزیەک ئەبێت.

- وەرە، وەرە...

وێڵگەردەكە دووپاتی ئەكاتەوە، "لالا"ش هەوڵ ئەدات قامكە ناخون شكاوەكانی لە خۆی جیا كاتەوە. ئەمجا ترس شاڵاوی بۆ دێنێ، "لالا" پاڵتۆكەی لە دەست وێڵگەردەكە دەردێنێ و بە راكردن خۆی دەرباز ئەكات. سواڵكەرەكان دەست ئەكەن بە پێكەنین، تەنیا ژنەكە لەسەر پیادەرەوەكە نیوەچەماوە و بە لوورە لوور جوێن ئەدات.

دڵی ئەكەوێتە خورپە خورپ. بە درێژایی شەقامەكەدا رائەكات، ئەكەوێ لەو خەڵكانەی كە ئەرۆنە ناو كافە و سینەماكان و دینەدەر و كۆت و شەڵواریان لەبەرە و تازە لە خواردنی نانی شێوان بوونەتەوە. روخساریان هێشتا لە هەوڵ و تەقالایەك كە بۆ زۆر خواردن و خواردنەوە كێشاویانە ئەدرەوشێتەوە.

كورە بۆن خۆشەكان، جووتە ژن و پیاوەكان، سەربازەكان، خارجیە پێست رەش و قژ لوولەكان، وشەگەلێك ئاراستەی ئەم ئەكەن كە لێی تێ ناگات، یان هەوڵ ئەدەن بە گاڵتە و پێكەنینەوە بیگرن. مۆسیقایەكی بێ‌وچان لە كافەكاندا بڵاو ئەبێتەوە، مۆسیقایەكی جەزرەبەدەر و وەحشی كە بە دەنگێكی نهێنی و كپ لە زەویدا ئەزرنگێتەوە. جەستەی ئەلەرزێنێ، لە سك و پەرەی گوێیدا دەنگ ئەداتەوە.

هەمیشە هەر هەمان مۆسیقایە كە لە كافە و بارەكان دێتە دەر، لەگەڵ رۆشنایی لوولەی نیئۆنەكان بە رەنگە سوور و سەوز و نارنجیەكانیانەوە، تێكدەئاڵێن بەسەر دیوار و مێزەكاندا ئەرژێن و لە روخساری رەنگینی ژنەكاندا دەئاڵێن.

چ ماوەیەكە لە نێوان ئەم گەردەلوولانە و ئەم مۆسیقایەدا پێش ئەروا؟ نازانێ. بۆ ماوەی چەندین سەعات، رەنگە بۆ ماوەی هەموو شەوەكان، ئەو شەوانەی كە هەرگیز رۆژ نابنەوە و هەرگیز ناپچرن. بیر لە پانتایی فەلاتە بەردینەكان ئەكاتەوە، لە تەپۆڵكەی بەردە تیژەكان كە وەك دەمەی چەقۆ لە كوێرەرێگای كەروێشك و مارەكاندا، لەبەر تریفەی مانگدا، ئەدرەوشێنەوە. لێرەدا چاوەچاو ئەكات، ئەڵێی بە تەمایە هەموو ئەوانە دەركەون، "ئارتانی" بە پاڵتۆ بۆرەكەیەوە و چاوە گەشەكانیەوە لە نێوان رووەمەتە هەرە رەشەكەیدا وەك بزنە كێفی، بە بزاوتی ئارام و ماوەدارەوە ئەبزوێ.

بەڵام هەر ئەم شەقامەیە و ئەم شەقامە و ئەم چوار قاشەکە سیخناخە لە روخسار و سیما، پڕن لە چاوو لە دەم، لە قیژەقیژی گوێدڕ، لە وتە، زەنازەنا، دەنگی ماتۆڕەکان و هۆرنەکان، پڕن لە ڕۆشنایيە وەحشیەکان. ئاسمان دیار نیە، ئەڵێی پەردەیەکی سپی زەوی داپۆشیوە. چۆن ئەتوانن تا ئێرە بێن ؟ "ئارتانی" و ئەو جەنگاوەرەی شینی بیابان "ئیس سیر"، نەهێنی؟!

ئەوان ناتوانن لە نێوان ئەو هەموو روخسار و جەستە و ماشینەدا، لە نێوان ئەو کامیۆن و ماتۆڕانەدا بیناسنەوە. تەنانەت دەنگی ناتوانن ببیسن. بەو هەموو زەنازەنایە، بەو هەموو زمان و زاراوە جۆراوجۆرەکە ئەدوێن و ئەم مۆسیقایە کە دەنگ ئەداتەوە و زەوی ئەلەرێنێتەوە. بۆ ئەوەیە "لالا" ئیتر بە دوایاندا ناگەڕێ. ئیتر قسەیان لەگەڵ ناکات، ئەڵێی بۆ هەتاهەتایە نوقم بوون. ئەڵێی ئەوان لای ئەم ئیتر مردوون.

سواڵکەرەکان لەوێ، لە ناوەندی شارەکەدان، باران ناباریْ، شەوێکی بێخەوی درێژە، شەو تا نیوە هاتووە و تاک و تەرا خەڵک چاو ئەکرێن. لە کافە و بارەکاندا دێنە دەر بەڵام تا ئەتوانن بەخێرایی و بە ماشین دوور ئەکەونەوە. "لالا" بەرەو دەستی ڕاست وەرئەچەرخێ، لە شەقامێکی تەنگی بەرەو ژوورکاییدا، لە پشت ماشینە وێستاوەکانەوە تێئەپەڕێ. چەن پیاو لەسەر شۆستەکە بێجووڵە و مات و خامۆش وەستاون، چاویان بڕیوەتە ئەوبەر شەقامەکە، دەرگای خانوویەکی پیس و چڵکن، دەرگایەکی زۆر بچووکی سەوزکە نیوەی کراوەتەوە ناو داڵانێکی ڕۆشن، "لالا"ش ئەوێسێ و لە پشت ماشینەکەوە ئەڕوانێ. دڵی توند لێ ئەدا، بۆشاییەکی گەورەی نیگەرانی لەناو شەقامەکە هەڵیکردووە، خانووەکە وەک قەڵایەکی چڵکن بە دەلاقە بێ شووشەکانیەوەکە بە پەڕەی ڕۆژنامە داپۆشراون، قوت ڕاوەستاوە. بڕێ لە دەلاقەکان ڕۆشنن، ڕۆشناییەکی ناباری توندن یا تیشکێکی سەیری کز بە ڕەنگی خوێن، لە دێوەزمەیەکی بێ جووڵە ئەچێ. بە دەیان چاوەوەکە خەوتوون یان زاق ئەڕوانن، دێوەزمەیەکی سیخناخ لە هێزی نەخۆشی و دەرد و ئازار کە ئامادەیە مرۆڤە بچووکە چاوەڕوانەکانی سەر شەقامەکە لەتوکوت کات.

"لالا" هێزی لێ براوە، پاڵ ئەداتەوە بە ماشینەکەوە، هەموو ئەندامانی جەستەی ئەلەرزێ، "با"ی نەخۆشی لە شەقامەکە هەڵی کردووە، "با"یەک کە شارەکە پڕ لە بۆشایی و ترس و نەداری و برسیەتی ئەکات و ئەم گەردەلوولانە لە ئاستی سەر گۆڕەپانەکاندا، ئەکەنێ و قورسایی بێ دەنگیەک ئەخاتە ناو هۆڵە دوورکەوتوەکان و پیر و منداڵەکان ئەخنکێنێ.

"لالا" رقی لێیانە، لە هەموو ئەو دێوەزمە چاوکراوانە کە بەسەر شاردا زاڵن و هەر سات ئامادەن ژن و پیاوەکان هەڵلووشن. بیانجون و لە خۆیاندا بیانهاڕن.

دەرگاکە بە تەواوی ئەکرێتەوە، ئێستا لەسەر شۆستەکە، ژنێ بەرانبەر "لالا" وشک وەستاوە، پیاوەکان چاویان تێ بڕیوە و جگەرە ئەکێشن. ژنێکی زۆر بچووکە، لەوانەیە باوەعەمرە بێت، جەستەیەکی پان و سەرێکی ماسیو و بێ مل بەسەر شانەکانیەوەیەتی. بەڵام رواڵەتێکی منداڵانە و دەمێکی زۆر بچووکی رەنگ سووری هەیە و دوو چاوی قەترانی رەش، کە دەورەکەی سەوز کردووە، جگە لە کورتی باڵاکەی قژیشی زۆر سەیرە، قژێکی کورت و لوول دراو، رەنگێکی سووری مسین کە بە چەشنێکی سەیر لەبەر رۆشنایی داڵانەکەی پشتەسەریەوە ئەدرەوشێتەوە و وەک خەرمانەیەکی رووناکیە بەسەر بووکڵەیەکی قەڵەوەوە، ئەڵێی تارماییەکی ئاسمانیە، قژی ژنە بچووکەکە سەرنجی "لالا"ی بۆ لای خۆی راکێشاوە، بێ جووڵە و هەناسەکێشان چاوی تێبڕیوە. "با"یەکی سارد بە توندی لە دەریاوە هەڵئەکات، بەڵام ژنە بچووکەکە لەبەر دەرگای ماڵەکە راوەستاوە و قژی ئەدرەوشێتەوە و تەنوورەیەکی زۆر کورتی لەبەردایە. رانە قەڵەوە سپیەکانی دەرخستووە و جۆرە پولیورێکی بەنەوشی تەنگی لەبەردایە. پێڵاوی سەربازی پاژنەبەرزی لە پێدایە، لەبەر سەرما چەن هەنگاو بەرەو گۆڕەپانەکە ئەڕوا، تەقەی کەوشەکانی بەرز ئەبێتەوە. پیاوەکان بەدەم جگەرەکێشانەوە لێی نزیک ئەبنەوە، زۆربەیان عەرەبن، قژیان رەش رەشە و روخسارێکی رەنگ خۆڵەمێشی کە "لالا" تا ئێستا نەیدیوە، ئەڵێی لەژێر زەویدا ئەژین و هەر شەوانە دێنەدەر.

ورتەیان لێوە نایەت، وەحشی و لاساران، لێویان ئەگەزن و نیگایان رەقە، ژنە بچووکە قژ درەوشاوەکە تەنانەت بۆیان ناروانێ. ئەویش جگەرەیەک دائەگرسێنێ و بەدەم دەوردانەوە بەدەور گۆرەپانەکەدا مژی لێ ئەدات. کاتێ پشتی هەڵئەکات ئەڵێی کورە. پاشان لەوپەڕ کۆڵانەکە ژنێکی تر تێئەپەڕێ، ئەمەیان بە پێچەوانەوە کەڵەگەت و تۆکمەیە، ژنێکی بەساڵا چوو کە ماندووی و بێ خەوی ژاکاندوویەتی. بارانییەکی گەورەی مشەمایی شینی لەبەرە، "با" قژە رەشەکەی هەڵشێواندووە، بە تەقە تەقی پێڵاوەکانی لە شەقامەکەدا ئەگەڕێ. ئەگاتە لای باوەعەمرەکە و ئەویش لەبەر دەرگاکە رائەوەستێ، عەرەبەکان لێیان نزیک ئەبنەوە و قسەی لەگەڵ ئەکەن. "لالا" گوێی لێی نیە چی ئەڵێن، یەک لە دوای یەک جیا ئەبنەوە و دوور لە یەک رائەوەستن، چاو ئەبڕنە دوو ژنەکە کە بێ جووڵە جگەرە ئەکێشن. "با" لە تاشەبەردەکانەوە لە درێژایی کۆڵانەکەوە هەڵئەکات و جلی ژنەکان ئەنوسێنێ بە جەستەیانەوە و قژیان ئەشەکێنێتەوە. ئەم کۆڵانە سیخناخە لە رق و نائومێدی، ئەڵێی لە پلەکانی جەهەندەمەوە بێوچان ئەگوزەرێ و بێ ئەوە هەرگیز بگەیەتە ئاخرەکەی، بێ ئەوە هەرگیز راوەستێ. پڕە لە برسیەتی و هەوەس و حەزی پێنەگەشتوو، سیخناخە لە تووڕەیی و قەڵسی. پیاوە بێدەنگەکان لە قەراخ شۆستەکە وەک سەرباز جووڵەیان لە خۆیان بڕیوە، چاویان بڕیوەتە سک و سینگ و گۆشتی بێڕەنگی گەردن و لاقە رووتەکانیان. ئەڵێی ئەوین و سۆز و بەزەیی و مێهرەبانی مردووە، ئەڵێی پەردەیەکی سپی ئاسمان و زەوی لێک جیاکردووەتەوە و مرۆڤەکانی خنکاندوە و خورپەی دڵیانی وەستاندووە و هەموو بیرەوەریەکانی کوشتوون و ئاواتە کۆنەکانیان و هەموو جوانیەکی خنکاندوون.

"لالا" هەست بە سەرگێژەی بێوچانی نەمان و بۆشایی ئەکات کە دێتە ناخیەوە، رەنگە "با" سەربانە چلکنەکان هەڵکەنێ . دەرگا و پەنجەرەکان تێکشکێنێ و دیوارە رزیوەکان برووخێنێ و هەموو ماشینەکان بکات بە کۆگایەکی ئاسنی. ئەبێ بێت، چونکە ئێرە پڕە لە رق و ئازار. بەڵام خانووە گەورە چلکنەکە قوت راوەستاوە و بە هەموو بەرزییەکەیەوە پیاوەکان پێشێل ئەکات. ئەوانە دێوەزمە بێ جووڵەکانن، بە

چاوی خوێناوی و بێ بەزەییەوە، دێوەزمەکان کە ژن و پیاوەکان لەتوپار ئەکەن. لە نێوان دڵ و ریخۆڵەکانیاندا، ژنە لاوەکان لەسەر دۆشەکە کۆنە لەکەدارەکاندا، بۆ چەن ساتێ هی پیاوە بێدەنگەکانن کە گڕ بەربووەتە جەستەیان، پاشان جلەکانیان لەبەر ئەکەنەوە و ئەڕۆن، جگەرەکانیان لە پەراوێزی مێزەکەدا هێشتا نەکوژراوەتەوە.

لەناو ئەو دێوەزمە درندانەدا ژنە پیرەکان لەژێر قورسایی پیاوەکاندا کە پێشێلیان ئەکەن و گۆشتە زەردەکەیان پیس ئەکەن، خەوتوون. پاشان لە زگی هەموو ئەو ژنانەدا بۆشایی لە دایک ئەبێت، بۆشاییەکی سەخت و سەهۆڵ بەستوو کە لە دەستیان رائەکات و وەک "با" لە درێژایی کۆڵانەکانەوە، بە گەردەلوولێکی بێبڕانەوەوە هەڵئەکات.

لەپڕ "لالا" ئیتر توانای بۆ نامێنێ. ئەیەوێ هاوار بکات، بقیژێنێ، تەنانەت بگریەت. بەڵام ناکرێ. نەمان و بۆشایی و ترس بەتوندی گەرووی ئەگووشن، هەناسەی هەڵئەیەت، ئەمجا دەست ئەکات بە ڕاکردن. بە هەموو هێزیەوە لە کۆڵانەکە هەڵدێ، تەپەی هەنگاوەکانی بێدەنگیەکە تێک ئەشکێنێ. پیاوەکان وەرئەچەرخن و بۆ ڕاکردنەکەی ئەڕوانن. باوە عەمرەکە ئەقیژێنێ بەڵام پیاوێ ملی ئەگرێ و رایئەکێشێ بۆ ناو خانووەکە. بۆشاییەکە بۆ تاوێ تێکچووە، دیسان لە ئاست سەریانەوە دروست ئەبێتەوە، لە ئامێزیان ئەگرێت، چەن پیاو بنە جگەرەکانیان توور ئەدەنە ناو جۆگەلەکەوە ڕێگای شەقامەکە ئەگرنە بەر و وەک سێبەرێک ئەخزن و بزر ئەبن.

ئەوانی‌تر ئەگەن و لە قەراخ شۆستەکە رائەوەستن و چاو ئەبڕنە ژنە قژ رەشە کەڵەگەتەکە کە لەبەر دەرگای ماڵەکە راوەستاوە.

سواڵکەرێکی زۆر، نزیک وێستگەکە ترنجاونەتە یەک و خەوتوون. یان لەناو کارتۆندا، لەبەر دەرگای ماڵاندا نووستوون، لە دوورەوە ئێستگەکە و دارتێلە کارەباییەکان کە لە ئەستێرە ئەچن، ئەدرەوشێنەوە. لە کونجی دەرگایەک لە ناو رووبارێکی تەڕی تاریکیدا، "لالا" لەسەر زەویەکە خەوتووە، تا توانیویەتی سەر و جەستەی وەک رەقەیەک لە نێوان پاڵتۆ بۆرەکەیدا داشاردووە. بەردەکە رەق و ساردە

و دەنگی تەڕی تایەی ماشینەکان ئەیلەرزێنێ بەڵام وەک جاران لەسەر فەلاتە بەردینەکە و لە نێوان درزی پەردە سپیەکەوە، بە چاوی نووساوەوە، ئەتوانێ شەوی بیابان ببینێ.

***

"لالا" لە هوتێلی "سەنت بلانش" ئەمێنێتەوە، لە هۆدەیەکی زۆر بچووک، کونجێکی تاریکی ژێر سەربانەکە لەگەڵ گسک و سەتڵ و شتەکۆنەکان کە ماوەیەکی زۆرە فەرامۆش بوون، لەگەڵ گڵۆپێک، مێزێک و قەرەوێڵەیەکی کۆنی تەسمەیی. کاتێ لە خاوەن هوتێلەکە پرسیبووی کە ئەتوانێ لەوێ بمێنێتەوە یان نە، ئەو ساکارانە وتبووی: ئەرێ. بێ ئەوە ئیتر هیچ پرسیارێکی ئاراستە بکات هەر وتبووی لەویا بخەوێ بەڵام قەرەوێڵەکەی بەکەڵک نایەت. هەروەها وتبووی پووڵی کارەبا و ئاو لە مانگانەکەی کەم ئەکاتەوە. هەر ئەمانەی وتبوو و لەسەر قەرەوێڵەکەی راکشا بوو و دەستی کردبوو بە خوێندنەوەی رۆژنامەکەی. هەر بۆ ئەوەیە "لالا" پێی وایە کە پیاوێکی چاکە. گەرچی پیس و پۆخڵە، بەڵام خۆ پرسیاری لێ ناکات. هەموو شت بۆ ئەو یەکسانە، بەڵام "عەمە" وا نیە. کاتێ "لالا" پێی وت ئیتر لای ئەو نامێنێتەوە، روخساری گرژ کردبوو و تا توانیبووی قسەی ناخۆشی پێ وتبوو. ئەو پێی وابوو ئەیەوێ بڕوا و لەگەڵ پیاوێکدا بژیەت، بەڵام لەهەر حاڵدا رازی بوو. وا بۆی باشتر بوو، چونکە کوڕەکانی ئەهاتن بۆ لای و هەموویان جێگایان نەئەبووەوە.

ئێستا "لالا" دانیشتوانی هوتێلی "سەنت بلانش"ی باشتر ئەناسێ. هەموو زۆر دەست کورت و فەقیرن و لە وڵاتگەلێکی زۆر فەقیرەوە کە نانی خواردنیان نیە، هاتون.

روخساریان رەق هەڵاتووە و زۆر لاوازن و بۆ ماوەیەکی زۆر ناتوانن بدوێن. لەو نهۆمە کە "لالا" تیایدا ئەژی، کەسی لێ نیە. چونکە ژێر شیروانیە و جێگەی مشکەکانە. بەڵام رێک لەژێر هۆڵەکەی ئەودا، سێ برای رەش پێست لە هۆڵێکدا ئەژین، نارەسەن نین، خەمینیش نین، بەڵکوو هەمیشە شاد و خۆشحاڵن. "لالا" زۆری

پێ خۆشه له دوانیوەڕۆی شەممە و یەکشەممەدا گوێی لە پێکەنین و قلانەوە و ئاواز خوێندنیان بێت.

ناویان نازانێ و نازانێ لە شار چکارەن بەڵام برێ جار کە بۆ دەسشۆری ئەڕۆن لە داڵانەکە پێیان ئەگات، یان کاتێ بەیانی زوو بۆ پاک کردنەوەی پلیکانەکان ئەچێتە خوارەوە. بەڵام ئیتر کاتێ بۆ گسک دانی هۆدەکان ئەڕوا، نایانبینێ، شتێکی وایان نیە، تەنیا کارتۆنی جل و گیتارێک. لای هۆدەی رەشەکاندا، دوو هۆڵ هەیە، چەن کەسی خەڵکی باکووری ئەفریقا تیایدان کە لە کارخانە کار ئەکەن و هەرگیز بۆ ماوەیەکی زۆر نامێننەوە. ئەوان مێهرەبانن بەڵام زۆر کەم قسەن. "لالا" هەرگیز لە گەڵیان زۆر نادوێ. هیچ شتێ لە هۆڵەکانیاندا نیە، هەموو جلەکانیان لە نێو جانتایەکدایە کە لە ترسی دز، ئەیخەنە ژێر قەرەوێڵەکە.

لاوێکی رەش پێستی ئەفریقایی لەگەڵ براکەی لە هۆڵێکی بچووکدا لە نهۆمی دووەم، لە بێخی داڵانەکەدا ئەژین. "لالا" زۆری خۆش ئەوێن. هۆڵەکەیان جوانترین هۆڵی هوتێلەکەیە، چونکە دەلاقەکەی بەسەر بەشێ لە حەوشەکەدا کە درەختێکی تێدایە، ئەکرێتەوە. "لالا" ناوی برا گەورەکەی نازانێ بەڵام برا بچووکەکە ناوی "دانیال"ە، گەلێ رەشە و قژی هێندە لوولە کە هەمیشە شتانێکی پێوە گرساوەتەوە، وردەکا، پەڕۆ و گیا وردە، سەرێکی خڕ و گەردنێکی زۆر قەڵەوی هەیە. زۆر بەرزە و دەست و قاچیشی درێژن. رێگە رۆیشتنەکەی پێکەنین هێنەرە، ئەڵێی خەریکە سەما ئەکات. هەمیشە زۆر شادە، کاتێ لەگەڵ "لالا" قسە ئەکات، هەر پێئەکەنێ. "لالا" بە جوانی تێناگات چی ئەڵێ، زاراوەیەکی سەیری ئاهەنگینی هەیە بەڵام ئەوە زۆر گرینگ نیە، چونکە بە دەستە درێژەکانی و بزاوتی دەمە گەورە پڕ لە دیانە هەرە سپیەکانی تێی ئەگەیەنێت. "لالا" زۆری بە دڵە، بە بۆنەی روومەتە ساف و لووسەکەی و پێکەنینەکەیەوە، رواڵەتی کەمێ منداڵانەیە. لەگەڵ براکەی لە نەخۆشخانە کار ئەکەن. شەممە و یەکشەممانەش ئەڕوا بۆ یاری تۆپی پێ، زۆر حەز لە تۆپی پێ ئەکات، هەموو جۆرە عەکس و وێنەی بە دیواری هۆڵەکە و سەردەرگا و ناو کومێدەکەیەوە

لکاندووە. هەموو جارێ کە چاوی بە "لالا" ئەکەوێ پێی ئەڵێ کەی بۆ دیتنم دێیت بۆ یاریگە؟ "لالا" جارێ ڕۆشتبوو، دوانیوەڕۆیەکی یەکشەممە، لەسەر پلیکانەکان دانیشتبوو و ئەوی چاو کردبوو کە هەر خاڵێکی ڕەش بوو لەسەر سەوزەکە، هەر بەو بۆنەوە ناسیبوویەوە، لە دەستی ڕاست و لە پێشەنگی یاریەکەدا بوو، بەڵام "لالا" هەرگیز پێی نەوتبوو کە ڕۆیشتووە. لەوانەیە لەبەر ئەوەی کە دیسان بە پێکەنینەکەیەوە کە لە داڵانی هوتێلەکە دەنگ ئەداتەوە، داوای لێ بکا کە بڕوات.

هەروەها پیاوێکی پیر لە هۆڵێکی بچووکی ئەوپەڕی داڵانەکەدا ئەژی، هەرگیز لەگەڵ کەس قسە ناکات و کەسیش نازانێ لەکوێوە هاتووە، پیاوێکی پیرە کە بە هۆی نەخۆشینێکی سامناکەوە ڕوومەتی خوراوە و دەم و لووتی نیە، تەنیا دوو کون بەجێگەی کونە لووتەکانی و برینێ بەجێگەی لێویەتی. بەڵام دوو چاوی جوانی خەمین و قووڵی هەیە و هەمیشە زۆر هێمن و بە ئەدەبە، هەر بۆئەوە "لالا" زۆری خۆش ئەوێ. لە هۆڵێکی زۆر فەقیرانەدا ئەژی. زۆربەی کات هیچ ناخوات. بەیانیانی زوو بۆ پیاسە کردن لەبەر هەتاودا ئەڕواتە دەرەوە، مێوەگەلێ کە داکەوتوونەتە سەر زەوی کۆ ئەکاتەوە. "لالا" ناوی نازانێ بەڵام خۆشی ئەوێ، کەمێ لە "نوعمان"ی ماسیگر ئەچێت. دەستی هەر لە دەس ئەو ئەچێت، بە هێز و چالاکە، هەتاو سووتاندوویەتی و پڕە لە زانیاری. کاتێ "لالا" بۆ دەستی ئەڕوانێ، ئەڵێی دیمەنێکە کە ئەسووتێ و ئەیناسێتەوە، پانتایی لم و بەردەکە، دەوەنە سووتاوەکان، ڕووبارە وشکبووەکان، بەڵام ئەو هەرگیز لە خۆی و وڵاتەکەی قسە ناکات، بەڵکوو هەمووی لە ناخیدا حەشار داوە. بەئەستەم چەن وشە لەگەڵ "لالا" ئەدوێ. کاتێ لە داڵانەکە پێی ئەگات، بەدەم ڕۆشتنەوە، هەواڵەکان کە لە ڕادوێ بیستوویە، بۆی ئەگێڕێتەوە. ڕەنگە ئەو تەنیا کەسێکە نهێنیەکەی "لالا" ئەزانێ، چونکە دوو جار بە ڕوانینە قووڵەکەیەوە بۆی ڕوانیوە و لێی پرسیوە کە کار کردن ماندووی ناکات؟ ئیتر هیچی نەوتووە، بەڵام "لالا" وائەزانێ کە ئەو پێی زانیوە کە سکی پڕە و لەوە ئەترسێ کە بڕوا بە خاوەن هوتێلەکە بڵێ، چونکە ئەگەر پێی بزانێ لەوێ دەری ئەکات. بەڵام پیاوە پیرەکە بە

کەس هیچی نەوتووە.

دووشەممانە، لە پێشەوە کرێهای حەوتوویەکی پێ ئەدات، بێ ئەوە کەس بزانێ لەکوێوە پارە دێنێ. "لالا" تەنیا کەسێکە کە ئەزانێ زۆر نەدارە، چونکە جگە لە مێوەی پلیشاو کە لەسەر زەوی و بازارەکە کۆی ئەکاتەوە، هیچی بۆ خواردن نیە . "لالا" جار جار کاتێ پوولی هەیە، یەک یان دوو سێو و پرتەقاڵی جوان ئەسێنێ و لە کاتی کارکردندا ئەیخاتە سەر تەنیا سەندەڵی هۆڵەکەی. پیاوە پیرەکە هەرگیز سوپاسی لێ ناکات، بەڵام "لالا" لە چاویدا ئەیخوێنێتەوە کە لە دیتنی خۆشحاڵە.

"لالا" دانیشتوانی تری هوتێلەکە ناناسێ، کەسانێکن کە ماوەیەکی زۆر نامێننەوە، عەرەبەکان، پرتەقاڵیەکان و ئیتالیاییەکان کە هەر بۆ خەوتن دێنەوە. کەسانێ تریش هەن کە ئەمێننەوە، بەڵام "لالا" خۆشی لێیان نایەت. دوو عەرەب لە نهۆمی یەکەمدا ئەژین کە وەحشی و توورە دیارن و هەمیشە سەرخۆشی ئەلکولن.

یەکێکی تریش هەیە کە گۆڤاری سێکسی ئەخوێنێتەوە و وێنەی رووتی ژنان لەسەر قەرەوێڵەکەی دائەنێ بۆ ئەوە "لالا" بەرزیان کاتەوە و بۆیان بڕوانێ. کابرایەکی خەڵکی یوگسلاویە بە ناوی "گریگۆری". رۆژێ کاتێ "لالا" رۆشتبووە ناو هۆڵەکەی، ئەو لەوێ بوو، باوەشی بۆ گرتبوو بیخاتە سەر قەرەوێڵەکەی، بەڵام "لالا" قیژاندبووی و ئەو لە ترسا بە بۆڵە بۆڵ و جوێن دان وێڵی کردبوو کە بڕوا. ئەو رۆژە تا ئەو لەویا بوو نەچوو بۆ ناو هۆڵەکەی. بەڵام لە راستیدا هیچیان نین جگە لە پیاوە پیرە روومەت خوراوەکە، ئەوانی تر نین چونکە هیچ نیشانە و شوێنەوارێکیان لێ بەجێ نامێنێ، هەروەک سێبەرن، وەک تارماییە، کاتێ رۆژێ ئەڕۆن ئەڵێی هەرگیز نەهاتوون. قەرەوێڵە تەسمەیەکە هەر ئەوەیە، سەندەڵیە لێکجیابووەکە، مشەما لەکەدارەکە، دیوارە چەورەکان لە شوێنێکدا کە رەنگەکەی ماسیوە، گڵۆپی سەر سیمەکە بە گوو مێشەکانیەوە، هەموو هەروا ئەمێننەوە. بەتایبەت رووناکیەک کە لە دەرەوە دێت، لە شووشە چڵکنەکانەوە، رووناکی رەنگ خۆڵەمێشی حەوشی پشتەوە، لێکدانەوەی تیشکەکانی هەتاو و دەنگەکان؛ هاژە هاژی شێری ئاوەکان، تنۆکی ئاو،

جیرەجیری پلیکانەکان، دەنگی "با"کە وەرەقەکانزاییەکان و ناودانەکان ئەلەرێنێتەوە.

"لالا"، شەوانە لەسەر قەرەوێڵەکە رائەکشێ و بەدەم روانینی لەکەی زەردی گلۆپە رۆشنەکەوە، گوێی لە هەموو ئەم دەنگانەئەگرێ. مرۆڤەکانی ئێرە ناتوانن بوونیان هەبێت، منداڵەکانیش، هیچ کەس. گوێ رائەگرێ لە دەنگی شەو، ئەڵێی لە ناو ئەشکەوتێکدایە، ئەڵێی ئیتر خۆی نیە.

شتێ لە سکیدا ئەلەرزێ، وەک ئەندامێکی نەناسراو ئەکەوێتە ترپە ترپ. "لالا" لەناو قەرەوێڵەکەدا خۆی گرمۆڵە ئەکات، چەناکەی ئەخاتە سەر ئەژنۆکانی، هەوڵ ئەدات گوێ گرێ لەو شتە کە لە ناخیدایە، شتێک کە ئەبزوێ، شتێک کە ژیانی دەست پێ ئەکات.

دیسان ترسەکە لە درێژایی شەقامەکاندا هەڵئەکات و لەم سووچ بۆ ئەو سووچ وەک تۆپ هەڵئەبەزێتەوە. بەڵام هەر لەو کاتەدا، شەپۆلی بەختەوەریەکی سەیر، تینی رووناکیەک کە ئەڵێی لە زۆر دوورەوە، لەوبەر دەریاکانەوە دێت و "لالا" بە جوانیەکەی بیابانەوە گرێ ئەدات و ئەمجا وەک شەوانی دیکە چاوی ئەقوونجێنێ و بە قووڵی هەناسە ئەکێشێ. رووناکی خۆڵەمێشی هۆڵە تەنگەکە بە ئارامی ئەکوژێتەوە، شەوێکی جوان دەرئەکەوی، پڕ لە ئەستێرە، سارد و بێ دەنگ و تەنیا. ئەکەوێتە سەر زەویە بەردینەکە، سەر پانتایی تەپۆلکە لمە بێ جووڵەکان، "ئارتانی" لە تەنیشت "لالا"یە، پاڵتۆ بۆرەکەی لەبەردایە، روومەتە رەشە مسینەکەی لەبەر رۆشنایی ئەستێرەکاندا ئەدرەوشێتەوە. روانینی تا لای ئەم دێت. لێرە ئەیدۆزێتەوە، لەم هۆڵە تەنگەدا، لە رۆشنایی کز و بێ تینی گلۆپەکەدا، روانینی "ئارتانی" لەودا ئەبزوێ، لە زگیدا، ژیانی پێ ئەبەخشێ، ماوەیەکی زۆرە کە نوقم بووە، ماوەیەکی زۆرە ئەم هاتووەتە دەرەوە لەوبەر دەریاوە، ئەڵێی شاربەدەر کراوە، بەڵام بینایی شوانە لاوەکە گەلێ بەهێزە، هەستی پێ ئەکاکە لە ناخیەوە ئەبزوێ، لە نهێنیەکەی ناو زگیدا.

خەڵکی ئەم شارەن کە لە بیر ئەچنەوە، پۆلیسەکان، پیاوەکانی ناو شەقامەکە، دانیشتووەکانی ناو هوتێلەکە، هەموو نوقم ئەبن، لەگەڵ خۆیشیاندا شار و خانوو و

شەقامەکانیان، ماشین و کەمیۆنەکان بزر ئەبن. هەر پانتایی بیابانەکە ئەمێنێتەوە. لەو شوێنەدا کە "لالا" و "ئارتانی" پێکەوە نووستبوون، هەردووکیان لەژێر پالتۆ بۆرەکەدا، شەوە ڕەشەکە و هەزاران ئەستێرە دەوری دابوون و ئەوان توند خۆیان لەیەک گرێ دابوو بۆ ئەوە هەست بە سەرمای زەوی نەکەن.

***

کاتێ لە پانیەر کەسێ ئەمرێ، لە دووکانی (بەڕێوە بردنی کفن و دفن) لە نهۆمی یەکەمی هوتێلەکەدا هەموو کارەکانی ئەکەن. لە پێشەوە "لالا" وایئەزانی کەسێکە خزمی خاوەن هوتێلەکەیە، بەڵام هەر بازرگانێکە وەک هەرکەسێکی دیکە. "لالا" وایئەزانی ئەوانەی لە هوتێلەکە ئەمرن ئەیانبەنە ناو دووکانەکە. لە دووکانەکە هەرچەن کەسی لێیە، خاوەنەکەی "ئاغەی شۆرێ" دوو کاریگەری مردووبەر و ئاژوەری لیمۆزینەکە.

کاتێ کەسێ ئەمرێ، کاریگەرەکان و شۆفێرەکە بە لیمۆزینەکەوە ئەڕۆن و بەسەر دەرگای ماڵەکەدا پەڕۆی ڕەش بە خاڵی زێوینەوە هەڵدەواستن. لەبەرماڵەکەدا و لەسەر شۆستەکە مێزێکی بچووک دائەنێن و سفرەیەکی ڕەش بە خاڵ گەلی زێوینەوە، لەسەر مێزەکە ژێرپیاڵەیەک دائەنێن بۆ ئەوە هەرکەس ئەیەوێ چاوی بە مردووەکە بکەوێ، ناوی لەسەر کاغەزێ بنووسێ و بیخاتە ناو ژێرپیاڵەکە.

کاتی ئاغای "کۆرسۆلا" مرد، "لالا" خێرا زانی، چونکە کورەکەی لە نهۆمی یەکەمی هوتێلەکەدا بینی. کوری ئاغای "کورسولا" پیاوێکی بچووکی قەڵەوە، تووکەسەری تەنکە سمێڵی ڕێک و داهێنراوە و زۆر بە چاوی پیسەوە بۆ "لالا" ئەڕوانێ. بەڵام ئاغای "کورسولا" خۆی جۆرێکیتر بوو، "لالا" زۆری خۆش ئەویست، کەڵەگەت نەبوو، بەلکوو پیرێکی لەڕ و لاواز بوو و بە هۆی ڕوماتیسمەوە، زۆر بە دژواری ڕێی ئەکرد. هەمیشە کۆت و شەڵوارێکی ڕەشی لەبەر بوو کە لەوانەیە هەر وەک خۆی پیر بوو بێت چونکە تان و پۆکەی دیار بوو و ئەنیشکەکانیشی دڕابوو. بەڵام کەوشە کۆنە ڕەشە چەرمەکانی هەمیشە بۆیاخ کرابوو. کاتێ هەوا سارد بوو،

شاڵێکی خوری و کاسکتێکی لەسەر ئەکرد. رووومەتی وشک و پڕ لە چرچ و لۆچ بوو، بەڵام لە دەرەوە لە هەوای ئازاددا ساف‌ولوس دیار بوو. قژە سپیەکەی کورت بوو، چاویلکەکەی لە پووڵەکی رەقە بوو کە بە مشەمای پزیشکی و تەناف درووست کرابوو.

خەڵکی "پانیەر" زۆریان خۆش ئەویست چونکە بەو جلە رەشە لە مۆد کەوتووانە و کەوشە بۆیاخ کراوانیەوە، گەلێ بە ئەدەب و میهرەبان و سەنگین و لەسەر خۆ بوو. هەموو ئەزانن کە جاران دارتاش بووە، وەستا دارتاشێکی کارامە کە بەرلە شەڕ لە ئیتالیاوە هاتبوو، چونکە زۆری رق لە "موسولینی" بوو. خۆی جارێکیان لە شەقام، کاتێ بۆ کڕینی پێویستیەکانی رۆیشتبووە دەرەوە، بۆ "لالا"ی گێڕا بووەوە. وتبووی کە کاتێ هاتبوو بۆ پاریس بێ پووڵ ببوو، هەر بۆ دوو یان سێ شەو مانەوە لە هوتێل، پووڵی هەبوو، تەنانەت وشەیەک فەرەنسی نەئەزانی و کاتێ داوای سابوونی کردبوو کە خۆی بشوات، گۆزەیەک ئاوی گەرمیان پێ دابوو.

کاتێ "لالا" پێی ئەگەیشت، یارمەتی ئەدا و شتەکانی بۆ هەڵئەگرت، چونکە بە دژواری رێی ئەکرد. بەتایبەت کە ئەبوایە لە پلیکانەکان بەرەو شەقامی پانیەر سەربکەوتایە. بەدەم رێگە رۆشتنەوە بە ئیتالیایی قسەی بۆ ئەکرد، سەبارەت بە گوندەکەیان، کاتێ کە لە "تونس" "کرێکار بووە، سەبارەت بەو خانووانەی کە ئەیانکردەوە، لە هەموو جێگایەکدا، لە "پاریس"، "لیۆن"، "کۆرس"...

دەنگێکی سەیری پتەوی بوو، "لالا" بە دژواری لە زاراوەکەی تێ ئەگەیشت بەڵام زۆری پێ خۆش بوو گوێی لە قسەکردنی بێت.

ئێستا ئەو مردووە، کاتێ زانی مردووە، هێندە خەم و پەژارە سیمای گرت کە کوڕەکەی ئاغەی "کورسولا" پێی سەیر بوو. ئەڵێی لەوە کە کەسێ بیر لە باوکی ئەکاتەوە، سەری سووڕ ماوە. "لالا" خێرا دێتەدەرەوە، پێی خۆش نیە هەوای دووکانی بەڕێوەبردنی کفن و دفن هەڵمژێ و چاوی لەو هەموو ئەکلیلە سلولوئیدانە و ئەو تابووتانە بێت. بەتایبەت مردووبەرەکان کە چاویان پیسە.

"لالا" سەر دائەخات و بە ئارامی تا بەر دەرگای ئاغای کورسولا ئەڕوا، پەڕۆی ڕەشــیان بــەدەرگاکــەوە هــەڵواسـیوە، مـێزێکی بـچووک و سـفرەیەکـی ڕەش و ژێرپیاڵەیەک بەسەریەوە. هەروەها تابلۆیەکی ڕەشی گەورە بەسەر دەرگاکـەوە کـە دووپیتی وەک کەمانەی مانگ بەسەریەوەیەتی، ئاوا: ♡

"لالا" ئەڕواتە ماڵەوە، لە پلیکانە تەنگ و تروسکەکان سەرئەکـەوێ، وەک کاتێ شتەکانی بۆ ئاغای "کورسولا" هەڵئەگرت . لە بەین پـلیکانەکـاندا ئـەوەستێ هەناسەی هەڵبێنێتەوە، ئیمرۆ گەلێ ماندووە، هەست ئەکا قورس و سەنگینە، ئـەڵێی خەریکە خەو بیباتەوە، ئەڵێی هەرکە گەیشتە نهۆمی ئاخر، ئەمرێ.

لەبەر دەرگاکە ئەوەستێ، تاوێ ڕائەمێنێ، ئەمجا دەرگاکە ئـەکـاتەوە، ئـەچێتە ماڵەوە، لە پێشەوە نایناسێتەوە چونکە پەنجەرەکرکرەییەکە دادراوەتەوە و زۆر تاریکە. کەسی لێ نیە، "لالا" بەرەو هۆڵە گەورەکـە ئـەڕوا، مـێزێکی لێـیە کـە بـە مشـەمما داپۆشراوە و بەرچنێ مێوە بەسەریەوەیە. قەرەوێڵەکە لە کونجی هۆڵەکەدایـە، ئـاغای "کورسولا" بە پشتا ڕاکشاوە، ئەڵێی لەسەر قەرەوێڵەکە خەوتووە، لە تاریک و لێڵی هۆڵەکەدا زۆر ئارام دیارە. دوو چاوی بەسراوە و دەستەکانی لە ئاست لاشەیدا درێژ بوونەتەوە. "لالا" بۆ ساتێ پێی وایە خەوتووە و ئێستا خەبەری ئەبێتەوە. بـۆ ئـەوەی دایئەچڵەکێنێ بە چـپە ئـەڵێ : ئـاغای کـورسولا، ئـاغای کـورسولا، بـەڵام ئـاغای "کورسولا" نەخەوتووە، وەک هەمیشە هەمان کۆت و شەڵوارە ڕەشەکـە و پـێڵاوە بۆیاخ کراوەکانی لە پێیە. بەڵام کۆت و شەڵوارەکەی نەختێ گۆڕاوە. ملیوانەکەی تا پشتە سەری بـەرز بـووەتەوە. "لالا" پـێی وایـە لۆچ بـووە، سـێبەرێکی خـۆڵەمێشی کەوتووەتە سەر گۆنا و چەناکەی پیرەمێردەکە. دەور چاوی کەوە بووەتەوە، ئـەڵێی لێیان داوە. "لالا" دیسان ئەکەوێتەوە بیر "نوعمان"ی پیر، کاتێ لەسەر زەوی لەنـاو ماڵەکەی خەوتبوو و نەیئەتوانی هەناسە بکێشێ، هێندە بە قووڵی بیری لێ ئەکاتەوە. بۆ چەن ساتێ هەست ئەکا بەڕاستی خەریکە ئەیبینێ کە لەسەر قەرەوێڵەکە ڕاکشاوە و ڕوخساری نوقمی خەوە و دەستی لە ئاستی لاشەیدا درێژکردووەتەوە.

ژیان کە بە ئەستەم هەستی پێ ئەکرێ، بە سرتە سرتێکی نزمەوە، هێشتا لە تاریک و لێڵی هۆڵەکەدا ئەبزوێ. "لالا" زۆرتر لە قەرەوێڵەکە نزیک ئەبێتەوە. چاو ئەبڕێتە روخسارە دامرکاوەکەکە بە رەنگی مۆمە، دەستەیەک لە قژە رەقەکە سپیەکەی کەوتووەتە سەر لاجانگی، دەمی نیوە کراوەتەوە. گۆناکانی بە بۆنەی قورسی کاکیلەکانیەوە چاڵ بوون. شتێک کە روخساری سەیر نیشان ئەدات ئەوەیە، کە چاویلکە کۆنە پووڵەکیەکەی لەچاو نیە. روخساری رووت و لاواز دیارە. بە بۆنەی ئەم نیشانانەوە کە ئیتر هیچ سوودێکیان نیە، نیشانەکانی سەر لووتی، دەور چاوەکانی و درێژایی لاجانگی، جەستەی ئاغای کورسولا لەپڕ زۆر بچووک بووەتەوە. ئەڵێی لەناو جلە رەشەکانیدا ون بووە. دیسان لەپڕ ترس دایئەگرێ. ترسێ کە پێستی ئەسووتێنێ و بینایی تێک ئەشێوێنێ. تاریک و لێڵی هۆڵەکە خنکێنەرە، ئەویش ماسیەکی ئیفلیجە، تاریک و لێڵیەکە لە بێخی حەوشەکانەوە دێت و رێگای شەقامە تەنگەکان ئەگرێتە بەر. لە شارە کۆنەکە تێئەپەڕێ، هەر شتێ کە لە سەر رێگایدایە نوقمی ئەکات. زیندانیەکانی ناو هۆدە تەنگ و تروسکەکان، منداڵە بچووکەکان، ژنەکان، پەک کەوتووەکان... ئەچێتە ناو خانووەکان، ژێر سەربانە تەرەکان، ناو ژێرزەویەکان و شەقارەکان پڕ ئەکاتەوە.

"لالا" بێ جووڵە لەبەر لاشەی ئاغای کورسولا ماوەتەوە. هەست ئەکات سەرما تەرمەکەی رەق هەڵگەڕاندووە. رەنگی سەیری مۆمێک کە پێستی روومەت و دەستی داپۆشیوە. "با"ی بەدبەختی ئەکەوێتەوە یادی کە لە ئاوەها شەوێکدا لە "سیتە" هەڵیکردبوو و کاتێ "نوعمان"ی پیر خەریک بوو ئەمرد، ئەتوت سەرما لە هەموو کون و چاڵێکی زەویەوە بۆ کوشتنی مرۆڤەکان هەڵئەقوڵی.

بێ ئەوە چاو لە تەرمەکە هەڵگرێ، بەرەو دەرگای ئاپارتمانەکە ئەڕوا، مەرگ لە سێبەرە رەنگ خۆڵەمێشیەکەدا لە نێوان دیوارەکاندا شەپۆل لێ ئەدات. لە پلیکانەکاندا، لە رەنگی پووڵەکەیی داڵانەکاندا رەوانە. "لالا" بە فرکان دێتە خوار، دڵی بە توندی کەوتووەتە خورپە خورپ، چاوی پڕە لە فرمێسک، دەرئەپەڕێتە دەرەوە. رائەکات،

بەرەو خواری شار، رووناكی و "با" ئابلۆقەيان داوە، بەڵام ئازارەكەی ناو سكی ناچاری ئەكات لەسەر زەويەكە دانيشێ. دائەنەوێتەوە، ئەناڵێنێ، خەڵكەكە لەبەردەميەوە تێئەپەڕن، بە دزيەوە بۆی ئەڕوانن و دوور ئەكەونەوە. بە ڕێگە ڕۆشتنيانا ديارە كە ئەوانيش ئەترسن. لەپاڵ ديوارەكانەوە تێئەپەڕن وەك سەگێك كە مووی راست بووبێتەوە، تۆزێ چەماونەتەوە.

مەرگ لە هەموو جێگايەكدايە، لە ئاست سەريانەوە، "لالا" وائەزانێ ناتوانن لە دەستی ڕاكەن. مەرگ لە دووكانە رەشەكە نيشتەجێ بووە. لە نهۆمی يەكەمی هوتێلی "سەنت بلانش"، لە نێوان تەوقە وەنەوشەگەچيەكان و كۆگای بەردە مەرمەرينەكاندا.

مەرگ لەوێ لە سەرەوە ئەژی. لەناو خانووە كۆنە رزيوەكەدا، لە هۆڵی پياوەكاندا، لە داڵانەكاندا و ئەوان پێی نازانن، تەنانەت گومانيشی پێ نابەن. شەو لە دووكانی بەرێوە بردنی كفن و دفنەوە دێتە دەر، بە شكلی قالۆنچە و مشك و گەنە و لە هەموو هۆڵە تەرەكاندا بڵاوە ئەكات. لەسەر دۆشەكە كاينەكاندا، بە سينەخشكێ و شەپۆل لێدان لە تەختی هۆڵەكاندا ئەخولێتەوە. لەناو شەقارەكاندا وەك رۆحێكی ژەهراوی هەموو شتێ پڕ ئەكاتەوە.

"لالا" هەڵئەسێتەوە، بە تلاوتل ڕێ ئەكەوێ. دەستی توند ئەنێتە سەر جێگا ئێشەكەی سەر سكی، ئيتر سەيری كەس ناكات بەرەو كوێ بڕوات؟

ئەوانە ئەژين، ئەخۆنەوە، ئەخۆن، ئەدوێن و هەر لەو ماوەيەدا داوە كە بەسەريانەوە ئەتەنرێ. ئەوان هەموويان ون بوون ، شاربەدەر كراون، لێ دراون و سووكايەتيان پێ كراوە. لە "با" سەهۆڵ بەستووەكەی شەقامەكاندا كار ئەكەن. لە ژێر باراندا، زەويە ريخينەكە چاڵ ئەكەن، دەست و سەريان ئەشكێنن، چەكوشەكان شێت و شويريان ئەكەن، برسيانە، ئەترسن، لە تەنيايی و بۆشايیدا رچيون، كاتێ رائەوەستن، مەرگ ئابلۆقەيان ئەدات، لە ژێر قاچيانەوە سەرئەكەوێ، لە دووكانەكەی ژێر پێياندا، لە نهۆمی يەكەمی هوتێلەكەدا.

لەويا مردووبەرەكان بە چاوە پيسەكانيانەوە، نوقميان ئەكەنەوە، ئەيان كوژێننەوە،

تەرمەکانیان نوقم ئەکەن. روومەتیان بە ماسکێکی مۆمی ئەگۆرن، بە جێگای دەستیان، دەستەوانەگەلێ لە جلە خاڵیەکانیانەوە دەردێنن.

بەرەو کوێ بڕوات ؟ لە کوێ خۆی حەشار بدات ؟ حەشارگەیەکی ئەوێ، وەک جاران، لە ئەشکەوتەکەی "ئارتانی"، بەسەر تاشەبەردەکانەوە، لە جێگایەکەوە کە تەنیا دەریا و ئاسمانی لێوە دیار بێت. ئەگاتە گۆرەپانە بچووکەکە، لەسەر نیمکەتە پلاستیکیەکە دائەنیشێ، بەرەو دیواری ماڵە رووخاوەکە کە دەلاقە چۆڵەکانی لە چاوی دێوەزمەیەکی مردوو ئەچن.

***

زۆربەی شار تووشی جۆرە یاوێک ئەبێت، لەوانەیە بە بۆنەی "با"یەکەوە بێت کە لە ئاخر و ئۆخری زستاندا هەڵی کردووە. لە "با"ی بەدبەختی و نەخۆشی ناچێ کە "نوعمان"ی پیری نەخۆش خستبوو و کوشتبووی، بەڵام بایەکی توند و سارد، لە شەقامەکاندا لوول ئەخوات و تەپ و تۆز هەڵدەبەزێنێتەوە. وەرەقەی رۆژنامەکان بەرز ئەکاتەوە، مەستیان ئەکات و ئەیانخاتە تلاوتل. "لالا" هەرگیز "با"ی وای نەدیوە، ئەچێتە ناو مێشکەسەری و لوول ئەخوات و وەک بۆرانێکی سارد یەکبەیەکی ئەندامی جەستەی ئەگەڕێ و ئەیلەرزێنێ. ئەم دوانیوەڕۆ هەر کە هاتە دەر، بە فڕکان بێ ئەوە تەنانەت بۆ دووکانی (بەڕێوە بردنی کفن و دفن) بڕوانێ! دەرئەپەڕێتە دەرەوە، دەرەوە، شەقامە گەورەکان ئاخنراون لە رووناکی، چونکە "با" لەگەڵ خۆی هێناویەتی. رووناکی هەڵئەبەزێتەوە، بەسەر ماشینەکانەوە، بەسەر شووشەی خانووەکانەوە ئەدرەوشێتەوە، ئەچێتە ناو مێشکی "لالا"، بە سەر پێستیەوە ئەلەرێتەوە قژی ئەدرەوشێنێتەوە، ئیمرۆ دوای ماوەیەکی زۆر بۆ جاری یەکەم، دەور و بەری خۆی ئەبینێ، سپێتی دائیمەی بەرد و لمەکان، وریشەی ئەستێرەکان کە وەک بەردی چەخماخە تیژن، دوورتر لەبەرانبەریدا لەوپەڕ شەقامە گەورەکە، لە نێوان تەم و مژی رووناکیدا، سەراوەکان، گومەز و بورج و مەنارەکان و کاروانەکان دەرئەکەون و لەگەڵ کۆمەڵی خەڵک و ماشینەکان تێکەڵ ئەبن. "با"ی رووناکیە، کە لە رۆژئاواوە

دێت و له ئاستی سێبەرەکانەوە مل ئەنێ، "لالا" وەک جاران دەنگی پرتە پرتی رووناکی بەسەر ئاسفالتەکەوە ئەبیسێ، زایەڵەیەکی ماوەدار لەسەر شووشەکان و قرچە قرچی شۆڵەکان.

لەکوێیە؟ هێندە رۆشنایی لێیە ئەڵێی لە نێوان تۆرێکی دەرزی، تەنیا کەوتووە، وەک بڵێی خەریکە لەسەر پانتایی هەراوی بەردەڵان و لمەکە رێ ئەروا. لەویا کە "ئارتانی" چاوەروانیەتی، لە ناوەراستی بیاباندا، وەک بەسەر پێوە خەو ببینێ، هەر ئێستا بە بۆنەی رووناکی و "با"وە، بە زوویی شارەکە ئەتاوێتەوە. لە هالاو و تینی هەتاوی رۆژهەلات، لە دوای شەوە سامناکەکە ئەبێ بە هەلم؟

***

لە سووچی شەقامێکدا، نزیک پلیکانەی بەرەو وێستگەکە، "رادیکز"ی سواڵکەر، قوت لەبەردەمیا رائەوەستێ. روخساری ماندوو و پەرێشانە و "لالا" بە دژواری ئەیناسێتەوە چونکە کورە لاوەکە وەک پیاوی لێ هاتووە. "لالا" ئەو جلانەی تا ئێستا لەبەریا نەدیوە، کۆت و شەڵوارێکی رەنگ بۆر کە جەستە لاوازەکەی تیایدا ون بووە، جووتێ پێلاوی گەورەی چەرمی رەش کە ئەبێ قاچە رووتەکانی برینداربکردبێت. "لالا" ئەیەوێ قسەی لەگەڵ بکات، پێی ئەڵێ کە ئاغای کورسولا مردووە و ئیتر هەرگیز نایەوێ بگەرێتەوە و لە هوتێلی سەنت بلانش کار بکات و نە لە هیچ کام لەو هۆڵانەدا کە مەرگ هەرسات شالاو دێنێ و ئەیکا بە ماسکێکی مۆمی.

بەڵام هاژەی "با" و دەنگە دەنگی شەقام بواری قسەکردنیان پێ نادات، مشتە پارە گرمۆڵە بووەکەی ناودەستی نیشان "رادیکز" ئەدات:

- بروانە.

"رادیکز" چاوی ماق ئەمێنێ، بەڵام پرسیار ناکات، رەنگە وائەزانێ پارەی دزیوە یان خراپتر...

"لالا" پووڵەکە ئەخاتە گیرفانی پاڵتۆکەی، هێن هەموو ئەو رۆژە رەشانەی هوتێلەکەیە، ساوینەوەی پەرۆکەتانیەکان و برۆس و گسک دانی هۆڵە

خۆڵەمێشیەکان، کە بۆنی ئارەق و جگەرەیان ئەدا. کاتێ بە خاوەن هوتێلەکەی وتبوو کە ئەڕۆم، ئەو هیچی نەوتبوو. لەسەر قەرەوێڵە کۆنەکەی هەڵسابووەوە و بەرەو پەغانەکەی لە کونجی هۆڵەکەدا ڕۆشتبوو ، پووڵەکەی هەڵگرتبوو و ژماردبووی، پووڵی حەوتوی پێشووی نابووە سەری و پێی دابوو و بێ ئەوە ورتەی لێوە بێت چووبووە سەر قەرەوێڵەکەی و راکشا بوو. ئەوکارانەی بێ پەلە کردبوو، ژێرپانتۆڵی لە پێدابوو، ردێنی هاتبووەوە و قژی گەلێ چڵکن بوو. دەستی کردبوو بە خوێندنی رۆژنامەکەی، ئەتوت هیچی تر گرینگ نیە.

ئێستا "لالا" سەرمەستی ئازادیە، چاو ئەگێڕێنێ بۆ دەور و بەری، دیوارەکان، پەنجەرەکان، ماشینەکان، خەڵکەکە، ئەڵێی ئەوانە هەر تەنیا پەیکەرن، خەیاڵ و تارماییگەلێ کە "با" و رۆشنایی گسکیان لێ ئەدەن. "رادیکز" هێندە بەدبەخت دیارە، "لالا" بەزەیی پیا دێتەوە:

- "وەرە". دەستی کورە لاوەکە ئەگرێ و لە نێوان گەردەلوولی حەشامەتەکەوە ئەپیا، خۆیان ئەکەن بە دووکانێکی زۆر گەورەدا کە رووناکی ئەبرووسکێتەوە، بەڵام نە رووناکی دڵبزوێنی هەتاو، بەڵکوو رۆشناییەکی سپی و توندکە ئەندازەی ئاوێنەکان نیشان ئەدەن.

بەڵام ئەم رووناکیە ئینسان مەست و گێژ ئەکات و بە شەوارەی ئەخات. لەگەڵ "رادیکز" کە لۆژە لۆژ کەوتووەتە دوای، لە نێوان وڵاتی عەترەکان و رۆنی قژ و کڵاوقژ و سابوونە بۆن خۆشەکانەوە تێئەپەڕن. لەبەر هەرکامیاندا تاوێ ئەوەستن، لە هەموو رەنگەکان سابوون ئەکڕێ و بە "رادیکز"یشی ئەدات. ئەویش ورتەی لێوە نایەت. پاشان دوای ماوەیەکی زۆر شووشەیەکی چوارگۆشی لاکی ناخونی رەنگ ئاجۆری و رەنگی لێوی ئەرغەوانی هەڵئەبژێری، لەسەر چوارپێیەکی بەرزدا دائەنیشێ و لەبەر ئاوێنەکەدا رەنگەکان بەسەر دەستیەوە تاقی ئەکاتەوە. ژنە فرۆشیارە قژ رەنگ کاڵینەکەیش بە چاوە گێلانەکەیەوە سەیری ئەکات.

"لالا" خۆی ئەکات بە ناو جلەکاندا، لە تەواو ئەو ماوەیەدا دەستی "رادیکز"ی

گرتووە، تی‌شرتێک هەڵەبژێریێ و لیباس کارێکی شین، جووتێ سەندەلی تنیس و گۆرەوی سەوز.

لە سالۆنی تاقی کردنەوەی جل، کراسە پێش‌بەسە خۆڵە مێشیەکەی و سەرپێیە کائۆچۆییەکەی دائەنێ بەڵام پاڵتۆ رەنگ بۆرەکەی هەڵەگرێتەوە، چونکە زۆری خۆش ئەوێ.

ئێستا سووک‌تر رێ ئەروا. بە پێڵاوە کێشیەکانیەوە هەڵەبەزێتەوە و دەستێکی ناوەتە گیرفانی. پەلکە رەشەکانی بەسەر یەخەی پاڵتۆکەیدا قورس دائەکەوێ، لە ژێر رووناکی سپی گڵۆپەکەدا ئەدرەوشێتەوە "رادیکز" سەیری ئەکات،پێی جوانە، بەڵام ناوێرێ ئەوەی پێ بڵێ. چاوەکانی لە شادمانی‌دا ئەدرەوشێتەوە، ئەڵێی شۆڵەی ئاگر لە قژە رەشەکانی "لالا"دایە، لە رەنگی مسینی سووری روخساریدا.

ئێستا ئەڵێی رووناکی گڵۆپەکە رەنگی هەتاوی بیابانی زیندوو کردووەتەوە، ئەڵێی لە رێگای فەلاتە بەردینەکانەوە هاتووە بۆ ئێرە، بۆ ناو "پریزۆنی".

رەنگە لە راستیدا هەموو شتێ نوقم بووبێ، تەنیا دووکانە گەورەکە وەک قەڵایەکی بەردین و گڵین لە ناوەراستی بیابانێکی بێ بنەتادا مابێتەوە و هەموو شارەکە، لم ئابلۆقەی داوە و ئەیگووشێ و دەنگی تەق و هۆری بەرزایی خانووبەرە بەتوونیەکان کە شەقاری سەر دیوارەکان تا دێت پەرە ئەسێنێ و هەڵدێرانی سەفحەی شووشە ئاوێنەییەکانی بینا بەرزەکان ئەبیسرێ.

روانینی "لالا"یە کە هێز و وزەی ئاگرینی بیابانی پێیە، رووناکی بەسەر قژە رەشەکانیەوە سووتێنەرە، بەسەر پەلکە ئەستوورەکانیەوە و چاڵایی شانەکانیانەوە، رووناکی لەناو چاوە رەنگ عەنبەریەکەیدا سووتێنەرە، بەسەر پێستیەوە، بەسەر بەرزایی گۆناکانی و سەر لێوەکانیەوە.

لە دووکانە ئاخنراو لە دەنگ و رووناکیە دەستکردەکە، خەڵکەکە لەسەر رێگاکەی "لالا" و "رادیکز"ی سوالکەرەوە دێن و ئەچن و رائەوەستن. ژن و پیاو بەسەر سوورِ مانەوە رائەمێنن، چونکە هەرگیز کەسیان بەو جۆرە نەدیوە، بە ناوەراستی

ڕێگاکەدا ئەڕوا.

جلی کارە ڕەنگ تێرەکەی لەبەرە و بە پالتۆ بۆرەکەی رووومەتە ڕەنگ مسینەکەی داپۆشیوە، "لالا" زۆر کەڵەگەت نیە، بەڵام کاتێ لە ناوەڕاست ڕێگاکەوە تێئەپەڕێ و بە پلیکانە بزۆکەکەدا بەرەو نهۆمی یەکەم دائەگەڕێ، گەورە دیار بوونەکەی، لەبەر هەموو ئەو رووناکیەیە کە لە قژ و پێست و چاویەوە هەڵئەقوڵێ، لەبەر ئەو رووناکیە نائاساییە. کوڕەلاوازە سەیرەکەش بە جلە پیاوانەکەی و قاچە بێ گۆرەویەکانی لەناو پێڵاوە چەرمە ڕەشەکانیدا، کەوتووەتە دوای. قژە ڕەشە درێژەکەی دەور رووومەتە سێ گۆشەکەی بە گۆنا چاڵەکانیەوە و چاوە قووڵەکانیەوە، گرتووە، بێ ئەوە باڵی ببزوێنێ کەوتوەتە دوای، وەک سەگێکی ترساو خۆی لار کردووەتەوە. خەڵکەکە بە سەیرەوە بۆ ئەویش ئەڕوانن، ئەڵێی ڕۆحێکە لە جەستەی جیا بووەتەوە. ترس بەسەر و روخساریەوە دیارە، بەڵام ئەو هەوڵ ئەدا بە پێکەنینێکی سەیرەوە ترسەکەی داپۆشێ، کە زۆرتر لەوە ئەچێ کە رووی گرژ کردبێت. جارجار "لالا" ئاوڕ ئەداتەوە و ئیشارەیەکی پێ ئەکات، یا دەستی ئەگرێ:

- وەرە!

بەڵام لاوەکە دیسان دوائەکەوێتەوە، کاتێ دیسان لە دەرەوەن، لە شەقام، لە بەر هەتاو و "با"دا "لالا" ئەپرسێ:

- برسیتە؟

"رادیکز" بە چاوە برووسکەدارە تاودارەکانیەوە بۆی ئەڕوانێ

"لالا" ئەڵێ: با شتێ بخۆین..

باقی پارەکەی ناو گیرفانی جلە تازەکەی نیشان ئەدات. لە درێژایی شەقامەکە خەڵکەکە بە پەلەن و برێکیان بە هێمنی ڕێ ئەڕۆن قاچیان بە دوای خۆیاندا ڕائەکێشن، ماشینەکان لە هاورێکی شۆستەکە دەئاژون. ئەڵێی بەتەمای شتێکن، کەسێ، جێگایەک کە راوەستن.

ماسی خۆرەکان لە ئاسمانە بێ هەورەکەدا باڵ ئەگرنەوە و بە قیژەقیژێکەوە کە

مێشکی مرۆڤ ئازارئەدەن، دێنە خوار.

"لالا" دەستی "رادیکز"ی گرتووە و رازیە. ورتەیان لێوە نایەت، ئەڵێی بەرەو ئەوپەڕی دونیا ئەڕۆن و هەرگیز ناگەڕنەوە، بیر لە وڵاتەکانی ئەوبەر دەریا ئەکاتەوە، زەویە زەرد و سوورەکان، تاشە بەردەکان کە وەک ددان قوت وەستاون، بیر لە ئاوە شیرینەکان ئەکاتەوە کە چاویان ماقی ئاسمان بووە، بیر لە بۆن و بەرامەی "شرجی" ئەکاتەوە کە پێستی تەپ و تۆزەکە هەڵئەبەزێنێتەوە و تەپۆڵکە لمەکان ئەبزوێنێ. بیر لە ئەشکەوتەکەی "ئارتانی" ئەکاتەوە لەسەر تاشەبەردەکەی رۆخی دەریا، لەویاکە هەرتەنیا ئاسمان دیار بوو.

ئێستا ئەڵێی لە درێژایی شەقامەکاندا، بەرەو ئەو وڵاتە ئەڕوا و ئەگەڕێتەوە، خەڵکەکە لەسەر ڕێگاکەیدا دوور ئەکەونەوە، بێ ئەوە بە خۆیان بزانن چاویان لەبەر تیشکی رووناکی تەنگ کردووەتەوە. "لالا" بێ ئەوە چاویان لێ بکات، بە بەردەمیانا تێئەپەڕێ، ئەڵێی بە نێوان کۆمەڵێ رۆحدا تێئەپەڕێ، ورتەی لێوە نایەت، دەستی "رادیکز"ی توندتر گرتووە و بەرەو هەتاو ملیان ناوە.

کاتێ ئەگەیەنە دەریا، "با" توندتر هەڵئەکات، پاڵیان پێوە ئەنێت، ماشینەکان بە توندی هۆڕن لێئەدەن، لە ڕێبەندانی سەر پردەکە گیریان خواردووە.

دیسان ترس سیمای "رادیکز"ی گرتووە، "لالا" بۆ ئەوەی دڵنیای کات، دەستی توند ئەگووشێ، نابێ گومانی بێت ئەگینا مەستی "با" و رۆشناییەکە ئەڕوا و ئەوان بەجێ ئەهێڵێ و ئیتر زاتیان نامێنێ ئازاد بن. بەسەر لەنگەرگەکەدا ئەچنە پێشەوە بێ ئەوە بۆ کەشتیەکان بڕوانن کە شەقەی دەکەلەکانیان بەرز بووەتەوە.

تیشک دانەوەی ئاوەکە بەسەر گۆناکانیەوە سەما ئەکات، پێستە مسینەکەی و قژەکانی ئەدرەوشێتەوە. پەراوێزی رووناکیەکە سوورە، سوورێکی ئاگرین، کورەلاوەکە بۆی ئەڕوانێ و خۆی ئەسپێرێ بە دەست گەرمایەک کە لەوێوە دێتە دەر و ناخی سیخناخ ئەکا و مەستی ئەکات. دڵی بە توندی لێ ئەدات. ترپە ترپی لە لاجانگ و ملیدا دەنگ ئەداتەوە.

ئێستا دیوارە سپیە بەرزەکان دەرئەکەون و شووشە پانەکانی رستوورانەکە، ئەیانەوێ بۆ ئەوێ بڕۆن، بەسەر دەرگاکەوە "با" دەکەڵ و ئاڵا ڕەنگینەکان ئەشەکێنێتەوە. "لالا" ئەویا باش ئەناسێ، ماوەیەکی زۆرە لە دوورەوە ئەیبینێ، گەڵێ سپیە و شووشە گەورەکانی تیشکی هەتاوی ئاوابوون هەڵدەگەڕێننەوە. بە بێ گومانکردن، دەرگا شووشەیەکە ئەکەنەوە و ئەڕۆنە ناو رستوورانەکە. سالۆنێکی تاریکی گەورەیە، بەسەر مێزە خڕەکانەوە سفرەکان بەرق ئەدەنەوە. بۆ ساتێ "لالا" هەموو شت بە ئاشکرایی ئەبینێ. تەوقە گوڵە سوورەکان لەناو لێوانە کریستاڵەکاندا، کەوچک و چنگاڵە زێوینەکان، لێوانە کەمەر باریکەکان و دەستە سرە بێ لەکەکانی سفرەکە. سەندەڵیەکانیش بە مەخمەڵی شینی دەریایی داپۆشراون، تەختی دارینی هۆڵەکەش کە خزمەتکارە سپی پۆشەکان بەسەریا دێن و ئەچن.

ئەڵێی خەیاڵێکی دوورە، بەڵام ئەو هاتووەتە ناوی، دەستی "رادیکز"ی سواڵکەری توند گرتووە و بە ئارامی و کپ و خامۆش بەسەر تەختی سالۆنەکەدا هەنگاو ئەنێ.

"لالا" ئەڵێ: وەرە ، لەویا دانیشین.

مێزێکی پێ نیشان ئەدات، لە تەنیشت پەنجەرەیەکی گەورەی سالۆنەکەوە تێئەپەڕێ، ژن و پیاوەکان لەدەور مێزە خڕەکانەوە سەریان بەسەر دەوریەکانیانەوە بەرز کردۆتەوە و دەسیان لە خواردن و قسەکردن هەڵگرتووە. خزمەتکارەکان وشکدا ماون، کەوچکەکانیان کردوە بە ناو دیسی برنجەکاندا و بوتڵە شەرابەکانیان لار کردۆتەوە و تاڵێکی باریک لە بوتڵەکەوە تاڵ کێش ئەبێت و وەک شۆڵەیەک کە خەریکە ئەکوژێتەوە ئەڕژێتە ناو لێوانەکە. "لالا" و "رادیکز" لەملاولای مێزێک دائەنیشن کە سفرەیەکی سپی جوانی بەسەرەوەیە. دەستە گوڵێکی سوور لە نێوانیاندایە، خەڵکەکە دەست ئەکەنەوە بە جاوین و قسەکردن، بەڵام هێندێ‌تر، شەرابەکە ئەڕژێتە ناو لێوانەکان، کەوچکەکە برنجەکە تێ ئەکات، سرتە سرتی دەنگەکان بەرز ئەبێتەوە، هەمهەمەی ماشینەکان کە لەوبەر شووشە گەورەکانەوە کە لە ئاکواریۆمێکی گەورە

ئەچێ تێئەپەڕن، سرتە سرتەکەیان دائەپۆشێ.

"رادیکز" ناوێری چاو بە دەور و بەریدا بگێڕێ، تەنیا بە هەموو هێزەوە چاوی بڕیوەتە "لالا"، هەرگیز روخساری بەو روونـاکـی و جـوانـیەی نـەدیوە. رۆشـنایی پەنجەرەکان قژە رەشە زۆرەکەی ئەبریسکێنێتەوە، خەرمانەیەکـی ئـاگـرین لەدەور روخسار و سەر و مل و شانەکانی و سەردەستەکانی کە لەسەر دەوری سەر سفرەکەی داناوە، پێک هاتووە، چاوەکانی لە دوو بەردی ئاگرپژێن ئەچن، بە رەنگی کانزایەکی ئاگرین، روخساری وەک ماسکێکی مسین ساف و لووسە.

پیاوێکی باڵابەرز قوت لەبەر مێزەکە وەستاوە، کـۆت و شـەڵوارێکـی رەشـی لەبەرە، کراسەکەی وەک سفرەکە سپیە. سیمایەکی قـەڵەوی مـاندوو و داهـێزراو و دەمێکی بێ لێوی هەیە، هەر کە زاری کردەوە بە دوو منداڵەکە بڵێ خێرا بڕۆنە دەرەوە و دەردیسەریان بۆ درووست نەکەن، کاتێ نیگا خەمینەکەی لەگەڵ نیگای "لالا" یەک ئەگرن، بۆ ساتێ لە بیری ئەچێتەوە ئەیویست چی بڵێ. نیگای "لالا" وەک بەردی ئاگرپژێن رەق و پڕلە وزەیە، پیاوە رەش پێستەکە بە ناچاری چاوی لێ وەرئەگرێ، هەنگاوێ ئەکشێتە دواوە، ئەڵێی ئەیەوێ بڕوا، ئەمجا بە دەنگێکی سەیری کەمێ کپ، ئەڵێ، ئێوە: ئێوە شتێ ئەخۆنەوە؟

"لالا" چاو ناترووکێنێ، ماقی ماوە، تەنیا ئەڵێ : برسیمانە ، خۆراکمان بۆ بێنە.

پیاوە رەش پێستەکە ئەڕوا و بە خشتەی خواردەمەنیەکانەوە ئەگەڕێتەوە. ئەینێتە سەر مێزەکە. بەڵام "لالا" پێی ئەداتەوە و بێ‌وچان چاو ئەبڕێتە پیاوەکە، رەنگـە بـە زوویی رق و کینەکەی بێتەوە یادی و لە پێستی شەرم بکات.

- لەو خۆراکەی ئەوانمان بۆ بێنە.

"لالا" فەرمانی پێ ئەدات، مێزەکەی پاڵ دەستیان نیشان ئەدات، ئەوانەی کە جار جار کەمێ وەرئەچەرخن و لە ژێر چاویلکەکانیانەوە بۆیان ئەڕوانن. پیاوەکە لەگەڵ یەکێ لە خزمەتکارەکان قسە ئەکات کە چەرخێکی دەستی بـچووک پـڕ لە دیسـی رەنگاورەنگی پێیە. گارسۆنەکە تەماتە و گەڵای کاهوو و زەیتوون، تورشی "کاپر"،

پەتاتەی سارد، هێلکە بە گەردی زەردەوە و زۆر شتی تریان بۆ دێنێ. "لالا" بۆ "رادیکز" ئەڕوانێ کە بە پەلە دەستی کردووە بە خواردن. چەماوەتەوە وەک سەگێ ئەجاوێ. "لالا" پێکەنینی دێت، رووناکی "با" بێوچان سەما ئەکات، تەنانەت لێرە بە ئاستی سەر لێوان و دەوریەکانەوە، لەسەر ئاوێنەی دیوارەکان، بەسەر تەوقەی گوڵەکانەوە.

دیسەکان یەک لە دوای یەک لەسەر مێزەکە دائەنرێن، گەورە و گەشێنن، پڕلە هەموو جۆرە خۆراکیەک کە "لالا" ناویان نازانێ. ماسیەکان لەناو سۆسێکی نارنجیدا گوم بوون، کۆگای سەوزیەکان بەرز ئەکاتەوە بۆ ئەوە بۆنەکەیان هەڵمژێ. خاوەن هوتێلەکە بە ڕێ و ڕەسمێکەوە شەرابێکی ڕەنگ عەمبەریان بۆ تێ ئەکات. پاشان لە پەرداخێکی باریک و بەرزدا شەرابێکی یاقووتی مەیلەو ڕۆشن.

"لالا" قومێ ئەخواتەوە، بەڵام زۆرتر ڕەنگەکەیەتی کە هەڵیئەمژێ، زۆرتر رووناکیەکە و بۆن و ڕەنگی خۆراکیەکانە کە مەستیان ئەکات. "رادیکز" بە پەلە ئەخوات، جارجاریش لە خواردنەوەی ناو پەرداخەکانیش ئەخواتەوە، بەڵام "لالا" هەر هیچی نەخواردووە بۆ کورە لاوەکە ئەڕوانێ کە بە پەلە خەریک خواردنە و خەڵکەکەی ناو ساڵۆنەکەش ئەڵێی بەسەر دەوریەکانیانەوە وشک بوون.

کات ئارامتر تێئەپەڕێ، یان روانینی ئەوەکە لەگەڵ ڕۆشناییەکەدا وەستاوە. لەدەرەوە ماشینەکان بێوچان لەبەر شووشەکانەوە تێئەپەڕن و ڕەنگی خۆڵەمێشی دەریا لە نێوان کەشتیەکانەوە دیارە. کاتێ "رادیکز" هەموو خۆراکی ناو دیسەکان ئەخوات، بە دەستەسڕەکەی دەمی پاک ئەکاتەوە و پاڵ ئەداتەوە بە سەندەڵیەکەوە، سوور بووەتەوە، چاوەکانی ئەدرەوشێتەوە.

- بە دڵت بوو؟

"رادیکز" ساکارانە ئەڵێ:

- ئەرێ.

هێندەی خواردوە، ئەکەوێتە نزگەرە، "لالا" پەرداخێ ئاوی پێ ئەدات، پێشی

ئەڵێی بۆم بڕوانە ڕێک بۆ ناوچاوم بڕوانە تا نزگەرەکەت لە بیر چێتەوە.

پیاوەکەڵەگەتە رەشەکە لێیان نزیک ئەبێتەوە:

- قاوە؟

"لالا" سەرێ ئەلەقێنێ

کاتێ خاوەن ئوتێلەکە خشتەی حسابەکە بە سەر سینیەکەوە دێنێ "لالا" لێی ئەگرێ.

- بیخوێنەوە.

"لالا" ئەسکەناسە گرمۆڵەکانی ناو گیرفانی دەردێنێ و لەسەریەک لەسەر سفرەکە دەقیان ئەکات. خاوەن هوتێلەکە پارەکە ئەگرێ و ئەڕوا، پاشان ئەگەڕێتەوە.

- ئاغایەک ئەیەوێ لەگەڵتان قسە بکات، لە مێزی لای دەرگاکە.

"رادیکز" باسکی ئەگرێ و بە توورەییەوە ئەیکێشێ:

- با بڕۆین، لێرە بڕۆین.

کاتێ لە دەرگاکە نزیک ئەبنەوە، "لالا" لەسەر مێزەکە پیاوێکی سی ساڵانەی خەمین چاو ئەکات. پیاوەکە هەڵئەسێتەوە و بەرەو ئەم دێت. بە منە منەوە ئەڵێ:

- من، ببوورن، ئاوا لەگەڵتان پێوەندیم گرت، بەڵام من.

"لالا" بە بزەوە ڕێک بۆ ناوچاوی ئەڕوانێ.

- من وێنەگرم، زۆرم پێخۆشە وێنەی ئێوە بگرم، ئەگەر بتانەوێ.

"لالا" وەڵامی ناداتەوە و هەروا بە بزەوە بۆی ئەڕوانێ. پیاوەکە سەری لێ ئەشێوێت:

- ئاخر من، ئێوەم بینی، هەر کە هاتنە ناو رستوورانەکە، سەیر بوو، ئێوە نائاسایین.

پێنووسێ لە گیرفانی کۆتەکەی دەردێنێ و خێرا ناو و نیشانی لەسەر لەتەکاغەزێ ئەنووسێ، بەڵام "لالا" سەرێ ئەلەقێنێ و کاغەزەکەی ناگرێ:

- سەوادم نیە

وێنەگرەکە ئەپرسێ: دەی پێم بڵێ لەکوێ ئەژیت؟

چاوە شین و خۆڵەمێشیەکەی خەمی لێ ئەباری و وەک چاوی سەگ تەڕە. "لالا" بە چاوە پڕ لە ڕووناکیەکەیەوە بۆی ئەڕوانێ. پیاوەکە دیسان ئەیەوێ شتێ بڵێ.

- من لە هوتێلی "سەنت بلانش"م. "لالا" خێرا ئەڕوا.

لە دەرەوە "رادیکز"ی سواڵکەر چاوەڕوانیەتی، "با" قژە درێژەکەی ئەرژێنێتە سەر روخسارە لاوازەکەی، رازی دیار نیە، کاتێ "لالا" قسەی بۆ ئەکات، شانی هەڵئەتەکێنێ، پێکەوە تا لای دەریا ئەڕۆن، بێ ئەوە ئاگایان لێ بێت بۆکوێ ئەڕۆن. لێرە، دەریا، لە دەریاکەی لای "نوعمان"ی ماسیگر ناچێ.

دیوارێکی سیمانی لەڕاستای ساحلەکە تا تاشەبەردە خۆڵەمێشیەکان کشاوە. شەپۆلە کورتەکان بە دەنگی تەقینەوەیەک، لە چاڵایی تاشەبەردەکان ئەدەن. کەف وەک تەم و مژ هەڵئەبەزێتەوە. بەڵام "لالا" رازیە و پێی خۆشە زمانی بەسەر لێویا بساوێ و تامی خوێ بچێژێ. لەگەڵ "رادیکز" تا ناو تاشەبەردەکان دائەگەڕێن، تا کونج و قوژبنەکانی تاشەبەردەکان، بۆ ئەوە لە "با" پەنا بگرن.

هەتاو لێرەدا ئەدرەوشێتەوە، لە ئاستی سەر دەریا، لە دڵی دەریا و بەسەر تاشەبەردەکانەوە ئەدرەوشێتەوە. لە دوای هەموو قاڵە قاڵ و زەنازەنای شار، هەموو بۆنە سەیرەکانی رستووران، پێیان خۆشە کە لێران. لەبەردەمیانا تەنیا ئاسمانە و دەریایە. چەن دوورگە لە رۆژئاواوە دیارن، چەن تاشەبەردی رەشە کە وەک نەهەنگ لە دەریا دەرتۆقیون، "رادیکز" ئەمە ئەڵێ.

هەروەها کەشتیە بچووکەکان بە بایەوانە سپیەکانیانەوە لە ئامێری گەمەی منداڵان ئەچن، کاتێ هەتاو ئەکشێتە خوارەوە و ڕووناکی لەسەر شەپۆلەکان و تاشەبەردەکان کز ئەبێتەوە. "با"یش دائەمرکێتەوە، کە ئەوە حەزی خەوتن و قسەکردن لە ناخیاندا ئەهەژێنێ.

"لالا" بۆ گیا وردەکان ئەڕوانێ کە تامی هەنگوێن و بیبار ئەدەن و لە هەر جار شاڵاوی "با"دا لە چاڵایی تاشەبەردە خۆڵەمێشیەکاندا ئەلەرێنەوە.

واتەزانێ خەریکە بەرە بەرە هێندە چکۆلە ئەبێتەوە کە ئەتوانێ لە نێوان دەستەیەک لەو گیا بچووکانەدا بژی، لە کەلەبەری تاشەبەردێکدا بمێنێتەوە، تنۆکێ ئاوو نەختێ نانی بەسە بۆ رۆژێکی.

"رادیکز" لە گیرفانی کۆتە کۆنە بۆرەکەی پاکەتێ جگەرەی پلیشاو دەردێنێ و دەنکێکی ئەدا بە "لالا". ئەڵێ کە هەرگیز لەبەر چاو خەڵکدا جگەرە ناکێشێ مەگەر لە جێگایەکدا کە حەز ئەکات. ئەڵێ کە ئەمە یەکەمجاریە لای کەسێکی تردا جگەرە ئەکێشێ ئەویش "لالا"یە.

لە جگەرە ئەمریکاییەکە هەست بە تام و بۆنی هەنگوێنێکی هێڵنج هێنەر ئەکات. هەر دووکیان بە ئارامی چاویان بڕیوەتە دەریا و مژ لە جگەرەکە ئەدەن. "با" دووکەڵە شینەکەی دوور ئەخاتەوە.

- ئەتەوێ قسەی ئەویات بۆ بکەم، لەویا کە ئەژیم، لای هەمارەکان؟

دەنگی "رادیکز" بە تەواوەتی گۆڕاوە، ئێستا کەمێ گڕە، ئەڵێی هەست و سۆزەکانی گەرووی ئەگووشن. بێ ئەوە بۆ "لالا" بڕوانێ، بەدەم جگەرە کێشانەوە، قسە ئەکات. تا کاتێ کە جگەرەکە نووکی قامکی و لێوی ئەسووتێنێ.

- جاران من لەگەڵ ئەرباب نەبووم، لە کاروانێکدا لەگەڵ دایک و باوکم ئەژیام و لە هات و چۆدا بووین. مەیدانی تیرئەندازیمان بوو، ئەڵبەت نە بە "کارابین" بەڵکوو بە کەلا و قوتوی خاڵی خۆراک. پاشان باوکم مرد، چونکە زۆر بووین و دەست کورت دایکم منی فرۆشت بە ئەرباب و هاتم بۆ ئێرە، بۆ مارسێ. لە پێشەوە نەمدەزانی کە دایکم منی فرۆشتوە، بەڵام رۆژێ ویستم ڕا بکەم، ئەرباب گرتمی و لێی دام و پێی وتم ئیتر ناتوانم بگەڕێمەوە لای دایکم، چونکە ئەو منی فرۆشتووە و ئێستا ئەو وەک باوکی منە. ئیتر هەر لای ئەو مامەوە چوونکە نەمدەویست دایکم ببینمەوە. لە پێشا زۆر خەمین بووم، کەسم نەئەناسی، گەلێ تەنیا بووم، بەڵام راهاتم چونکە ئەرباب زۆر مێهرەبان بوو و هەر خواردنیەکمان بویستایە پێی ئەدایِن، ئێستە کە دایکم منی نەئەویست ئەوێم پێ‌خۆشتر بوو. شەش کوڕ بووین، لە پێشدا حەوت بووین،

یەکێکیان کەوتەیی گرت و مرد. بۆ ئەو شوێنانە ئەرباب ئەیوت ئەرۆیشتین بۆ سواڵکەری. شەوانە پووڵەکەمان ئەبردەوە، کەمێکمان لێ هەڵدەگرت و باقیەکەمان بە ئەرباب ئەدا. ئەویش لەو پارە خوراکی بۆ ئەسەندین. ئەرباب هەمیشە ئامۆژگاری ئەکردین ئاگامان لە خۆمان بێت پۆلیس نەمانگرێ، چونکە ئەکەوینە کونجی زیندان و ئەو ناتوانێ دەرمان بێنێت. هەر بۆیە بۆ ماوەیەکی زۆر لە یەک جێگادا نەئەماینەوە، ئەرباب بۆ جێگایەکی دیکەی ئەبردین. لە پێشەوە لە هەمارێک بووین لە باکوور، ئەمجا وەک کاروانەکەی باوکم کاروانێکمان بوو و لەگەڵ قەرەجەکان لە دەرەوەی شار رەشماڵمان لێ ئەدا.

ئێستا بە هەموومان خانوویەکمان هەیە. درووست لەبەر هەمارەکاندا. منالانی تریش هەن کە بۆ ئەربابێ بە ناو "مارسل"کار ئەکەن. هەروەها "ئانیتا"ش هەیە، لەگەڵ دوو کور و سێ کچی تردا وائەزانم بە تەمەن ترینیان کچەکەیەتی، ئێمە لای وێستگەکە کار ئەکەین ئەڵبەت بۆ ئەوە نەگیرێن هەموو رۆژ بۆ ئەویا ناچین، بۆ سەر پردەکەش ئەچین، یان سەیرانگەی "بولسونس" یان بۆ "کانبێر".

بەڵام ئێستا ئیتر ئەرباب ئەڵێ من تەمەنم بۆ سواڵکردن گەورەیە و باش نیە، کورە بچووکەکان و کچەکان بۆ سواڵ باشن . ئەیەوێ من بە راشکاوی و هەوڵدان کار بکەم، فێری کردووم چۆن گیرفان ببڕم و لە دووکان و لە بازاڕ دزی بکەم. ئاوەتە ئەم جلانە، ئەم کراس و پێڵاوانەی بۆ من لە دووکانێکدا دزیوە، لە کاتێکدا من خۆم داگرتبوو و لە بۆسەدا بووم.

ئەگەر خۆت بتویستایە، ئەتتوانی بە جلە کۆنەکانتەوە بهاتیتایەتە دەرەوە، تەنیا کاری تۆ هەڵبژاردنی ئەو شتە بوو کە ئەتویست. ئیتر من رێگاکەی ئەزانم چۆن بمهێنایە. بۆ وێنە بۆ کیفەکان، ئەبێ دوانی بین، یەکێ ئەبێ بیفرێنێ و خێرا بەویتریان بدات، بۆ ئەوە بە کیفەکەوە نەگیرێ. ئەرباب ئەڵێ من بۆ ئەو کارە لێهاتووم، چونکە دەستەکانم نەرم و درێژن، ئەڵێ بۆ مۆسیقا لێدان و دزی باشن. ئێستا ئێمە بە کچەکەی "ئانیتا"وە سێ کەسین. سەر ئەکەین بە هەموو دووکانە گەورەکاندا. برێجار ئەرباب

ئەڵێ بۆ شت کڕین بڕۆن بۆ دووکانە گەورەکان. زۆربەی کات کچەکەی "ئانیتا"یە و کوڕێ، کوڕەکە هەمیشە منم. خۆ تۆ شارەزای دووکانە گەورەکان گەلێ گەورەن، ڕێگای زۆریان بۆ خۆ شاردنەوە هەیە، هەروەها خواردن، لیباس، پێڵاو، سابوون، هەموو شت ئەدزین. دووقۆڵی خێراتر کار ئەکەین. ساکێکمان هەیە وبە جێگاگەلی نهێنیەوە بۆ شتە بچووکەکان و بۆ خۆراکیەکان. ئەوە لای "ئانیتا"یە هەڵیئەبەسێ بەسکیەوە، ئەو بە جۆرێ بە سکیەوە هەڵیئەبەسێ کە ئەڵێی سکی پڕە. ئەرباب خۆی بارانیەکی هەیە، لە ناوەوە پڕە لە گیرفان، هەرچیمان پێویست بێت هەڵیدەگرین و ئەڕۆین.

لە پێشدا ئەترسام کە بمگرن، بەڵام ئەبێ بێ ئەوە گومان کەیت، باشترین کات بۆ ئەو کارە هەڵبژێری. ئەگەر گومان بکەیت کێشکچیەکان ئەتگرن. ئێستا ئیتر من کێشکچیەکان ئەناسم. تەنانەت لە دوورەوە، هەموویان یەکجۆر ڕێ ئەڕۆن ، یەکجۆر لەژێر چاوەوە ئەڕوانن. ئەتوانم لە یەک کیلومەتریەوە بیانناسمەوە. من پێم خۆشە لە شەقام کار بکەم، لەسەر ماشینەکان، ئەرباب ئەڵێ فێرم ئەکا لەسەر ماشینەکان کار بکەم. ئەو لەو کارەدا پسپۆڕە. بڕێجار ئەچێ بۆ شار ، ماشینێک دێنێتەوە و بۆ ئەوە من لەگەڵی رابێم، فێری کردووم بە تاڵێ سیم یان کلیلی دەستکرد قوفڵەکان بکەمەوە. زۆربەی ماشینەکان بە کلیلی دەستکرد ئەکرێنەوە بەڵام ئەڵێ ئاژوتن بۆ من زووە و هێشتا منالم. من ئەزانم لەناو ماشینەکاندا چی هەیە، زۆربەی کات سنووقەکەی پڕە لە شت، دەسەچەک، قەباڵە و بەڵگە، تەنانەت پووڵ، لەژێر سەندەڵیەکانیشی ئامێری وێنە گرتن و رادوێ هەیە.

زۆرم پێ خۆشە بەیانیان زوو کار بکەم. بە تەنیایی، کاتێ کەس لە شەقام نیە، تەنیا جار جارێ پشیلەیەک پەیدای ئەبێ، گەلێ پێم خۆشە هەڵهاتنی هەتاو ببینم و ئاسمانی تایبەتی بەیانیان.

ئەرباب پێی خۆشە فێر بم قوفڵی ماڵەکان بکەمەوە، ویلای دەوڵەمەندەکان لێرە لە نزیک دەریاوە. ئەرباب ئەڵێ : دوو کەسی ئەو کارە زۆر ئاسانە چونکە سووکین و

ئەتوانین لە دیواری ماڵەکان سەرکەوین. ئەو فێری کردووین چۆن دەرگای ماڵەکان و پەنجەرەکان بکەینەوە. خۆی نایەوێ ئەو کارە بکات، ئەڵێ زۆر پیر بووە و کاتی پێویست ناتوانێ را بکات، بەڵام بۆ ئەوە نیە، جارێ گیراوە و ئەوە ترساندوویەتی. من جارێکیان رۆیشتووم، لەگەڵ یەکێ بە ناوی "ریتۆ"، لە من گەورەترە، زووتر کاری بۆ ئەرباب کردووە، ئەرباب منی لەگەڵ ئەو نارد. لە شەقامی "پرادۆ" ماڵێکی نیشان کردبوو و ئەیزانی کەسی لێ نیە، من نەچوومە ماڵەوە، لە باخەکە مابوومەوە، "ریتۆ" تا توانی شتی هێنا دەرەوە، ئەمجا هەموومان تا لای ماشینەکە برد کە لەوێ ئەرباب بەتەمامان بوو.

زۆر ئەترسام، چونکە لە باخەکە خۆم داگرتبوو، پێم وابوو ئەگەر لە ماڵەوە بوایەم کەمتر ئەترسام بەرلەوە دەست پێ بکەیت ئەبێ لە هەموو شت بزانی، ئەگینا ئەتگرن.

بۆ چوونە ماڵەوە ئەبێ پەنجەرەیەک کرابێتەوە، ئەمجا بەسەر درەختێکەوە یان بەسەر ناودانێکەوە سەرکەوی، نابێ سەرگێژەت بێت. کاتێ تەقە و رەقەت بیست نابێ بشلەژێی. ئەبێ جووڵە لە خۆت ببری، یان لە ژێر سەربانەکە خۆت داشاری چونکە ئەگەر راکەی، خێرا ئەتگرن. ئەرباب هەموو ئەمانەی لە هوتێلەکەی خۆمان فێری کردووین. فێری کردووین چۆن وەک چەترباز بپەرین، بەڵام ئەڵێ بۆ هەمیشە لەوێ نامێنینەوە، ماشینێک ئەسێنین و ئەچین بۆ ئیسپانیا. من زۆرتر پێم خۆشە بۆ "نیس" برۆم بەڵام وائەزانم ئەرباب ئیسپانیای زۆرتر بە دڵە. تۆ ناتەوێ لەگەڵ ئێمە بێت؟ من بە ئەرباب ئەڵێم کە تۆ هاورێمی و ئەو هیچ ناڵێ. من ئەڵێم کە رەفێقمی، رەنگە تۆیش بتوانی لە دووکانەکان کار بکەیت، یان لە ماشینەکان، بە نۆبە کار ئەکەین. ئیتر خەڵک گومانمان پێ نابەن. ئەزانی، ئانیتا زۆر مێهرەبانە، دڵنیام خۆشت لێ دێ. ژنێکی قژ کاڵ و چاو شینە، کەس باوەر ناکات قەرەج بێت، ئەگەر تۆ لەگەڵمان بیت، بۆ من گرینگ نیە. بۆ نیس برۆم یان ئیسپانیا هەر کوێ بێت.

"رادیکز" بێدەنگ ئەبێت، زۆر حەز ئەکات برێ پرسیاری لێ بکات،

سەبارەت بە منالەكەی ناو سكی، بەلام ناویرێ، جگەرەیەكی‌تر دائەگرسێنێ، مژی لێ ئەدا. جار جار بە "لالا"ی ئەدا مژی لێ بدات. هەر دووكیان چاو ئەبڕنە دەریا جوانەكە و دوورگەكان كە لە بالۆن ئەچن و كەشتیە باریەكان كە بە ئارامی لەسەر دەریالیورێژ لە ڕووناكیەكە بەرەو پێش ئەڕۆن.

جار جار "با" هێندە توند هەلئەكات. ئەلێی ئاسمان و دەریا سەرەونخوون ئەبن.

***

ئێستا "لالا" سەیری وێنەكانی ئەكات بە سەر گۆڤار و ڕۆژنامەكانەوە. بۆ وێنەكان ئەڕوانێ، نموونە ڕەنگیەكان كە ڕوخساری بە گەورەیی سروشتی خۆیەتی، گۆڤارەكان وەرەق ئەداتەوە، لە كۆتاییەوە بۆ سەرەتاكەی، تۆزێ لار گرتوویەتی و سەری چەماندووەتەوە.

- پێت جوانە؟

وێنەگرەكە پرسیار ئەكات. دەنگی نیگەرانە، ئەلێی وەلامەكەی ئەمی بۆ گرینگە. "لالا" پێئەكەنێ، پێكەنینێكی بێدەنگ، ددانە سپیەكانی ئەدرەوشێتەوە، بە هەموو ئەوانە پێدەكەنێ، بە گۆڤارەكان، وێنەكان، ئەلێی ئەمانە هەمووی شۆخی و گالتەن، ئەلێی ئەو وێنە بەسەر لاپەڕەی گۆڤارەكانەوە، خۆ ئەویش نیە، "حەوا" یە. ئەو ناوەی بە وێنەگرەكە داوە، ئەویش وای پێ ئەلێ: "حەوا"

جاری یەكەم كە یەكتریان دیبوو، لە پلیكانەكانی پانیەر، "لالا"ی بردبوو بۆ ئاپارتمانە گەورە چۆلەكەی لە نهۆمی یەكەمی مالێكی نۆ نهۆمیدا. ئێستا "حەوا" لە هەموو جێگایەكدایە، لەسەر لاپەڕەی گۆڤارەكان، بە دیواری مالەكانەوە. "حەوا"، سپی پۆش و كەمەربەنێكی ڕەش بە دەور كەمەریدا، تەنیا لە نێوان تاشەبەردەكاندا، بێ سێبەر. "حەوا"، حەگالێكی ڕەشی بەدەور تەوێلیا هەلپێچاوە؛ "حەوا" لە پێنج و پلووچی شارە كۆنە ئاجۆریە سوور و ئالتوونیەكەدا وەستاوە.

"حەوا" لەسەر دەریای مەدیتەرانە وەستاوە، "حەوا" لە گەرەكەكانی "بولسونگ"، یان لەسەر پلیكانەكانی وێستگەكە؛ "حەوا" بە جل و بەرگێكی

شینەوە، پێخاوس لەسەر ئاسفالّتی گۆرەپانە گەورەکە کە لە بیابان ئەچێ وەستاوە، لەگەڵ تارمایی مەخزەن و لوولە زۆپاکان کە دووکەڵیان لێ بەرز بووەتەوە. "حەوا" ڕێ ئەڕوا، "حەوا" خەریکە سەما ئەکات، "حەوا" نووستوە، "حەوا" وەک هەڵۆیەک ئەڕوانێ، بە قژە ڕەشە پڕەکەیەوە کە ڕژاوەتە سەر شانی، یان ئاوی دەریا وەک کڵاوێکی نەرم سافی کردووە.

بەڵام "حەوا" کێیە؟ هەر ڕۆژ کاتێ لە هۆڵە ڕەنگ سپی و خۆڵەمێشی دانیشتنەکە لەسەر دۆشەکێکی پلاستیکی، لە تەختی هۆڵەکە لە خەو هەڵئەسێ، بێدەنگ لە دەسشۆریەکە، دەست و دەم و چاوی ئەشوات، پاشان لە پەنجەرەکەوە ئەڕواتە دەرەوە، لە شەقامەکانی ئەو مەڵبەندە دوور ئەکەوێتەوە، بەرەو دەریا مل ئەنێ.

وێنەگرەکە خەبەری ئەبێتەوە، ئاگای لێیەتی ئەڕوا، بەڵام نابزوێ، ئەڵێی هەر نەیشی‌زانیوە، بۆ ئەوە "حەوا" ئازار نەدات، ئەزانێ کە ئەو وایە و نابێ بەرگری بکات. پەنجەرەکە داناخات بۆ ئەوە وەک پشیلە دیسان بێتەوە ماڵەوە.

برێ‌جار هەر شەوانە دێتەوە، لە پەنجەرەکەوە خۆی ئەخزێنێتە ماڵەوە، وێنەگرەکە چاوەڕوانیەتی. لە تاقیگەکەی دێتە دەر، لە هۆڵی دانیشتن لای دائەنیشێ، بۆ ئەوە لەگەڵی بدوێ. هەمیشە کاتێ ئەیبینێ ئەگەشێتەوە چونکە روخساری سیخناخە لە ڕووناکی و ژیان، ئەو لە هۆڵی تاریکی تاقیگەکەی بووە، بە دیتنی ئەو هەموو ڕووناکیە چاوی ئەتروکێنێ، هەمیشە پێی وایە قسەی زۆری پێیە، پێی بڵێ. بەڵام کاتێ لە بەرانبەریدایە ئیتر نازانێ چی بڵێ، "لالا" قسە ئەکات، لەو شتانە دیویەتی، بیستویەتی، باسی شەقامەکان ئەکات... بەدەم گێڕانەوەوە، نان ئەخوا، نان و خورمایەک کە کڕیویەتی.

لە هەموو سەیرتر نامەکانن،لە هەموو لایەکەوەدێن، ناوی "حەوا" بەسەریانەوەیە، ڕۆژنامەکان کە ناوونیشانی وێنەگرەکەیان پێوەیە، دیتنی هەموو ئەو نامانە بەختەوەر و نیگەرانی ئەکات، "حەوا" پێی ئەڵی بیانخوێنێتەوە بۆی، "لالا"یش سەرێ لار ئەکاتەوە و بەدەم خواردنەوەی چایی نەعناوە گوێی لێ‌ئەگرێ، ئێستا

چێشتخانە بچووکەکەی پڕبووە لە بەسەی "گانپودر" و چایی یاسەمەن و پاکەتی بچووکی نەعنا) نامەکان بڕێجار شتی زۆر سەیریان تیایە، شتی گێلانە کە کچە لاوەکان ئەینووسن یان نامەی کورە لاوەکان کە ئەویندارین و ئەڵێن کە ئەو وەک "نوفێریتی" جوانە، یان وەک شازادەی "ئینکا"یە و تامەزرۆن کە ڕۆژێ ببینن.

"لالا" دەست ئەکا بە پێکەنین، چ درۆگەلێ!

کاتێ وێنەگرەکە وێنەکان کە لێی گرتووە، پێی نیشان ئەدات، "حەوا" بە چاوە بادامیەکانیەوە کە وەک گەوهەر ئەدرەوشێتەوە، پێستە ڕەنگ عەمبەرینەکەی کە پڕە لە ڕووناکی، لێوەکانی کە بزەیەکی گاڵتەجارانەی بەسەرەوە نیشتووە، دیسان بە پێکەنینەوە ئەڵێ:

- چ درۆیەک، چ درۆیەک.

چونکە ئەو وائەزانێ لە خۆی ناچێ و هەمووی درۆیە، نامەگەلێکی جیدیش هەن کە باس لە پەیمان نامە و بڕیار ئەکەن، سەبارەت بە پارە و ژوان و نمایشی مۆد.

وێنەگرەکە هەموو ئەم بڕیارانە ئەنجام ئەدات، زەنگ بۆ خەیاتەکان لێ ئەدات، لە دەفتەری ڕۆژانەکەی ژوانەکان ئەنووسێ، پەیمان نامەکان ئیمزا ئەکات.

ئەو مودێلەکان هەڵدەبژێری، ڕەنگەکان جیا ئەکاتەوە، جێگایەک کە وێنەی تیا ئەگرن، بە کامیۆنە بچووکە سوورەکەی "حەوا" ئەبات، دوور ئەکەونەوە، جێگایەک کە ئیتر ماڵی تیا نیە، تەنیا تەپۆڵکە ڕەنگ خۆڵەمێشیەکان کە بە دڕک و داڵ داپۆشراون، یان دڵتای گۆلاوەکە، لەسەر ڕۆخە خزەکانی زەلکاوەکان، لە شوێنێکدا کە ئاسمان و ئاو، یەک ڕەنگن.

"لالا" ("حەوا") پێی خۆشە بە کامیۆنی وێنەگرەکە سەفەر بکات، چاو ئەبڕێتە دیمەنەکان، کە بە دەور شووشەکاندا ئەخزن، جادە ڕەشەکە کە پێچ ئەکاتەوە، خانووەکان، باخەکان کە تێئەپەڕن. خەڵکەکە لە قەراخ جادەکە وەستاون و چاویان بڕیوەتە بۆشایی، وەک لە خەودا بن، ڕەنگە "لالاحەوا" لە خەودا ئەژی، خەوێ کە ڕۆژ و شەوی بۆ نیە، برسیەتی و تینوویەتی نیە، بەڵام خزینی دیمەنە گەچیەکان،

دیمەنە دڕکاویەکان، چوارقاشی جادەکان، ئەو شارانەی لێی ڕائەبووریّ، شەقام و ماڵ و هوتێلەکانی هەیە.

وێنەگرەکە بێوچان وێنەی "حەوا" ئەگرێ، ئامێرەکەی ئەگۆڕێ، ڕووناکیەکەی ئەندازە ئەگرێ، دەس بەسەر پەلەپیتکەی کامێراکەدا ئەنێ، سیمای "حەوا" لە هەموو جێگایەکدا هەیە، لە ڕووناکی هەتاودا، وەک شکۆیەک لە ئاسمانی زستاندا ئەگرێ، یان لە دڵی شەواندا، لە شەپۆلی ئێزگەی ڕادوێنەکاندا ئەلەرێتەوە، لە پەیامە تەلەفونیەکاندا، وێنەگرەکە بە تەنیا لە هۆڵی تاقی کردنەوەکەیدا خۆی زیندانی ئەکات. لەژێر گڵۆپە ڕەنگ نارنجیەکەدا و بێ بڕانەوە چاو ئەبڕێتە ڕوخساری سەر کاغەزەکە کە لە تەشتی تێزابەکەدا خەریکە بەرە بەرە خۆی ئەگرێ. پێش لە هەموو شت چاوەکانی، هەروەها و خاڵگەلێ کە تا دێت قووڵ ئەبنەوە، پاشان قژە ڕەشەکەی، کەوانی لێوەکانی، فورمی لووتی، سێبەری ژێر چەناکەی، چاوەکانی کە بۆ جێگایەکی تر ئەڕوانن وەک هەمیشەی "لالاحەوا" جێگایەک لەوپەڕی دونیا. دڵی وێنەگرەکە توند لێ ئەدات، هەموو جار ئەڵێی جاری یەکەمەکە ڕۆشنایی نیگای ئەوی بۆ لای خۆی ڕاکێشا بوو.

لە ڕستوورانی "گالێر" یان دوای ئەوەکە بە ڕێکەوت لە پلیکانەکانی شارە کۆنەکە پەیدای کردبووەوە. "لالا" تەنیا فورم و وێنەکەیی پێ ئەدا و هیچی تر. بڕێجار لەپی دەستی لێ ئەکەوێ، یان بروسکەی قژی لەگەڵ جەستەیدا و بۆنەکەی کە وەک بۆنی مێوەکان توند و تیژە، ئاهەنگی دەنگی، پێکەنینە زوڵاڵەکەی، بەڵام ئەو کێیە؟ ڕەنگە هەر خەونێکە بە ئامێرەکانی لە هۆڵی تاقیکردنەوە تاریک و لێڵەکەی ئەبینێ، زەرەبینەکانن کە تاریکی چاوەکانی و فورمی بزەکەی گەورە ئەکەنەوە؟

خەوێکە لەگەڵ مرۆڤەکانی تر ئەبینێ، لەسەر پەڕەی ڕۆژنامەکان و وێنە سەهۆڵ بەستووەکانی گۆڤارەکان؟

لەگەڵ خۆی بە فڕۆکە، "حەوا" بۆ پاریس ئەبات. بە تاکسی لە ژێر ئاسمانە ڕەنگ خۆڵەمێشیەکە، لە درێژایی چەمی "سێن"دا بەرەو ژوانی کارەکەیان ئەچن.

لەسەر لەنگەرەکانی چەمە قوڕاویەکە وێنە ئەگرێ، لە گۆڕەپانە گەورەکان، لە شەقامە بێبڕانەوەکان وێنە ئەگرێ بێ ئەوە روخسارە جوانە رەنگ مسینەکەی کە رووناکی وەک ئاو بەسەر روخساریدا ئەخزێ، ماندوو بێت. "حەوا" لە جلێکی ساتەنی رەشدا، "حەوا" لە پاڵتۆیەکی شینی تۆخدا و قژی کردووە بە پەلکەیەکی ئەستوور، هەرجار کە نیگای لەگەڵ بینایی "لالا" یەک ئەگرێ، دڵی ئەگووشرێ، هەر بۆ ئەوە بە پەلە دەست ئەکا بە وێنەگرتن، ئەرواتە بەرەوە، بۆ دواوە، ئامێرەکەی ئەگۆڕێ، جەستەی ئەخاتە سەر ئەژنۆ، "لالا" گاڵتەی پێ ئەکات : "ئەڵێی سەما ئەکەی".

ئەیەوێ تووڕە بێت، بەڵام ناتوانێ، تەوێڵی کە شەڵاڵی ئارەقە و کەوانی برۆکانی کە نووساوە بە ئامێری وێنەگرتنەکەدا پاک ئەکاتەوە.

لەپڕ لە مەیدانی رۆشناییەکە دەردەچی، چونکە ئیتر ماندوو بووە، مل ئەنێ و ئەڕوا،ئەویش، وێنەگرەکە، بۆ ئەوە هەست بە بۆشایی نەکـات، بـۆ مـاوەی چـەند سەعات لە تاریکی تاقیگەکە، کە خۆی لە حەمامی هوتێلەکە درووستی کردووە، چاو ئەبڕێتە ئەو.

چاوەڕوانە، بە ژماردنی خورپەی دڵی کاتێ روخسارە جوانەکەی لەناو تـەشتی تێزابەکەدا دەرئەکەوێ بە تایبەت نیگای، رووناکیەکی قووڵ کە لە چاوە تێرەکانیەوە هەڵئەقوڵی، رووناکیەک بە رەنگی تاریکی، دوورتر، ئەڵێی کەسێکی تر، نهێنیەک بەم گلێنانەوە ئەڕوانێ، لە بێدەنگیدا رای خۆی دەرئەبڕی، پاشان بە ئارامی وەک هەورێ کە درووست ئەبێ، دەرئەکەوێ، تەوێڵی، هێڵی گۆناقوتەکانی، خاڵی پێستە مسینەکەی کە "با" و هەتاو پڕتووکاندوویانە.

شتێکی نهێنی لەودایە کە بە رێکەوت لەسەر کاغەزەکە دەرئەکەوێ، شتێ کە ئەبینرێ بەڵام هەرگیز خۆی بە دەسەوە نادات، تەنانەت ئەگەر لە سات بە ساتی ژیانی تا سەرەمەرگی وێنە بگرێ. هەروەها بزەیەکی نەرمی بە گاڵتەوە کونجی لێوەکانی چاڵ کردووە، چاوە خێلەکانی تەنگ کردۆتەوە.

هەموو ئەمانەیە کە وێنەگرەکە ئەیەوێ وێنەیان بگرێ و پاشان لە تاریک و لێڵی

تاقیگەکەدا دیسان بیانهێنێتەوە دونیا.

بڕێجار هەست ئەکا بەڕاستی دەرئەکەوێ، بزەکەی ڕووناکی چاوەکانی، قەشەنگی هێڵەکانی ڕوومەتی، بەڵام هەر بۆ ساتێکی کورتە، لەسەر پەڕەی کاغەزی ناو تێزابەکە نەقشەکە ئەبزوێ، ئەگۆڕیەت، ئەشێوێ، تاریک ئەبێت، ئەڵێی وێنەکە نوقمی ئەکاتەوە.

ڕەنگە لە جێگایەکی دیکە بێ، جگە لە ناو وێنەکە ؟ ڕەنگە لە هەڵسوکەوت و لە بزاوت و جووڵانەوەکەیدا بێ؟

وێنەگرەکە بۆ "لالا" "حەوا" ئەڕوانێ، چۆنیەتی دانیشتنی، جووڵاندنەوەی دەستی، لەپی دەستی کراوەتەوە و شکڵی کەوانێکی تەواو لە دەمارەکانی ئەنیشکی تا نووکی قامکەکانی، بۆ هێڵی پشتە ملی ئەڕوانێ، پشتە نەرمەکەی، دەست و پێ درێژەکانی، شان و قژە زۆر ڕەشەکەی کە خۆڵەمێشی ئەنوێنێ و قورس کەوتوونەتە سەر شانەکانی.

بۆ "لالاحەوا" ئەڕوانێ، ئەڵێی بۆ ساتێ، سیمایەکی‌تر ئەبینێ، ڕوخساری لەڕاستای جەستەیەکی‌تردا، لە پشتەسەریدایە، بە ئەستەم ئەبینرێ، سووک، ڕێبوار، کەسەکەی‌تر لە قووڵاییدایە. پاشان نوقم ئەبێت و بیرەوەریەکی لەرزۆک بە جێ دێڵێ.

کێیە؟ کەسێکە کە ناوی "حەوا" یە، کێیە؟ لەڕاستیدا ناوی چیە؟

بڕێجار، "حەوا" بۆی ئەڕوانێ، یان بۆ خەڵکەکە ئەڕوانێ، لە ڕستوورانەکاندا، لە سالۆنی فرۆکەخانەکاندا، لە ئیدارەکاندا ، بۆیان ئەڕوانێ و ئەڵێی چاوەکانی ساکارانە، نوقمیان ئەکاتەوە، ئەیانباتەوە بۆ پووچی و نەمانێ کە هی ئەوانە.

کاتێ ئەو نیگا سەیرەی هەیە، وێنەگرەکە لەرز ئەیگرێ، ئەڵێی سەرما ناخی گرتووە، نازانێ چیە، ڕەنگە بوونەوەرێکی دیکە بێ لە "لالا"دا، کە دونیا بە چاوەکانی پێوانە ئەکات. ئەڵێی لەو ساتەدا، ئەو شارە زەبەلاحە، ئەو چەمە، ئەو گۆڕەپان و شەقامانە هەموو نوقم ئەبن و ئەو، پانتایی بیابان و لم و ئاسمان و "با" چاو ئەکات.

وێنەگرەکە "حەوا" بۆ جێگاگەلێ ئەبات کە لە بیابان ئەچن، بەردەڵانە گەورەکان، زەلکاوەکان، زەویە بایرەکان، لەتەنیشتیەوە لە ڕووناکی هەتاودا ڕێ ئەکات و نیگای وەک نیگای باڵندە نێچیرەکان ئاسۆ دائەماڵێ: بە دوای سێبەرێکدا، تارماییەکدا ، ماوەیەکی زۆر ئەڕوانێ، ئەڵێی بەڕاستی بەدوای کەسێکدا ئەگەڕێ، پاشان بێ جووڵە لە سێبەرەکەی ئەمێنێتەوە، لەکاتێکدا وێنەگرەکە دەست ئەکا بە وێنە گرتن.

بەدوای چیدا ئەگەڕێ؟ لە ژیان چی ئەوێ؟ وێنەگرەکە چاو ئەبڕێتە چاوەکانی و ڕوومەتی و هەست بە نیگەرانیەکی قووڵ لە دوای هێزی ڕۆشناییەکەیەوە ئەکات، هەروەها بێباوەڕی و سۆزی دەرباز بوون، ئەم چەشنە تیشکە کە جار جار لە چاوە وەحشیەکانیەوە ڕائەبوورێ. ڕۆژێ "لالا" بە نەرمی، لە مناڵەکەی ناو سکی قسەی بۆ کرد، منداڵێ کە سکی بەرز کردووەتەوە و مەمکەکانی ئاوساندووە.

- ڕۆژێ ئەڕۆم و نابێ هەوڵ بدەی بەرم بگری، چونکە بۆ هەمیشە ئەڕۆم.

ئەو پارەی ناوێ، سەرنجی ڕاناکێشێ، هەموو جارێ کە وێنەگرەکە پارەی ئەداتێ - پارەی ماوەیەک کەلە بەر ئامێری وێنەگرتنەکەدا ئەوەستێ - "حەوا" ئەسکەناسەکان ئەگرێ، یەک دوانێکیان لێ هەڵئەبژێرێ و باقیەکەی ئەداتەوە بە وێنەگرەکە. بڕێجار تەنانەت ئەو بە وێنەگرەکە پووڵ ئەدات، مشتێ ئەسکەناس و پارە وردە لە گیرفانی جلی کارەکەی دەردێنێ و پێی ئەدا. ئەڵێی پێی خۆش نیە هیچی بەلاوە بێت، یان لە شەقامەکانی شاردا، بە دوای سواڵکەرەکاندا لەکونجی دیوارەکاندا ئەگەڕێ و پارەیان ئەداتێ، یان قەرەجەکان کە ڕوویان داپۆشیوە و بە پێی پەتی لە شەقامەکاندا وێڵن، ژنە پیرە ڕەش پۆشەکان کە لەبەر دەرکی ئیدارەکاندا هەڵتروشکاون، وێڵگەردەکان کە لەسەر نیمکەتەکان ڕاکشاون، لە ناو گۆڕەپانەکاندا، پیرەکان کە سەرەتای شەو بەناو زبڵدانی دەوڵەمەندەکاندا ئەگەڕێن، هەموویان ئەیناسن، کاتێ ئەیبینن کە نزیک ئەبێتەوە، چاویان بەرق ئەداتەوە، وێڵگەردەکان وائەزانن خراپەکارە، چونکە هەر ژنە خراپەکان ئەونە پووڵیان پێ ئەدەن. گاڵتەی پێ

ئەکەن و ئەقلێنەوە، بەڵام لەهەر حاڵدا لە دیتنی شاد ئەبن.

ئێستا لە هەموو جێگایەکدا، باس باسی "حەوا" یە، لە پاریس رۆژنامە نووسەکان بۆ دیتنی دێن.

شەوێ ژنێ لە سالۆنی هوتێلەکە پرسیاری لێ ئەکات:

- هەموو باسی ئێوە ئەکەن، نهێنی "حەوا" ؟ "حەوا" کێیە؟

- ناوی من "حەوا" نیە، کاتێ لە دایک بووم، ناوم نەبوو، پێیان وتم "بلائیسم"* یانێ "بێ ناو".

- ئەی بۆ "حەوا" ؟

- ناوی دایکمە، ناوی من "حەوا" یە، کچی "حەوا" ، هەر ئەوە.

- خەڵکی کوێی؟

- وڵاتێک کە ناوی نیە، وەک خۆم.

- لە کوێیە؟

- شوێنێ کە هیچی نیە، کەسی نیە.

- بۆ لێرەی؟

- حەزم لە سەفەرە.

- لە ژیاندا حەز لە چی ئەکەیت؟

- لە ژیان.

- لە خواردندا؟

- مێوە.

- کام رەنگت پێ جوانە؟

- شین.

- کامە بەرد؟

---

*- Bla-Esm

- بەردەڵانی سەر جادە.

- ئەی مۆسیقا؟

- لای لایە.

- ئەڵێن شێعر ئەڵێی؟

- من سەوادم نیە.

- ئەی لە سینەما؟ یاریگەی سینەما بووی؟

- نە.

- ئەوین لای تۆ چیە؟

بەڵام لەپڕ "لالا" هەڵدێ، لێواولێو لە ئەوین، بێ ئەوە ئاوڕ بداتەوە، دەرگای هوتێلەکە ئەکاتەوەو، لە شەقامەکەدا بزر ئەبێ.

لە شەقام زۆر کەس ئەیناسنەوە، کچە لاوەکان کە وێنەیەکی پێ ئەدەن بۆیان ئیمزا بکات. بەڵام چونکە "حەوا" سەوادی نیە، تەنیا نیشانەی هۆزەکەی ئەکێشێتەوە، نیشانەیەک کە بەسەر وشتر و بزنەکانیاندا رەسمی ئەکەن، کەمێ لە دڵ ئەچێ. ♡

هەموو جێگایەک پڕە لە خەڵک، شەقامەکان، دووکانەکان، سەرجادەکان، خەڵکێکی زۆر کە پاڵ بە یەکەوە ئەنێن و بۆ یەک ئەڕوانن، بەڵام کاتێ بینایی "لالا" "حەوا" بەسەریانەوە ئەگرسێتەوە، ئەڵێی هەموو نوقم ئەبنەوە، کپ و خامۆش و چۆڵ ئەبنەوە.

"لالا حەوا" خێرا لەو جێگاگەلە تێئەپەڕێ، ئەیەوێ بزانێ لە دوای ئەوانەوە چیە. شەوێ وێنەگرەکە بۆ سالۆنێکی سەمای ئەبا بە ناوی "پالاس" یان "پارس - پالاس"، ئاوەها ناوێ. کراسێکی رەشی پشت ئاوەڵا لەبەر ئەکا، چونکە وێنەگرەکە ئەیەوێ وێنەی لێ بگرێ. ئەوەش جێگایەکە وەک مەیدانە گەورە چۆڵەکان کە تەنیا تارمایی خانووەکان و ماشینە وەستاوەکانی بەر هەتاوی تێدایە، جێگایەکی چۆڵ و سامناک کە ژن و پیاوەکان ئاپوورەیان داوە لە تاریکی خنکێنەری سالۆنەکەوە رووناکی گڵۆپەکان لە نێوان گەردەلوولی دووکەڵی جگەرەکان و دەنگە دەنگی

وەک هەورە تریشقەکە زەوی و دیوارەکان ئەلەرزێنێتەوە.

"لالا حەوا" لە کونجێکدا، لەسەر پلەیەکدا سەیریان ئەکات، کە سەما ئەکەن، سیمایان لە ئارەق ئەدرەوشێتەوە و جلە پڕ لە زرق و بریقەکانیان، بەرق ئەداتەوە. مۆسیقاژەنەکان لەوپەڕ سالۆنەکە، لەناو جۆرە ئەشکەوتێکدا، گیتارەکانیان ئەبزوێنن و بەسەر تەپڵەکاندا ئەکوتن، بەڵام ئەڵێی دەنگی مۆسیقاکان لەجێگایەکی ترەوە دێت، وەک قیرەی دێوەزمەکان.

پاشان ئەویش لەسەر تەختی سەماکە دەست پێ ئەکات، وەک چۆن جاران ئەیزانی، تەنیا لەبەر ئەوەی ناو خەڵکەکەدا، ترسەکەی بشارێتەوە، چونکە ئەویا سیخناخە لە دەنگ و رووناکی.

وێنەگرەکە لەسەر پلەکە بێ جوولە ماوەتەوە، بێ ئەوە تەنانەت بیر لە وێنەگرتن بکاتەوە. لەبەرا خەڵکەکە سەرنجی نادەن، رۆشناییەکە بە شەوارەی خستوون دوایی وەک بڵێی رووداوێکی سەیر رووی دابێت بێ‌ئەوە ساتێ رابمێنن، لە یەک جیا ئەبنەوە، یەک لە دوای یەک دەست لە سەما کردن هەڵئەگرن، بۆ سەیر کردنی "لالاحەوا". "لالا" لە نێوان بازنەی رووناکیەکە تەنیایە، کەس چاو ناکات، بە ئاهەنگی ئارامی مۆسیقا ئەلکتریکیەکە سەما ئەکات. ئەڵێی مۆسیقاکە لە ناخیدا، لەسەر پارچەی رەشی کراسەکەی، لەسەر پێستە مسینەکەی، لەسەر قژی ئەدرەوشێتەوە، سێبەرکەوتووەتە سەر چاوەکانی، بەڵام بینایی لە ئاستی سەر خەڵکەکە تێئەپەڕێ، سالۆنەکە پڕئەکاتەوە، بە هەموو هێز و تواناییەوە بە هەموو جوانیەکەیەوە.

"حەوا" پێخاوسە، لەسەر زەویە سافەکە سەما ئەکات، قاچە پان و سافەکەی بە ئاهەنگی تەپڵەکان لە زەویەکە ئەدەن، یان بەکوتانی قاچ و پاژنەکانی سەما ئەکات.

ئەوە، کە چۆنیەتی مۆسیقاکە ئەسەپێنێ، جەستە نەرمەکەی شەپۆل لێ ئەدات، شان و باسکە نەرمەکانی وەک باڵندە ئەکرێنەوە، تیشکی پرۆژکتۆرەکان ئەپرژێن بە سەریا، باوەشی پیا ئەکات، ئەبێ بە گەردەلوولێ لە دەور هەنگاوەکانیدا. لە ناو سالۆنەکەدا تەنیای تەنیایە، وەک لە ناو فەلاتێکی بەردیندا بێت، رۆشنایی گڵۆپەکان

ئەڵێی هەر بە بۆنەی ئەمەوە بە ئاهەنگە ئارام و سەنگینەکەیەوە، کایە ئەکەن.

وەک بڵێی هەموو ئەوانەی کە لە دەوروبەریدا بوون نەمابن، ژنەکان، پیاوەکان، تیشک دانەوەی کاتی ئاوێنە بریقەدارەکان. ئێستا ئەو ئیتر چاویان ناکات ئیتر گوێی لێیان نیە، تەنانەت وێنەگرەکە کە لە سەر پلەکە دانیشتووە نوقم بووە، وەک تاشە بەردیان لێ هاتووە، وەک لەتە ئاهەکیان لێ‌هاتووە.

ئەو ئەیەوێ ببزوێ، ئازادە، بەدەور خۆیدا ئەخولێتەوە، باڵەکانی بڵاو کردووەتەوە، پێ بە زەویدا ئەکوتێ، بە نووکی قامکی پێ، پاشان بە پاژنەی، ئەڵێی لەسەر هێڵی بازنەگەلێکی گەورەیە کە هێڵەکانی بە باڵای شەودا هەڵئەزنێن.

ئەو سەما ئەکات بۆ ئەوە بڕواتە دەرەوە، بۆ ئەوە نادیار بێت، بۆ ئەوە وەک باڵندەیەک باڵ گرێتەوە بەرەو هەورەکان بڕوات. لە ژێر قاچە رووتەکانیدا زەویە پلاستیکیەکە گڕی تێ بەربووە، بێدەنگ بووە، بەڕەنگی لمە، هەوا بە توندی "با"، بە دەور جەستەیدا سووڕ ئەخوا.

سەرگێژەی سەماکە، رۆشناییەکە دەرئەخا، ئێستا ئیتر رۆشناییە سارد و تیژەکەی پرۆژکتۆرە بچووکەکان نیە، بەڵکوو رۆشنایی جوانی هەتاوە، کاتێ زەوی و تاشە بەردەکان و تەنانەت ئاسمان سپی سپیە. مۆسیقا ئارام و سەنگینە ئەلەکتریکیەکەی گیتارەکان و ئورگ و تەپڵەکان ئەچێتە ناخیەوە، بەڵام ئەڵێی هەر نایبیسێ، مۆسیقاکە هێندە ئارام و قووڵە کە پێستە مسینەکەی، قژی و چاوەکانی دائەپۆشێ، مەستی سەماکە بەدەوریا بڵاو ئەبێتەوە، ژن و پیاوەکان دەست ئەکەنەوە بە سەما کردن، بە لاسایی کردنی یەکبەیەکی بزاوتەکانی "لالا". کەس نقەی لێوە نایەت، کەس هەناسە ناکێشێ، بە مەستیەوە چاوەڕوانن کە بزاوتەکانی سەماکە خۆی بێت و ئەوان لەگەڵ خۆی راکێشێ، وەک ئەستوونی هەڵمی ئاو کە لە ئاستی سەر دەریاوە ئەگەڕێن، قژە زۆرەکەی "حەوا" بەرز ئەبێتەوە و تێکڕا ئەکوترێتەوە بەسەر شانەکانیدا. دەستەکانی بە قامکە کراوەکانیەوە ئەلەرزن، قاچە رووتەکانی ژن و پیاوەکان بە ئاهەنگی توند بوونەوەی مۆسیقاکە، ئەکوترێ بەسەر زەویەکەدا کە ئێستا بووە بە شووشە.

ئێستا لە دەوروبەری "لالاحەوا" دا، پانتایی بێ برانەوەی تۆز و خۆڵ و بەردی سپیە، پانتایی زیندووی لم و خوێ، شەپۆلی تەپۆڵکە لمەکان وەک جاران، لە ئاخری کوێرە رێگای بزنەکاندا، لە شوێنێکدا کە هەموو شت ئەڵێی قوت وەستاوە، ئەڵێی لە ئاخری دونیادان، لە داوێنی ئاسمانن، لەبەردەم "با"دا.

وەک یەکەمین جار کە هەستی بە نیگای "ئیس سێر"کرد کەسێک کە پێی ئەڵێ "نهێنی"، ئەمجا لە ناو سەرگێژەکەیدا، لە کاتێکدا بێ وچان لاقەکانی بە دەوریدا ئەچەرخێن، تا دێت توند و توندتر دیسان دوای ماوەیەکی زۆر، نیگاکە بەرەو ئەم دێت و تاقی ئەکاتەوە.

لە ناوەڕاستی جێگاگەورە خاڵیەکە، دوور لە مرۆڤەکان کە سەما ئەکەن، دوور لە شارە تەماویەکان، نیگای "نهێنی" دێتە ناوی و دڵی ئەگرێ. رۆشناییەکە لەپڕ دەست ئەکا بە سووتاندن، کە ئەم هێزی بەرگری کردنی نیە. بە تەقینەوەیەکی سپی و ئاگرین کە شۆڵەکانی هەموو سالۆنەکە ئەگرێ، تروسکەیەک کە هەموو گڵۆپەکان و مەهتابیەکان تێک ئەشکێنێ، قامکی گیتار ژەنەکان بەسەر گیتارەکانەوە وشک ئەبێ، بڵندگۆکان ئەتەقینەوە.

"لالا" بەدەم خولاندنەوە وە بە ئارامی بەسەر خۆیدا ئەشکێتەوە، بەسەر زەویە شووشەییەکەدا ئەخزێ، وەک مانکەنێ کە جومگەی نەمابێ. ماوەیەکی زۆر هەروا لە سەر زەویەکە ئەمێنێتەوە قژی روخساری داپۆشیوە، بەر لەوە وێنەگرەکە لێی نزیک بێتەوە، لە کاتێکدا سەماکەرەکان لە یەک جیا ئەبنەوە، بێ ئەوە هێشتا بزانێ چی بەسەر هاتووە.

***

مەرگ هاتبوو، لە مەڕ و بزن و ئەسپەکانەوە دەستی پێ کردبوو، لە رۆخی چەمەکەدا کەوتبوون، سکیان ماسیبوو و دەست و پێیان بڵاوکردبووەوە، پاشان نۆبەی منالّ و پیرەکان بوو، دەستیان ئەکرد بە ورینە کردن و ئیتر توانای هەڵساندنەوەیان نەبوو. ژمارەی مردووەکان هێندە زۆر بوون ناچار بوون لە خوار چۆمەکەوە لەسەر تەپۆڵکەیەک خۆڵی سوور، گۆرستانێکیان بۆ بکەنەوە. دەمەو بەیانان ئەیان هێنان، بێ رەسم و یاسا، لە نێوان پەڕۆ کۆنەدا دایانئەپێچان و لە چاڵێکدا کە بە پەلە ئەیان‌کەند، ئەیان ناشتن. چەن بەردیان لەسەری دائەنا بۆ ئەوە سەگە وەحشیەکان دەریان نەهێنن. کاتێ مەرگ ئەهات "با"ی "شرجی" هەڵی ئەکرد. لە تاشەبەردەکانەوە ئەهات. مرۆڤەکانی لەناو لۆچە سووتێنەرەکانیدا دائەپۆشی، هەموو شێی زەوی هەڵئەمژی.

هەر رۆژ، "نوور" لەگەڵ منالّەکانی‌تر، لە رۆخی چەمەکەدا بەدوای "مێگو"دا ئەگەڕان. بە لق و دار داویان بۆ کەروێشک و مشکە سەحراییەکان درووست ئەکرد. بەڵام زۆربەی کات بەرلەوان رێویەکان خۆیان پێ ئەگەیاند. برسیەتی مرۆڤەکانی ئەڕزاند و منالّەکانی ئەمراند. لەو رۆژەوە کە گەیشتبوونە بەر شارە سوورەکە، خواردەمەنیان پێ نەگەشتبوو، ئازووخەکەشیان تەواو ببوو. هەر رۆژ شێخی گەورە

جەنگاوەرەکانی بۆ بەر دیوارەکانی شار ئەنارد، بۆ ئەوە جێ کشت و کاڵ و خواردن بۆ خەڵکەکەی داواکات، بەڵام گەورەکانی شار هەرجار بەڵێنیان ئەدا و هیچیان نەئەنارد. ئەیانوت کە خۆیشیان زۆر نەدار و دەستکورتن. باران نەباریبوو، زەوی وشک هەڵهاتبوو، زەخیرەی ماڵەکان کۆتایی هاتبوو و برێجار شێخی گەورە و کورەکانی تا لای خاکرێژەکان ئەچوون بۆ داواکردنی زەوی و تۆو بەشێ لە دارستانی خورماکە. بەڵام ئەوان ئەیانوت کە بۆ خۆشیان زەوی بەش ناکات. لەسەر چۆمەکەوە تا دەریا، زەویە بە کەڵک هاتووەکانیان داگیر کرابوون، سەربازە مەسیحیەکان زۆربەی کات ئەهاتن بۆ ناوشاری ئاگادیر و بەشی زۆری داهاتی زەویەکان هی ئەوان بوو. هەرجار "مائەلعەینەین" بێ ئەوە ورتەی لێوە بێت، گوێی لە وەڵامی پیاو چاکان ئەگرت. پاشان ئەگەرایەوە ژێر رەشماڵەکەی، لە رۆخی چەمەکەدا. بەڵام ئیتر توورەیی و بێ ئۆقرەیی نەبوو کە لە دڵیدا پەرەی ئەسەند. هەر رۆژ لەگەڵ هاتنی مەرگدا و "با"ی سووتێنەری بیابان، نائومێدی بوو کە لەگەڵ خەڵکەکەدا بەشی ئەکرد و شەریک ئەبوون. ئەویش وەک خەڵکە سەرگەردانەکەی درێژای چۆڵی رۆخی چەمەکە، کە هەڵتروشکاو لە سێبەری کەپرەکانیاندا، بەڕاشکاوی سزاکەیان ئەبینی.

ئەو زەویە سوورانە، ئەو کێڵگە وشک هەڵاتووانە، باریکە رێگا تەخت کراوانە کە زەیتوون و پرتەقاڵیان تیایدا چاندووە و دارستانە تاریکەکانی خورما، هەموو ئەمانە نامۆ بوون و وەک سەراوێ دوور. گەرچی نائومێدی بەرۆکی گرتبوون، لارداف و سەعد بوو ئەیانویست هێرش بەرنە سەر شارەکە. بەڵام شێخ ئامادەی ئەو توورەیی و زبریە نەبوو . پیاوە شینەکانی بیابان ئێستا گەلێ ماندوو بوون، ماوەیەکی زۆر بوو بێ خواردن و خواردنەوە رێیان بڕیبوو. زۆربەی جەنگاوەرەکان تووشی یاو ببوون، نەخۆشینی "ستوربوت" قاچیانی تووشی زامی چڵکی کردبوو، تەنانەت چەکەکانیان ئیتر بە کەڵک نەئەهات. خەڵکی شار گومانی خراپیان لە پیاوەکانی بیابان ئەبرد. دەرگاکانی شار هەروا تەواوی کات نەئەکرانەوە، هەموو ئەوانەی خۆیان خستبووە مەترسیەوە و لە خاکرێژەکان نزیک ببوونەوە، تەقەیان لێ کرابوو و ئەوە ئاگاداریەک

بوو.

پاشان کاتێ تێ گەیشت کە ئیتر هیچ ئومێدێکیان نەماوە کە هەموو یەک لە دوای یەک لە ڕۆخی سووتاوی چەمەکە لەبەر خاکرێژی شارە بێ بەزەییەکە، ئەمرن.

"مائەلعەینەین" فەرمانی ڕێکەوتنی بەرەو باکووردا. ئەمجارە نە نوێژ بوو نە ئاواز و نە سەما، وەک ئاژەڵی نەخۆش کە ئەندامەکانیان بڵاوئەکەنەوە و دیسان بە تلاوتل هەڵئەسنەوە، پیاوە شینەکان بە ئارامی ڕۆخی چۆمەکەیان بە جێ هێشت و بەرەو نادیار ڕێکەوتن.

دەستەی جەنگاوەرانی شێخ وەک جاران نەبوون، لەگەڵ کاروانی مرۆڤ و ئاژەڵەکان ئەچوونە پێش، وەکوو ئەوان لە پێ کەوتبوون، جل و بەرگیان شڕ ببوو، چاوە یاو کردووەکانیان پووچ ببووەوە، وەک بڵێی ئیتر باوەڕیان بە هۆوسۆنگەی ئەم ڕێپێوانە بێبڕانەوە نەماوە و تەنیا بە پێی عادەت بە هەموو هێزیانەوە ڕێیان ئەبڕی، هەرسات خەریک بوو بکەون، ژنەکان چەمابوونەوە و ئەچوونە پێش، ڕوخساریان بە دەمامکەکانیان داپۆشیبوو، زۆربەیان ئیتر منداڵەکانیان پێ نەبوو، چونکە لە زەویە سوورەکەی دۆڵی "سوس" مابوونەوە. لە دوای کاروانەکەوە هەموو دۆڵەکەیان گرتبوو، منداڵەکان، پیرەکان و جەنگاوەرە بریندارەکان بە ئارامی ملیان نابوو. "نوور"یش لەناو ئەواندا بوو، دەستی جەنگاوەرە کوێرەکەی گرتبوو، تەنانەت نەیئەزانی کەس‌وکارەکەی لەکوێن؟ لە جێگایەکدا لەناو گەردەلوولی تەپ‌وتۆزەکە نوقم ببوون.

تەنیا چەن جەنگاوەر هێشتا ئەسپەکانیان مابوو، شێخی گەورە لە نێوانیاندا بەسەر وشترەکەیەوە خۆی لە پاڵتۆکەی داپێچابوو، کەس ورتەی لێوە نەئەهات، بە ڕوخساری ڕەشی هەڵگەڕاوە، هەرکەسە بۆ خۆی ملی ڕێگای گرتبووە بەر. بە چاوەیاو کردووەکانیان ماقی خاکی سووری تەپۆڵکەکان ببوون.بەرەو ڕۆژهەڵات ملیان نابوو، بە هیوای پەیدا کردنی ڕێگایەک لە نێوان کێوەکانەوە، بۆ گەیشتن بە شاری پیرۆزی "مەراکیش".

لەژێر تینی سووتێنەری رۆژدا رێیان ئەبری، سەر و ملیانی ئەسووتاندەوە، ئازارێکی لە هەموو ئەندامانی جەستەیاندا بڵاو ئەکردەوە و تا ناخی جەستە ئەیسووتاندن. ئیتر ویزەویزی "با" و دەنگی هەنگاوی مرۆڤەکان کە بیابانیان ئەساویەوە نەیاندەبیست، تەنیا ترپەی دڵ و دەمارەکانیان ئەبیست، دەنگی ئازارێ کە لە پشت پەرەی گوێیاندا فیکەی ئەکێشا.

"نوور" ئیتر هەستی بە دەستە گرێدراوەکانی شەرکەرە کوێرەکە نەئەکرد، تەنیا رێی ئەبری، بێ ئەوە بزانێ بۆ. بێ ئەوە ئومێدی بە وەستانیان بێت، رەنگە رۆژێک کە دایک و باوکی بریاری بە جێ هێشتنی ئوردووگاکەی باشووریان دابوو، بەسەریاندا سەپێنرا بوو کە تا هەتا هەتایە وێڵ و سەرگەردان بمێننەوە لە درێژایی دۆڵە وشک هەڵاتووەکاندا، لەم چەم بۆ ئەو چاڵ برۆن.

بەڵام ئایا لە دونیادا جگە لەم زەویانە کە تا ئەوپەری دونیا درێژەیان هەیە، کە بە تەپ و تۆز لەگەڵ ئاسمان تێکەڵاو بوون، ئیتر زەویەکی دیکە نیە؟ جگە کێوە بێ سێبەرەکان، چۆمە بێ ئاوەکان و دەوەنە دڕکاویەکان کە زامێکی بچووک ئەبوو بە هۆی مردن؟

هەر رۆژ لەدوورەوە لە داوێنی تەپۆڵکەکان، نزیک چاوانەی ئاوەکان، خانووە تازەکانیان ئەدی، قەڵا سوورە گڵێنەکان، کە کێڵگە و دارستانی خورماکان دەوریان گرتبوون، بەڵام ئەوان، ئەوانیانە وەک سەراوگەلێک ئەدی کە لە هاڵاوی گەرمی هەوادا ئەلەرزین و دوور و دەستنەکەوتوو بوون. گوند نشینەکان خۆیانیان دەرنەئەخست، هەڵهاتبوون بۆ کێوەکان، یان لە پشت خاکرێژەکان خۆیان داشاردبوو و ئامادەی شەر لەگەڵ پیاوە شینەکانی بیابان بوون. لەبەر کاروانەکەوە، کورەکانی "مائەلعەینەین" بەسەر ئەسپەکانیانەوە، لە رێگای تەنگی دۆڵەکە و کێوەکاندا سەر ئەکەوتن.

- جادەکەیە... جادەکەی باکوور.

دوای چەندین رۆژ لە کێوەکان تێپەرین، "با"یەکی داخ لە کەناوەکان هەڵی

کردبوو، ئاسمانە شینەکەی سەر تاشەبەردە سوورەکان، پان و بەرین بوو. کەس لەوێدا نەبوو، نە مرۆڤ، نە حەیوان، تەنیا جاربەجارێ، ئاسەواری خزینی مارێ لەناو لمەکە یان سێبەری داڵێ بە تاقی ئاسمانەوە بوو، بێ ئەوە بەدوای ژیاندا بن. بێ نیشانەیەک لە هیوا و ئومێد ئەچوونە پێش، وەک کوێر، پیاو و ژن یەک لە دوای یەک کەوتبوونە شوێن یەک. پێیان لەسەر جێپێی پێشووەکان دائەناکە لەگەڵ جێ سمی ئاژەڵەکان تێکەڵاو ببوو. کێیە ئەیانبات؟ ڕێگاکە لە درێژای کەناوە پێچاوپلووچەکە، کە لە کارێزەکان تێئەپەڕی، لەگەڵ سێلاوگە وشکەکە یەکیان ئەگرتەوە.

مسافرەکان گەشتنە قەراخ چەمە وەرزیەکەی "ئیسێن" کە بەفراو زۆری کردبووەوە، ئاوێکی جوان و خاوێن کە لە نێوان قەراخە وشکەکەوە، هەڵئەقوڵی، بەڵام ئەوان بێ سۆز و شادمانی بۆیان ئەڕوانی چونکە ئەو ئاوە هی ئەوان نەبوو و نەیانئەتوانی لێی هەڵگرن. بۆ ماوەی چەندین ڕۆژ لە قەراخ چەمە وەرزیەکە مانەوە، لە کاتێکدا جەنگاوەرانی شێخ لەگەڵ لارداف و سەعدبوو لە ڕێگای "شیشائوا" سەرئەکەوتن.

- گەیشتووین؟ ئەمە سەرزەوەیەکەی ئێمەیە؟

جەنگاوەرە کوێرەکە هەمیشە ئەم پرسیارەی ئەکرد.

ئاوی ساردی چەمەکە وەک تاڤگە بەسەر تاشەبەردەکاندا ئەڕژایە خوارەوە و ڕێگاکەی دژوار کردبوو. کاروانەکە گەیشتە بەرگوندێکی "شلۆ" لە قووڵایی دۆڵەکە، جەنگاوەرانی شێخ لەوێ چاوەڕوانیان بوون. ڕەشماڵە گەورەکەیان دامەزراندبوو و شێخەکانی کێوسان لەبەر پێی "مائەلعەینەین"، بزنیان قوربانی کردبوو، گوندی "ئاگلاگلا" بوو لە بناری کێوێکی بەرزدا، بیابانیەکان بێ ئەوە داوای شتێکیان لێ بکەن لە نزیک دیوارەکانی گونددا جێگیر ببون، شەو منداڵەکانی گوند هاتبوون، گۆشتی برژاو و شیری دەڵەمەیان بۆ هێنابوون، ئەوانیش دوای ماوەیەکی زۆر تێر سکیان خواردبوو. پاشان لەبەر سەرمای شەو، لە لق و گەڵای سدر، ئاگرێکی گەورەیان داگرساندبوو. "نوور" ماوەیەکی زۆر سەیری سەمای شۆڵەکانی لەو شەوە ئەنگوستە

چاوەدا کردبوو. دەنگی ئاوازێکیش ئەهات، مۆسیقایەکی سەیر، ئەتوت هەرگیز نەیبیستووە، خەمگین و ئارام لەگەڵ دەنگی شمشاڵ تێکەڵاو ببوو.

ژن و پیاوەکانی گوند بۆ خۆش بوونەوەی نەخۆشینەکانیان داوای تەبەرکیان لە "مائەلعەینەین" کردبوو. ئێستا مسافرەکان لە لێژایی کێوەکە بەرەو شارە پیرۆزەکەدا ئەگەڕان، رەنگە لەوێ دەرد و ئازاری بیابانیەکان، کۆتایی پێ بێت. هەروا کە جەنگاوەرە شینەکان وتبوویان، چونکە لە مەراکیش مەولای "حەفید"، رێبەری موسڵمانان، چواردە ساڵ پێشتر پەیمان و بەڵێنی لەگەڵ "مائەلعەینەین" بەستبوو، پادشا زەویەکی لێرە بە شێخ دابوو بۆ ئەوەی بتوانێ فێرگەی "گودفیا"یەکان بکاتەوە. لە شارە پیرۆزەکەدا کوڕە گەورەکەی "مائەلعەینەین" بەتەمای گەیشتنی باوکی بوو بۆ شەڕی پیرۆز.

هەموو رێزیان لە مەولای هیبا ئەگرت، کەسێکە پێیان ئەوت، "دێهیبا"، پارچەی زێڕ، مەولای سەبا، "شێر"، چونکە بۆ پاشایەتی زەویەکانی باشوور هەڵبژێردرابوو.

شەو، کاتێ کاروانەکە وەستا، ئاگرەکان داگرسان. "نوور" جەنگاوەرە کوێرەکەی بۆلای سەربازەکانی "مائەلعەینەین" برد و گوێیان لە بەسەرهاتوو و رووداوەکانیان ئەگرت. کاتێ شێخی گەورە و کوڕەکانی لەگەڵ جەنگاوەرانی بیابان بەسەر وشترە چالاکەکانەوە هاتبوون و چۆن چووبوونە ناو شارە پیرۆزەکە و پادشا لەگەڵ دوو کوڕی "مائەلعەینەین"، مەولای سەبا، شێر و "محەممەد ئەششەمس"، "هەتاو" پێشوازی لێ کردبوون.

هەروەها ئەیانگێڕایەوە کە پادشا چەنێ نەزر و قوربانی کردبوو بۆ ئەوە شێخ بتوانێ خاکرێژی شاری "سمارا" درووست بکات؛ سەفەرەکانیان لەگەڵ گەلەی وشترەکان ئەگێڕایەوە کە هێندە زۆر بوون هەمووی دەشتەکەیان داگرتبوو. لەکاتێکدا ژن و مناڵ و خۆراک و ئازووخەکان بە کەشتی گەورەی بوخاری "باشیر"، چەندین شەو و رۆژ لە "موگادار" تا "مارساتارفایار" بەرێوە بوون.

بە دەنگە ئاهەنگینەکەیانەوە، ئەفسانەکانی "مائەلعەینەین"یان ئەگێڕایەوە، وەک

خەویّ کە زووتر دیبێتیان. دەنگی جەنگاوەرەکان لەگەڵ قرچە قرچی پزیسکی ئاگرەکە تێکەڵ ببوو، "نوور" جار جار تارمایی ناسکی پیرپیاوەکەی وەک شۆڵەیەک لە ئوردووگاکە، لە لابەلای ئەستونی دوکەڵەکاندا ئەبینی.

"شێخی گەورە، زۆر دوور لە وڵاتی "حودە" لە دایک بووە. باوکی کوڕی مەولای ئیدریس بوو و دایکی سەیدی پێغەمبەر بووە، کاتێ شێخ لە دایک ئەبێت ناوی ئەنێن "ئەحمەد" بەڵام دایکی پێی ئەڵێ "مائەلعەینەین"، ئاوی چاوەکان، چونکە لەکاتێکدا لە دایک ببوو ئەو لەشادمانیدا گریابوو. "نوور" لە تەنیشت جەنگاوەرە کوێرەکەوە سەری لەسەر بەردێ نابوو و گوێی گرتبوو. لە تەمەنی حەوت ساڵاندا، قورئانی بێ هەڵە لەبەر کردووە، پاشان باوکی، "محەممەد ئەلفازل" ناردوویە بۆ شاری پیرۆزی مەککە، لە ڕێگادا مناڵەکە پەرجۆی کردبوو، ئەیتوانی نەخۆش چاک کاتەوە و ئەو کەسانەی داوای ئاویان لێ ئەکرد، ئەیوت ئاسمان ئاوت پێ ئەدا و خێرا باران بە خورەم دایئەکرد. جەنگاوەرە کوێرەکە سەری ئەلەقاند، ئەتوت خەریکە وتەکان بە ئاهەنگەوە ئەڵێتەوە. "نوور"یش هێدی هێدی خەریک بوو خەوی لێ ئەکەوت.

پاشان خەڵک لە هەموو لایەکەوە بۆ دیتنی منداڵێ کە پەرجۆی ئەکرد، ئەهاتن. مناڵەکە کوڕی "محەممەد ئەلفازل"ی گەورە و کوڕی "مامینا" بوو. کەمێ ئاوی دەمی ئەنایە سەر چاوی نەخۆشەکە و فووی لێ ئەکرد و نەخۆشەکە خێرا هەڵئەسایەوە و دەستی منداڵەکەی ئەگرت."

"نوور" هەستی ئەکرد جەستەی جەنگاوەرە کوێرەکە بەدەم ڕاوەشاندنی ئارامی سەری بەسەر شانەکانیەوە، ئەلەرزێ. دەنگی بێ گۆڕانی چیرۆک بێژەکە و لەرینەوەی شۆڵە و دووکەڵەکان، تەنانەت ئەتوت زەوی بە ئاهەنگی دەنگەکەوە ئەبزوێ.

"شێخی گەورە لە شاری پیرۆزی "شاگێتی" لە چاڵی "نەزەران"، نزیکی "ئیدا داخلا"، بۆ دەرس وتنەوە مابووەوە، چونکە ئەستێرەناسی و بیرکاری و ڕاڤەکردنی ئەزانی، بیابانیەکان کە ببوونە قوتابی ئەو، پێیان ئەوت "باریک ئەللە" کەسێکە خوا پیرۆزی کردووە."

دەنگی بێ گۆڕانی جەنگاوەرە شینەکە، لە تاریکی شەودا بێوچان ئەهات، لەبەر شۆڵەکاندا کە هەڵئەکشان و سەمایان ئەکرد و دووکەڵەکەی پیاوەکانی ئابلۆقە ئەدا و ئەیخستنە قۆزە قۆز. "نوور"گوێی لە چیرۆکی پەرجوەکان گرتبوو، کانیەکان لە بیابان هەڵئەقوڵین، باران زەویە بایرەکانی داپۆشاند، وتەکانی شێخی گەورە بۆ خەڵک، لە گۆرەپانی "شاگێتی" یان لەبەر ماڵەکەی، لە نەزەران، گوێی لە رێپێوانە ماوەدارەکەی "مائەلعەینەین"، لە بیابانەوە تا "سمارا"گرتبوو. لە زەویە پڕ درکەکە، لەویاکە شێخی گەورە، شارەکەی بەنا کردبوو، گوێی لە ئەفسانەی شەڕەکانیان لە بەرانبەر ئیسپانیۆلیەکان لە "ئەلعیون" "بیفنی"، لە "تیزنی"، لەگەڵ کوڕەکانی "رۆبۆ"، "تالیب"، "لارداف"، "ئە ششەمس"، کەسێ کە پێیان ئەوت مەولای "سەبا"، "شێر".

بەم شێوە، هەرشەو هەر ئەو دەنگە ئاهەنگینە، بێوچان چیرۆکی ئەگێڕایەوە، "نوور" لە بیری ئەچووەوە کە لە کوێیە، ئەتوت چیرۆکی ئەمە کە پیاوە شینەکە ئەیگێڕێتەوە. لەوبەر کێوەکانەوە، هاتبوونە دەشتە هەراوە سوورەکە، بەرەو باکوور، گوند بۆ گوند رۆشتبوون، لەهەر گوندێکدا پیاوەکان بە نیگا تاودارەکانیانەوە و ژنەکان و مناڵەکان ئەکەوتنە تەکیان، جێگای ئەو کەسانەی کە مردبوون، پڕیان ئەکردەوە، شێخی گەورە بەسەر وشترەکەیەوە، لەپێش هەموویانەوە بوو. کوڕەکانی و جەنگاوەرەکانی دەوریان گرتبوو، "نوور"لە دوورەوە گەردەلوولی تەپ و تۆزەکەی ئەبینی کە ئەتوت خەریکە رێنوێنیان ئەکات. کاتێ گەیشتنە بەر شاری گەورەی مەراکش، زاتیان نەبوو نزیک بینەوە، ئوردووگاکەیان لە نزیک چەمە وشک بووەکە لە باشوور هەڵکردبوو، بۆ ماوەی دوو رۆژ پیاوە شینەکان بێ جووڵە لەژێر کەپرەکان و لەناو کۆڵیتەکانیاندا کە بە لق و پۆپی درەخت سازیان کردبوو، مابوونەوە، "با"ی گەرمی هاوین لە تەپ و تۆز داپۆشیبوون.

بەڵام ئەوان چاوەڕوان بوون و هەموو هێز و وزەیان لە پێناوی چاوەڕوانیەکەیان دانابوو. سێهەمین رۆژ، کوڕەکانی "مائەلعەینەین "گەڕابوونەوە، پیاوێکی کەڵەگەت کە جل و بەرگێکی وەک جەنگاوەرانی باکووری لەبەر کردبوو، لەگەڵیان بوو، ناوەکەی

دەمبەدەم بڵاو ببووەوە، "مەولای هیبا"کە پێیان ئەوت "مـەولای دیـهبا" "پـارچـەی زێر"، مەولای سەبا.

کاتێ جـەنگاوەرە کـوێرەکـە نـاوی بـیستبوو، دەسـتی کـردبوو بـە لەرزیـن، فرمێسکەکان لە چاوە سووتاوەکانیەوە بە خوڕ ئەتکایە خوارەوە. دوو دەسـتی بـڵاو کردبووەوە و بە قیرە قیڕ دەستی کرد بە هەڵهاتن، جۆرە ناڵە و نرکەیەک کە پەردەی گوێی ئەدراند. "نوور" هەوڵی ئەدا بیگرێ، بەڵام کوێرەکە بە هەموو هـێزیەوە رای ئەکرد، هەڵئەکەوت بەسەر بەردەکاندا، بەسەر دڕکە جارەکەدا بە تلاوتل ئەڕۆشت.

خەڵکەکە خۆیان لەبەریا لائەدا، تەنانەت بڕێکیان رێگایان دوور ئەکـردەوە و وایانئەزانی کوێرەکە شـێت بـووە. ئـەتوت شـادمانی و ئـازارێکـی نـائاسایی تـێکی شکاندووە، چەن جار لە ریشەی دار و لە بەرد هەڵئەکـەوت، بـەڵام هـەرجـار خـێرا هەڵئەسایەوە و دەستی ئەکردەوە بە راکردن بەرەو جێگایەک کە "مـائەلعەینەین" و مەولای هیبای لێ بوو، بێ ئەوە بتوانێ بیانبینێ. "نوور" خۆی پێ گـەیاند و بـاسکی گرت، بەڵام پیاوەکە بە قیرەقیڕ دەستی کردەوە بە هەڵهاتن و "نوور"یشی لەگەڵ خۆی کێش ئەکرد. لە هێڵێکی راستدا هەڵئەهات، ئـەتوت "مـائەلعەینەین" و کـورەکـەی ئەبینێ. جەنگاوەرانی شێخ بە ترسەوە چەکەکانیان توند لە دەستیاندا گرتبوو، بۆ ئەوە لە نزیک بوونەوەی بەرگری کەن. بەڵام شێخ وتی کە وێڵیان کـەن. پـاشان لەسـەر وشترەکەی دابەزی و لە جەنگاوەرە کوێرەکە نزیک کەوتەوە.

- چیت ئەوێ؟

جەنگاوەرەکە خۆی دا بە زەویدا، دوو دەستی بڵاو کردەوە، هەنسکە هەنسک جەستەی ئەشەکاندەوە و دەنگی دەر نەئەهات، تەنیا ویزە و نرکەیەک لە گەروویەوە دەرئەپەڕی.

"نوور"کەوتە قسە:

- شای مەزن، بینایی پێ بەرەوە.

"مائەلعەینەین" ماوەیەکی زۆر بـۆ پـیاوە راکشـاوەکـەی سـەر زەوی ڕوانـی،

جەستەی بەدەم هەنسکەوە هەڵئەتەکایەوە، ڕێگاکە جلە شڕەکانی و دەست وپێی خوێناوی کردبوو، کوڕە شینەکان، کوڕەکانی شێخ، هێشتا وەستابوون. بێدەنگیەکە گەلێ گەورە بوو، "نوور" هەستی بە سەرگێژە و بۆشاییەک ئەکرد. هێزێکی سەیر و نەناسراو لە زەویە خۆڵاویەکەوە هەڵئەقوڵا و پیاوەکانی لە گەردەلوولێکدا ئابلۆقە دابوو، وەک بڵێی تیشک و ڕۆشنایی هەتاو ڕووی لە داچوون بێ، یان وزەی نیگایەک کە لە جێگایەکدا گرسابێتەوە و وەک ئاوێکی دیل کراو ئەیویست هەڵبێ. جەنگاوەرە کوێرەکە بە ئارامی هەڵسایەوە سەرپێ، ڕوخساری لەبەر ڕووناکیەکەدا دەرکەوت، لم و فرمێسک لەکەداریان کردبوو ، شێخ بە سووچێکی عابا شینە ئاسمانیەکەی ڕوخساری پیاوەکەی پاک کردەوە، ئەمجا دەستی هێنا بەسەر تەوێڵ و پێڵوە سووتاوەکانیدا، وەک ئەوەی بیەوێ پاکی کاتەوە، سەر قامکەکانی بە ئاوی دەمی تەڕ کرد و هێنای بەسەر پێڵوی کوێرەکەدا و بە ئارامی فووی کرد بە ڕوومەتیا، بێ ئەوە ورتەی لێوە بێت، بێدەنگیەکە گەلێ درێژەی کێشابوو و نوور لە بیری چوبووەوە کە چی ڕووی‌داوە و چی وتووە. لە تەنیشت شێخەوە چۆکی دادابوو و چاوی بڕیبووە جەنگاوەرە کوێرەکە کە لە ڕوخساریدا ڕووناکیەکی نوێی ئەبینی و ئەتوت تا دێت هەر گەورە ئەبێتەوە. پیاوەکە ئیتر نەیئەناڵاند، بێ جووڵە لەبەرانبەر شێخدا مابووەوە. دوو دەستی کەمێ بڵاو کردبووە و چاوە بریندارەکانی زاق کردبۆوە. ئەتوت نیگای شێخ خەوێکە مەستی ئەکات. پاشان کوڕەکانی "مائەلعەینەین" هاتن، مەولای "هیبا"یش لێیان نزیک بووەوە. یارمەتی پیاوە پیرەکەیان دا کە هەڵسێتەوە. "نوور" بە ئەسپایی باسکی جەنگاوەرەکەی گرت و بەرزی کردەوە. پیاوەکە پاڵی دایەوە بە شانی کوڕە لاوەکەوە و ڕێکەوت. تیشکی ڕۆژئاوا بەسەر ڕوخساریەوە وەک گەردی زێڕ ئەدرەوشایەوە و ورتەی لێوە نەئەهات. بە ئارامی هەنگاوی هەڵئەگرت، ئەتوت دوای ماوەیەکی زۆر، لە نەخۆشین ڕزگاری بووە. تەختی قاچی لەسەر بەردەڵانەکە دائەنا، کەمێ تلاوتلی پێ کەوتبوو، بەڵام باڵی ئیتر بڵاو نەکردبووەوە و ئیتر هەستی بە ئازار لە جەستەیدا نەئەکرد. خەڵکی بیابان مات و

خامۆش و بێ جووڵە چاویان تێبڕیبوو کە بەرەو ئەوپەڕی دەشتەکە ملی نابوو و ئازارەکانی جەستەی ڕەوییوونەوە و ئێستا ڕوخساری هێمن و ئارام بوو، و بینایی پڕ لە ڕووناکی زێڕینی هەتاو بوو کە بەرەو ئاسۆ ئەکشا. دەستی بەسەر شانی "نوور"ەوە سووک ببوو، وەک دەستی کەسێک کە ئەزانێ ڕووەو کوێ ئەڕوا.

# چەمی وەرزی "تادلا"، ١٨ژوەنی ١٩١٠

سەربازەکان لە "زێتات" و "بێن ئەحمەد" بەرلە کازیوە تێپەڕیبوون، ژنەراڵ "موانیەر" فەرماندەی پەلی پارتی "بێنئەحمەد"، دوو هەزار چەکدار کە چەکی "لێبێل"یان پێبوو. کاروانەکە بەسەر دەشتە سووتاوەکەوە بەلای دۆڵی چەمی "تادلاوە" ئەچوونە پێش، سەرۆکی پەلەکە ژنەراڵ "موانیەر" بوو.

دوو ئەفسەری فەرەنسەوی و دیدەبانێکی مەدەنی و بەڵەدێکی مەراکشیان لەگەڵ بوو کە جلەکانی وەک جەنگاوەرانی باشوور بوو و وەک ئەفسەرەکان بەسەر ئەسپەوە بوو.

هەر ئەو ڕۆژە، پەلێکی تر کە تەنیا پانسەدکەس بوون، شاری "زێتات"یان بە جێ هێشتبوو بۆ درووست کردنی لقەکەی تری پلاسیەکە، بۆ گرتنی یاخیەکانی "مائەلعەینەین"کە بەرەو باکوور ئەچوون. لەپێش سەربازەکانەوە، تا چاو بڕی ئەکرد، زەویەکی رووت ڕاخرا بوو،زەویەکی ئاجۆری ڕەنگ سوور و خۆڵەمێشی، لە ژێر ئاسمانی شیندا ئەدرەوشایەوە. "با"ی ئاگرینی هاوین هەڵیکردبوو، تەپ و تۆزی هەڵئەبەزاندەوە و وەک تەم و مژ ڕووناکیەکەی دائەپۆشاند.

کەس ورتەی لێوە نەئەهات، ئەفسەرەکان، لە پێشەوە، لە ئەسپەکانیان ئەخوڕین بۆ ئەوەی لە باقی دەستەکە جیا ببنەوە، بەڵکوو کەمێ خۆیان لە گەردەلوولی تەپ و تۆزە خنکێنەرەکە دوور کەنەوە. چاوەڕوانی ئاسۆ بوون بۆ دیتنی ئەو شتانەی لەویایە، ئاو، گوندە گڵینەکان یان دوژمنەکانیان. ماوەیەکی زۆر بوو ژنەراڵ "موانیەر" بەتەمای

ئەم ساتە بوو، هەرجار کە لە باشوور، لە بیابان ئەدوان، بیری لە "مائەلعەینەین"ی مێشک وشک و نەساچاو ئەکردەوە. پیاوێ کە سوێندی خواردبوو هەموو مەسیحیەکانی سەرزەوینی بیابان دەربکات، سەرکەردەی هەموو یاخیەکان بکوژێ؛ حاکمی "کوپۆلانی".

"گرینگ نیە ". سەرگورد وتی بە "کازا"، بە "فورت ترانکیت"بە "فورت گورۆد"، «مێشک وشک جۆرە جانەوەرێکە، باران هێنەرێکە کە هەموو شرپۆشەکانی "درا" و "تاندۆف" و هەموو رەش پێستەکانی "موریتانی"کەوتوونەتە دوای.»

بەڵام دەستیان بە پیاوە پیرەکە نەئەگەیشت، هەواڵیان پێ گەیشت کە لە نزیکی شوێنی پشکنینی بیابان بینراوە، بەڵام کاتێ چوو بوون، نوقم ببوو، دیسان جارێکیتر لە رۆخی دەریا باسیان ئەکرد لە "ریودۆ ئورۆ"، لە "ئیفنی".

شتێکی ئاسایی بوو کە زۆرێ لە ئیسپانیۆلیەکان لایەنگری بوون. چیان لەدەست دێت، لەوێ لە "ئەلعیون"، لە "تارفایا"، لە کەپکی "ژوبی"؟

بزاوتەکەی دەستی پێ کردووە، شێخە پیرەکە وەک رێوی فێڵبازە، لەگەڵ جەنگاوەرەکانی گەڕانەوە بۆ سەر زەویەکەیان لە باشووری "درا" لە "ساگیت ئەلحەمرا" بۆ ناو قەڵاکەی لە "سمارا". هەرگیز نەیاندەتوانی لەوێ دەری پەڕێنن و ئەو وەک نهێنیەک بوو، خورافات بوو.

چەن کەس ئەیانتوانی لەم مەڵبەندە تێپەڕن، دیدەبانەکە، لە کاتێکدا لەڕیزی ئەفسەرەکانەوە بە سواری ئەسپ ئەچووە پێش، سەفەرەکەی "کامیل دولس"ی هاتبووەوە یاد لە ساڵی ١٨٨٧.

بەسەرهاتی چاوپێکەوتنەکەی لەگەڵ "مائەلعەینەین"، لەبەر کۆشکەکەی "سمارا"، عەبا شینە ئاسمانیە درێژەکەی لەبەر بوو و مێزەرەیەکی سپی بەرز بەسەریەوە، شێخ لێی نزیک ببووەوە و هەر ئەو نیگا ماوەدارەیە کە هەرجار ئەهاتەوە یادی، ئەیلەرزاند. رەنگە ئەو تەنیا کەسێ بوو کە بە خوێندنەوەی بەسەرهاتی دولس،

ئاوەها هەستێکی بوو.

"مێشک وشک". ئەفسەرەکان ئەیانوت. «وەحشیەک لە ناوچەکانی باشوور کە تەنیا ئەزانێ تاڵان بکات و بکوژێ و ئاگر هەڵسێنێت و خوێن برژێنێت.»

وەک لە ساڵی ۱۹۰۴، کاتێ کۆپۆلانی لە "تاژانت"کوژرابوو، وەک لە ئووتی ساڵی ۱۹۰۵ "مۆشامپ" لە "ئۆجا"کوژرابوو.

بەڵام دیدەبانەکان کە هەموو رۆژێک لەگەڵ ئەفسەرەکان ئەرۆیشت، ترس و نیگەرانیەکی هەست پێ ئەکرد، کە لێی تێ نەئەگەیشت، ئەتوت زۆربەی ترسەکەی لەوەیە، لەپڕ لە پێچی تەپۆڵکەیەکدا، لە شەقاری جادەیەکی وشکدا، بە تەنیا لە ناوەراستی بیاباندا، چاوی بە ناوچاوی شێخی گەورە بکەوێ.

«ئێستا ئەو ئیتر کۆتایی پێ هاتووە، ئیتر ناتوانێ دەوام بێنێ، لە مانگ و حەوتەدایە، مەجبوورە خۆی تەسلیم بکات، یان خۆی بخاتە ناو دەریا، یان لە بیابان خۆی نوقم بکات، ئیتر کەس پشتیوانی لێ ناکات، خۆی چاک ئەوە ئەزانێ....»

ماوەیەکی زۆر بوو ئەفسەرەکان بەتەمای ئەم ساتە بوون و هەروەها بنکەی ئەرتەش لە "ئۆران" لە "رابات" و لە "داکار".

«مێشک وشکە کە پاشەکشێی کردووە، بۆ ئەو لای دەریا، بۆ بیابانێکی دیکە، رێویە پیرەکە ناچارە تەسلیم بێت، نایەوێ دەس هەڵگرێ، لە باکوور، مەولای "حەفید"، پەیمانی ئەلجەزیرەی ئیمزا کردووە، کە کۆتایی بە شەری پیرۆز بێنێ و قەبووڵی کردووە کە بکەوێتە ژێر چاودێری و دەسەڵاتی فەرەنسە، نامەیەکیش لە ئۆکتۆبری ۱۹۰۹ بە ئیمزای کورەکەی "مائەلعەینەین"، "ئەحمەد دیهبا"، کە پێی ئەڵێن مەولای "سەبا"، "شێر"، کە لەو نامەیەدا پێشنیاری فەرمانبەری شێخ لە یاسای مەخزەن، ئەکا و داوای یارمەتی ئەکات.

"شێر"، گەلێ تەنیایە، ئێستا "شێر" و کورەکانی دیکەی شێخ "ئەششەمس" لە مەراکش، "لاردافی" پیاوکوژ و تاڵانکەر لە "ئامادا"یە، ئیتر هێز و دەسەڵاتیماڵیان نیە، چەکیان نیە و خەڵکی "سووس" بە جێیان هێشتوون، هەر تەنیا چەند کەس

شەرکەری شرپۆش کە لە جیاتی چەک، "کارابین"ی لوولە برونزی کۆنیان پێیە و خەنجەر ونێزەی چاخە ناوەنجیەکان.»

دیدەبانە شاریەکە، لە کاتێکدا لەگەڵ ئەفسەرەکاندا، بە سواری ئەسپەوە ئەڕۆیشت، بیری لە هەموو ئەوانە ئەکردەوە کە چاوەڕوانی نابوودی شێخ بوون.

ئورووپاییەکانی باکووری ئەفریقا، مەسیحیەکان، هەروا کە خەڵکی بیابان پێیان ئەڵێن - بەڵام ئایا بە ڕاستی ئایینی ڕاستەقینەیان پارە نیە؟

ئیسپانیۆلیەکانی "تانژێر" و "ئیفنی"، ئینگلیزیەکانی "تانژێر" و "ڕابات"، ئەڵمانیەکان، هولەندیەکان، بلژیکیەکان و هەموو بانکدارەکان و بازەرگانەکان کە چاوەڕوانی هەڵدێرانی ئیمپراتۆری عەرەب بوون، ئێستە بەرنامەی داگیر کردنیان بەرەو پێش ئەچوو، تا کێڵگەکان دابەش کەن، دارستانی چێو پەممەکان، دارستانی خورماکان، هەمووی دابەش کەن.

نوێنەری بانکی پاریس و هولەند، بە بڕی یاسایی، نرخی گومرێکیان لە هەموو ڕێگاکان زیاد کرد، بازرگانەکانی نوێنەری "ئاتن" کە کۆمەڵی "زوموڕودی سەحرا"یان پێک هێنابوو و کۆمەڵی نیتراتەکانی "گوارارا"، "توات" بۆ کەسانێ کە زەویە رووتەکە ئەبێ تەسلیمی گوزەری ڕێگا ئاسنیە خەیاڵیەکان بێت، ڕێگاکانی ئەوپەڕی سەحرای ئەفریقا و ئەوپەڕی سەحرای موریتانی و ئەرتەش بە زۆری چەک، ڕێگاکەی ئەکردەوە.

دەی پیاوە پیرەکەی "سمارا" بە تەنیا چی ئەکات؟ لە بەرانبەر ئەم شەپۆلانی پووڵ و تۆپانەدا؟

نیگای یاخی حەیوانێکی هەڵهاتوو چی ئەکا، لەبەرانبەر کەسانێک کە سەوداگەری ئەکەن، کە بە تەمای زەویەکان و شارەکانن، بە تەمای سامان و داراییەکن کە وەعدەی بەدبەختی ئەم خەڵکە ئەدەن؟

لە تەنیشت دیدەبانە شاریەکەوە، ئەفسەرەکان بەسەر ئەسپەکانیانەوە، بە ڕوخساری خوێنسارد و ئارامەوە بێ ئەوە زاریان بە وشەیەکی بێهوودە بجووڵێ، ماقی

ئاسۆ بوون. بیناییان لەسەر ئاسۆ، ئەوبەر تەپۆڵکە بەردینەکان گرساندبوو، شوێنێ کە دۆڵە تەماویەکەی چەمی وەرزی "تادلا" تێدا راخرابوو.

رەنگە تەنانەت بیر لەو کارەی کە ئەیکەن نەکەنەوە ؟ بەسەر ئەسپەکانیانەوە، لە رێگایەکی نادیاردا بوون، کە بەڵدەکە بەسەر ئەسپە شێتەکەیەوە رێنوێنی ئەکردن. دوابەدوای ئەوان تیر ئەندازە سەنگاڵی و سودانیەکان بە ئونیفۆرمە خۆڵەمێشیە خۆڵاویەکانی بەریانەوە چەمابوونەوە و ئەتوت لە شەقارەکانی زەوی تێئەپەڕن، بە قورسی هەنگاویان هەڵئەگرت.

دەنگی بێوچانی خێش کردنی هەنگاوەکانیان کە بەسەر زەویە رەقەکەوە ئەهات، ئەبووە هۆی گەردەلوولی تەپ و تۆزێکی سوور و خۆڵەمێشی کە بە ئەسپایی هەڵئەبەزیەوە و ئاسمانی پیس و چڵکن ئەکرد.

ماوەیەکی زۆر بوو رێکەوتبوون. ئێستا ئیتر هیچیان لەدەست نەئەهات، ئەتوت ئەم لەشکرە بۆ هێرش بردنە سەر تارماییەکان ئەڕوا.

بەڵام ئەو هەرگیز خۆی تەسلیم ناکات، بە تایبەت بە فەڕەنسەویەکان، ئەو پێی باشترە هەموو پیاوەکانی بکوژرێن و خۆشی لەگەڵ کورەکانیدا بکوژرێ. لەگرتن پێی باشترە و ئەویشە بۆ ئەو باشترە، چونکە باوەڕی پێئەکەن.»

"حکوومەت دوای کوشتنی "کۆپۆلانی" خۆ تەسلیم کردنی ئەو قەبووڵ ناکات، سەرنج بدەن، نا، ئەو مێشک وشکە، ئەو بێ بەزەیی و وەحشیە، ئەبێ تەفر و توونا بێت، ئەو و هەموو هۆزەکەی، باریک ئەللاییەکان، "بێنیس دۆ دیۆکان" - واکە پێیان ئەڵێن "قرونی وەستایی"، وانیە؟ دەور و بەرەکانی رێویە پیرەکە غەدریان لێ کردووە، جێیان هێشتووە، یەک لە دوای یەک، هۆزەکان لێی جیا بوونەتەوە، چونکە سەرۆکەکان هەستیان بەوە کردووە کە بەرگری لە پێشڤە چوونی مەسیحیەکان ناکرێ، لە باکوور و لە باشوورەوە تەنانەت لە دەریاوە دێن، لە بیابان تێئەپەڕن. لەسەرەتاکانی بیابان، لە تاندوف، لە تابۆلبالا، لە ئوادان، تەنانەت شاری پیرۆزی "شینگێتیان" داگیر کردووە، شوێنێ کە "مائەلعەینەین" تێدا دەرسی خوێندبوو.

لەوانەیە، دوایین شەڕی گەورە لە "بودونیب" رووی دابێ، کاتێ ژنەراڵ "وینی" شەش هەزار پیاوی مەولای هیبای کوشتبوو، پاشان کورەکەی "مائەلعەینەین" کردبوویە سەرکێوەکان. بێ گومان خۆی نوقم کردبوو بۆ ئەوە شەرمەکەی بشارێتەوە، چونکە ببوو بە "لاخم"، گۆشتی بێ ئێسقان، هەرواکە ئەڵێن، "بەزیو". شێخی گەورە لە قەڵای "سمارا" تەنیا خۆی زیندانی کردبوو. ئەو تێ نەگەشتبوو کە چەکەکان ئەویان نەبەزاندووە بەڵکوو پارە ئەوی نابوود کردبوو. پارەی گومرێکی دەروازەکانی بیابان، کە سەربازە مەسیحیەکان بە دوایەوە بوون.، پووڵی زەویە داگیر کراوەکان، دارستانە خورما داگیر کراوەکان، دارستانەکان بە کەسانێ دراون کە ئەزانن بەهرەی لێ وەرگرن، ئەوە لەمە چۆن تێ‌بگات؟ ئەو ئەیزانی بانکی پاریس و هولەند چیە؟ ئەیزانی وام بۆ درووست کردنی رێگا ئاسنیەکان چیە؟ ئەیزانی دەستەی دەرهێنانی "نیتراتی گورارا- توات" چیە؟ ئایا تەنانەت ئەیزانی لەو ماوەیە کە ئەو نوێژی ئەخوێند و خەڵکی بیابانی تەبەڕوک ئەکرد، حکوومەتەکانی فەرەنسە و بریتانیای گەورە، پەیمان نامەیەکیان ئیمزا کردووە کە هەرکامیان وڵاتێکی بەرکەوێت. یەکێکیان مەراکش و ئەوی‌تریان میسر؟

لەکاتێکدا ئەو قسەی بۆ دوایین مرۆڤە ئازادەکان ئەکرد و فووی لێ ئەکردن، لە ئیزارگێی "ئاروسین"، "تیدرارینەکان"، "تولود بووسەباکان" "توباڵتەکان" "رۆکیباتە ساحلیەکان، "ئولود دێلیم" و "ئیمراگینیەکان" لەکاتێکدا هێز و وزەی بە هۆزەکەی خۆی باریک ئەڵلایەکان ئەبەخشی، ئایا ئەیزانی "کونسرسیومێکی" بانکی، کە ئەندامە سەرەکیەکانی، بانکی پاریس و ئامریکا بوون، وامێکی ٦٢٥٠٠٠٠ فرانکی بە ئاڵتوونیان بەشا و مەولای "حەفید" دابووی بە بەهرەی پێنج لە سەد، کە لە بەهرەی مانگانەی گومرێکی دەروازەکانی رۆخی دەریا مسۆگەر ئەبوو و سەربازە خارجیەکان هاتبوونە ناوچەکان بۆ ئەوەی چاودێری کەن کە لانی کەم شەست لە سەدی داهاتی رۆژانەی، داهاتی گومرێکی بگەڕێتەوە بۆ بانک؟

ئەیزانی کە لەکاتی پەیمانی ئەلجەزیرە کە کۆتایی بە شەڕی باکوور هێنا، قەرزی

پادشا، مەولای "حەفید" ٢٠٠٠٠٠٠٠٠ فرانک ئاڵتوون بووە و ئاشکرا و روون بوو کە ئەو هەرگیز نەیئەتوانی قەرزەکەی بداتەوە؟

بەڵام شێخی گەورە ئەوەی نەئەزانی، چونکە جەنگاوەرەکانی شەڕیان بۆ زێڕ و ئاڵتوون نەئەکرد، بەڵکوو بۆ لێبوردن و دۆعای خێر بوو. ئەو زەویەی کە ئەیان پاراست، نە هی ئەوان بوو، نە هی کەسی‌تر، چونکە هەر بۆشاییەکی بەرفراوانی بینراییان بوو، دیاری و پێشکەشی خوا بوو.

... وەحشیەک، مێشک وشکێک، کە بەرلە شەڕ بە جەنگاوەرەکانی بەڵێن ئەدات کە نەبەز و نەمرن، کە بە تەنیا بەو چەکانەوە، نێزە و شمشێرەکانیانەوە ئەیان نێری بۆ شەڕ لەگەڵ چەک و مسەلسەلەکانی ئەوان...

دەستەی تیر ئەندازە رەشەکان، هەموو دۆڵی چەمی تادلایان بەرلە پایابەکە داگیر کردبوو، لە کاتێکدا پیاوە مەزنەکانی "کاسباتادلا" گوێڕایەڵی و فەرمانبەری خۆیان پێشکەش ئەفسەرەکانی فەرەنسی ئەکرد، دووکەڵی ئوردووگاکە لە تاریکی شەودا بەرز ببووەوە، دیدەبانە شاریەکە وەک هەموو جارێ لە مەنزڵگاکاندا چاوی بڕیبووە ئاسمانی قەشەنگی شەوانە کە بە ئارامی خۆی دەرئەخست.

دیسان بیر لە نیگای "مائەلعەینەین" ئەکاتەوە، نهێنی و قووڵ، نیگایەک کە بەسەر "کامیل دولسە"وە روابوو، بازرگانێکی تورک، کە تا ناخی رۆحی پشکنیبووی.

رەنگە لە پێشەوە هۆی هاتنی ئەم بێگانە شڕپۆشەی زانیبێ، ئەم یەکەمین دزە خەیاڵیە کە هەر شەو بیرەوەریەکانی لەسەر پەڕەی قورئانەکە ئەنووسێ؟

بەڵام ئێستا زۆر دێر بوو و ئیتر چارەنووس بەرگری لێ ناکرێ، لە لایەکی دەریا، لە بیابان، دیمەنەکانی سەر خەڵکی "سمارا" درووست ئەبێتەوە. ئەوان دوایین سەحرانشینەکان ئابلۆقە ئەدەن. برسیەتی و تینوویەتی گەمارۆیان ئەدا.

ترس و نەخۆشین و بەزینیان ئەناسی.

«ماوەیەکی زۆرە کە شێخ و پێ‌پەتیەکانی دەوروبەری هەر پارویەکی ئامادەن، ئەگەر بمانویستایە تۆپێکی ٧٥ بەر کۆشکە گڵینەکەیدا و چەند مسەلسەل، ئەوێ

گسک لێ ئەدا. پێمان وایە ئەوەشی ناوێ، باشتر ئەمەیە کە تاک و تەنیا بمێنێتەوە، وەک مێوەیەکی کرمۆڵ... بەڵام ئێستا، دوای کوشتنی کۆپۆلانی، ئەمە ئیتر شەڕ نیە، عەمەلیاتی پۆلیسیە لەبەرانبەر دەسەیەک چەتە و خراپکار، هەر ئەوە...»

تەنانەت ئەوکەسانە کە پیاوە پیرەکە ئەیویست بیانپارێزێ، غەدریان لێ کردبوو، پیاوەکانی "سوس"، "تارودانت"، "ئاگادیر" کە هەواڵیان هێنابوو : "شێخی گەورە "مەولای ئەحمەد بێن محەممە ئەلفازل"، ناسراو بە "مائەلعەینەین"، ئاوی چاوەکان، لە ڕێگای باکووردایە، لەگەڵ جەنگاوەرانی بیابان و "درا" و "ساگیت ئەلحەمرا"یە، تەنانەت پیاوە شینەکانی "ئوالاتا" و "شانگتیان" لەگەڵدایە، بەرەو باکوور ئەڕۆن، بەرەو شاری پیرۆزی "فێ" بۆ هەڵدێرانی سوڵتان و جێگیر کردنی مەولای هیبا کە بە سەبا ناسراوە، "شێر" کوڕی گەورەی "مائەلعەینەین". بەڵام بنکە باوەڕی بەو هەواڵە نەکردبوو، ئەفسەرەکانیش پێکەنیبوون.

«پیاوە پیرەکەی "سمارا"، شێت بووە، ئەڵێی ئەیتوانی لەگەڵ شوێن کەوتووە پێپەتیەکانیدا، سوڵتان هەڵدێرێ و ئەرتەشی فەڕەنسە دەربکات!»

"شتێک کە روونە ئەوەیە کە ڕێویە پیرەکە بەرەو دەریا و بیابان پاشەکشێی کردووە، ئەو خۆکوشتنی هەڵبژاردووە، تەنیا چارەیەک کە بۆی ماوەتەوە. خۆی و هەموو هۆزەکەی بکوژێ.

ئیمڕۆ، ۲۱ ژوەنی ۱۹۱۰، دەستەی تیرهاوێژە ڕەشەکان لەسەر جادەکەدان، لەگەڵ سێ ئەفسەری فەڕەنسی و دیدەبانیە شاریەکە کە لە پێشەوەن. ڕێگاکەیان پێچ ئەکەنەوە بۆ ئەوەی بگەنەوە بە گروپەکەی دیکە کە لە بەشی "زێتات" دان.

کاکیلەکانی پلایسەکە بۆ گرتنی شێخە پیرەکە و پێپەتیەکانی پێک هاتووە، هەتاو چاوی سەربازەکان ئەسووتێنێ، رووناکیەکی تێکەڵ لەگەڵ تەپ و تۆزدا.

لە دوورەوە، لەسەر تەپۆڵکەکەوە کە بەسەر دەشتە بەردەڵانەکەدا زاڵە، گوندێکی ڕەنگ ئاجۆری دەرئەکەوێ کە بە ئاستەم لە بیابان لێک ئەدرێتەوە. بەڵەدەکە تەنیا ئەڵێ: "قەسبەی زیدانی"

بەڵام خێرا ئەسپەكەی ڕائەوەستێ و لە دوورەوە دەستەیەك لە شەڕكەرەكان لە درێژایی تەپۆڵكەكانەوە بە غار تێئەپەڕن. تیرهاوێژە ڕەشەكان خێرا جێگر ئەبن و ئەفسەرەكان، ئەسپەكانیان دوور ئەكەنەوە. چەن تەقەی پرژ و بڵاو بەرز ئەبێتەوە: بێ ئەوە كەس بپێكرێ. دیدەبانە شاریەكە پێی وایە كە ئەوە زۆرتر لە تەقەی ڕاوچیەكانی كوێستان ئەچێ، پیاوێكی دیندار دیل ئەبێ، عەرەبێكی هۆزی بەنی ئەمیر.

شێخ "مائەلعەینەین" دوور نیە، جەنگاوەرەكانی لە ڕێگای "ئەلبروج"دان، لە باشوور، دەستەكە ڕێ ئەكەوێ، بەڵام ئەفسەرەكان لای سەربازەكان ئەمێننەوە.

بە ناو دڕك و داڵەكاندا ئەگەڕێن، دووەمین پێكدادان لە ڕێگای ئەلبروجدا روو ئەدات، لە كاتێكدا كە هەتاو هێشتا بە تاقی ئاسمانەوەیە، تەقەی گوللە دیسان لە بێ دەنگیە ئاگرینەكەدا دەنگ ئەداتەوە. ژنەراڵ موانیەر فەرمانی هێرش بەرەو چاڵایی دۆڵەكە ئەدات. سەنگاڵیەكان لە كاتێكدا سەرنێزەكانیان بەرەو پێش گرتووە، هەڵدێن. هۆزی "بەنی مووسا"، دوانزە سەربازی ڕەش ئەكوژن و بە نێوان دڕكە جارەكەدا، ڕائەكەن و ئەكوژراو لەسەر زەوی بەجێ دێڵن. پاشان سەنگاڵیەكان هێرشەكەیان بەرەو قووڵایی دۆڵەكە درێژە پێ ئەدەن. سەربازەكان، پیاوە شینەكان لە هەموو كونج و قوژبنێ دەرئەكێشن، بەڵام ئەو جەنگاوەرە نەبەزانە نین كە ئەمان چاوەڕوانیان بوون. خەڵكێكی پێ پەتی و جل شڕ و چڵكن و بێ چەكن كە بە شەلەشەل هەوڵ ئەدەن هەڵبێن و ئەكەونەوە سەر بەردەڵانەكە. زۆربەیان سواڵكەرە لاوازەكانن كە هەتاو سووتاندوویانی و لەبەر "یاو" داچەكیون. لەیەك ئەكەون و لە بێچارەگی و بەدبەختیدا ناڵە و هاوار ئەكەن.

لە كاتێكدا، سەنگاڵیەكان لەبەر تۆڵەیەكی مەرگهێنەر دەستڕێژیان بەسەردا ئەكەن و بەسەر نێزەكانیان پانیان ئەكەنەوە بەسەر زەویە سوورەكەدا، ژنەراڵ "موانیەر" بێهوودە، فیكەی ئامادەباش لێ ئەدات. ژن و پیاوەكان لە پێش سەربازە ڕەشەكانەوە بەملاولادا هەڵدێن و ئەكەون بە زەویدا. مناڵەكان لە نێوان دەونەكاندا ڕائەكەن، لە

ترسدا لاڵ بوون، مەڕ و بزنەکان بە قیڕە قیڕ و نەڕەنەڕ لەیەک ئەکەون. تەرمی پیاوە شینەکان لەسەر زەوی پرژ و بڵاو بوون. دوایین تەقەی گوللەکان بەرز ئەبێتەوە و ئیتر هیچ دەنگێ نیە، دیسان بێدەنگیەکی ئاگرین دیمەنەکە دائەگرێتەوە.

بێجووڵە، لە لووتکەی تەپۆڵکەیەکدا، ئەفسەرەکان بەسەر ئەسپەکانیانەوە لە نیگەرانیدا کەوتوونەتە جم و جووڵ، چاویان بڕیوەتە پانتایی هەراوی دڕکە جارەکە، شوێنێ کە پیاوە شینەکان نوقم بوون. ئەڵێی زەوی هەڵیمژیون، تیرهاوێژە سەنگاڵیەکان، هەڤاڵە کوژراوەکانیان بەسەر کۆڵیانەوە، ئەگەڕێنەوە، بێ ئەوە چاوێک بخشێنن بە دەیان ژن و پیاوی شرپۆش کە لە سەرزەویەکەدا کەوتوون.

لە جێگایەکدا، لە لێژایی دۆڵەکە، لە نێوان دەوەنە دڕکاویەکاندا، کوڕێکی لاو لە تەنیشت تەرمی جەنگاوەرێکی کوژراودا دانیشتووە و بە هەموو هێزیەوە چاوی بڕیوەتە روخسارە خوێناویەکە، کە چاوەکانی کوژاونەتەوە.

***

لە ڕووناکی دەمەوبەیانی شەقامەکەدا، کوڕە لاوەکە، بێ پەلە، لە درێژایی ماشینە ڕاوەستاوەکانەوە ئەچێتە پێش، جەستە لاوازەکەی لە درێژایی ماشینەکانەوە ئەخزێ و بەسەر شووشەکان، لەسەر گڵگیرە بریقەدارەکان و لەسەر چراکان ڕائەبوورێ، بەڵام ئەو بۆ ئەوانە ناڕوانێ، بەسەر هەر ماشینێکەوە، دائەنەوێتەوە و چاو بەناویا ئەگێڕێ، سەندەڵیەکان و ژێر سەندەڵیەکان، شووشەی دوای ماشینەکە و سنووقەکەی، بێدەنگ ئەچێتە پێش، تەنیا، لە شەقامە گەورە چۆڵەکەدا. کازیوەی هەتاو لە بەیانیەکی خاوێن و ڕووندا تیشکەکانی ئەپژێنێ.

ئاسمان گەلێ شین و ساف و ساماڵە. "با"ی هاوین لە دەریاوە هەڵئەکات و هێرش ئەباتە ناو شەقامەکان، لە درێژایی شەقامە ڕاستەکاندا، لە باخە بچووکەکاندا لوول ئەخواتەوە و دارخورما و کاجەکان ئەشەکێنێتەوە. "ڕادیکز" زۆر حەز لە "با"ی هاوین ئەکات، وەک "با"یەک کە تۆز و خۆڵ هەڵئەبەزێنێتەوە زیانهێنەر نیە، یان "با"یەک نیە کە تا ناخی سینە ئەڕوا و ئێسکەکان ڕەق هەڵئەگەڕێنێ، بەڵکوو "با"یەکی سووک و دڵبزوێن و نەرمە. "با"یەکە بۆنی دەریا و گیا ئەدات و حەز و ئاواتی خەوتن ئەبزوێنێ. "ڕادیکز" بەختەوەرە، چونکە لەژێر ئەستێرەکاندا لە باخێکی چۆڵ نزیک دەریا

خەوتووە، سەری لەسەر ریشەی کاجێکی چەتری‌دا، بەر لە هەڵهاتنی هەتاو لەخەو هەستا و خێرا هەست بە "با"ی هاوین ئەکات، لەسەر گیاکە وەک سەگ کەمێ خۆی ئەتلێنێتەوە، پاشان بێ ئەوە ساتێ رامێنێ، تا دەریا هەڵدێت، ماوەیەکی زۆر لە سەر جادەکەوە چاوی تێ‌ئەبرێ، گەلێ ئارام و جوانە، هێشتا رەنگی خۆڵەمێشی شەوی پێوە ماوەتەوە، بەڵام دەمەوبەیان خاڵی شین و سوور لەبرێ شوێنیدا دەرئەکەوێ، تەنانەت بۆ ساتێ "رادیکز" حەز ئەکا لە تاشەبەردە چیاوەکان داگەرێ و هەموو جلەکانی دابکەنێ و خۆی بخاتە ناو ئاوەکە. بای هاوین تا دەریا بانگهێشتنی کردووە کە ئاوەکەی پێ نیشان بدات، بەڵام دێتەوە یادی کە ئەبێ پەلە بکات و کاتێکی زۆری نیە، چونکە خەڵک خەبەر ئەبنەوە، پاشان بەدوای ماشینەکاندا، لە شەقامەکە سەرئەکەوێ.

ئەگاتەوە بەر خانووباخێکی گەورە، لە پارکەکە تێئەپەرێ، شوێنێ کە ماشینەکانیان وەستاندووە،کەس لە باخەکە چاو ناکات، سەیوانی ماڵەکان دادراونەتەوە، بانجێڵەکان چۆڵن، "با"ی هاوین بەسەر رووکاری خانووەکانەوە هەڵئەکات، سەیوانەکان تەقە تەقیان پێ کەوتووە. خشە خشێکی نەرم، لق و پۆپی دارگوڵەکانی هەورێشم، "گەڵابۆ" و لق و پۆپی دارخورماکان ئەشەکێنێتەوە، رووناکی بە هێمنی دێت، لە پێشەوە لە ئاسمانەوە، ئەمجا لەسەر خانووبەرەکانەوە، گڵۆپی دار بەرقەکان بێ‌رەنگ ئەبن. "رادیکز" ئەم کاتانەی گەلێ پێ‌خۆشە، چونکە شەقامەکان هێشتا کپ و خامۆشن، دەرگاکان داخراون و کەس دیار نیە، ئەڵێی لە دونیادا تاک و تەنیایە. بە ئارامی لەراستای خانووبەرەکانەوە ئەچێتە پێش، وائەزانێ هەموو دونیا هی ئەوە و کەسی لێ‌نەماوە. رەنگە بە دوای کارەساتێکدا، لەو ماوەیەدا کە ئەو لە باخە چۆڵەکەدا خەوتووە، ژن و پیاو، بەرەو کێوسان هەڵهاتوون و ماڵ و ماشینیان جێ‌هێشتووە.

"رادیکز" لە درێژای ماشینەکاندا ئەچێتە پێش و چاو ئەگێرێنێ بە ناویاندا. سەندەڵیە خاڵیەکان، فەرمانە بێ جووڵەکان، هەست ئەکات بینایەک بەسەریەوە گرساوەتەوە و هەرەشەی لێ ئەکات. رائەوەستێ، سەری بەرەو دیواری بەرزی خانووەکان بەرز ئەکاتەوە، تیشکی سووری کازیوە، رووکاری بەرزی خانووەکانی

ڕۆشن کردووەتەوە، بەڵام سەیوانی پەنجەرەکان و پەنجەرەکان هێشتا داخراون.

دەنگی نەرمی "با" ئارام و هێمن تێئەپەڕێ، دەنگێ کە هی مرۆڤەکان نیە، "رادیکز" هەست بە بۆشاییەک ئەکاکە شارەکە کون ئەکات و جێی دەنگە دەنگ و بزاوتی مرۆڤەکان ئەگرێتەوە.

رەنگە لەو ماوەیەدا کە ئەو خەوتبوو و سەری لە نێوان ریشەی کاجە چەتریە پیرەکەدا بوو، "با"ی هاوین بە شێوەیەکی نهێنی، وەک بڵێی لە دونیایەکی ترەوە هاتبێ، هەموو ژن وپیاوەکانی شاری خەواندبێ. ژن و پیاو لەسەر قەرەوێڵەکانیان خەوتوون، پەنجەرەی ئاپارتمانەکانیان بەستووە و لە خەوێکی قووڵی جادووی بێبڕانەوە دان. ئیتر شار ئاسوودە ئەبێت، ئەتوانێ هەناسە بکێشێ، شەقامە چۆڵە گەورەکان و ماشینە وەستاوەکانی، دووکانە داخراوەکان، دار چرابرقەکان و ئاگرە سوورە کوژاوەکان، پاشان گیاکان ئەتوانن بە ئارامی لە شەقاری جادەکەدا بڕوێن، باخەکان وەک دارستانیان لێ دێتەوە، مشک وباڵندەکان بێ سڵ کردنەوە، بۆ هەموو جێگایەک ئەڕۆن وەک ئەو کاتانەی کە هێشتا مرۆڤی لێنەبووە.

"رادیکز" ساتێ بۆ گوێ گرتن ئەوەستێ، تەنیا باڵندەکان لە نێوان دارەکاندا خەبەریان بووەتەوە، ریشۆڵەکان، چۆلەکەکان، تووکاکان، بەتایبەت تووکاکان توندتر ئەقیژێنن و بە قورسی لەم دار بۆ ئەو دار ئەفڕن، یان بە هەڵبەز و دابەز لەسەر قیرتاوە تەڕەکەی پارکینگەکە ئەچنە پێش. کوڕە لاوەکە تووکاکانی زۆر خۆش ئەوێ. کراسێکی رەشی جوانیان لەبەرە و نووکی زەردیان هەیە و بە جۆرێکی تایبەت هەڵئەبەزنەوە و بۆ بەرگری لە مەترسیەکان، سەریان بە لایەکدا لار ئەکەنەوە، لە دز ئەچن، هەر بۆ ئەوەیە "رادیکز" خۆشیانی ئەوێ، ئەوانیش وەک ئەون، تۆزێ گێژ و دز.

لەکاتی مەترسیدا ئەزانن فیکە لێبدەن، کە گوێ کەڕ ئەکات، ئەزانن پێکەنن، ملیان ئەخولێننەوە، ئەوەش "رادیکز" دێنێتە پێکەنین.

"رادیکز" بە ئارامی لە پارکینگەکە ئەچێتە پێش، جار جار بە فیکە وەڵامی

توکاکان ئەداتەوە، رەنگە لەو ماوەیەدا، کە کورە لاوەکە لە باخە چۆڵەکەدا خەوتبوو و سەری لە سەر ریشەی کاجە چەتریەکەدا بووە، ژن وپیاوەکان بێ سرتە شاریان بە جێ هێشتووە و توکاکان جێی ئەوانیان گرتووەتەوە، ئەم بیرە، "رادیکز" زۆرتر شاد ئەکات و بەرزتر بە قامکی فیکە لێ ئەدا بۆ ئەوەی بە توکاکان بلێ لەگەڵیانە، بۆ ئەوەی بلێ کە هەموو شت هی ئەوانە، هەموو، ماڵەکان، شەقامەکان، ماشینەکان و تەنانەت دووکانەکان و هەرچیان تێدایە.

رووناکی خێرا لە پارک و دەوروبەری خانووەکان پەرە ئەسێنێ، تنۆکە شەونمەکان لەسەر سەقفی ماشینەکان و گەڵای گوڵەکان ئەدرەوشێتەوە. "رادیکز" هەوڵێکی زۆرتر ئەدا بۆ ئەوە بەرخۆی گرێ بۆ سەیر کردنی تنۆکە رۆشناییەکان نەوەستێ.

لە چۆڵایی پارکینگە گەورەکەدا، بە دیوارە بەرزە سپیەکانیەوە، بە سەیوانە نزمەکان و بانیجە بۆشەکان، بە هەموو هێزیانەوە ئەدرەوشێنەوە، ئەڵێی تەنیا شتە راستەقینە و زیندووەکان هەر ئەوانن و لە بەرانبەر "با"ی دەریادا کە هەڵئەکا، ئەلەرێنەوە، وەک هەزاران چاو کە زاق بۆ دونیا ئەروانن. دیسان "رادیکز" هەست بە مەترسی و هەرەشەیەکی نادیار ئەکات، کە بەسەر هەموو ئەوانەدا قورس داکەوتووە. لێرە لە پارکینگی خانووەکاندا، مەترسیەک پیاسە ئەکات. روانینێ یان رووناکیەک کە کورە لاوەکە نایبینێ و لێی تێ ناگات. مەترسیەک کە لە ژێر تایەی ماشینە وەستاوەکاندا خۆی حەشار داوە، لە تیشک دانەوەی شووشەی ماشینەکاندا، لە رووناکیە کزەکەی گڵۆپی داربرقەکان، کە گەرچی رۆژ بووەتەوە هێشتا هەر ئەگرن.

هەست بە لەرزەیەک بەسەر پێستیەوە ئەکات، ئەڵێی دڵی ئارامتر لێ ئەدات و پاشان، خورپە خورپەکەی توند ئەبێتەوە، ئارەقێکی سارد لەپی دەستی تەر ئەکات.

ئێستا باڵندەکان ون بوون، تەنیا پەرەسێلکەکان بە قیژەقیژ و بە توندی ئەفرن. توکاکان هەڵهاتوون بۆ ئەوبەر بلوکە بتونیە گەورەکان، بێدەنگی زاڵە، تەنانەت هێزی "با" رەویوەتەوە. کازیوە بۆ ماوەیەکی زۆر لەسەر شارە گەورەکە نامێنێتەوە، ساتێ

پەرجوەکەی نیشان ئەدات و نوقم ئەبێت.

ئێستا رۆژ هەڵاتووە، ئاسمان ئیتر خۆڵەمێشی و سوور نیە، بێ‌رەنگیەک دایئەپۆشێ، جۆرە هەڵمێ لە رۆژهەڵاتەوە بەرز بوەتەوە، لە شوێنێکدا کە لوولە گەورەکانی مەخزەنەکان، بێ‌گومان دەستیان کردوە بە تف کردنەوەی دووکەڵە دیل کراوەکانیان.

"رادیکز" هەموو ئەمانە، هەموو ئەو شتانەی روو ئەدەن ئەبینێ و دڵی ئەگووشرێ. بە زووی ژن و پیاوەکان پەنجەرە و دەرگاکانیان ئەکەنەوە، سەیوانەکانیان هەڵئەدەنەوە و دێنە بانیجەکانیان و لە شەقامەکان رێ ئەکەون. ماتۆری ماشین و کامیۆنەکانیان رۆشن ئەکەن، بەدەم سەیرکردنی هەموو شتەوە، بە چاوە پیسەکانیانەوە، دەئاژوون. هەر بۆ ئەوەیە، ئەم نیگایە و ئەم مەترسیە هەیە. "رادیکز" حەز لە رۆژ ناکات. هەر حەز لە شەو و دەمەوبەیان ئەکات. کاتێ هەموو شت بێدەنگە، چۆڵە و جگە لە شەمشەمە کوێرەکان و پشیلە وێڵەکان چی‌تری لێ نیە.

بە نێوان ماشینەکاندا، رێ ئەکەوێتەوە، جوان سەرنجی ناو ماشینە وەستاوەکان ئەدات. جارجار شتێ سەرنجی رائەکێشێ، دەست لەسەر دەستەی دەرگاکەیدا دائەنێ بۆ دەرفەتێ ئەگەڕێ بیکاتەوە. سێ ماشین نیشان ئەکات کە دەرگاکانیان داخراون.

رووناکی هەتاو لە ئاسماندا، لە ئاستی سەر درەختەکاندا پەرە ئەسێنێ، بەڵام هێشتا نابینرێ. هەر رۆشنایيەکی قەشەنگی گەرمە کە ئەکرێتەوە و لە ئاسماندا بڵاو ئەبێتەوە.

"رادیکز" خۆشی لە رۆژ نایەت، بەڵام گەلێ هەتاوی خۆش ئەوێ. پێی خۆشە سەیری هەڵهاتنی هەتاو بکات. سەرئەنجام دێت، سەفحەیەکی هەڵگرساو کە تیشکەکانی بۆ قووڵایی چاوەکانی ئەهاوێ. "رادیکز" ساتێ بەسەر سوورمانەوە ئەوەستێ، بەدەم گوێدانی ترپەی دڵیەوە، چاوەڕوان ئەبێ. هەرەشە کە ئابلۆقەی ئەدات، بێ ئەوە بزانێ لە کوێوە پەیدای بووە. رۆژ بووەتەوە بەڵام قورسایی ترسەکە بەسەر دیوارە بەرزە سپیەکانەوەیە، بەسەدان سەیوانی شینەوە لەسەر بانە سافەکاندا کە

ئانتینەکان قوت بەسەریانەوە وەستاون، بەسەر دەکەڵە سیمانیەکانیانەوە، سەر دارخورماکان کە کۆتەکانیان ساف و لووسە.

بە تایبەت بێدەنگی رۆژ ئەیترسێنێ و رۆشنایی دەستکردی دارچرابرقەکان کە هێشتا بە ژاوەژاوێکی بزرەوە ئەسووتێن، ئەڵێی دەنگی ئاسایی مرۆڤەکان و ماتۆڕەکانیان ئیتر ناتوانن دەرکەون، ئەڵێی ماتۆڕە لەکارکەوتووەکان و روخسارە چاوبەسراوەکان، گەرووە گووشراوەکان، هەر وەک زیڕک لە ژێر خۆڵداخەو وەستاندوونی.

"باشە، ئەڕۆم" "رادیکز" بۆ ئەوە ترسەکەی بڕەوێتەوە، بە دەنگی بەرز ئەڵێ. دیسان دەستگیرەی ماشینەکە ئەگرێ، چاو بە ناو ماشینە ساردەکەدا ئەگەڕێنێ، تیشکی هەتاو لەسەر دڵۆپە شەونمەکانی سەر ماشینەکە و شووشەکانیدا ئەدرەوشێتەوە. «هیچ... هیچ»

پەلە کردن، نیگەرانیەکەی ئەڕەوێنێتەوە، رۆژباڵێکی سپی کراوەیە، هەتاو بە زوویی بەسەر بانی خانووە بەرزەکاندا تێدەپەڕێ، بێ گومان بە هەڵگرسانی تیشکدانەوی بڵێسەکانی بە پۆپەی شەپۆلەکانەوە، بەسەر دەریاوە ئەدرەوشێتەوە.

"رادیکز" بێ ئەوە بۆ دەوروبەری بڕوانێ ئەچێتە پێش : "ئاها... سوپاس" دەستگیرەیەک کراوەتەوە. کوڕە لاوەکە بێدەنگ ئەخزێتە ناو ماشینەکە، دەستی بە هەموو جێگایەکدا دێنێ، ژێر سەندەڵیەکان، کونج و کەلەبەرەکان، گیرفانی دەرگاکان ، سنووقی ئامێرەکان، وەک دەستی کوێر بە خێرایی دێنی و ئەیبا.

«هیچ، هیچ...» ناو ماشینەکە خاڵیە، وەک سەراوێ سارد و تەڕە.

«پەست»... توڕەیی بەسەر نیگەرانیەکەیدا زاڵ ئەبێ، کوڕە لاوەکە لە درێژایی خانووەکاندا، بەدەم تێڕوانینی ماشینەکانەوە رێ ئەکەوێتەوە. لەپڕ دەنگێ رایئەچڵەکێنێ. نەڕەی ماتۆڕێ و تەقە تەقی وەرەقە لۆحەکان، "رادیکز" لەپشت واگونی وێستگەیەکی سەوزەوە سەیری تێپەڕینی کامیۆنی زبڵەکان ئەکات کە زبڵەکان کۆ ئەکاتەوە.

کامیۆنەکە بەدەور خانووەکەدا دەور ئەداتەوە بێ ئەوە بڕواتە ناو پارکینگەکە، مل ئەنێت و نیوە نادیار لەپشت ریزە گەڵابووەکان و کۆتەی دارخورماکانەوە ئەڕوا.

"رادیکز" پێی وایە بەم پشتەخڕ و لەرزە لەرزەیەوە لە کرمێک ئەچێ یان لە دەعبایەکی پێکەنینی.

کاتێ دیسان هەموو شت کپ و خامۆش ئەبێتەوە، لەسەر سەکۆی واگۆنەکە شتگەلێ سەرنجی رائەکێشن. لە شووشەی پشتووی نزیک ئەبێتەوە، کۆگایەک لیباس لەسەریەک کەوتوون لەسەر رووکەشێکی پلاستیکی نارنجیدان. هەروەها لە پێشەوە جلی تیایە، کارتۆنێ پێڵاو لەسەر زەویەکەیە لای سەندەڵیەکە، لە سووچێکدا رادیۆیەکی ترانزیستۆری، دەرگاکانی واگۆنەکە بەسراون بەڵام شووشەی پێشەوەی نیوە کراوەیە. "رادیکز" بە هەموو هێزیەوە ئەیکێشێ، خۆی لە پەراوێزەکەی هەڵئەواسێ و گەورەتری ئەکاتەوە. نەختە نەختە شووشەکە ئەکرێتەوە. "رادیکز" دەسکەی درێژی دەستگیرەکە ئەگرێت و ئەیکاتەوە و ئەخزێتە ناوەوە.

واگۆنەکە گەلێ گەورەیە. "رادیکز" لەوەی کە لەویایە رازیە، ساتێ جەستەی ئەخاتە سەر سەندەڵیە ساردەکە و دائەنیشێ. دەستی ئەنێتە سەر فەرمانەکە و لە شووشەی پێشەوە چاو ئەگێڕێ بۆ پارکینگ و درەختەکان. لاژووری شووشە پێشووەکە، رەنگێکی سەوزی زمرووتی هەیە کە لە ئاسمانە سپیەکەدا رۆشناییەکی سەیر پێک دێنێ.

کاتێ لا ئەکاتەوە، لە دەستی راستی فەرمانەکەدا رادیۆیەک ئەبینێ، پێچەکەی ئەکاتەوە، بەڵام رۆشن نابێ، دەست ئەبا سنووقی واگۆنەکە ئەکاتەوە. کاغەز و پێنووس و چاویلکەیەکی تیایە، لە پشت سەندەڵیەکەوە ئەخزێتە رێرەوەکەی دواوە، بە توندی جلەکان ئەمدیو و ئەودیو ئەکات، هەموویان تازەن، کۆت و شەڵوار، کراسی پیاوانە، جلیقە و شەڵواری ژنانە، جاکەتی کاموایی، هەموو لەناو رووکەشی پلاستیکیدا دەق کراون. "رادیکز" لە تەنیشتی خۆیەوە جلەکان کۆ ئەکاتەوە، پاشان کارتۆنی پێڵاوەکان، کەراواتەکات، حەگاڵەکان لاخواری شەڵوارەکان گرێ ئەدات و

جلەکان ئەخنێتە ناوی.

لەپڕ رادوێکە ئەکەوێتەوە یادی، ئەخزێتە پێشەوە، سەری دائەنەوێنێ بۆ تەختی واگۆنەکە، دەست ئەخشێنێ و بەرزی ئەکاتەوە. پێچێک ئەگەڕێنێ و ئەمجارە ئاهەنگێ بڵاو ئەبێتەوە، نوتی گیتارەکە وەک ئاوازی باڵندەکان بەکازیوەدا ئەخزێن و رەوان ئەبن. لەوکاتەدا گوێی لە هاتنی پۆلیسەکانە، نایانبینێ، رەنگە لە راستیدا نەیبیستووە، دەنگی تایەکان لەسەر قیرتاوەکەی رێگاکەدا، هەڵدانەوەی سەیوانێ لە جێگایەکدا لەسەر رووکاری بەرینی خانووەکە، کە لە رووناکیدا سپی ئەنوێنێ.

رەنگە شتێکی ترە کە بە ئاگای هێناوەتەوە، لەکاتێکدا کە ئەو سەری دانەواندبوو و گوێی لە مۆسیقای باڵندەکانی رادوێکە ئەگرت.

لە ناخی جەستەیدا، لەپشت چاوەکانیەوە یان لە دڵ و رێخۆڵەیدا شتێ پێک دێت، ئەگووشرێت، بۆشایی وەک سەرما واگۆنەکە سیخناخ ئەکات، هەڵئەسێتەوە و چاوی ئەکات.

ماشینە رەشەکەی پۆلیس بە توندی ئەگاتە رێگای پارکینگەکە، دەنگی تایەکانی لە دەنگی ئاو ئەچێ کە ئەرژێتە سەر قیر و رێخەڵانەکە.

"رادیکز" بە روونی روخساری پولیسەکان و ئونیفورمە رەشەکانیان چاو ئەکات، لەوساتەدا هەست بە نیگایەکی رەق و مەرگ هێنەر ئەکات، کە لە بانیجەی خانووەکەوە چاوی تێ بڕیوە، لە شوێنێکدا کە سەیوانێ بە توندی هەڵدراوەتەوە.

لە ناو ماشینەکە بمێنێتەوە و وەک حەیوانێ خۆی داشارێ؟ بەڵام پۆلیسەکان دێن. بێگومان دیویانە. بەپڕتاو لە دەلاقەی پێشووەوە باز ئەداتە دەرەوە، بەرەو دیواری پارکینگەکە هەڵدێ. ماشینە رەشەکە توندی ئەکاتەوە و لەسەر دیوارە بەرزە سپیەکان هەڵئەگەڕێتەوە. "رادیکز" فیکە ساماناکەکانیان ئەبیسێ، سەری لە نێوان شانەکانیدا ئەشارێتەوە.

دڵی هێندە توند لێ ئەدا، گوێی لە هیچی تر نیە، ئەڵێی هەموو تەختایی پارکینگەکە و خانووەکان و درەختەکان و رێگا قیرتاویەکان لەگەڵ دڵیدا دەست

ئەكەن بە لێدان و هەڵبەزینەوە و ئازاردانی. لاقەكانی هەڵدێن، هەڵدێن و ئەكوترێن بەسەر زەویە قیرتاویەكەدا، ئەكوترێن بەسەر زەویە شلەكەی ریزە درەختەكاندا، بەسەر گوڵەكاندا باز ئەدات، بەسەر دیوارە نزمەكانی چیمەنەكاندا ئەپەرێتەوە و بە هەموو هێزیەوە رائەكات. ترس و هەراس شڵەژاندوویەتی، نازانێ لاقەكانی بۆ كوێیی ئەبەن. ئێستا دیواری پاركینگەكەیە و لاقەكانی توانای فڕینیان نیە. بە درێژایی دیوارەكەدا هەڵدێ، بە ناو ماشینە وەستاوەكاندا خوار و خیچ تێئەپەڕێ. پێویست ناكات كورە لاوەكە ئاوڕ بداتەوە بزانێ ئایا ماشینە رەشەكە هێشتا لەویایە، جوان لێی نزیك بووەتەوە و بە كڕەكڕی تایەكانی و خڕەخڕی ماتۆڕەكەیەوە بە هەموو خێراییەكەوە دەور ئەداتەوە. پاشان لەدواوە لەسەر هێڵێكی رێكی درێژ كە بەرەو شەقامەكە ئەكرێتەوە و جەستە بچووكەكەی "رادیكز" وەك كەروێشك هەڵئەبەزێتەوە.

ماشینە رەشەكە هەر گەورە و گەورە ئەبێتەوە، نزیك ئەبێتەوە، تایەكانی رێگای قیرتاوی رێنخەڵانەكە قووت ئەدەن. بەدەم راكردنەوەوە "رادیكز" دەنگی هەڵدانەوەی سەیوانەكان ئەبیسێ، لەملاو ئەولادا، وائەزانێ ئێستا هەموو خەڵك لەسەر بانیجەكانەوە بۆ راكردنەكەی ئەو ئەڕوانن. لەپڕ لە دیوارەكەدا شتێ وەك دەرگا دەرئەكەوێ و جەستەی "رادیكز" ئەپەڕێتە دەرەوە.

ئێستا لەمبەر دیوارەكەیە، تاك و تەنیا، لەسەر شەقامێ كە بەرەو دەریا ئەڕوا، دوو یان سێ دەیەقە تا دەریا رێگایە، هەر ئەو ماوەیە كە پێویستە تا ماشینە رەشەكەی پۆلیس بگاتە دەرگای پاركینگەكە و نیوەدەورێ لە شەقامەكە بداتەوە. كورە لاوەكە ئەوە ئەزانێ، بێ ئەوە بیری لێ كاتەوە، ئەڵێی دڵە پەشۆكاوەكەی و لاقەكانی لە جیاتی ئەو بیر ئەكەنەوە، بۆ كوێ بڕوا؟ كەمتر لە سەد میتری شەقامەكە ئەگاتە دەریا و تاشەبەردەكان، پیاوەكە بە شێوەیەكی غەریزی بۆ ئەوێ ئەڕوا، هێندە توند هەڵدێ هەوای گەرمی رۆژ، ئاو لە چاوی دێنێ، ئیتر هیچ نابیسێ، جگە لە هێڵی رەشی شەقامەكە كە تیشكی هەتاو بە هەموو هێزیەوە بەسەریەوە ئەسووتێ و لەوپەریەوە بەسەر دیوارەكەوە رەنگە شیریەكەی دەریا و ئاسمان تێكەڵ بوون.

ئەونە توند هەڵدێ کە ئیتر دەنگی چەرخی ماشینە رەشەکە لەسەر جادەکە و دوو هۆرنە سامناکەکەی کە بۆشایی نێوان خانووەکان پڕ ئەکاتەوە نابیسێ. دیسان چەن باز ئەدات، دیسان، لاقەکان، دیسان چەن دڵەخورپە، دڵ، دیسان ... چونکە دەریا ئیتر زۆر دوور نیە، دەریا و ئاسمان تێکەڵاو بوون، شوێنێ کە ئیتر نە خانووی لێیە و نە مرۆڤ و نە ماشین، پاشان لە کاتێکدا لەسەر جادە سافەکە هەڵئەبەزێتەوە، رێک ئەڕوا بەرەو دەریا و ئاسمان کە تێکەڵاو بوون، وەک ئاسکێک کە راوچیەکان لێی نزیک بوونەتەوە. لەمساتەدا ئوتووبووسێکی گەورەی شین نزیک ئەبێتەوە، چراکانی هێشتا رۆشنن و هەتاوی بەیانی لەسەر شووشە لارەکەی پێشەوەی ئەدرەوشێتەوە. لە کاتێکدا جەستەی "رادیکز" لەژێر کاپووتەکە و چراکانیدا و دەنگی بەرزی وەرەقە کانزاییەکان و جیڕەجیڕی ئیستۆپەکەیدا، تێک ئەشکێ.

کەمێ لەولاترەوە، لە قەراخی باخی دارخورماکانەوە، ژنێکی زۆر خەمین، بێ جووڵە، وەک رۆحێک، بە هەموو هێزیەوە ئەڕوانێ، ئەو نابزوێ، ئەڕوانێ، لە کاتێکدا خەڵکەکە لە هەموو لایەکەوە لەدەور ئوتووبووسەکە و ماشینە رەشەکە و بەتانیەک کە جەستە تێک شکاوەکەی دزەکەی داشاردووە، کۆ ئەبنەوە.

# تیزنیت - ۲۳ ئوکتوبری ۱۹۱۰

له جێگایه‌کدا که شار له‌گه‌ڵ زه‌ویه سووره‌که تێکه‌ڵ بووه، دیواره به‌ردینه وشکه کۆنه‌کان، ریزی ماڵه وێرانه‌کان، له نێوان ئه‌و ئه‌قاقیانه‌ی که زۆربه‌یان سووتاون، له‌ویا که "با" به ئازادی رائه‌بووڕێ، دوور له سه‌رچاوه‌ی ئاوه‌که، دوور له سێبه‌ری دارستانه‌کانی خورما، له‌ویا شێخی پیر خه‌ریکه ئه‌مرێ.

له دوای رێپێوانه درێژه بێهووده‌که‌ی، گه‌یشتووه‌ته ئێره، شاری "تیزنیت". له باکوور، له وڵاتی پادشا به‌زیوه‌که‌وه، سه‌ربازه بێگانه‌کان، شار بۆ شار ئه‌هاتنه پێش و هه‌موو کۆسپ و له‌مپه‌ری به‌رده‌میان ته‌فر و توونا ئه‌کرد.

له باشوور، سه‌ربازه مه‌سیحیه‌کان چوونه‌ته دۆڵی پیرۆزی "ساگیت ئه‌لحه‌مرا"، ته‌نانه‌ت شاری "سمارا" و کۆشکه چۆڵه‌که‌ی مائه‌لعه‌ینه‌ینیان داگیر کردووه. "با"ی به‌دبه‌ختی له‌سه‌ر دیواره به‌ردینه‌کانه‌وه هه‌ڵیکردووه، له کون و که‌له‌به‌ره ته‌نگه‌کانه‌وه، "با"یه‌ک که هه‌موو شت دائه‌رزێنێ، هه‌موو شت پووچ و خاڵی ئه‌کاته‌وه.

لێرە "با"ی بەدبەختی هەڵئەکات، "با"یەکی فێنک کە لە باکوورەوە دێت و کەفی دەریا لەگەڵ خۆی دێنێ.

لە دەوروبەری تیزنیت، پیاوە شینەکان وەک حەیوانی ون بوو پرژ و بڵاو بوون، لەژێر کۆڵیتەکان کە لە لق و گەڵا درووست کراون، چاوەڕوانن.

لە هەموو ئوردووگاکەدا، تەنیا خشە و هاژەی "با" بە ناو ئەقاقیەکاندا دێ و جارجارێ بۆڕەی ئاژەڵێ. بێدەنگیە بەرین و ساماناکەی هێرشی سەنگاڵیەکان لە دۆڵی بە هارەچۆمەکەی "تادلا"وە هێشتا تێک نەشکاوە. ئێستا دەنگی جەنگاوەرەکان نەماوە، ئاوازەکان خامۆش بوون، کەس لەوەی کە ڕووئەدات قسە ناکات، لەوانەیە لەبەر ئەوە بێت کە ئیتر هیچ ڕوو نادات.

"با"ی مەرگ لەسەر زەویە وشک هەڵاتوەکە هەڵئەکات، "با"یەکی زیان هێنەر کە لە سەرزەویە داگیرکراوەکانەوە دێت، لە "مۆگادۆر"، "ڕابات"، "فێ"، لە "تانژیر"، "با"یەکی فێنک کە زەنازەنای دەریای لەگەڵە و لەوپەڕیشەوە، هەراهەرای شارە سپیە گەورەکان کە بانکدار و تاجرەکان بەسەریاندا حکوومەت ئەکەن.

لە ماڵە گڵینەکەدا کە بانەکەی ڕووخاوە، شێخە پیرەکە، لە نێوان پاڵتۆکەیدا، لەسەر زەویەکە ڕاکشاوە، بە گەرمایەکی خنکێنەرەوە هەوایەکی سیخناخ لە ویزەی مێش و زەردەواڵە. ئێستا ئیتر ئەزانێ کە هەموو شت لەدەست چووە.

هەموو شت دوایی هاتووە؟ دوێنێ و پێرێ، هەواڵهێنەرەکان لە باشوورەوە هەواڵیان بۆ هێنابوو، بەڵام نەیویست بیبیسێ. هەواڵهێنەرەکان هەواڵی باشووریان پێ بوو. تەسلیم کردنی "سمارا"، هەڵهاتنی مەولای هیبا بەرەو کێوەکانی "ئەتلاس".

بەڵام ئێستا هەواڵێکیان هێناوە، بۆ ئەو کەسانەی بە تەمای هەواڵن: «شێخی گەورە "مائەلعەینەین" بە زوویی ئەمرێ، چاوی نابینێ و ئیتر ناتوانێ قسە بکات. ئەڵێن کە شێخی گەورە لە فەقیرانەترین ماڵی "تیزنیت" وەک سواڵکەرێک خەریکە ئەمرێ، دوور لە کورەکانی، دوور لە خەڵکەکەی.»

لەدەور ماڵە ڕووخاوەکە چەن پیاو دانیشتوون، دوایین جەنگاوەرە شینەکانی

هۆزی بارەکەللایین لە دەشتی چەمی "تادلا"وە هەڵهاتوون، بێ ئەوەی ئاور بدەنەوە، بێ ئەوەی رووداوەکان لێک بدەنەوە.

ئەوانی دیکە گەڕاونەتەوە بەرەو باشوور، چونکە ئەزانن کە ئیتر هیچ هیوایەکیان نیە، و هەرگیز ناگەیەن بەو زەویانەی کە بەڵێنیان پێ درابوو. بەڵام ئەوان، زەویان نەئەویست، شێخی گەورەیان خۆش ئەویست. لایان پیرۆز و مەزن بوو، چونکە ئەو دوعا و تەبەرۆکی خوایی بۆ هێنابوون و هەر ئەوەش وەک پەیمانێک ببووە هۆی پێوەندیەک لە مابێنی ئەوان و شێخدا.

"نوور"، ئیمرۆ لای ئەوانە، لەسەر زەویە خۆڵاویەکە، لەژێر کەپرێکدا دانیشتووە و چاوی بڕیوەتە ماڵە گڵینە بان رووخاوەکە کە شێخی تێدا زیندانیە. هێشتا نازانێ کە شێخ خەریکە ئەمرێ. چەندین رۆژ بوو کە شێخی نەدیبوو کە بە پاڵتۆ چڵکنە سپیەکەیەوە، لە حاڵێکدا پاڵی داوەتەوە بە شانی خادمەکەیەوە، لەگەڵ "مەیمونا لالیی" ژنە گەورەکەی شێخ، دایکی مەولای "سەبا"، "شێر"، بێنەدەر.

کاتێ هاتبوو بۆ تیزنیت، هەواڵنێرەکانی بۆلای کورەکانی ناردبوو بۆ ئەوەی بێن بۆ لای. بەڵام هەواڵنێرەکان ئەگەڕانەوە، "مائەلعەینەین" هەموو شەوێک بەرلە نوێژ لە ماڵ ئەهاتە دەر و رووڵە باکوور، رێگایەک کە مەولا "هیبا"، لەوێوە ئەبوایە بێت، ئەیڕوانی. ئێستا ئیتر لێی روونە کە کورەکانی ناگەڕێنەوە، لە ماوەی دوو رۆژدا کوێر ببوو، ئەتوت مەرگ لە پێشەوە چاوەکانی لێ گرتبوو.

کاتێ ئەچووە دەرەوە، ئیتر چاوەکانی نەبوو کە بەرەو باکوور بە دوای کورەکانیدا ئەگەڕا، روخساری بوو، دەستەکانی و جەستەی کە تامەزرۆی حوزووری مەولای "هیبا" بوون.

"نوور" بۆ تارمایە ناسکەکەی ئەڕوانی، تارمایەکی خەیاڵی کە خادمەکانی دەوریان گرتووە و سێبەرە رەشەکەی "لالا" مەیمونا بە شوێنیەوەیە.

هەست بە سەرمای مەرگ ئەکات کە دیمەنەکە لێڵ و تاریک ئەکات، ئەڵێی هەور هەتاوی داپۆشیوە، "نوور" بیر لە جەنگاوەرە کوێرەکە ئەکاتەوە کە لە کەناوی

قەراخ چەمی "تادلا" خەوتووە، بیر لە روخسارە کوژراوەکەی هەڤاڵەکەی ئەکاتەوە کە رەنگە تا ئێستا چەقەڵەکان خواردبێتیان، بیر لە هەموو ئەوانە ئەکاتەوە کە لەسەر جادەکە مردوون، لەشەو و هەتاودا بەجێ ماون.

دوای ئەوە خۆی گەیاندبوو بە باقی کاروانەکە، کە لە کوشتارەکە هەڵهاتبوون، بۆ ماوەی چەندین رۆژ رێیان بڕیبوو، لە برسیەتی و ماندوویەتی تا سەرەمەرگ چووبوون، وەک دەرکراو و شاربەدەرکراو لە درێژایی جادە سفت و رەقەکاندا هەڵاتبوون، خۆیان لە شارەکان لادابوو، بە ترسەوە لە ئاوی چاڵەکانیان خواردبووەوە، پاشان شێخی گەورە نەخۆش کەوتبوو و ئەو ناچار ببوو لێرا بمێنێتەوە، لە دەروازەکانی تیزنیت، لەسەر ئەم زەویە خۆڵاویەکە "با"ی بەدبەختی هەڵی‌کردبوو. زۆربەی پیاوە شینەکان رێگاکەیان درێژە پێدابوو، رێگایەکی بێ پایان و بێ ئامانج، بەڵام ئەو نەیتوانیبوو لەگەڵیان بڕوا. رەنگە هێشتا بەتەمای پەرجۆیەک بوو، سەرزەویەک کە شێخی گەورە بەڵێنی پێ دابوون، شوێنێ کە ئاشتی و فەراوانی هەیە و سەربازە بێگانەکان هەرگیز ناتوانن پای لێ‌بنێن.

پیاوە شینەکان یەک لە دوای یەک مێگەلەکانیان لەگەڵ خۆیان بردبوو و رۆیشتبوون، بەڵام لەسەر رێگایاندا مەرگ و نابوودی بەزۆری هەبوو. ئەوان هەرگیز هێمنیەکەی پێشوویان دەست نەئەکەوتەوە، هەرگیز "با"ی بەدبەختی بەرۆکی بەرنەئەدان.

برێ‌جار قاو دائەکەوت: «مەولای "هیبا" هات... مەولای "سەبا"، "شێر"، پادشاکەمان...!» بەڵام هەر سەراوێک بوو کە لەگەڵ بێدەنگیە ئاگرینەکە تێکەڵاو ئەبوو.

ئێستا زۆر دێرە، چونکە شێخ "مائەلعەینەین"، خەریکە ئەمرێ. "با" ئیتر لەناکاو هەڵناکات، هێزی هەوا مرۆڤەکان بەرز ئەکاتەوە.

هەموو لەسەر ئەژنۆ بەرز بوونەتەوە و بەرەو رۆژئاوا ئەڕوانن، شوێنێ کە هەتاو بەرەو ئاسۆ دائەکشێ. زەویە خۆڵاویەکە، بەردەکانی وەک تێغ تیژن و بەرەنگێکی

وەک کانزای لوول خواردوو کە ئەدرەوشێنەوە، داپۆشراون.

تەم و مژێکی ناسک ئاسمان دائەپۆشێ، لە نێوانیانەوە هەتاو وەک بازنگەیەکی سوور دەرئەکەوێ، زۆر ئاوەڵا ئەنوێنێ.

کەس نازانێ بۆ "با" لەپڕ ئەوەستێ، ئەم ڕەنگە سەیر و سووتاوە لە ئاسۆدا هی چیە؟ بەڵام "نوور" دیسان هەست ئەکا سەرمایەک وەک یاو، ناخی ئەگرێ، لەرز ئەکات، ڕووی بەرەو ماڵە رووخاوەکە وەرئەچەرخێنێ، بینایی بەسەر دەرگا ڕەشەکەوە ئەگرسێنێتەوە، بەرەو ماڵەکە مل ئەنێ، جەنگاوەرانی "مائەلعەینەین"، بارەک ئەللایەکان، بە ڕوخسارە پڕلە پەژارەکانیانەوە، سەیری کورە لاوەکە ئەکەن کە بەرەو ماڵەکە ئەڕوا، بەڵام کەسیان بەری لێ ناگرن. بینایان خاڵی و ماندووە، ئەڵێی لە خەودا ئەژین، ڕەنگە ئەو ماوە درێژە بێهوودەیەی ڕێپێوانەکە، ئەوانیشی کوێر کردبێ، ریخی بیابان و هەتاو چاویانی سووتاندبێ. "نوور" بە ئارامی لەسەر بەردەلانەکە ئەچێتە پێش، بەرەو ماڵە گڵینەکە کە تیشکی خۆرئاوا دیوارە کۆنەکان ئەدرەوشێنێتەوە و سێبەری دەرگاکە کون ئەکات.

"نوور" ئێستەش لە هەمان دەرگاوە ئەچێتە ماڵەوە، وەک جاران کە لەگەڵ باوکیدا، بۆ لای قەبرە پیرۆزەکە ئەڕۆشتن، ساتێ بێ جووڵە ئەمێنێتەوە ، چاوی نابینێ، هەست بە فێنکی تەڕی ماڵەکە ئەکات. کاتێ چاوی بە تاریکیەکە ڕادێت، هۆڵە گەورە چۆڵەکە و زەویە پێشێل کراوەکەی ئەبینێ.

لەوپەڕ هۆڵەکە، شێخە پیرەکە لەسەر پاڵتۆکەی ڕاکشاوە و سەری لەسەر بەردێ داناوە. "لالا" مەیمونا لە تەنیشتیەوە دانیشتووە و خۆی لە پاڵتۆ ڕەشەکەی داپێچاوە و ڕوومەتی داپۆشیوە. "نوور" نقەی لێوە نایەت. هەناسەی ڕاگرتووە، دوای ماوەیەکی زۆر، "لالا" مەیمونا سەری بەرەو کورە لاوەکە وەرئەچەرخێنێ. هەستی بە ڕوانینەکەی کردبوو. ڕووبەنە ڕەشەکەی لائەبا، ڕوخسارە جوانە ڕەنگ مسینەکەی دەرئەکەوێ. چاوەکانی لە تاریک و لێڵیدا ئەدرەوشێتەوە. فرمێسک بەسەر گۆنایەوە ئەخزێتە خوارەوە، دڵی توندتر لێ ئەدات، ئازارێکی دڵتەزێن لە ناخی جەستەیدا

هەست پێ ئەکات. کاتێ پیرەژنەکە پێی ئەڵێ بێتە ماڵەوە، خەریک بوو پاشەکشێی ئەکرد و ئەڕۆیشت. بە ئارامی بەرەو ناوەڕاستی هۆدەکە ئەڕوا، لەبەر ئازاری جەستەی کەمێ چەماوەتەوە. کاتێ ئەگاتە بەردەم شێخ، لاقەکانی شل دائەڕمێن و قورس ئەکەوێتە سەر زەوی.

قۆڵەکانی رائەکشرێن بۆ بەرەوە، دەستی ئەکەوێ لە پاڵتۆ سپیەکەی "مائەلعەینەین"، هەروا روومەتی نووساوە بە زەویە تەڕەکەدا. ئیتر ناگری، هیچ ناڵێ، بیر لە هیچ ناکاتەوە، دەستی لە پاڵتۆ خوریەکەی گیر ئەدات و توند ئەیگووشێ. "لالا" مەیمونا لە تەنیشتیەوە بێ جووڵە خۆی لە پاڵتۆ رەشەکەی داپێچاوە و لای پیاوەکە خۆشی ئەوێ دانیشتووە. ئەو ئیتر هیچ نابینێ، هیچ نابیسێ، "مائەلعەینەین" بە ئارامی و بە ئازارەوە هەناسە ئەکێشێ، هەناسەی بە دژواری سینگی بەرز ئەکاتەوە، سیخە سیخی هەناسەی، هۆڵەکەی پڕ کردووەتەوە و لە تاریک و لێڵی هۆڵەکەدا، روخسارە لەڕ و لاوازەکەی هێشتا سپی و بێ گەردە. "نوور" بە هەموو هێزیەوە بینایی لەسەر پیرەمێردەکە ئەگیرسێنێتەوە، ئەڵێی نیگاکەی ئەتوانێ هاتنی مەرگ دێرتر بخات. لە لێوە نیوە کراوەکانی "مائەلعەینەین" وشەکان پچڕ پچڕ دەردێن، بەڵام سیخە سیخی گەرووی، خێرا وشەکان ئەخنکێنن، رەنگە ناوی کوڕەکانی بڵێتەوە، "محەممەد"، "رۆبۆ"، "تالیب"، "محەممەد لارداف"، "حەسەنا"، "سەعدبوو"، "ئەحمەد ئەششەمس"، کەسێ کە پێی ئەڵێن "هەتاو" بە تایبەت ناوی کەسێ کە هەرشەو لەسەر جادەکەی باکوور چاوەڕوانیەتی، "ئەحمەد دیبا"، ناسراو بە مەولای "سەبا"، "شێر".

"لالا" مەیمونا بە داوێنی پاڵتۆکە ئارەقی سەر روومەتی "مائەلعەینەین" پاک ئەکاتەوە، بەڵام ئەو تەنانەت هەست بە لێکەوتنی پەڕۆکە بەسەر تەوێڵیەوە ناکات.

جار جار هەر دوو باسکی راست ئەکاتەوە و هەوڵ ئەدات لاژووری جەستەی بەرز کاتەوە، ئەیەوێ دانیشێ. لێوی ئەلەرزێ، چاوی لەناو کاسەی چاویدا ئەخولێتەوە. "نوور" نزیکتر ئەبێتەوە، لەگەڵ "لالا" مەیمونا، "مائەلعەینەین" بەرز ئەکەنەوە، جەستەی ئەنیشێتە سەر زەوی، بۆ ماوەی چەن سات، بە هێزێکی سەیرەوە

لەسەر جەستە سووكەكەی دائەنیشێ، دوو قۆڵی بۆ بەرۆ راكێشاوە، ئەڵێی ئەیەوێ بوەستێ. نیگەرانیەكی زۆر بە روخساریەوە دیارە. روانینە بێ تینەكەی لە گلێنە بێرەنگەكانیدا "نوور" دووچاری ترس و هەراس ئەكات. "نوور" جەنگاوەرە كوێرەكە، كە "مائەلعەینەین" دەستی بەسەر چاویدا هێنابوو و هەناسەی بەسەر روخساری پیاوە بریندارەكەوە دێتەوە یادی.

ئێستا "مائەلعەینەین" هەر ئەو تەنیایە تاقی ئەكاتەوە. تەنیاییەك كە ناتوانێ لەدەستی هەڵبێت و كەس ناتوانێ بۆشایی نیگای دامركێنێتەوە.

ئازارێ كە "نوور" هەستی پێ ئەكات هێندە گەورەیە كە ئەیەوێ بروا و ئەم ماڵە تاریك و مردووە بە جێ بێڵێ، بەرەو دەشتە خۆڵاویەكان هەڵبێت، بەرەو رۆشنایی زێرینی رۆژئاوا. بەڵام لەپڕ لە دەستەكانیدا لە هەناسەیدا، هەست بە هێز ئەكاتەوە. بە ئارامی وەك ئەوەی بیەوێ بزاوتە پێشینەكان بێتەوە یادی، بێ ئەوەی ورتەی لێوە بێت، لەپی دەستی ئەنێتە سەر تەوێڵی "مائەلعەینەین". نووكی قامكەكانی بە ئاوی دەمی تەڕ ئەكا و بەسەر پێڵوەكانیدا دێنێ كە لە نیگەرانیدا ئەلەرزن. بە نەرمی فوو ئەكات بە روومەت و لێوەكانی و چاوی پیاوە پیرەكەدا. باسكی ئەگرێ و ماوەیەكی زۆر جەستە ناسكەكەی خۆی بەدەستەوە ئەدات و بە پشتا ئەخەوێ. ئێستا روخساری "مائەلعەینەین" ئارام و هێمن دیارە و ئەڵێی لە ئازارەكەی دەرباز بووە، بە چاوی بەسراوەوە بە نەرمی و بێدەنگ هەناسە ئەكێشێ، ئەڵێی خەوتووە.

"نوور"یش هەست بە ئارام بوونەوە ئەكات، ئازارەكانی ناخی جەستەی رەویوەتەوە، بێ ئەوە چاو لە شێخ هەڵگرێ، كەمێ خۆی ئەكشێنێتە دواوە، پاشان لە كاتێكدا سێبەرە رەشەكەی "لالا" مەیمونا لەسەر زەویەكە رائەكشێ كە بخەوێ، ئەڕواتە دەرەوە . شەو بە ئەسپایی دادێت، قیڕەقیڕی باڵندەكان لە رۆخی چەمە وەرزیەكەوە دێت كە بەرەو دارستانی خورماكە ئەخزن.

"با"ی فێنكی دەریا هەڵیكردووە و تەنەكەی سەر بانە رووخاوەكە بێوچان ئەلەرێنێتەوە. "مەیمونا" چرا رۆنیەكە دائەگرسێنێ و ئاو بەدەم شێخەوە ئەكات. لەبەر

دەرگای خانووەکەدا، "نوور" هەست ئەکاگەرووی سووتاوە و ئەگووشرێ، خەوی لێ ناکەوێ. شەو چەن جار بە ئیشارەی "مەیمونا" لە پیرەمێردەکە نزیک ئەبێتەوە و لەپی دەستی لەسەر تەوێڵی شێخ دائەنێ و فوو لە لێو و پێڵووەکانی ئەکات. بەڵام ماندوویەتی و بەدبەختی وزەی لا نەهێشتووە و ناتوانێ نیگەرانیەکەی "مائەلعەینەین" کە لێوەکانی هێناوەتە لەرزین، بڕەوێنێتەوە. ڕەنگە ئازاری ناخی جەستەی خۆیەتی ناهێڵێ هەناسەکانی هەڵبێت.

درووست بەرلەکازیوە، کاتێ هەوا بێدەنگ و کپ و خامۆشە و تەنانەت سرتەیەک و قیڕەی دەعبایەک نیە، "مائەلعەینەین" ئەمرێ. مەیمونا کە دەستی لەناو دەستیدا بوو، لای ئەو کەسەکەی گەلێ خۆشی ئەوێ خەوتبوو، هەر کە زانی مردووە دەستی کرد بە گریان و شیوەن.

"نوور" نزیک دەرگاکە راوەستاوە و بۆ دوایین جار بۆ تارماییە ناسکەکەی شێخی گەورە ئەڕوانێ کە لە نێوان پاڵتۆ سپیەکەیدا بەسەر عەرزەوە شەپۆل لێ ئەدات.

پاشگەز ئەبێتەوە، تەنیا لە شەودا، لە دەشتێکی ڕەنگ خوڵەمێشی کە تیشکی مانگ ڕووناکی کردووەتەوە، دوور ئەکەوێتەوە.

خەم و پەژارە و ماندوویەتی ناهێڵێ لەوە دوورتر کەوێتەوە، لای بنەدرکێکدا ئەکەوێ بەسەر زەویدا و خێرا خەوی لێ ئەکەوێ بێ‌ئەوە گوێی لە دەنگی "لالا"مەیمونا بێت کە وەک ئەوەی گۆرانی بڵێت، ئەگریەت.

***

بەم شێوە، ڕۆژێ بێ ئەوە خەبەر بدات، ئەڕوات، ڕێک بەرلە کازیوە، خۆی ئەشۆرێ، هەروا کە جاران عادەتی بوو، لە وڵاتەکەی خۆی کە بۆ ئەوبەر دەریا یان تا دەروازەکانی بیابان ئەڕۆیشت. گوێ لە هەناسەکانی وێنەگرەکە ئەگرێ کە لەسەر قەرەوێڵە گەورەکەیدا خەوتووە. گەرمای هاوین لەپێی خستووە، قیژەی پەڕەسێلکەکان و دوورتر، دەنگە دەنگی ئارامی ئاوپرژاندنی ئاوپرژێنە گشتیەکان دێت.

"لالا" دوو دڵە، چونکە ئەیەوێ شتێ بۆ وێنەگرەکە، نیشانەیەک، پەیامێک، بۆ خواحافیزی دابنێت. چونکە پێنووسی پێ‌نیە، بە لەتێ سابوون، نیشانە بەناو بانگەکەی هۆزەکەی ئەکێشێ کە وێنەکانی بەوە ئیمزا ئەکرد. ♡

چونکە کۆنترین ڕەسمێکە کە ئەیزانێ و وەک "دڵە". ئەمجا لە شەقامەکانی شار بۆ دوایین‌جار تێئەپەڕێ. ماوەی چەندین ڕۆژ بەشەمەندەفەر، لەم شار بۆ ئەو شار، لەم کیشوەر بۆ ئەو کیشوەر ئەڕوا. هێندە لە ئێستگەکاندا بەتەمای شەمەندەفەر دانیشتبوو لاقەکانی وەک داریان لێ هاتبوو و سمتی سڕ ببوو. خەڵکەکە ئەهاتن و ئەچوون، قسەیان ئەکرد، ئەیانڕوانی، بەڵام کەس بۆ تارمایی کچێکی لاو بە سیمای شەکەتەوە

ورد نەئەبووەوە کە بەو گەرمایە خۆی لە پاڵتۆیەکی بۆری درێژدا داپێچابوو. ڕەنگە ئەوان پێیان وابوو کە فەقیرە، یان نەخۆشە. برێجار لەناو واگۆنەکان قسەیان لەگەڵی ئەکردا بەڵام ئەو لە زمانیان تێ نەئەگەشت و هەر بە بزەیەک وڵامیانی ئەدایەوە.

پاشان کەشتیەکە بە ئارامی لەسەر دەریا چەورەکەدا ڕێ ئەکەوێ. لە ئەلجەزیرە دوور ئەکەوێتەوە و بەرەو "تانژیر" لەسەر عەرشەکە هەتاو و خوێ ئەسووتێن. خەڵکەکە ترنجاونەتە سێبەرەکە، ژن و پیاو و منداڵ لای کارتۆن و ساکەکانیانەوە دانیشتوون. برێکیان بۆ ئەوەی نیگەرانی و دڵەخورپەکەیان برەوێتەوە لە ژێر لێوەوە ئاوازێکی خەمین ئەڵێنەوە. ئەمجا ئاوازەکە دائەمرکێتەوە و ئیتر جگە لە لەرەلەری ماتۆری کەشتیەکە چی‌تر نابیسرێ.

"لالا" لەسەر عەرشەکەوە چاوی بڕیوەتە دەریا شینە تۆخە سافەکە، کە شەپۆلەکان بە ئارامی لوول ئەخۆن و ئەچنە پێش، بە هێڵی سپی دوای کەشتیەکەدا، دولفینەکان هەڵدەبەزنەوە و دوای کەشتیەکە ئەکەون، جیا ئەبنەوە، "لالا" بیر لە باڵندە سپیەکە ئەکاتەوە، باڵندەیەک کە شازادەی ڕاستەقینەی دەریا بوو، کە لە ڕۆخی دەریادا ئەفری، ئەو کاتە کە "نوعمان"ی پیر بوو، دڵی توندتر لێ‌ئەدا، بە مەستیەوە ئەڕوانێ، ئەڵێی لە ڕاستیدا ئەیبینێ، باڵەکانی لەسەر دەریا بڵاو کردووەتەوە، گڕی هەتاو بەسەر پێستیەوە هەست پێ‌ئەکات. گڕ و سووتانێکی کۆن و قەدیمی، ڕووناکی جوان و توندی ئاسمان ئەبینێ.

دەنگی سرتەسرتی ئاوازی پیاوەکان لەپڕ ئەیهەژێنێ، بێ ئەوە بزانێ بۆ، هەست بە فرمێسکەکانی سەر گۆنای ئەکات. لە مێژە ئەو ئاوازەی بیستووە، وەک لە خەوی رابردوویەکی دووری تەماویدا. پیاوە ڕەش‌پێستەکانن کە تەنیا کراسێکی پڵنگی و پانتۆڵێکی ڕەشی زۆر کورتیان لەبەرە بی گۆرەوی و بە سەرپێی ژاپۆنیەوە، یەک لە دوای یەک ئاوازە کە لە ژێر لێوەوە ئەڵێنەوە کە کەسێ تریان لێ‌تێ‌ناگات و خۆیان ئەشەکێننە و چاویان نیوە قوونجاندوە.

کاتێ "لالا" ئاوازەکەیان ئەبیسێ، لە ناخیدا زۆر بە نهێنی تامەزرۆی دیسان دیتنی

زەویە سپیەکە ئەکاتەوە، دارخورما بەرزەکان لەناو دۆڵە سوورەکاندا، پانتایی ڕێخ و بەردەکان، ڕۆخە چۆڵەکان و تەنانەت گوندە گڵینە و تەختەیەکان بەسەر بانە لۆحە قیرتاویەکەیانەوە.

چاوی نیوە ئەقوونجێنێ و لەبەردەمیا، ئەیبینێ، ئەڵێی هەر لەوێ بووە و ئەمانەی لە یەک یان دوو سەعاتدا بە خەو دیتوە، لە ناخیدا، لەناو سکە بەرز بووەکەیدا، هەر ئەو جم و جووڵە هەیە، ئەم هەژاندنانە کە ئازاری پێ ئەگەیەنێ و لەناو پێستیەوە تەپەی دێت.

ئێستا بیر لە منداڵێ ئەکاتەوە کە لە دایک ئەبێ، ئەژی، ئەخەوێ. کەمێ ئەلەرزێ، سکە بەرز بووەکەی لەناو دەستیدا ئەگووشێ، خۆی ئەدا بە دەست کەشتیەکەوە بیشەکێنێتەوە، پاڵ ئەداتەوە بە دیوارە ئاسنیەکەوە کە ئەلەرێتەوە. ئەویش لەژێر لێوەوە بۆ مناڵەکە ئاواز ئەخوێنێ ، بۆ ئەوەی ئیتر نەجووڵێتەوە و گوێی لێ گرێ. ئاوازێکی کۆن، کە "عەمە" لە زوانی دایکیەوە ئەیوتەوە.

«... ڕۆژێ، قاڵاو ڕەشە سپی ئەبێت، دەریا وشک ئەبێت، هەنگوێن لەناو کاکتوسدا پەیدا ئەبێت، لە لقی ئەقاقیا نوێن ساز ئەکەن، ڕۆژێ، ئای ڕۆژێ، ئیتر ژەهر لە دەمی ماردا نیە، گوللەی تۆپەکان ئیتر مەرگ‌هێنەر نین، چونکە ئەو ڕۆژە، من ئەوینەکەم بەجێ دێلم...»

هارەهاری ماتۆرەکە، دەنگی ون ئەکات بەڵام مناڵەکە لەناو سکیدا جوان گوێی لێی ئەگرێ و ئەخەوێ، پاشان بۆ ئەوەی ترسەکەی بڕەوێنێتەوە بەرزتر ئەیڵێتەوە، ئاوازە خۆشەویستەکەی ئەڵێتەوە،

- مێدیە - تێر - ڕا - نێ نێ ێ...

کەشتیەکە بە ئارامی لەژێر ئاسمانە قورسەکە، لەسەر دەریا چەورەکە ئەخزێتە پێشەوە، ئێستا خاڵێکی خۆڵەمێشی ناحەز لە ئاسۆوە دەرئەکەوێ، ئەڵێی هەورێکە خۆی بە دەریاوە گیردابێت "تانژیر"، هەموو بەرەو خاڵەکە وەرئەچەرخن، بێدەنگ ئەبن، تەنانەت ڕەشەکان ئیتر ئاواز ناخوێنن، ئافریقا بە ئارامی لەبەر کەشتیەکەوە

دەرئەکەوێ، چۆڵ و نادیار.

ئاوی دەریا تەنک و خۆڵەمێشی دیارە، یەکەمین گاکیەکان لە ئاسماندا باڵیان گرتووەتەوە، ئەوانیش خۆڵەمێشی و لاواز و ترساون، یانێ هەموو شت گۆڕاوە؟

"لالا" بیر لە جاری یەکەم ئەکاتەوە کە بەرەو مارسێی ڕۆشتبوو، کاتێ هەموو شت بۆی نوێ بوو. شەقامەکان، خانووەکان، مرۆڤەکان. بیر لە خانووەکەی "عەمە" ئەکاتەوە، هوتێلی "سەنت بلانش"، زەویە بایرەکانی نزیک مەخزەنەکان، بیر لە هەموو ئەو شتانەی لە پشتە سەریەوە، لەشارەگەورە مەرگ‌هێنەرەکە بە جێی هێشتووە. بیر لە "رادیکز"ی گەدا ئەکاتەوە، لە وێنەگرەکە، ڕۆژنامە نووسەکان، هەموو ئەوانەی وەک سێبەرێکیان لێ هاتووە و ئێستا جگە لەم لیباسانە و ئەم پاڵتۆ بۆرەکە "عەمە" لە ڕۆژێکدا گەیشتبووە ئەوێ پێی دابوو، چی‌تری نیە، دەستەیەک ئەسکەناسیش بە دەرزیەکەوە گرێ داوە کە بەرلەوەی ڕێ کەوێ لە گیرفانی کۆتی وێنەگرەکە هەڵی‌گرتبوو.

بەڵام ئەڵێی هیچ ڕووی‌نەداوە، ئەڵێی هەرگیز سێتەی تەختەیین و لۆحە قیرتاوینەکەی بە جێ نەهێشتووە، فەلاتە بەردینەکە و تەپۆڵکەکان کە "ئارتانی" لەوێ ئەژی، ئەڵێی هەر سەعاتێک و دووان خەوی لێ کەوتووە.

بۆ ئاسۆ چۆڵەکەی دوای کەشتیەکە ئەڕوانێ، پاشان خاڵی زەویە خۆڵەمێشیەکە و کێوەکە، لەوێدا کە تا دێت خاڵی خانووەکانی شارە عەرەبیەکە گەورە ئەبێتەوە. لەرز ئەیگرێ، چونکە منداڵەکە لە ناو سکیدا بە توندی ئەجووڵێتەوە.

لەناو ماشینێکدا کە لەسەر جادە خۆڵاویەکە بەرەو پێش ئەڕوا و بۆ سوار کردنی جووتیار و ژن و مناڵەکان ڕائەوەستی، "لالا" هەست بە مەستیە سەیرەکە ئەکاتەوە، ڕووناکی ئامێزی بۆ گرتووەتەوە، تەپ و تۆزێکی ورد کە وەک هەڵم لە هەر دوولای ماشینەکە بەرز ئەبێتەوە و ئەڕواتە ناو ماشینەکە، ئەگیرێتە ناو گەرووی و ژێر قامکەکانی، ڕووناکی، وشکی تەپ و تۆز، "لالا" هەست بە بوونی ئەکات، ئەڵێی پێستێکی تازەیە، ئەڵێی هەناسەیەکی تازەیە.

ئایا شتێکی دیکە هەیە؟ دونیایەکی دیکە، سیماگەلێکی دیکە و رووناکیەکی دیکە؟ بیرەوەریە درۆینەکان ناتوانن بەسەر دەنگی لەهێز کەوتووی ماشینەکەدا، بەسەر گەرما و تەپ و تۆزدا زاڵ بن.

رووناکیەکە وەک جاران، لەسەر فەلاتە بەردینەکە گسک لە هەموو شت ئەدات. "لالا" دیسان هەست بە قورسی نیگا نهێنیەکە ئەکات کە ئابلۆقەی داوە. ئیتر روانینی پڕ لە حەز و هەوەسی پیاوەکان نیە، روانینی شکۆمەندی کەسێکە کە "لالا" ئەیناسێ و وەک خوایەک دەسەڵاتی بەسەریدا هەیە.

ماشینەکە بە سەر تەپوتۆزەکەدا بەرەو پێش ئەڕوا، لە تەپۆڵکەکان سەر ئەکەوێ، هەموو شوێنێک هەر زەوی وشک هەڵاتووی سووتاوە وەک پێستی مارێکی پیر وایە. بەسەر ماشینەکەوە ئاسمان و رووناکی بەگەشی ئەسووتێ و گەرمای ناو ماشینەکە تا دێت وەک تەنوور هەر زۆرتر ئەبێتەوە.

"لالا" هەست بە تنۆکە ئارەقەکان بەسەر تەوێڵ و مل و پشتیدا ئەکات. لەناو ماشینەکەدا خەڵک بێ جووڵە و هێمن و کپ و بێدەنگن. پیاوەکان خۆیان لە پاڵتۆ خوریەکانیان داپێچاوە، ژنەکان لە نێوان سەندەڵیەکان هەڵترووشکاون، سەرپێچ و دەمامکی شین و رەشیان هەڵبەستووە.

هەر تەنیا شۆفێرەکە ئەجووڵێتەوە... روخساری گرژ ئەکات و بۆ ئاوێنەی ماشینەکە ئەڕوانێ، چەن جار لەگەڵ "لالا" چاویان یەک ئەگرێتەوە. "لالا" سەری وەرئەچەرخێنێ، پیاوە قەڵەوە روومەت پانەکە ئاوێنەکە ئەگەڕێنێ بۆ ئەوە باشتر "لالا" ببینێ، پاشان بە توورەییەوە ئەینێتەوە سەر جێگاکەی خۆی. تا ئاخەرین رادە دەنگی رادیۆکە بەرزە، کاتێ لە نزیکی ئێزگەیەکی ئەلەکتریکی تێئەپەڕن، ئاهەنگێکی ماوەدار ئەبیسرێ. تەواوی رۆژ ماشینەکە لەسەر جادە قیرتاوەکان، لە چەمە وشک بووەکان تێئەپەڕێ، لەبەر گوندە گڵینەکاندا کە منداڵە پێخاوسەکان چاوەڕوانن ئەوەستێ.

سەگە لاوازەکان لەپەنای ماشینەکەوە هەڵدێن، ئەیانەوێ گاز لە تایەکانی بگرن.

برێجار ماشینەکە لە دەشتێکی چۆڵدا ئەوەستێ چونکە ماتۆری ماشینەکە لەکار ئەکەوێ. لە ماوەیەکدا کە شۆفێرەکە بەسەر کاپووتی ماشینەکەدا دائەنەوێتەوە، ژن و پیاوەکان دێنە خوارەوە، لە سێبەری ماشینەکە دائەنیشن یان لە پشت دەوەنی فرفیۆنەکاندا بۆ پیشاو کردن هەڵدەتروشکێن.

بڕێکیان لیمۆیەکی بچووک دەردێنن و ماوەیەکی زۆر ئەیمژن. ئەمجا ماشینەکە لەسەر جادەکە رێ ئەکەوێتەوە، لە تەپۆڵکە بێ پایانەکان بەرەو ئاوا بوون سەرئەکەوێ، شەو بە زووی پانتایی دەشتە چۆڵەکە دائەگرێ، بەردەکان دائەپۆشێ و تەپ و تۆزەکە ئەکات بە خۆڵەکەوە.

شەو لەپڕ ماشینەکە ئەوەستێ و "لالا" لە دوورەوە رووناکیەکانی ئەوبەر چەمەکە ئەبینێ. لە دەرەوە شەو داخە، سیخناخ لە خشە خش و وزەوزی دەعباکان و قیژەقیژی قربۆقەکان، بەڵام پاش سەفەری چەن سەعاتەی ناو ماشینەکە، کە ئەم هەموو هەرایە وەک بێ دەنگی وایە "لالا" دائەبەزێ و بە ئارامی لە درێژای چەمەکە رێ ئەکەوێ. حەمامی گشتی ئەناسێتەوە و پاشان تەنکاوی ئاوەکە. چەمەکە رەشە، خێزاو و نیشتاوەکە پاڵ بە ئاوە ئارامەکەوە ئەنێن، "لالا" لە تەنکاوەکە تێئەپەڕێ، ئاو تا رانەکانی دێت، بەڵام تازەیی چەمەکە هێمنی ئەکاتەوە، لە تاریک و لێڵیدا تارمایی ژنێ ئەبینێ کە بوخچەیەک بەسەریەوە، کراسەکەی تاسکی بەرز کردوەتەوە، کەمێ لەولاتر، لەولاتری ساحل، رێگای "سیتە" ئەگرێتە بەر. پاشان یەک لە دوای یەک ماڵە گڵینە و تەختەییەکان دەرئەکەون.

"لالا" ئیتر خانووەکان ناناسێتەوە، ماڵە نوێکان لە هەموو جێگایەکدا هەن، تەنانەت لە نزیک رۆخی چەمەکە، لەویاکە ئاوەکە هەڵدەچێ.

رووناکی کزی گڵۆپەکان، عەرزی پێشێل کراوی کۆڵانەکان رووناک ئەکاتەوە و خانووە تەختینە و لۆحینەکان ئەڵێی ماڵە چۆڵەن. کاتێ لە کۆڵانەکان تێئەپەڕێ سرتە سرت و گریانی منداڵەکان ئەبیسێ و جێگایەک لەوپەڕی شار، دەنگی حەپ حەپی سەگێکی وەحشی دێت. "لالا" لە سەر جێ پێ کۆنەکان پێ دائەنێ. پاپۆشەکانی

دەردێنێ بۆ ئەوە باشتر هەست بە تەڕی و تازەیی زەویەکە بکات.

هەمیشە هەمان نیگایە کە لێرە لە کۆڵانەکانی ستیە دووری ئەخاتەوە. نیگایەکی ماوەدار و نەرم کە بە یەکجاری لە هەموو لایەکەوە دێت. لە قووڵایی ئاسماندا، لەگەل "با"دا ئەشەکێتەوە. "لالا" لەبەر ئەو خانووانەی کە ئەیانناسێتەوە تێئەپەڕێ، بۆنی ئاگری ئاگردانەکان هەست پێ ئەکات کە خەریکن ئەکوژێنەوە.

دەنگی "با" لە ناو لۆحە قیرتاویەکان ئەناسێتەوە، بە یەکجاری هەموو ئەوانە هەست پێئەکات ئەڵێی هەرگیز لێرە نەڕۆشتووە هەر سەعاتێ و دووان خەوتووە.

پاشان لە ڕێگای ماڵی "ئیکیکر" لە نزیک کانیەکەوە، بەرەو تەپۆڵکەی لمەکان مل ئەنێت. ماندوویەتی جەستەی قورس داگەڕاندووە، ئازارێ بە گورچیلەکانیدا ئەگەڕێ، بەڵام نیگا نەناسراوەکە رایئەکێشێ و ئەو هەست ئەکات کە ئەبێ لە گوند دوور کەوێتەوەو پێخاوس، بە هەموو هێزیەوە بە ناو دڕکەجاڕی تەپۆڵکەی لمەکاندا بڕوا.

لە درێژای تەپۆڵکە ڕەنگ خۆڵەمێشیەکان، وەک جاران تێئەپەڕێ، جار جار ئەوەستێ، چاو ئەگەڕێنێ بەدەور و بەریدا. چڵێ گیای قەڵەو هەڵدەکەنێ و لە نێوان قامکەکانیدا ئەیپروێنێ، بۆ ئەوەی بۆنەکەی کە حەزی لێئەکا هەست پێکات. هەموو چاڵاییەکان ئەناسێ، کوێرەڕێگاکان کە بەرەو تەپۆڵکە بەردینەکان، بەرەو زەلکاو و شۆرەزارەکان ئەڕوا و بەرەو هیچ کوێی نابەن.

شەو قووڵ و هێمنە. لە ئاست سەریەوە ئەستێرەکان ئەگەشێنەوە. بۆ ئەمان چ ماوەیەک تێپەڕیوە؟ شوێنیان نەگۆڕاوە، ئاگرەکانیان نەکوژراوەتەوە؟ وەک گڵۆپە سیحراویەکان، ڕەنگە تەپۆڵکەکان جووڵابێتنەوە، بەڵام چۆن بزانن؟

ئەو قرژاڵە پیرەی کە شاخ و چنگەکانی بەرز ئەکردەوە و ئەیترساند، ئێستا ئیتر نیە. ئیتر قوتووی خواردەمەنی و توورداوی لێ نیە. چەند دەوەن سووتاون، لقەکانیان بۆ ئاگردانەکان شکاونەتەوە. لە تەپۆڵکەیەک سەرئەکەوێ، سیخە سیخی پێ کەوتووە. ئازاری گورچیلەکانی جەرگبڕە. ئەناڵێنێ و ددانی ئەساوێ بە یەکدا و ناڵە

و هاوارەکانی ئاهەنگین ئەکات. بیر لە ئاوازێ ئەکاتەوە کە جاران زۆری حەز لێ ئەکرد و کاتێ نیگەران بوو و ئەترسا، ئەیخوێند، مێدیتر - را - نێ ێ ێ...

ئێستا لە سەر ریخە رەقەکەی رۆخی دەریا لە نزیک کەفی دەریاوە ئەچێتە پێشەوە، "با" ئیتر بە توندی هەڵ ناکات. دەنگی شەپۆلەکانی شەوانە ئارام و نەرمە. "لالا" دیسان هەست بە مەستی ئەکاتەوە. ئەڵێی هەموو ئەو شتانە بە تەمای ئەو بوون. ئەڵێی روانینی "ئیس سێر" "نهێنی"ەکەلەسەر رۆخی دەریاکە، لەگەڵ رۆشنایی ئەستێرەکان و هاژەی دەریا و سپیەتی کەفەکە تێکەڵبووە، شەوێکی بێترسە، شەوێکی دوور، شەوێکە کە "لالا" هەرگیز تاقی نەکردوەتەوە. ئەگاتە ئەو شوێنەی کە "نوعمان"ی پیر بەلەمەکەی رائەکێشاو بۆ درووست کردنی تۆرەکەی یان بۆ کوڵاندنی قیر، ئەمایەوە.

بەڵام ساحلەکە چۆڵ و هۆڵە و لەشەودا پان و بەرین دیارە تەنیا دارهەنجیرە پیرەکە لەبەرانبە تەپۆڵکەکە راوێستاوە، لقە درێژەکانی بەرەو "با" بە پشتا هەڵگەراونەتەوە. "لالا" بە تامەزرۆییەوە بۆنە توون و بێتامەکەی ئەناسێتەوە. بۆ جم و جووڵی گەڵاکانی ئەروانێ، لەداوێنی تەپۆڵکەکە لە تەنیشت دارەکە دائەنیشێ. ماوەیەکی زۆر بینایی لە سەر رائەگرێ ئەڵێی بێوچان ماسیگرە پیرەکە دەرئەکەوێ.

ماندوویەتی جەستەی "لالا"ی قورس کردووە، ئازار قاچ و قۆڵی بێهێز کردووە، بە پشتا خۆی بەسەر لمە چیاوەکەدا ئەخزێنێ، دڵنیا لە بۆنی دەریا و دار هەنجیرەکە، خەو ئەیباتەوە. مانگ لە رۆژهەڵاتەوە بەرەو شەوی سەر تەپۆڵکە بەردینەکان هەڵئەکشێ و رووناکیە بێرەنگەکەی دەریا و تەپۆڵکەی لمەکان رۆشن ئەکاتەوە و روخساری "لالا" ئەشۆرێتەوە. دواتریش "با" هەڵئەکات. بایەکی فێنک لە دەریاوە دێت. لە سەر و روخسار و قژی تێئەپەرێ. لم ئەپرژێنێتە سەر جەستەی، ئاسمان گەلێ گەورە و بەرینە، زەوی لە حەنایدا هەر هیچ نیە. لە خوار بورجی ئاسمانیەوە، شتەکان ئەگۆرێن. ئەبزوێن، شارەکان ئەڵقەکانیان گەورە کردووەتەوە.

لە نێوان گەردەلوولی تەپ و تۆز و قۆلانچەدا، مرۆڤەکان مردوون، ماڵەکان

رووخاون، بەڵام لە ساحل، نزیک دارهەنجیرەکە، لە جێگەکەی "نوعمان"ی پیر، ئەڵێی هیچ رووی نەداوە، ئەڵێی ژنە لاوەکە هەروا بێوچان خەوتووە.

مانگ لە تاقی ئاسمان هەڵدەکشێ پاشان لە ئاستی سەردەریاوە، بەرەو رۆژئاوا دائەگەرێ. ئاسمان ساف و ساماڵە، لە بیابان لەوبەر دەشتەکان و تەپۆڵکە بەردینەکان، سەرما لە لمەکەوە هەڵدەقوڵێ و وەک ئاو بڵاو ئەبێتەوە، ئەڵێی لێرە، هەموو زەوی و تەنانەت ئاسمان، مانگ و ئەستێرەکان هەناسەیان راگرتووە. ئەڵێی کات وەستاوە.

ئێستا هەموو شت وەستاوە. لەکاتێکدا "فیجار"*، کازیوە، هەڵدەکات، لە بیابان ئیتر رێوی و چەقەڵ ناکەونە دوای کەروێشک و سمۆرە.

ماری شاخدار، دووپشک و خشخشۆکە، لەسەر عەرزە ساردەکە، لە ژێر ئاسمانە رەشەکە، جووڵەیان لە خۆیان بریوە . "فیجار" زاڵ بووە بەسەریاندا. کردوویانیە بە بەرد، بە تۆزی بەرد، بە هەڵم، چونکە کاتێکە کە دەسەڵاتی ئاسمان بەسەر زەویدا دەست پێ ئەکات. جەستەکان ئەرچن و جاری واش هەیە گیانیان ئەگرێ.

"لالا" لە چاڵایی تەپۆڵکەی ریخەکە نابزوێ، پێستی ئەلەرزێ. لەرزێ کە جەستەی ئەبزوێنێ و تەقەی ددانەکانی دێت. بەڵام هێشتا خەوتووە. پاشان دووەمین کازیوە دێت، "بلانک"، رۆشنایی لەگەڵ هەوا رەشەکە تێکەڵ ئەبێت، لە کەفی دەریادا لە سەر خوێنی سەرتاشە بەردەکان و لە سەر بەردە تیژەکانی ژێر دار هەنجیرەکە ئەدرەوشێتەوە. تیشکێکی خۆڵەمێشی و بێرەنگ کە ترۆپکی تەپۆڵکە بەردینەکان رۆشن ئەکاتەوە و بەرەبەرە ئەستێرەکان ئەشواتەوە، بزنەکە، سەگەکە و مار و دووپشکەکە و سێ خۆشکە ئەستێرەکان، "مینتاکا"، "ئالنیلام"، "ئالنیتاک". ئەمجا ئەڵێی ئاسمان سەرەونخون بووە، پەردەیەکی سپی دایدەپۆشێ و دوایین ئەستێرەکانیش ئەکوژێنەوە. لە چاڵایی تەپۆڵکەی لمەکاندا، گیا درکاویە بچووکەکان

---

*- Fijar

ئەلەرێنەوە. شەونمەکان وەک مرواری لە ناو کۆشکەکانیدا ئەدرەوشێنەوە، لە سەر گۆناکانی "لالا" تنۆکەکان وەک فرمێسک خلێر ئەبنەوە. ژنە لاوەکە هەڵئەسێ و بە دەنگێکی نزم ئەناڵێنێ. چاوی ناکاتەوە، بەڵام ناڵەکەی بەرز ئەکاتەوە و لەگەڵ دەنگی بێوچانی دەریاکە لە گوێیدایە تێکەڵ ئەبێت. ئازار بە ناو سکیدا لوول ئەخوات. ماوەی هاوارەکانی لەگەڵ ئاهەنگی شەپۆلەکان خێرا و خێراتر ئەبێتەوە.

"لالا" ئەوەستێ، بەڵام ئازارەکە هەناسەی سوار ئەکات. لەپڕ تێئەگات کەکاتی لە دایک بوونی منداڵەکە گەشتووە، هەر ئێستا، لێرە لەسەر ئەم رۆخە، ترس بەرۆکی گرتووە، چونکە ئەزانێ کە تەنیایە و کەس بۆ یارمەتی نایەت، کەس. ئەیەوێ هەڵسێتەوە، چەن هەنگاو لەسەر ریخە ساردەکە بە تلاوتل ئەروا بەڵام ئەکەوێ و ناڵەکەی ئەبێ بە قیژە. لێرە تەنیا ساحلە خۆڵەمێشیەکەیە و تەپۆڵکەی ریخەکان کە هێشتا لەشەودان. لەبەردەمیا، دەریا قورس و خۆڵەمێشی و سەوز و تاریکە، هێشتا لەگەڵ رەشایی شەودا تێکەڵە. لەسەر ریخەکە رائەکشێ و ئەژنۆکانی ئەچەمێنێتەوە و بە دەم ئاهەنگی دەریاوە ئەناڵێنێ. ئێشەکەی لە شەپۆلەکانەوە دێت لە شەپۆلە درێژ و ماوەدارەکانەوە کە پۆپەیان ئەگاتە ئاستی تاریک و لێڵی ئاوەکە، بۆ ساتێ خۆی لە رۆشناییە بێرەنگەکە ئەگیرێنێ تا ئەشکێتەوە.

"لالا" بۆ رەوتی ئێشەکەی لەسەر دەریاکە ئەروانێ، هەر لەرزێکی لە قووڵایی ئاسۆوە دێت، لە مەڵبەندێکی تاریک و لێڵەوە کە خەسی شەوی هێشتا تیاماوە. بە ئارامی تیشکەکانی ئەپرژێنێ، تا سنوورەکانی رۆخی دەریا، لە رۆژهەڵات، بە بڵاو بوونەوە و هاوێشتنی سفرەی کەفەکەی، لە کاتێکدا ئاوەکە لەسەر لمە رەقەکە پێش ئەڕوا و دائەپۆشێ.

برێجار ئێشەکەی زۆرە، ئەڵێی سکی هەڵئەدرێت و خاڵی ئەبێتەوە. هاوارەکانی زۆر ئەبنەوە، هەرا و هوریای تێک شکانی شەپۆلەکان لەسەر لمەکە دائەپۆشێ.

"لالا" هەڵئەسێتەوە سەر ئەژنۆ. هەوڵ ئەدات بە چوار دەس و پێ لە درێژای تەپۆڵکە ریخەکەدا بچێتە پێش، تا سەر جادەکە، هێندە تەقالا ئەدات، بەو سەرمای

دەمەوبەیانە، ئارەق روخساری ئەخووسێنێ، چاوەڕوان ئەمێنێتەوە. چاو ئەبڕێتە دەریا، بەرەو جادەکەی ئەوپەڕ تەپۆڵکەکان وەرئەچەرخێ، ئەقیژێنێ، هاوار ئەکات: "ئارتانی"، ئا ئار - تا - نی.

وەک جاران کە ئەڕۆشتە سەر فەلاتە بەردینەکە و ئەویش لە چاڵایی تاشەبەردێکدا خۆی دائەشارد، هەوڵ ئەدا وەک شوانەکان فیکە بکێشێ، بەڵام لێوەکانی قەڵیشاون و ئەلەرزن.

لە ماوەیەکی کەمدا، خەڵکی ستیە لەخەو هەڵئەسن، مەلافەکانیان بەسەریانەوە لا ئەدەن، ژنان ڕێگای کانی ئەگرنە بەر، ڕەنگە کچانیش لە نێوان درکەجارەکەدا بە دوای چیلکەدا بگەڕێن. ژنەکان ئاگردانەکان دائەگرسێنن، بۆ برژاندنی نەختێ گۆشت و گەرم کردنەوەی شۆربای جۆ و دەم کردنی چایی. بەڵام هەموو ئەمانەدوورن، لەدونیایەکی تردان، وەک خەوێ کە بێ وچان لەوێ لە دەشتە قوراویەکەدا، کە مرۆڤەکان ئەژین، لە جەمسەری چەمەکە، نیشان ئەدرێ. یان دوورتر، لەوبەر دەریا، لە شاری گەورەی سواڵکەر و دزەکان، شارێکی وێرانکەر، بە خانووە سپیەکان و ماشینەکانیەوە.

فیجار، تروسکە سپی و ساردەکانی بە هەموو لایەکدا پرژاندووە، لە کاتێکدا پیرەکان لە بێدەنگی و ترس‌دا، ئەمرن، "لالا" هەست ئەکات خاڵی ئەبێتەوە و دڵی بە ئارامی و بە ئازارەوە ئەکەوێتە ترپە ترپ. شەپۆلەکانی ئێش و ئازار، ئێستا هێندە نزیک بوونەتەوە کە لە ناو سکیدا تەنیا ئازارێ بێ وچان شەپۆل لێ ئەدا و ئەکوترێ. بە ئارامی، بە ئازارە بێ برانەوەکەیەوە، بە سەر باڵیەوە بە درێژای تەپۆڵکەکەدا خۆی ئەخشێنێ. لەبەردەمیا، ئەولاتر، تارمایی درەختەکە بەسەر کۆگای بەردەکاندا درێژ ئەبێتەوە، کە لە حەنای ئاسمانە سپیەکەدا زۆر رەشە.

هەرگیز دارهەنجیرەکەی هێندە گەورە و بەهێز نەدیبوو. کۆتە گەورەکەی بە پشتا لوولی خواردووە، لقە قەڵەوەکانی چەکەرەیان کردووە، گەڵا جوانە تۆڕیەکان لە "با" فێنکەکەدا ئەبزوێن و لەبەر تیشکی ڕۆژدا ئەدرەوشێنەوە. "لالا" ئابلۆقە ئەدات. بە

سەختی هەناسەی هەڵدێ، جەستەی بە ئارامی بەرز ئەکاتەوە و لە درێژای لمەکە رایدەگرێ. لە پشت سەریەوە، هێڵێ کە لاقەکانی بە جێیان هێشتووە، وەک بڵێی قایەقێ لە وشکیدا بە تەناف راکێشرابێت، بە ئارامی و بە سەختی بارە قورسەکە رائەکێشێ و کاتێ ئازارەکە زۆری بۆ دێنێ بە ناڵە ناڵەوە ئەیکێشێ.

چاو لە تارمایی درەختەکە هەڵناگرێ، لە دار هەنجیرە کۆتە رەشەکە، کە گەڵا رۆشنەکانی لەبەر تیشکی رۆژدا ئەدرەوشێتەوە.

لە دار هەنجیرەکە نزیک ئەبێتەوە، تا دێت هەر بەرین‌تر ئەبێتەوە، ئەڵێی هەموو ئاسمانی گرتووە، سێبەرەکەی لە دەوریا وەک دەریاچەیەک رائەخرێ. لەوێ کە دوایین رەنگەکانی شەو هێشتا ماوە. بە ئارامی جەستەی ئەخزێنێتە ناو سێبەرەکەی، ژێر لقە بەرزە بە هێزەکانی کە وەک باڵی دێون. "لالا"یش ئەوەی ئەوێ، ئەزانێ کە ئێستا تەنیا ئەو ئەتوانێ یارمەتی بدات. بۆنی توندی درەختەکە ئەچێتە ناخیەوە. لە ئامێزی ئەگرێ و جەستە مردووەکەی هێمن ئەکاتەوە و لەگەڵ بۆنی دەریا و گیای دەریایی تێکەڵ ئەبێت. هەوای دەریا تاشەبەردەکانی ژێر دار هەنجیرەکەی رووت و قووت کردوەتەوە و ساف و لووس بوون. باران و "با" رزاندوونی، لە نێوان تاشە بەردەکاندا ریشە بە هێزەکانی لە باسکێکی کانزایی ئەچن.

ددانەکانی جیڕ ئەکاتەوە بۆ ئەوەی نەناڵێنێ و باوەش ئەکا بە کۆتەی دار هەنجیرەکەدا و بە ئارامی هەڵئەسێتەوە سەر پێ و لەسەر لاقە لەرزۆکەکانی رائەوەستێ. ئازارەکەی ناو جەستەی، ئێستا وەک برینێکە کە بەرە بەرە دەم ئەکاتەوە و ئەدڕێ. "لالا" ئیتر ناتوانێ بیر لە هیچی‌تر بکاتەوە جگە لەوەی کە ئەیبینێ و ئەوەی کە ئەیبیسێ و هەستی پێ ئەکات.

"نوعمان"ی پیر، "ئارتانی"، "عەمە" و تەنانەت وێنەگرەکە، کێن؟ چییان لێ هاتووە؟

ئازارێ کە لە سکی ژنە لاوەکە هەڵئەقوڵێ، لە پانتایی دەریادا بڵاو ئەبێتەوە. لەسەر پانتای تەپۆڵکەی لمەکان و تا ئاسمانە کەمڕەنگەکە، لە هەموو شت بە هێزترە،

هەموو شت پاک ئەکاتەوە و چۆڵی ئەکا. ئازار وەک دەنگێکی بەهێز جەستەی سیخناخ ئەکا، جەستەی وەک کێوێکی گەورە لێ ئەکا و بە خەوتووی لەسەر زەوی دائەنێ. بە بۆنەی ئازارەکەیەوە کات بە ئارامی تێئەپەڕێت، بە ئاهەنگی دڵی لێ ئەدات، بە ریتمی سیەکانی کە هەناسە ئەکێشی، بە ریتمی گووشینی منداڵدانەکەی. بە ئارامی وەک بڵێی بارێکی قورس بەرزکاتەوە جەستەی لەبەر کۆتەی دار هەنجیرەکە بەرز ئەکاتەوە. ئەزانێ کە تەنیا ئەو یارمەتی ئەدات. وەک درەختێک کە لە رابردوودا لە رۆژی لە دایک بوونیدا یارمەتی دابوو. بە شێوەی غەریزی بزاوتەکانی باوو با پیرانی ئەدۆزێتەوە. بزاوت گەلێک کە مانایەکی لە خۆیان بەرزتریان هەیە بێ ئەوەی کەس فێری کردبێت.

لەژێر درەختە گەورەکەدا هەڵئەتروشکێ، پشتوێنی کراسەکەی ئەکاتەوە، پاڵتۆ بۆرەکەی لەسەر بەردەڵانەکە بڵاو بووەتەوە. پشتوێنەکەی بە لقی دار هەنجیرەکەوە گرێ ئەدات. لە گرێدانەکەی جوان دڵنیا ئەبێت، کاتێ بە دوو دەستی خۆی بە پشتوێنەکەیەوە هەڵئەواسێ، درەختەکە کەمێ ئەشەکێتەوە، بارانێ لە تنۆکە شەونمەکان دائەکاتە بارین.

ئاوێکی دەست لێ نەکەوتوو روخساری "لالا" ئەشۆرێتەوە، زمانی بەسەر لێویدا دێنێ و بە تامەزرۆییەوە ئەیخواتەوە.

لە ئاسماندا، "سوور" ئێستا، دەست پێ ئەکات. دوایین خاڵەکانی شەو نوقم ئەبن، تیشک پرژێنی دوایین کازیوە، لە رۆژهەڵات، لەسەر تەپۆڵکە بەردینەکەوە، جێگای سپاییەکە ئەگرێتەوە. رەنگی دەریا تۆختر ئەبێ، مەیلەو بەنەوش، لە کاتێکدا لە پۆپەی شەپۆلەکانداترووسکە ئەرغەوانیەکان ئەدرەوشێنەوە و کەفە سپیەکە برووسکەی لێوە دێت.

"لالا" هەرگیز تا ئەو رادەیە ماقی هەڵهاتنی رۆژ نەبووە. چاوە پڕپەژارەکەی ماق ماوە، روخساری لە رووناکیدا ئەدرەوشێتەوە، کاتی گرتنی گرژ بوونەوەی دەمارەکانیەتی، لەپڕ و سامناک، ئازارەکە وەک رووناکیەکی سوور وایە کە بە شەوارە

ئەخات.

بۆ ئەوەی نەقیژێنێ، کراسەکەی لەسەر شانیەوە گاز لێ ئەگرێ، بە دوو دەستی پشتوێنەکەی گرتووە، هێندە توند کە درەختەکە ئەجوولێتەوە و جەستەی بەرز ئەبێتەوە. لەهەر جار شالاوی ئێش‌دا، "لالا" بە ئاهەنگەوە، بە لقی دارەکەوە هەڵئەواسری، ئارەق روخساری ئەشۆرێتەوە و بەرچاوی ئەگرێ. رەنگی خوێنی ئێشەکە، لەبەردەمیایەتی، لەسەر دەریا، لە ئاسماندا، لە نێوان کەفی هەر شەپۆلێکدایە کە تێک ئەشکێ.

جار جار، بێ‌ئەوە بیەوێ، لە نێوان ددانە لێک‌نراوەکانیەوە، هاوارێ دەرئەپەرێ کە دەنگی دەریا ئەیخنکێنێ، هاواری ئازار و بەدبەختیە، بە یەکجاری، لەبەر هەموو ئەم رۆشناییە، هەموو ئەم تەنیاییە، لە هەر جووڵەیەکدا، درەختەکە بە ئاستەم ئەچەمێتەوە و گەڵا پانەکانی ئەدرەوشێتەوە. "لالا" بۆنەکەی هەڵئەمژێ. بۆنی شیرینی و شیرەی گیایی، وەک بۆنێکی ئاشناکە دڵنیای ئەکات و هێمنی ئەکاتەوە. لقە گەورەکە ئەگرێ و کەمەری ئەدا بەکۆتەی دارەکەدا. تنۆکە شەونمەکان دائەبارێنەوە بەسەر دەست و بە روخسار و جەستەیدا. مێروولە رەشە هەرە بچووکەکانیش بە درێژای باڵە هەڵواسراوەکانیەوە هەڵدێن و بەسەر جەستەیەوە دائەگەرێن. ماوەیەکی زۆر ئاوا ئەمێنێتەوە تا هەست ئەکات دەمارەکانی باڵی وەک تەناف سفت و سۆڵ بوون. بەڵام قامکەکانی هێندە توند لە پشتوێنەکە گرێ داوەکە هیچ شتێ ناتوانێ لێی جیا بکاتەوە. لەپڕ هەست ئەکات بە شێوەیەکی سەیر جەستەی خاڵی ئەبێتەوە. لە کاتێکدا کە هێشتا بە توندی پشتوێنەکەی گرتووە، بە ئارامی، بە پشتا بە درێژای پشتوێنەکەیدا خۆی ئەخزێنێ. کەلەکە و پشتی ئەکەونە سەر ریشەی دار هەنجیرەکە. سەرئەنجام هەوا ئەرواتە ناو سیەکانی، هەر لەو ساتەدا گریانی گومی مناڵەکە ئەبیسێ.

رۆشناییە سوورەکەی سەر رۆخی دەریا، نارنجیە، پاشان زێڕین ئەبێت، هەتاو گەیشتووەتە ئاست تەپۆڵکە بەردینەکان لە رۆژهەڵات بۆ وڵاتی شوانەکان.

"لالا" مناڵەکە ئەگرێتە باوەش، بە ددانی تەنافەکە ئەقرتێنێ و گرێی ئەدات بە

دەور جەستەی بچووکی مناڵەکەیدا کە لە تاو گریان ئەلەرزێ. بە ئەسپایی لەسەر لمە رەقەکە، بە سینەخشکێ بەرەو دەریا ئەڕوا. لە ناو کەفە ناسکەکەدا لەسەر ئەژنۆ دائەنیشێ. مناڵەکە خەریکە ئەزریکێنی، ئەیخاتە ناو ئاوە سوێرەکە و بە سەرنجەوە ئەیشورێ.

ئەگەڕێتەوە لای درەختەکە، مناڵەکە لە نێوان پاڵتۆ رەنگ بۆرە گەورەکەی دائەپێچی و هەر بەو بزاوتە غەریزەییە کە لێی تێ‌ناگات، بەدەستی چاڵێ لە ناو لمەکە، لای ریشەی دار هەنجیرەکە هەڵئەکەنێ و جووتەکەی ئەخاتە چاڵەوە.

ئەمجا سەری لە تەنیشت کۆتە قەڵەوەکەی درەختەکە، دائەنێ و رائەکشێ، پاڵتۆکە ئەکاتەوە و مناڵەکە دەست ئەکا بە مژین و روخسارە هەرە بچووکەکەی بە چاوە قونجاوەکانیەوە ئەنێتە سەر سینەی. ماندوویەتی زۆری بۆ دێنێ، ساتێ بۆ رۆشناییە جوانەکەی رۆژ کە دەستی پێ کردووە ئەڕوانێ. دەریا گەلێ شینە و شەپۆلەکان لە هێڵێکی لاردا، وەک حەیوانگەلێک هەڵدێن.

چاوەکانی ئەبەسرێ، ناخەوێ، بەڵام ئەڵێی ماوەیەکی زۆرە لەسەر ئاوەکەدایە. هەست بە بوونەوەرێکی گەرم لە تەنیشتیا ئەکات، کە گووشیویە بە سینەیەوە، کە ئەیەوێ بژییەت، کە بە تامەزرۆییەوە شیرەکەی ئەمژێ "حەوا" کچی "حەوا"، "لالا" بیر ئەکاتەوە، هەستێکی خۆشی پێ ئەگات، وەک بزەیەک لە دوای هەموو ئەو ئازار و ئێشە. ئەمجا بێ‌ئوقرە، چاوەڕوان ئەمێنێتەوە کە کەسێ لە ستیەی تەختەیی و لۆحە قیرتاویەکانەوە بێت. کوڕێکی لاو راوچی قرژاڵ، یان کچێکی بچووک کە ساکارانە حەز ئەکات بەسەر تەپۆڵکەی لمەکاندا پیاسە بکات، بۆ سەیر کردنی باڵندە دەریاییەکان. ئێرە هەمیشە بە هاتنی کەسێ تەواو ئەبێ و سێبەری دارهەنجیرەکەش هەر نەرم و تازەیە.

***

بۆ دوایین جار، لەسەر دەشتە گەورەکە دەرکەوتن، نزیک دەریا لە جەمسەری ڕۆخانەکە، لە هەموو لایەکەوە ئەهاتن، باکووریەکان، "ئیداوترووماکان"، "تیداوتامانەکان"، "ئایت داوودەکان"، "مێسکالاکان"، "ئایت هادیەکان"، "ئیدا تووزمرینەکان"، "سەیدی ئامیلەکان"، "بیگودینەکان"، "ئەمیزمیزەکان"، "ئیشمرارەکان"، خەڵکەکانی ڕۆژهەڵات، ئەوبەر "تارودانت"، "تازانکت"، "ئوارزازات"، "ئایت کالاکان"، "ئاساراژەکان"، "ئایت کێونیەکان"، "ئامتازگینەکان"، "ئایت تومێریەکان"، "ئایت یرسەکان"، "ئایت زارهاڵەکان"، "ئایت ئودینارەکان"، "ئایت مودزیتەکان"، خەڵکی کێوەکانی "سارهرۆ"،کێوەکانی "بانی"، خەڵکی ڕۆخی دەریا، لە ئیسوپرا تاگاریری تۆکمە، خەڵکەکانی "تیزنیت"، "ئیفنی"، "ئائورینوراتان"، "تان"، "گولیمین"، "ئایت مێلوول"، "لائووسینیەکان"، "ئایت ئیلاکان"، "ئایت بورکا"، سەیدی "ئەحمەد و موسا"، "ئیداگوگمارەکان"، "ئایت باهاکان"، هەروەها خەڵکەکانی باشوور، مرۆڤە ئازادەکانی بیابان، "ئامراگینەکان"، "ئاریبەکان"، "ئولاد یەحیاکان"، "ئولاد دیلیم"، "ئاروسیوین"، "خەلیفیاکان"، "ڕۆگیبات" ساحلیەکان، "سەباکان"، خەڵکی "شلۆزوان"، "ئیدا و بیلالیەکان"، "ئیداو مێرپیاتەکان"، "ئایت باعمرانیەکان".

لە ڕۆخی ڕۆخانەکەیەکیان گرتەوە، هێندە زۆر بوون هەموو دۆڵەکەیان

داپۆشیبوو، بەڵام هەموویان شەڕ کەرنەبوون، ژن و منداڵەکان، پیاوە بریندارەکان، پیرەکان، هەموو ئەوانەی کە بێ وچان لەسەر جادە خۆڵاویەکان هەڵاتبوون. بە هاتنی سەربازە مەسیحیەکان دەرکرابوون و نەیانئەزانی بۆ کوێ بڕۆن. لێرە لەبەر شاری گەورەی "ئاگادیر"، دەریا بەری گرتبوون، زۆربەیان نەیاندەزانی لەبەر چی بۆ ئێرە هاتوون، بۆ رۆخی رۆخانەی "سووس"، رەنگە تەنیا برسیەتی، ماندوویەتی و نائومێدی بۆ ئێرەی هێنابن، بۆ جەمسەری رۆخانە، بەرەو دەریا.

بۆ کوێ بڕۆن؟ بۆ ماوەی ساڵان و مانگان بە دوای زەویەکدا، رۆخانەیەک، سەرچاوەی ئاوێک، وێڵ و وەیلان بوون، بۆ ئەوەی جێگیر بن و رەشماڵەکانیان هەڵکەن، گەوڕ بۆ مەڕ و بزنەکانیان درووست کەن.

زۆربەیان مردبوون، لەسەر رێگاگەلێک کە ئاکامیان بە هیچ جێگایەک نەئەگێشت، لە بیابان لە ئاقاری شاری گەورەی مەراکیش ، یان لە کەناوەکانی چەمە وەرزیەکەی "تادلا".

ئەوانەی توانیبوویان هەڵبێن بەرەو باشوور گەڕابوونەوە، بەڵام سەرچاوەی ئاوەکان وشک ببوون و سەربازە بێگانەگان لە هەموو جێگایەکدا کۆبوون، لە شاری "سمارا" لەوێ کە کۆشکی سووری بەردینی "مائەلعەینەین" بەرز ببووەوە. ئێستا "با"ی بیابان هەڵیکردووە و هەموو شتێکی هێناوەتە لەرزە.

سەربازە مەسیحیەکان زۆر بە ئارامی بە دەور پیاوە ئازادەکانی بیاباندا دیوارێکان چنی بووەوە. چاڵەکانی دۆڵی پیرۆزی "ساگیت" ئەلحەمرایان داگیر کردبوو، ئەم بێگانانە چیان ئەویست؟... هەموو زەویان ئەویست.

ماوەیەکی زۆر بوو خەڵکی بیابان لێرە بوون، لە باشووری شارە تۆکمەکە و بەتەمای شتێ بوون. دوایین جەنگاوەرانی "مائەلعەینەین" لەگەڵ هۆزەکانی کێوسانەکان یەکیان گرتبووەوە، باریکئەڵلاییەکان کە لەسەر روخساریان نیشانی زام و دەرد، نیشانی دووری بە هۆی مەرگی مائەلعەینەینەوە، دیار بوو، یاو و برسیەتی لە نیگایاندا ئەدرەوشایەوە.

هەموو رۆژێ خەڵکی بیابان بەرەو قەڵاکە ئەیانڕوانی، شوێنێ کە ئەبوایە مەولای سەبا "شێر" لەگەڵ جەنگاوەرە سوارەکانی دەرکەوێ بەڵام لە دوورەوە، دیوارە سوورەکانی شار، بێدەنگ مابوونەوە و دەرگاکان بەسرا بوون و ئەم بێ دەنگیە کە هەر درێژەی ئەکێشا، مەترسیەک بوو.

باڵندە رەشەکان لە ئاسمانی شیندا ئەسووڕانەوە و شەوانە لوورەی چەقەڵەکان ئەهات. "نوور"یش لەوێ بوو، تەنیا، لەناو کۆمەڵی پیاوە بەزیوەکان. ماوەیەکی زۆر بوو بەو تەنیاییە راهاتبوو، باوک و دایک و خۆشکەکانی گەڕابوونەوە بۆ باشوور، بەرەو جادە بێ بنەتاکان، بەڵام ئەو نەیویستبوو بگەڕێتەوە، تەنانەت لەدوای مەرگی شێخیش.

هەر شەو، لەسەرزەویە ساردەکە رائەکشا، بیری لە جادەیەک، لە رێگایەک ئەکردەوە کە "مائەلعەینەین" بەرەو باکوور کردبوویەوە، بەرەو زەویە نوێکان، شوێنێ کە "شێر"ەکەیش ئێستا رۆشتبوو بۆ ئەوەی ببێ بە پادشای راستەقینەی. لە ماوەی ئەو دوو ساڵەدا جەستەی لەگەڵ برسیەتی و ماندوویەتی راهاتبوو. لە بیر و مێشکیدا جگە لە ئارەزووی جادەیەک کە بە زوویی ئەکرایەوە، شتێکی تر نەبوو.

رۆژی دوایی، قاوێک کەوتە ئوردووگاکە، مەولای "هیبا"، مەولای "سەبا"، "شێر"، پاشاکەمان، پاشاکەمان...".

تەقەی گوللەکان بەرز بوونەوە، ژن و منداڵەکان لەگەڵ تەقینەوەکاندا ئەیانقیژاند. خەڵکەکە بەرەو دەشتە خۆڵاویەکە وەرچەرخان، رووناکی ئەسپەکانی داپۆشیبوو، گەردەلوولە سوورەکە بەرەو ئاسمانی بەیانی بەرز ئەبووەوە و لە ئاستی سەر دۆڵی رۆخانەکەوە لوولی ئەخوارد.

دەستەی جەنگاوەرەکان بەرەو پیری ئەسپ سوارەکان هەڵدەهاتن و بە کارابینە درێژەکانیان تەقەیان ئەکرد. زۆربەیان خەڵکی کوێستانەکان بوون، "شلۆ"کان کە پاڵتۆی بۆریان لەبەر بوو، پیاوە وەحشیە چڵکنەکان بە چاوە پرشنگدارەکانیانەوە.

"نوور" جەنگاوەرانی بیابان ناناسێتەوە، پیاوە شینەکانی بیابان کە تا مەرگی

"ماثەلعەینەین" لەگەڵی بیوون، ئەوانەکە برسیەتی و تینوویەتی لە پێی خستبوون، بیابان نەیسووتاندبوون، لە کێڵگە و گوندەکانیان وەدەرکەوتبوون بێ ئەوە بزانن بۆچی و لە بەرانبەر کێدا بەشەڕ هاتوون. تەواوی ڕۆژ جەنگاوەرەکان لەناو دۆڵەکە رایان ئەکرد، تا خاکرێژەکانی "ئاگادیر"، لە کاتێکدا ئەسپەکانی مەولای سەبا "شێر" بەغار گەردەلوولێکی سووریان بەرز ئەکردەوە.

چیان ئەویست؟ هەڵدەهاتن و ئەیانقیراند. دەنگی ژن و مناڵەکان لە ئاستی سەر ڕۆخانەکە ئەلەرایەوە. جار جار "نوور" تێپەڕینی ئەسپ سوارەکانی ئەبینی، لە نێوان گەردەلوولی سووری تەپ و تۆزدا لەناو تیشکی ڕووناکیەکاندا، ئەسپ سوارەکان بەرەو ئاسمان گوللەیان دەرئەکرد.

مەولای "هیبا"، مەولای "سەبا"، "شێر"، مناڵەکان ئەیانقیراند، ئەمجا ئەسپ سوارەکان بەرەو ئەوپەڕ دەشتەکە نوقم بوون. بەرەو خاکرێژەکانی "ئاگادیر". تەواوی ڕۆژ مەستی سەر دۆڵەکەی گرتبوو و هەروەها تینی ئاگرینی هەتاوکە لێوی ئەسووتاندن، بەرەو شەو، "با"ی بیابان هەڵیکرد و ئوردووگاکانی لە گەردەلوولێکی زێرین دائەپۆشی. "نوور" لەژێر درەختێکدا دانیشت، خۆی لە ناو پاڵتۆکەی داپێچا.

بەرە بەرە، لەگەڵ هاتنی شەودا مەستیەکەش ڕەویبووەوە، سێبەر سەر زەویە وشکەکەی گرتبوو. لەکاتی نوێژ خوێندندا و کاتێ ئاژەڵەکان لەبەر شێی شەوانە چۆکیان دادابوو.

"نوور" دیسان بیری لە هاوین ئەکردەوە کە بەڕێوە بوو، بیری لە وشکەساڵی، لە سەرچاوەی ئاوەکان، لە مێگەلەکان کە بە ئارامی، باوکی بەرەو کارخانەی خوێی ئەبردن، لە ئەولای بیابان، لە "ئوالاتا"، "ئوادان"، "شین شان"، بیری لە تەنیایی زەویە بێ پایانەکان ئەکردەوە کە هێندە دوورن کە ئیتر ئاگایان لە دەریا و کێوەکان نیە، ماوەیەکی زۆر حەسانەوە و هێمنایەتی بە خۆیەوە نەدیووە. ئەڵێی لە هەموو لایەکدا، جگە لە پانتایی خۆڵ و بەردەلان و کەناوەکان، نیە جگەلە ڕۆخانە وشکەکان، سەخرەکان کە وەک چەقۆ تیژن، بە تایبەت ترس کە وەک سێبەرێ کەوتووە بەسەر

هەموو لایەكدا، لە كاتی شێو كردندا، كاتێ نان و هەرزەنی كوڵاوی پیاوە شینەكانی بەش ئەكرد.

"نوور" بۆ شەوە پڕ لە ئەستێرەكەی ئەڕوانی كە زەوی دائەپۆشی، ماندوویەتی و یاو كە جەستەیانی ئەسووتاند و لەرزیان پێ ئەكرد. لە ئوردووگا كاتیەكە، لەژێر كەپرەكاندا، پیاوە شینەكان ئیتر نەئەدوان، ئیتر ئەفسانەی "مائەلعەینەین"یان نەئەگێڕایەوە. ئیتر گۆرانیان نەئەوت. خۆیان لە پاڵتۆكانیان داپێچابوو، چاویان بڕیبووە پزیسكی ئاگرەكە و كاتێ "با" ئاگرەكەی دائەمركاندەوە چاویان ئەترووكاند، رەنگە ئیتر چاوەڕوانی هیچ نەبن، چاویان تێكچووە و دڵیان ئارامتر لێ ئەدات. یەك لە دوای یەك ئاگرەكان ئەكوژانەوە و تاریكی دۆڵەكەی دائەگرت. دوورتر شاری ئاگادیر تا ناو دەریا رەشەكە هاتبووە پێشەوە.بە ئەستەم چاوی ئەترووكاند.

"نوور" لەسەر زەویەكە راكشا، سەری بەرەو رۆشناییەكان وەرچەرخاند، وەك هەموو شەو بیری لە شێخی گەورە "مائەلعەینەین" ئەكردەوە كە لەبەر ماڵە رووخاوەكە لە "تیزنیت"، لە قەبرێكدا رووەو رۆژهەڵات نێژراوە. لەگەڵیا تەنیا سامانەكەی، قورئان و تەزبێحە ئابنووسەكەیان ناشتبوو. زەویە شلەكە بەسەر جەستەیەوە قاڵبی گرتبوو، خۆڵی سووری بیابان و دیسان بەردێكی گەورەشیان لەسەری دانابوو، بۆ ئەوەی چەقەڵەكان لاشەكەی دەرنەهێنن.

پیاوەكان بە پێخاوس زەویەكەیان كوتابووەوە، وەك بەردەڕێژ ساف و رەق بوو، نزیك قەبرەكە، ئەقاقیایەكی زەردی دركاوی سپی، وەك ئەوەی بەر مزگەوتەكەی "سمارا"، روا بوو، پاشان یەك لە دوای یەك، پیاوە شینەكانی بیابان، بارك ئەللایەكان، دوایین هەڤاڵەكانی "گودفیا" لەسەر قەبرەكە چۆكیان دادابوو و بە ئارامی دەستیان نابووە سەر زەویە سافەكە بۆ وەرگرتنی دوایین دۆعای خێری شێخی گەورە. "نوور" بیری لەو شەوە ئەكردەوە، كاتێ هەموو پیاوەكان دەشتی "تیزنیت"یان بە جێ‌هێشتبوو و ئەو بەتەنیا لەگەڵ "لالا" مەیمونا لای قەبرەكە مابوونەوە. "نوور" لای قەبرەكە، لەسەر زەوی راكشا بوو، جەستەی بێ جووڵە مابووەوە، بێ ئەوە

بخەوێ. وەک بڵێی ئەویش مردبێ، ڕۆژی دوایی و ڕۆژانی دواتریش، قەبرەکەی بە جێ نەهێشتبوو، داپێچراو لە ناو پاڵتۆ خوریەکەی، لەسەر زەویە داخەکە دانیشتبوو، چاو و گەرووی یاو سووتاندبووی. "با" تەپ و تۆزی قەبرەکەی بۆ ئەهێنا، بە ئارامی گسکی لێ ئەدا، یاو جەستەی گرتبوو تا بێهۆش کەوتبوو، ژنەکانی "تیزنیت" بردبوویانەوە بۆ ماڵ خۆیان و چاودێریان لێ کردبوو. ئەو وراوەی کردبوو و بەرەو مەرگ چووبوو.

دوای چەند حەوتوو کاتێ چاک ببووەوە، سەرلە نوێ بەرەو ماڵە رووخاوەکەی "مائەلعەینەین" گەڕابووەوە، بەڵام کەسی لێ نەبوو. "لالا" مەیمونا ڕۆشتبووەوە لای هۆزەکەی. "با"یش هەڵیکردبوو، هێندە لمی لەگەڵ خۆی هێنابوو کە نەیتوانیبوو شوێنی قەبرەکە بدۆزێتەوە. "نوور" بیری کردەوە کە لەوانەیە بەم شێوەیە ئەبێ لە هەموو شتێ رابووری، رەنگە شێخی گەورەکە لە ناو لمی بیابان نوقم ببوو، بەرەو کەوشەنی ڕاستەقینەی خۆی گەڕابووەوە.

ئێستا "نوور" پانتایی بەرینی ڕۆخانەی "سووس"ی لەشەودا سەیر ئەکرد کە بە ئەستەم لە تەمی کاکەشاندا ڕۆشن ببوو. تیشکێکی گەورە، واکە ئەڵێن، جێگای خوێنی بەرخەکەی جبرەئیلە.

هەر ئەو زەویە بێدەنگەی لای "تیزنیت"بوو، "نوور" جار جار هەستی ئەکرد گوێی لە ناڵە ماوەدارە ئاهەنگینەکانی "لالا مەیمونا" بووە، بەڵام لەوانەیە دەنگی چەقەلێک بووبێ کە لە شەودا لووراندبێتی.

لێرە ڕۆحی "مائەلعەینەین" هێشتا دەریا و هەموو زەوی داپۆشیبوو، لەگەڵ لم و تەپ و تۆزدا تێکەڵ ببوو، یان بە شێوەیەکی گوم لەسەر هەر بەردێکی تیژدا ئەدرەوشایەوە. "نوور" بە نیگای هەستی پێ ئەکرد. لەوێ، لە ئاسماندا، لە خاڵە تاریکەکانی زەویدا، هەستی بە نیگایەک بۆ سەر خۆی ئەکرد، وەک جاران لە گۆڕەپانی "سمارا". جەستەی ئەلەرزی، بینایەک ئەچووە ناخیەوە، سەرگێژەکەی ئەهێنایەوە. ئەیەوێ چی بڵێ؟ لەم بێدەنگیە لەسەر دەشتەکە، رەنگە شتێکی بوێ.

ڕەنگە بیەوێ بە پیاوەکانی بڵێ وەدووی کەون بۆ شوێنەکەی لای خۆی، تێکەڵاو لەگەڵ زەویە خۆڵەمێشیەکەدا، پرژ و بڵاو لە "با"دا وەک خۆی کە ببوو بە خۆڵ.

"نوور" خەوتبوو، نیگا نەرمەکە لەگەڵ خۆی بردبووی، بێ جووڵە بێ ئەوەی خەو ببینێ.

کاتێ جاری یەکەم دەنگی تۆپەکانیان بیست، پیاوە شینەکان و جەنگاوەرەکان بۆ ڕوانینی دەریا، بەرەو تەپۆڵکەکان هەڵهاتبوون، دەنگەکە وەک هەورە تریشقەیەک ئاسمانی ئەلەراندەوە. تەنیا لە پانتایی "ئاگادیر"، کەشتیەکی گەورەی زرێپۆش وەک حەیوانێکی زەبەلاح و ئارام تیشکەکانی توور ئەدا. دەنگەکە دوای ماوەیەک ئەهات، نەرەیەک لە دوای دەنگی سامناکی خومپارەکان کە لە ناو شاردا تەقانەوە، لە چەن ساتدا، دیوارە بەرزە سوورە بەردینەکان هەرکۆگایەکی رووخاو بوون. دووکەڵ بەرز ببووەوە، لە ناو دیوارە رووخاوەکاندا خەڵکەکە، پیاو و ژن و منداڵ، خوێناوی و قیژە قیژ، ئەهاتنە دەرەوە، دۆڵی ڕووبارەکەیان پڕ کردبووەوە. تا ئەیانتوانی بە توندی لە دەریا دوور ئەکەوتنەوە. ببوون بە نێچیری هەراس و سام و ترس.

ئاگرە بڕگە بڕگەکان چەند جار لە نووکی لوولەی ڕەزمناوی "کازمائو" دەرئەپەڕیە دەرەوە، دەنگی سامناکی خومپارەکان کە لە ناوچەی ئاگادیر ئەتەقیتەوە و لە تەواوی دۆڵی ڕۆخانەی "سوس" بڵاوئەبووەوە، دووکەڵی ڕەشی ئاگرەکان تا تاقی ئاسمانە شینەکە بەرز ببووەوە و باوەشی بە ئوردووگای سەحرانشینەکاندا کردبوو.

پاشان جەنگاوەرە سوارەکانی مەولای "سەبا"، "شێر" دەرکەوتبوون، لە ڕۆخانەکە تێپەڕیبوون، بەرەو تەپۆڵکەکان، بەرەو دۆڵەکە وەرئەچەرخان، بەرەو ئەویا کە خەڵکی بیابان هەڵدەهاتن.

بەڵام ئاگرەکان ئیتر لە لوولەکانەوە نەئەدرەوشانەوە، بێدەنگیەکی ماوەدار دەستی پێ کرد، تەنیا دەنگی زەنازەنای خەڵکەکە کە ڕایان ئەکرد و قیڕە قیڕی حەیوانەکان بوو. لە کاتێکدا دووکەڵە ڕەشەکە بەردەوام بەرەو ئاسمان بەرز ئەبووەوە، کاتێ سەربازە مەسیحیەکان لەبەر خاکرێژە تێک شکاوەکانی شار دەرکەوتن، کەس

ئاگای نەبوو. رەنگە تەنانەت مەولای سەبا و پیاوەکانی بۆ ساتێ وایان زانیبوو کە جەنگاوەرانی باکوور، مەولا "حەفید"ی فەرماندەی موسڵمانان بۆ جیهاد ناردوونی.

بەڵام چوار گوردانی کلونێل "مانژەن" بوو کە دوای ڕێپێوانێکی زۆر تا شاری یاغیەکان، "ئاگادیر"، هاتبوون. چوار هەزار پیاوی ئونیفۆرم لەبەر، تیرئەندازەکانی ئافریقایی، سەنگاڵی، سوودانی و سەحرایی. چەکی لێبێلیان پێ بوو و دە مسەلسەلی "نوردان فێلت". سەربازەکان بە ئارامی بەرەو رۆخی رۆخانەکە پێش ئەچوون و لە نێو بازنەیەکدا بڵاو ببوونەوە. لە کاتێکدا لەولای رۆخانەکە، لە داوێنی تەپۆڵکە بەردەڵانەکە لەشکری سی هەزار سواری مەولای سەبا، بەدەور خۆیدا ئەسووڕایەوە، گەردەلوولێکی گەورەی تەپ و تۆزی سووریان بەرەو ئاسمان بەرز کردبووەوە، دوور لە گەردەلوولەکە مەولای سەبا، پاڵتۆیەکی سپی لەبەر بوو، بە نیگەرانیەوە بۆ ریزی درێژی سەربازە مەسیحیەکانی ئەڕوانی، کە وەک ئەستوونی دەعبا لەسەر زەویە وشکەکە ڕێ کەوتبوون. ئەیزانی بەزیون، وەک لە "بودەنیپ"دا کاتێ تیرهاوێژە رەشەکانی زۆرتر لە هەزار ئەسپ سواریان کە لە باشوورەوە هاتبوون، کوشتبوو.

بێجووڵە، بەسەر ئەسپەکەیەوە کە لە بێسەبریدا ئەلەرزی، چاوی بڕیبووە بێگانەکان کە بە ئارامی بەرەو رۆخانەکە ئەچوونە پێش، وەک بڵێی بۆ مەشق کردن بڕۆن. چەندین جار مەولای سەبا فەرمانی پاشەکشێی دابوو، بەڵام جەنگاوەرانی کێوسان گوێڕایەڵی فەرمانەکانی نەبوون. بە غار لە ئەسپەکانیان ئەخوڕی، تەپ و تۆز مەست و شێتی کردبوون، بە زمانە وەحشیەکەیانەوە ئەیانقیڕاند و هاواریان لە خوا و پێغەمبەر ئەکرد. کاتێ مەستیەکەیان دوایی پێهات، کەوتبوونە ناو داوێ کە بۆیان تەنیبوون. هەموویان مردبوون، مەولای سەبا هیچی نەئەتوانی بکات، چاوی پڕ ببوو لە فرمێسکی ئازار و دەرد. لەولای وشکایی رۆخانەکە، لەسەر تەپۆڵکە بەردینەکان، "مانژەن" مسەلسەلەکانی لە هەر دوو باڵی لەشکرەکە جێگیر کردبوو. کاتێ ئەسپ سوارە مەراکشیەکان بەرەو ناوەڕاستی مسەلسەلەکان هێرشیان ئەبرد، لە کاتێکدا کە لە رۆخانەکە تێئەپەڕین، مسەلسەلە دوو لوولەییەکان هەموویانی ئەماڵیەوە. ئیتر هەر بۆ

دڵنیایی پێویستیان بە تیرێکی خەلاس بوو.

دیسان بێدەنگیەکی قورس وڵاتی گرتەوە. ئەسپ سوارەکان راوەستابوون، کولۆنێل مانژەن بە دووربینە دوو چاوەکەیەوە ئەیروانی. هەوڵی ئەدا تێبگات. ئێستا پاشەکشێی ئەکەن؟ دەی ئەبێ سەرلە نوێ بۆ ماوەی رۆژانێکی دیکە رێ بکەوێ، لەسەر ئەم زەویە بیابانیە بەرەورووی ئاسۆیەک کە هەڵدێ و نائومێد ئەکات.

بەڵام مەولای سەبا، بێ جووڵە لەسەر ئەسپەکەی مابووەوە، چونکە ئەیزانی کۆتایی نزیکە، جەنگاوەرانی کێوسان، کورانی رەئیسەکانی هۆز بۆ شەڕ هاتبوون نە بۆ هەڵهاتن.

بەرلە هێرش راوەستابوون، نوێژەکەیان خوێندبوو، پاشان هەموو شت زۆر بە زوویی رووی دابوو. لەژێر هەتاوی داخی نیوەڕۆدا، سێهەزار ئەسپ سوار، بە رێکخراوەیەکی رێکوپێکەوە وەک بڵێی بۆ سان دان بچن، هێرشیان کردبوو، چەک و نێزە بەردینەکانیان لە هەوادا خولاندبووەوە، کاتێ گەشتبوونە رۆخانەکە، ئەفسەرەکان بەدەم فەرماندان بە مسەلسەلچیەکانەوە بۆ کولۆنێل "مانژەن"یان ئەروانی کە دەستی هێنابووە خوارەوە و لوولە پۆلاییەکان رەهێڵەی تۆپەکانیان بارانـدبوو، سێسەد تۆپ لە دەقیقەدا، دەنگێکی وەیشومە کە هەوای ئەهاڕی و تەواوی دۆڵەکە تا کێوەکان ئەزرنگایەوە.

کات بوونی هەبوو؟ چەن چرکە بۆ کوشتنی هەزار مرۆڤ، هەزار ئەسپ، بەس بوو؟

کاتێ ئەسپ سوارەکان زانیبوویان کە کەوتوونەتە ناو داو و ناتوانن لە دیواری گوللەکان تێپەڕن، ویستبوویان بگەڕێنەوە بەرەو ئەولای جادەکە بڕۆن، بەڵام زۆر دێر بوو، دەستڕێژی مسەلسەلەکان رۆخانەکەی گسک لێ ئەدا. جەستەی پیاو و ئەسپەکان بێوچان ئەکەوتن، ئەتوت داسێکی نادیار هەموویانی درەو ئەکرد. لەسەر بەردەڵانی رۆخەکە، جۆگەی خوێن رێ کەوتبوو و لەگەڵ تاڵە ناسکەکانی ئاو تێکەڵ ببوون. دیسان بێدەنگی وڵاتی گرتبووەوە، کاتێ دوایین ئەسپ سوارەکان بەرەو تەپۆڵکەکان

هەڵدەهاتن، بە سەر ئەسپەکانیانەوە کە لە ترسدا موویان راست ببووەوە، خوێنیان لێ ئەتکا. بێ پەلە کردن، لەشکری سەربازە رەشەکان لە درێژایی رۆخانەکە رێ کەوتبوون، یەک یەک و دوان دوان، لە پێشیانەوە ئەفسەرەکان و کولۆنێل مانژەن بوو.

لە رێگای رۆژهەڵاتەوە، بەرەو تارودانت... بەرەو مەراکش، بە دوای مەولای "سەبا"، "شێر" رێکەوتبوون، بێ ئەوەی ئاورێ بدەنەوە بە شوێن کوشتارەکەدا، بۆ جەستەی کوژراوەکان کە لە سەر زەویدا کەوتبوون بڕوانن. ئەسپە هەڵگەڕاوەکان، لاشخۆرەکان کە گەیشتبوونە قەراخی رۆخانەکە، ئیتر بۆ وێرانەکانی ئاگادیریان ئەڕوانی و دووکەڵێکی رەش کە هێشتا لە ئاسمانە شینەکەدا لوولی ئەخوارد.

دوورتر، رەزمناوی "کازمانۆ" بە ئارامی لەسەر دەریا رەنگ کانزاییەکە رێی باکووری گرتبووە بەر و پاشان بێدەنگیە کە شکا، قیرەقیری هەموو زیندووەکان بەرز بووەوە، پیاو و حەیوانە بریندارەکان و مناڵەکان، وەک ناڵەیەکی بێبڕانەوە، وەک ئاوازێ، دەنگێکی پڕ لە بەدبەختی و ئازار، کە تێکرا لە هەموو لایەک، لەسەر دەشتەکە و رۆخانەکە بەرز ببووەوە.

"نوور" لەسەر بەردەڵانی قەراخەوە، لە نێوان جەستە کەوتووەکاندا رێ ئەرۆشت، مێشە چنۆکەکان و زەردەواڵەکان بەسەر لاشەکاندا ویزەیان ئەهات، "نوور" هەستی ئەکرد هێڵنج و رشانەوەیەک گەرووی ئەگرێ، بە بزاوتی ئارامەوە، وەک ئەوەی لە خەو راپەڕێن، ژن و پیاو و مناڵەکان دڕکەکانیان لە خۆیان ئەکەندەوە و بەرەو رۆخانەکە ئەچوون، بێ ئەوەی ورتەیان لێوە بێت. ماوەی تەواوی رۆژ لاشەکانیان بۆ قەراخی رۆخانەکە ئەبرد کە بیاننێژن، کاتێ شەو داهات، ئاگریان کردەوە بۆ ئەوەی چەقەڵ و سەگە وەحشیەکان دوور خەنەوە. ژنانی گوندەکان هاتبوون، نان و شیری دەڵەمەیان بۆ هێنابوون، "نوور" بە تامەزرۆییەوە ئەیخوارد. پاشان بێ ئەوەی تەنانەت بیر لە مەرگ بکاتەوە لەسەر زەویەکە خەوت.

رۆژی دوایی، لەگەڵ دەمەوبەیاندا، ژن و پیاوەکان بۆ ئەوانی دیکەش قەبریان کەند. پاشان ئەسپەکانیشیان ناشت و لەسەر قەبرەکان بەردی گەورەی رۆخانەکەیان

دائەنا. کاتێ هەموو شت دوایی هات، دوایین پیاوە شینەکان رێکەوتنەوە، لە رێگای باشوورەوە، رێگایەک کە هێندە بێبرانەوە بوو، ئەتوت هەرگیز دوایی نایەت.

"نوور"یش لەگەڵیان چوو، پێخاوس، تەنیا پاڵتۆ خوریەکەی و نانێکی ملۆچەکراو کە لە پەڕۆیەکی تەردا بوو پێی بوو، ئەوانە دوایین ئیمازیغنەکانی بوون، دوایین پیاوە ئازادەکان، "تۆباڵتە"کان، "تێکنا"کان، "تیدرارینە"کان، "ئەروسیونیە"کان، "سەبا"یەکان، "رۆگیباتە" ساحلیەکان، دوایین پاشماوەکانی "باریکئەڵلایەکان"، هەڵبژێردراوەکانی خوا بوون، هیچیان نەئەویست، جگە لەوەی کە پێیان لەمسی ئەکرد. لەبەردەمیاندا زەویە سافەکە وەک دەریا بڵاو ببووەوە، خوێی سەری ئەدرەوشایەوە، زەوی شەپۆلی لێ ئەدا، شارە سپیەکان بە دیوارە شکۆدارەکانیەوە، درووستی ئەکرد، گومەزگەلێ کە وەک بلق ئەدرەوشانەوە، هەتاو روخسار و دەستیانی ئەسووتاند، کاتێ سێبەری مرۆڤەکان وەک چاڵێکی بێ بن بوو، رووناکی مەستیەکەی خۆی هێنابووەوە.

هەرشەو لێوە خوێناویەکانیان بە دوای تەڕایی سەرچاوەی ئاوەکاندا ئەگەڕا. بە دوای گڵی سوێری رۆخانە ئاموونیاکەکاندا، پاشان شەوە ساردەکان ئابلۆقەیانی ئەدا. هەناسەی سوار ئەکردن، ئەندامی لەشیانی تێک ئەشکاند و قورسایەکی ئەخستە سەر پشتە ملیان.

ئازادی بێ بنەتا بوو، وەک پانتایی زەوی پان و بەرین بوو، جوان بوو وەک رووناکی، نەرم وەک سەرچاوەکانی ئاو. هەر رۆژ لەگەڵ یەکەمین گزنگی رۆژدا، پیاوە ئازادەکان بەرەو مەنزڵگاکانیان ئەگەڕانەوە، بەرەو باشوور، بۆ شوێنێ کە کەسی دیکە نەیدەزانی تیا بژی ئەوان نەبێ.

هەموو رۆژێ بە هەمان رێ و رەوشت، ئاسەواری ئاگرەکانیان لائەبرد و پیسیەکانیان چاڵ ئەکرد و بەرەو بیابان ئەگەڕانەوە، نوێژەکانیان بە بێ لێو بزواندن ئەخوێند و ئەڕۆشتن، وەک چۆن لە خەوێکدا ئاوەها ون ئەبوون.

**پاییزی ٧٩**

# پێرستی ناوەکان

Aalun
Aammi
Aan Rag
Abd el Malek
Abdesselaam
Abou ibrahim tounsi
Abou Mahdi
Abou Mohammed abdel aziz ath Thobba
Abou Yaza
Abou Yazrd
Abou chouhaïb
Abou madian
Abou zakri Yahia an nowani
Adrar
Aganiers
Aglaga
Ain Rhatra
Aït boukha
Al Azraq
Al Hallaj
Al Halwi
Al chebli
Al jounaid
Algésiras
Alloth
Alkaïd
Ainilam
Amizmiz
Amtazguine
Anita
Arib
Aroussiyine
Assaka
Assaray
Asserssif
Atar
Atlas
Avezi
Aït Atta
Aït Kalla
Aït Kedif
Aït Youss
Aït Zarhai
Aït ba Amran
Aït daoud
Aït hadi
Aït moudzit
Aït oudinar
Aït toumert
Bacri
Baghdad

Bekkaĺa
Belsunce
Ben Ahmed
Ben Ahmed
Berik Al-lah
Berik Allah
Bigoudine
Birou
Borku
Bou Izakarn
Bou Sba
Casacheheibaghazali
CHems
Camille Does
Canebiere
Casmao
Cchere
Ceresola
Charite
Cherara
ChereE
Chiba
Chinguetti
Chinguetti
Chleuhs
Cité
Coppolani
Cresola
Cádiz
Daniel
Daniel
Daniel
Draa
Dzikr
ERg Iguidi
Ed Dakhla
El Aaiun
El Founat
El Gaba
El founat
El khadr
Embarec
Es Ser
Espagnol
Fanta
Fecha
Fozt Gourand
Fozt Trinquet
Gheris
Glaciéres
Goudfla
Goudfĺa
Goulminie
Granada
Gregori
Gregori
Hamada
Hamada
Hamal
Hamara

Hank
Haricha
Hartani
Hausa
Hausa
Hawa
Haīm
Horriga
Houa
I Kiky
I cherguiguine
Ibn Houary
Ichemraren
Ida Gougmar
Ida ou Tamane
Ida ou trouma
Ida ou zemzen
Idaou Belal
Idaou Melubat
Ifni
Ifrane
Iguetti
Ilias
Illa
Inca
Jang Saccum
Jilani
Joupiter
Kalla
Kasbah Zidaniya
Kig
Ko-Di-Ki
Kochab
Lagor
Lahoussine
Lalla
Lalla Fithima
Lalla Mangoure
Larhdaf
Lebel
Lebel
MA el Dehiba
Maarouf
Madvid
Makel
Malik
Maminna
Maqil
Marcel
Marrakech
Maulay Hiba
Maīder
Megrez
Meskala
Messeid
Mica
Mizar
Mohammad El Fadel
Mohammed as Saghir as souhaīli
Mohammed bel sliman al jazouli

Mohammed ech Cheakh El Klimel
Mouchamp
Moulay Hiba
Moulay bou Azza
Moumine
Mouritanie
Nazaran
Neferiti
Noun
Nour
Orion
Oualata
Oualata
Ouarkziz
Ougeft
Oulad Delim
Oulad yahia
Oum chakourt
Ouways Qarni
Petite charlot
Pistoles
Prado
Quenti
Radics
Radme Rieh
Rayem Mohamed Embarec
Rayem mohammed
Regbat
Reguibat
Rio De Oro
Rito
Saadbou
Saguiet
Sahabi
Sefar
Seine
Sevilla
Sici Adelqadir
Sidi Ahmed al Hiroussi
IstiraH le demhA IdiS
Sidi Amil
Sidi Belkheir
Sidi Brahim el AAttami
Sidi Embarek
Sidi Ifni
Sidi Jaker
Sidi Mohammed ben Issa
Sidi Mohammed el
Sidi ahmed el rifaĭ
Sidi ben Abbas sebti
Sidi el hach
Siroua
Smara
Souleĭman
Souss
Tabeelbala
Tadla
Tafilite
Tagant
Taidait

Taissa
Tamchakatt
Tamgraut
Tanger
Taramant
Tarfaga
Taroudante
Tassouf
Tazenakht
Tcart
Teghaza
Tibesti
Tichka
Timon
Tindonf
Tinergouet
Tingut
Tirhmi
Tiznit
Tombouctau
Torkrz
Tsaouri
Tubbus
Yalannour
Yetti
Yorf
Younous Ibn Obaid
Yuemala
Zemar
Zettat